# مێژووی تەبەری

نوسینی: محمد بن جریر طبری
وەرگێڕانی: زانەر محمد

بەرگی حەوتەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٢

# پێڕست

## بەیعەت وەرگرتنی عەلی لەخەڵکانی بەسرەو بەسەرهاتی زیاد کوڕی ئەبی سوفیان و عەبدوالرەحمان کوڕی باوکی بەکرە

دەقی بەیعەتەکە بەمشێوە بوو: لەسەر بەڵێن و پەیمانی خواوەند پێبەندی کە هەرکەس رێگەی ئاشتی لەگەڵ ئێمە گرتەبەر، رێگەی ئاشتی بگریتەبەر و هەرکەس لەگەڵ ئێمە جەنگا، لەگەڵی بجەنگی و زمان و دەستی خۆت لەئێمە بەدوور بگریت.

زیاد کوڕی ئەبوسوفیان یەکێك بوو لەو کەسانەی خۆی بەدوور گرت و بەشداری جەنگەکەی نەکردبوو. ئەو، لەماڵی نافیع کوڕی حارس بوو. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتی لەگەڵ خەڵکان تەواو کرد، عەبدوالرەحمان کوڕی ئەبی بەکر لەناو ئەو کەسانەی داوای ئەمانیان دەکرد هات و سلاوی کرد. عەلی وتی: مامی تۆ مایەوە و چاوەڕوانی دەکرد؟

وتی: ئەي سەروەری باوەڕداران شوێنکەوتەی تۆیە و بەشادمانی تۆ دڵخۆشە بەلام بیستوومە نەخۆشە، دەڕۆم هەواڵی دەزانم و دەگەڕێمەوە.

عەبدوالرەحمان شوێنی زیادی لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب شاردەوە تا ئەوەی بۆچوونی خۆی پرسی. زیاد وتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەشوێنەکەی ئاگادار بکاتەوە و ئاگاداری کردەوە.

عەلی وتی: پێش کەوە و من ببە لای ئەو.

عەبدوالرەحمان ئەو کارەی کرد و کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشتە لای، وتی: خۆت بەدوور گرت و چاوەڕوانی دەرئەنجامەکان بوویت؟

زیاد دەستی خستە سەر سینە و وتی: ئەم ئازارە دیارە. دواتر داوای لێخۆشبوونی لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد و ئەو، لێی خۆش بوو و لەگەڵ ئەو راوێژی کرد. ئەوی بۆ بەسرە دەویست کەوتی: دەبێت فەرمانڕەوا کەسێك لەبنەماڵەکەی تۆ بێت تا خەڵکان دڵی پێ خۆش بکەن و دڵنیا ببنەوە و ببنە شوێنکەوتەی تۆ. من هاوکاری و راوێژی لەگەڵ دەکەم. سەبارەت بەکوڕی عەباس بڕیاریاندا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە.

## فەرمانڕەوایی کوڕی عەباس لەبەسرە و سپاردنی کاروباری خەراج بەزیاد

عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کوڕی عەباسی کردە فەرمانڕەوای بەسرە و زەیدی وەك لێپرسراوی خەراج و بیت المال دەست نیشان کرد. پێشنیاری بەکوڕی عەباس کرد لەکارەکاندا راوێژی پێ بکات.

کوڕی عەباس دەویت: سەبارەت بەپێشهاتێك راوێژم پێکرد، وتی: ئەگەر دەزانی کە تۆ لەسەر راستیت و بەرابەرەکەت لەسەر ناڕاستییەوە، بەوشێوەیە قسە دەکەم و ئەگەر نازانی، بەوشێوەی دەبێت.

وتم: من لەسەر راستیم و ئەوان ناڕاستن.

وتی: بەهاوکاری ئەوەی شوێنکەوتەی تۆیە، نافەرمانەکان سەرکوت بکە و ئەگەر ڕشتنی خوێنی دەبێتە هۆی بەهێزی ئیسلام، ئەو کارە بکە.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەوم وەك دەبیری خۆم دەستنیشان کرد و کاتێك فەرمانڕەوایەتیم گرتەدەست، لەکردەوەکانی دڵنیا بووم.

سەبەئییەکان پەلەیان کرد و لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەمانەوە و بێ مۆڵەت وەرگرتن لەو بەرێکەوتن بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب شوێنیان کەوت بۆ ئەوەی لەمەبەستەکانیان دووریان بخاتەوە.

محەممەد دەڵێت: خەڵکانی مەدینە ڕۆژی پێنج شەممە پێش ئاوابوونی خۆر لەجەنگی جەمەل ئاگادار بوونەوە بەهۆی (بازێك) کە بەسەر ئاسمانی مەدینەدا دەفڕی و شتێك بەچنگۆڵەکانیەوە بو. خەڵك بەجوانی سەیریان کرد و کاتێك کەوتەخوار، دەستێك بوو کەئەنگوستیلەی تیا بوو و نەخشەکەی تایبەت بوو بە عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب. ئەوکەسانەی لەنێوان مەککە و مەدینە و بەسرە بوون، ترسان و لەپێشهاتەکەیان بەهۆی ئەو دەست و پێیانەی باز و هەڵۆکان دەیانهێنا، ئاگادار بوونەوە.

## ئامادەكارییەكانی عەلی كوڕی ئەبی تالیب بۆ بەرێكەوتنی عایشە لەبەسرە

محەممەد دەڵێت: عەلی كوڕی ئەبی تالیب بۆ عایشە ئەوەی پێویستی بوو لەچوارپێ و توێشوو وكەرەستە، ئامادەی كرد و هەموو ئەوكەسانەی لەگەڵ ئەو هاتبوون و تەندروست مابوونەوە، لەگەڵ ئەودا ڕەوانەی كردن مەگەر ئەو كەسانەی خوازیاری مانەوە بوون. چل كەس لەژنە بڕواپێكراوەكانی بەسرەی بۆ هاوڕێیەتی ئەو هەڵبژارد و وتی: ئەی محەممەد، ئامادەكارییە پێویستەكان ئامادە بكە و بەڕێی بكە.

دەڵێت: بۆ ڕۆژی بەرێكەوتنی عایشە، عەلی كوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای. چەند كەسێكی دیكەیش ئامادە بوون. عایشە ڕۆشتە ژوور و خەڵكان ماڵئاواییان لێكرد و ئەویش ماڵئاوایی لێكرد، وتی: كوڕەكانی من! ئێمە بەهۆی چاوەڕوانی یا زیادەخوازی، سكاڵامان لەیەك دەكرد، هەركەس لەمبارەوە شتێكی بیستووە، گرنگی پێنەدات. سوێند بەخوا پێشتر هیچ كێشەیەك لەنێوان من و عەلی كوڕی ئەبی تالیب بوونی نەبووە مەگەر ئەو بۆڵەبۆڵانەی لەنێوان ژنێك و خزمەكانی مێردەكەی ڕوودەدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو، لای من یەكێكە لەچاكەكاران.

عەلی كوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی خەڵكینە سوێند بەخوا ڕاستی هێنایە سەرزمان. لەنێوان من و ئەو هیچ كێشەیەك بوونی نەبووە. ئەو، لەدنیا و لەڕۆژی هەستانەوە هاوسەری پێغەمبەری ئێوەیە.

دەڵێت: عایشە لەڕۆژی شەممەی مانگی ڕەجەبی ساڵی سی و شەش بەرێكەوت. عەلی كوڕی ئەبی تالیب بۆ چەند فەرسەخێك لەگەڵی ڕۆشت و مناڵەكانی خۆی تا یەك مەنزڵ دوور لەبەسرە لەگەڵ ئەودا نارد.

## ئەوگێڕانەوانەی سەبارەت بەزۆر بوونی کوژراوەکانی جەنگ ئاماژەیان پێداوە

سەعیدی قەتعی دەڵێت: گفتوگۆمان دەکرد کەکوژراوەکانی جەنگی جەمەل لەشەش هەزار کەس زیاتر بووە.

باوکی لوبەید دەڵێت: بەمازە کوڕی زیادم وت: بۆ جوێن بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەدەیت؟

وتی: بۆ سەبارەت بەکەسێك کەدوو هەزار و پێنسەد کەسی لەئێمە کوشت و هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو، قسەی ناشیرین نەهێنمە سەرزمان؟

جەریر کوڕی باوکی حازم دەڵێت: بیستم کوڕی باوکی یەعقوب دەیوت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەنگی جەمەل دوو هەزار و پێنسەد کەسی کوشت، هەزار و سێسەد و پەنجا کەس لەخەڵکانی ئەزد، هەشسەد کەس لەمناڵەکانی زەببە و سێسەد و پەنجا کەس لەخەڵکانی دیکە.

جەریر دەڵێت: موعریز کوڕی خەلات لەجەنگی جەمەل کوژرا و براکەی حەجاج هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((رۆژێك نەبینی زیاتر لەو رۆژە دەستی چەپ کەوتبێتە سەرزوی
و دەستی راست لێی جیابووبێتەوە))

## وتەکانی عەممار دووای جەنگی جەمال لەگەڵ عایشە

باوکی یەزیدی مودینی دەڵێت: کاتێك خەڵکان لەجەنگی جەمەل تەواو بوون، عەمار کوڕی یاسر بەعایشەی وت: ئەی دایکی باوەڕداران، ئەم کارەت لەوەی پێغەمبەر (د.خ) بەتۆی فەرموو بوو، زۆر دوور بوو.

عایشە وتی: باوکی یەقزان؟

وتی: بەڵێ.

وتی: سوێند بەخوا تا ئەو جێگەی دەزانم بەردەوام راستیت هێناوەتە سەرزمان.

وتی: سپاس بۆ خوا کە لەسەر زمانی لەبەرژەوەندی من داوەری کرد.

بەسەرهاتەکانی تایبەت بەجەنگی جەمەل کۆتایی هات.

## ڕەوانە کردنی قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبـادە وەك فـەرمانڕەوای میـسر لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵە، یانی ساڵی سی و یەکەم، محەممەد کوڕی باوکی حوزەیفە کوژرا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەمە بوو کاتێك میسرییەکان هاوریێ لەگەڵ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕوویان لەمەدینـە کرد، ئەو لەمیسر مایەوە و عەبدوڵڵا کوڕی سـەعد کوڕی ئەبی سەرحی لەوێ دەرکرد و میسری خستە ژێر دەستی خۆیـەوە و لـەوێ مایـەوە تـا عوسمـان کـوڕی عـەفان کـوژرا و لەگـەڵ عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب بەیعـەتیان کـرد و معاویـە دژایـەتی خـۆی ئاشـکرا کـرد و عـەمرۆ کـوڕی عـاس بەیعـەتی کـرد. دواتـر معاویـە و عـەمرۆ پێش ئەوەی قـەیس کـوڕی سـەعد بڕواتـە میسر، ڕوویان لەمیسر و محەممەد کوڕی حوزەیفە کرد. مەبەستیان بوو بڕۆنـە ناو سەرزەمینی میسر بەڵام نـەیانتوانی. ئەوەنـدە فێڵیـان لەگـەڵ محەممـەد کـوڕی حوزەیفـە بـەکار بـرد کەئـەو لەگـەڵ هەزارکـەس هاتـە عورەیـشی میـسر و لـەوێ سـەنگەری گـرت. عـەمرۆ کـوڕی عـاس دژی ئـەو مەنجـەنیقی بـەکار بـرد تـا ئـەوەی محەممــەد لەگــەڵ ســی کــەس لــەهاوەڵانی خــۆی هاتــەدەر. ئــەوانیان گــرت و کوشتیانن.

عـەباس کـوڕی سـەهلی سـاعدی دەڵێـت: محەممـەد کـوڕی بـاوکی حوزەیفـە عوتەبە کوڕی ڕەبیعە کوڕی شەمس کوڕی عەبدمەناف بوو خـەڵکانی میسری بۆ مەدینــە و کوشــتنی عوســمــان ڕەوانــە کــرد و کاتێــك ڕوویــان لەمەدینــە کــرد و گەمارۆیان خستە سـەر عوسمـان کـوڕی عـەفان، ئـەو لەمیسر هێرشـی کردە سـەر سەعد کوڕی ئەبی سەرح کەیەکێك لەمناڵەکانی عامر کوڕی لوئەی قورەشـی بـوو. ئەو، بەنوێنەرایەتی عوسمان کوڕی عەفان کارگوزاری میسر بوو. محەممەد ئەوی دەرکرد و پێشنوێژی کردنی خەڵکانی گرتە ئەستۆ.

دەڵێت: عەبدوڵڵا کوڕی سەعد کوڕی باوکی سەرح لەمیسر هاتەدەر و لەنزیك سنوورەکانی میسر، هاوسنووری فەلەستین چاوەڕوان مایـەوە بۆ ئـەوەی بزانێـت عوسمـان کـوڕی عـەفان چـی بەسـەر دێـت تـا ئـەوەی سوارێك هـات و وتـی: ئـەی

بەندەی خوا، دەنگ و باس چییە؟ هەواڵەکانم بۆ باس بکە.

وتی: دەڵێم موسوڵمانان عوسمانیان کوشت.

عەبدواللە کوڕی سەعد انا للەی هێنایە سەرزمان و پرسی: ئەی بەندەی خوا، دوای ئەوە چییان کرد؟

وتی: دوای ئەوە لەگەڵ کورە مامی پێغەمبەر (د.خ)، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەست.

عەبدواللە دووبارە انا للەی هێنایە سەرزمان.

ئەو پیاوە پێی وت: خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەبڕوای تۆ هاوشێوەی کوشتنی عوسمانە؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: پیاوەکە سەیری کرد و ناسییەوە، وتی: دەڵێی عەبدواللە کوڕی سەعد کوڕی باوکی سەرحیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەگەر گیانی خۆت خۆش دەوێت رابکە چوونکە سەروەری باوەڕداران مەبەستی کوشتنی تۆ و هاوەڵانی تۆی هەیە، ئەگەر بتانگرێت یا دەتانکوژێت یا لەسنووری موسوڵمانان دەرتان دەکات، هەنووکە ئەمیر لەدوای منەوەیە و بەدوای ئێوەدا دێت.

عەبدواللە وتی: ئەم ئەمیرە کێیە؟

وتی: قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادەی ئەنساری.

عەبدواللە وتی: خواوەند محەممەد کوڕی باوکی حوزەیفە بەنەحلەت بکات کە لەکوڕە مامەکەی خۆی یاخی بوو لەکاتێکدا سەرپەرەست و بەخێوکەری بوو، چاکەی لەگەڵ کرد بەلام ئەو وەلامی نەدایەوە و هێرشی کردە سەر کارگوزارەکانی و کەسانی بۆ نەیاری کردنی ئەو هاندا و ڕەوانەی کردن تا ئەوەی کوشتیان. ئەوسا کەسێك خەلافەتی گرتەدەست کە لەو و عوسمان دوور بوو و یەکسان و یەك مانگ حکومەتی ویلایەتی بەونەدا و ئەوی بەشیاوی ئەم کارە نەزانی.

ئەو پیاوە وتی: رابکە بۆ ئەوەی نەکوژرێیت.

عەبدوالله کوڕی سەعد هەلات و ڕۆشتە دیمەشق بۆ لای معاویە کوڕی ئەبی سوفیان.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەم گێڕانەوەیە ئاشکرای دەکات ئەو کاتەی قەیس کوڕی سەعد فەرمانڕەوای میسر بوو، محەممەد کوڕی باوکی حوزەیفە هێشتا زیندوو بوو.

سەهل کوڕی سەعد دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب خەلافەتی گرتەدەست، قەیس کوڕی سەعدی ئەنساری بانگ کرد و وتی: بەرەو میسر بەرێکەوە چوونکە تۆم وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دیاری کردووە. برۆ ئەو سەرزەمینە و کەسانی بڕواپێکراوی خۆت لەگەڵ خۆت ببە تا ئەو کاتەی دەگەیتە میسر، سوپایەکەت لەبەردەستا بێت چوونکە ئەمە دەبێتە هۆی ترسی دوژمن و بەهێز بوونی دۆست. بەخواستی خوا ئەگەر گەشتیتە ئەو سەرزەمینە، بەچاکەکاری چاکە لەگەڵ خەڵکان بکە و لەگەڵ گومانداەرەکان بەتوندترین شێوە بجوڵێرەوە. لەگەڵ خەڵکان بەگشتی رێگەی سازگاری بگەربەر چوونکە سازان هۆکاری شکۆ و مەزنییە.

قەیس وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران خوا لێت خۆش بێت، لەمەبەستەکەت گەیشتم، ئەوەی دەڵێی لەگەڵ سوپایەك بەرەو میسر بڕۆم، سوێند بەخوا ئەگەر دەبێت سوپایەك لەمەدینەوە ببەم، هیچ کات ناڕۆمە ئەو سەرزەمینە و ئەم سوپایە بۆ تۆ بەجێدێڵم تا ئەگەر پێویستت پێیان بوو، لەبەردەستی تۆدابن و ئەگەر مەبەستی ئەوەت کرد بۆ شوێنێکیان بنێریت، هۆکارێك بن بۆ هاوکاری کردنی تۆ. خۆم و بنەماڵەکەم دەڕۆینە ئەو سەرزەمینە. ئەوەی پێشنیاری چاکەکاریم پێدەکەیت دەبێت لەخواوەند بۆ ئەم مەبەستە داوای هاوکاری بکەم.

دەڵێت: قەیس لەگەڵ حەوت کەس لەهاوەڵانی خۆی بەرێکەوت و گەیشتە میسر، ڕۆشتە سەر مینبەر، دانیشت و وتی: نامەی سەروەری باوەڕداران بۆ خەڵکان بخوێننەوە.

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بۆ هەرکەسێك لەباوەڕداران و موسوڵمانان کەئەم نامەی بەدەست دەگات، سڵاو لەئێوە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە.

بەڵام دواتر، خواوەند بەهۆی چارەئەندێشی و چارەنووسێکی باشتر، ئیسلامی کردە دینی خۆی و فریشتەکان و پێغەمبەران و پێغەمبەرانی بۆ ڕێنوێنی کردنی خەڵکان ڕەوانە کرد و ئەوانی لەناو باشترینی خەڵکان هەڵبژارد. یەکێك لەو گەورەییانەی خواوەند بەم ئۆمەتەی بەخشی ئەوە بوو کە پێغەمبەری بۆ لای ئەوان نارد کەکتێب و حکمەت و ئەرك و سوونەتە دینییەکانی فێر کردین بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت و کۆی کردینەوە بۆ ئەوەی پەرژوبڵاو نەبین، ڕێگەی نیشاندایین تا خۆمان پاك و خاوێن ڕابگرین و ڕێزی گرتین بۆ ئەوەی ستەم نەکەینە پیشە، کاتێك ئەرکەکەی خۆی بەسەر برد، خواوەند ئەوی بۆ لای خۆی بردەوە، دوواتر موسوڵمانان دوو خەلیفەی شیاویان کردە جێگرەوەی ئەو کە بەپێی کتێب و سوونەت کردەوەکانیان ئەنجامدا و فەرمانڕەوایی موسوڵمانانیان کرد. هەردووکیان چاکەکار و هیچ سنوورێکیان نەبەزاند. دواتر خواوەند ئەوانیشی بۆلای خۆی گەڕاندەوە. دووای ئەوان کەسێك خەلافەتی گرتەدەست کەکار و کردەوە کەم وێنەکانی لێ بینرا و خەڵکان دژی ئەو ڕاپەڕین و ڕەخنەیان لێگرت. دوای کوشتنی ئەو، ڕوویان کردە من و بەیعەتیان لەگەڵ کردم. هەنووکە لەخوا دەپاڕێمەوە بەخششەکانی خۆی بەمن ببەخشێت و بۆ خواپەرەستی و چاکەکاری هاوکاریم بکات. ئەرکی سەرشانی ئێمەیە بەپێی نوسراوی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرمانڕەوایەتی ئێوە بکەین، ماف و ڕاستییەکان زیندووەو بکەینەوە و چاکەخوازی ئێوە بین. بۆ ئەم مەبەستە داوای هاوکاری لەخوا دەکەین چوونکە باشترین پەناگە و پاڵپشتی باوەڕدارانە.

من، قەیس کوڕی سەعدم وەك فەرمانڕەوای ئێوە ڕەوانە کرد. پشتیوان و هاریکاری بن و بۆ مەبەستەکەی هاوکاری بکەن، فەرمانم پێداوە ڕێگەی چاکەکاری بگرێتەبەر و لەگەڵ گوماندراران بەشێوەیەکی توند بجووڵێتەوە و لەگەڵ خەڵکان بەگشتی ڕێگەی سازان بگرێتەبەر. ئەو یەکێکە لەو کەسانەی

کردەوەکانی پەسەند دەکەم و بەچاکەکاری و چاکەخوازی ئەو هیوادارم. لەخواوەند بۆ خۆم و بۆ ئێوە داوای بەخشش دەکەم. سڵاو و رەحمەتی خواوەند لەئێوە بێت.

عەبدوڵلا کوڕی رافیع نامەکەی نووسی لەمانگی سەفەری ساڵی سی و شەش))

دەڵێت: دووای خوێندنەوەی نامەکە قەیس کوڕی سەعد وتارێکی پێشکەش کرد. سەرەتا ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و سڵاوی بۆ پێغەمبەر (د.خ) نارد، وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی راستییەکانی هێنا و چەوتییەکانی سڕییەوە و ستەمکارانی لەناو برد، ئەی خەڵکینە، لەگەڵ باشترین کەس کەدوای محەممەدی پێغەمبەر (د.خ)، دەیناسین، بەیعەتمان کرد. ئێوەیش هەستن و لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) بەیعەت بکەن و ئەگەر ئەرك و بەڵێنەکانی خۆمان نەبردەسەر، بەیعەتی ئێمە لەملی ئێوەدا نییە.

دەڵێت: خەڵك هەستان و بەیعەتیان کرد و بەم شێوەیە کاروباری میسر سەقامگیر بوو. کارگوزارەکانی خۆی بۆهەموو ناوچەکان ڕەوانە کرد جگە لەیەك گوند بەناوی خەربتا. کەسانێك لەوێ بوون کە کوژرانی عوسمان کوڕی عەفانیان بەکارێکی قێزەون لەقەڵەم دەدا. کەسێك لەخەڵکانی مەدلەجی مناڵەکانی کەنانە بەناوی یەزید کوڕی حارس لەوێ بوو. ئەو، لەتیرەی مناڵەکانی حارس کوڕی مەدلەج بوو. ئەم دەستەیە کەسیان بۆ لای سەعد کوڕی قەیس نارد و رایانەگەیاند: ئێمە لەگەڵ تۆ ناجەنگین، کارگوزارەکەی خۆت ڕەوانە بکە چوونکە سەرزەمین، سەرزەمینی تۆیە بەڵام کارتان بەئێمە نەبێت تا بزانین بارودۆخ بەکوێ دەگات و سەرئەنجامی کاروباری موسوڵمانان چی دەبێت.

دەڵێت: لەو کاتەدا مەسلەمە کوڕی موخەلەدی ئەنساری لەتایەفەی قەیس کوڕی سەعد، یانی مناڵەکانی ساعیدە، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ناوی عوسمانی هێنایە سەرزمان و پێشنیاری تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەوی کرد.

دەڵێت: قەیس کەسی بۆ لای ئەو نارد کەهاوار لەتۆ! دژی من شۆڕش دەکەیت سوێند بەخوا ئەگەر حکومەتی شام و میسر بەمن بدەن حەز بەکوشتنی

تۆ ناکەم.

مەسلەمە کەسی بۆ لای ئەو نارد و وتی: تا ئەو کاتەی فەرمانڕەوای میسر بیت، دەستی خەڵکان لەتۆ دوور دەکەمەوە.

دەڵێت: قەیس کوڕی سەعد پیاوێکی دوورئەندێش و بەڕێوەبەر بوو، کەسی بۆ لای ئەو دەستەیەی لەخەرەبتا بوون، ڕەوانە کرد و پەیامی بۆ ناردن: بۆ بەیعەت ناچارتان ناکەم و دەست لەکاروباری ئێوە نادەم، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان مۆر کرد، هەروەها لەگەڵ مەسلەمە کوڕی موخەلەدیش پەیمانی ئاشتی مۆر کرد و دەستی بەکۆکردنەوەی خەراج کرد و لەمیسر کەس نەیاری نەبوو.

دەڵێت: ئەوکات عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕووی کردە هاوەڵانی وشتر و قەیس بەهەمان شێوە کارگوازری میسر بوو. دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەسرەوە ڕووی کردە کوفە و قەیس بەهەمان شێوە فەرمانڕەوای میسر بوو. ئەمە بۆ معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لەهەموو شتێك ناخۆشتر بوو لەبەر ئەوەی میسر لەشامەوە نزیك و معاویە دەترسا عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ خەڵکانی عێراق رووبکاتە شام و قەیس کوڕی سەعدیش لەگەڵ خەڵکانی میسر بێت و بەمشێوەیە لەنێوان هەردووکیاندا گرفتار ببێت.

بەمشێوەیە معاویە نامەیەکی بۆ قەیس کوڕی سەعد نووسی. لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکوفە بوو و هێشتا شەڕی سەفین دەستی پێنەکردبوو، لەنامەکەدا نووسی:

((لەمعاویە کوڕی ئەبو سوفیان

بۆ قەیس کوڕی سەعد

سلاو لەتۆ. بەلام دواتر، ئەگەر ڕەخنەتان لەعوسمان کوڕی عەفان گرت کەجیاوازی لەنێوان موسوڵمانان‌دا دەکرد، یا قامچی لەخەڵکان دەدا یا ئیهانەی کەسێکی کرد یا کەسێکی دوورخستبوویەوە، یا گەنجەکانی بۆ کاروبارەکان ڕادەسپارد، ئەگەر بتانەوێت بزانن، دەزانن خوێنی بۆ ئێوە حەڵاڵ نەبوو. کارێکی مەترسیدارتان ئەنجامدا و کردەوەیەکی قێزەونتان لێ وەشایەوە. کەواتە ئەی قەیس! کوڕی سەعد، ئەگەر لەکوشتنی باوەڕدار، تۆبە سوودی هەبێت، تۆبە بۆ

دەرگای خواوەند بەرز بکەرەوە چوونکە یەکێك بوویت لەوکەسانەی خەڵکت دژی عوسمان کوڕی عەفان هاندەدا، بەدڵنیاییەوە دەزانین هاوڕێکەی تۆ خەڵکی دژی عوسمان راپەڕاند و بۆ کوشتنی ئەو هانیدان تا ئەوەی کوشتیان و زۆربەی خەڵکان لەتۆڵە سەندنەوەی خوێنی ئەو، خۆیان بەدوور گرت. ئەی قەیس! ئەگەر دەتوانی یەکێك بە لەو کەسانەی داوای خوێنی عوسمان دەکەن و شوێنکەوتەی ئێمە بە، ئەگەر سەرکەوتم تا ئەو کاتەی زیندووم، حکومەتی دوو عێراق بۆ تۆبێت و تا ئەو کاتەی زیندوو بم و دەسەلاٌتم هەبێت، فەرمانڕەوای حیجاز بۆ یەکێك لەبنەماڵەکەی تۆ بێت. جگە لەوە، هەرچی دەخوازیت، داوا بکە چوونکە هەموو مەبەستەکانت دەهێنمەدی. سەبارەت بەوەی نووسیم، لەبۆچوونی خۆت ئاگادارم بکەرەوە. والسلام.))

کاتێك نامەی معاویە بەقەیس گەیشت، ویستی کەمێك وەلاٌمەکە دوا بخات و مەبەستەکەی خۆی ئاشکرا نەکات بۆ ئەوەی معاویە بۆ جەنگان و هێرش کردنە سەر میسر، نەکەوێتە پەلەپەلٌ. وەلاٌمی بۆ دایەوە:

((بەلاٌم دواتر، نامەکەی تۆ بەمن گەیشت و ئەوەی سەبارەت بەکوشتنی عوسمان ئاماژەت پێدا، تێگەیشتم. من ئەو کارەم نەکردووە و لێی نزیك نەکەوتوومەتەوە. نوسیبووت هاوڕێکەی من خەڵکانی دژی عوسمان هانداوە بۆ ئەوەی بیکوژن و خوێنی بڕێژن، لەم کارە ئاگادار نەبووم. نووسیوتە زۆربەی هۆزەکەی من داوای خوێنی عوسمان کوڕی عەفان ناکەن، یەکەم کەسان کەداوای خوێنی عوسمانیان کرد، هۆزەکەی من بوون. دەتەوێت بێمە لای تۆ و پێشنیاری پاداشتێکت پێ کردبووم، پێویستە لەم کارە ئەندێشە بکەم چوونکە ناکرێت بەپەلەپەل بڕیاری لەسەر بدرێت. من رێگە نادەم خەڵکان هێرش بکەنە سەرتۆ و لەلایەن منەوە هیچ شتێکی ناسازگار نابینیت، بەخواستی خوا. دەبێت پشت بەخوا ببەستیت. سلاٌو و رەحمەتی خوا لەتۆ بێت.))

دەڵێت: کاتێك معاویە نامەکەی خوێندەوە، گومانی کرد سەعد لێی نزیك دەبێتەوە و دوور دەکەوێتەوە، ترسا فێلٌ و تەڵەکە لەئارادا بێت و دووبارە نامەیەکی بۆ نووسی:

((نامەکەی تۆم خوێندەوە، نەنزیك بوویتەوە تا هەست بەئاشتی بکەم نە ئەوەی خۆت بەدوور گرتووە تا هەست بەجەنگ بکەم. لەم کارەدا وەك چەناکەی وشتر هەڵواسراوییت. کەسێکی هاوشێوەی من کەسوپای و جڵەوی ئەسپی لەبەردەستایە، لەگەڵ فریوباز رێگەی سازان ناگرێتەبەر و فریو ناخوات، بەخواستی خوا.))

کاتێك قەیس نامەکەی معاویەی خوێندەوە و زانی فریو ناخوات، مەبەستی ناخی خۆی ئاشکرا کرد و نامەیەکی بۆ نووسی، بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەقەیس کوڕی سەعد

بۆ معاویە کوڕی ئەبی سوفیان

بەڵام دواتر، سەیرە دەخوازیت من فریو بدەیت و تەماح لەمندا دروست بکەیت و گرنگی بەبۆچوونی من نادەیت، دەخوازیت من لەشوێنکەوتن و گوێڕایەڵی کەسێك کەلەهەموو خەڵکان زیاتر شیاوی خەلافەت و فەرمانڕەوایەتییە و بوێرانەتر لەهەموان راستییەکان دێنێتە سەرزمان و رێگەکەی روونترە و لەپێغەمبەری خواوەند نزیکترە، دوور بخەیتەوە و بمکەیتە شوێنکەوتەی خۆت کە لەهەموو کەسان بۆ ئەم کارە نەشیاوتر و زیاتر لەهەموان ناراستییەکان دێنێتە سەرزمان و گومراترینی خەڵکانیت و لەخواوەند و پێغەمبەر (د.خ) دووریت. تۆ منداڵی دوو گومڕای گومڕاکەریت کە لەیاخییانی سوپاکەی ئیبلیسن. بەڵام ئەوەی دەڵێی میسر لەسوار و پیادە پڕ دەکەیت، سوێند بەخوا ئەگەر بەشێوەیەك گرفتارت نەکەم کەتەنیا لەبیری رزگار کردنی گیانی خۆتا بیت، بەختەوەریت. والسلام.))

کاتێك نامەکەی بەدەستی معاویە گەیشت، لەقەیس هیوابڕاو بوو و بوونی ئەوی لەمیسر بەناخۆش دەزانی.

زوهری دەڵێت: لەکاتی خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادە فەرمانڕەوای میسر بوو. ئەو لەرۆژگاری پێغەمبەر (د.خ) ئاڵاداری ئەنسارییەکان و پیاوێکی بەڕێوەبەر و کارزان بوو. معاویە کوڕی ئەبی

سوفیان و عەمرۆ کوڕی عاس هەوڵیان دەدا ئەو لەمیسر دەرپەڕێنن و دەست بەسەر میسردا بگرن بەلاّم بەهۆی چارەئەندێشی و فریو، خۆی لەفێڵ و فریوەکانی ئەوان بەدوور گرت و بەمشێوەیە نەیانتوانی دەست بەسەر میسردا بگرن. سەرئەنجام معاویە لەرێگەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە فریوی لەقەیس کرد.

دەڵێت: معاویە لەگەڵ کەسانێکی خاوەن ڕای قوڕەیش گفتوگۆی دەکرد و دەیوت: هیچ کات فێڵێکی سەرنج ڕاکێشتر لەو فێڵەی لەسەعدم کرد، نەکردووە، لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب کە لەعێراق بوو. کاتێك قەیس تەسلیمی من نەبوو، بەخەڵکی شامم وت: خراپەی قەیس کوڕی سەعد مەهێننە سەرزمان و کەسان بۆ جەنگی ئەو هان مەدەن چوونکە چاکەخوازی ئێمەیە و ئامۆژگارییەکانی ئێمە بەشێوەیەکی نهێنی بەدەستی دەگات، مەگەر کردەوە و هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ براکانتان لەخەرەبتا نابینن کەمانگانەیان پێدەدات و دەیانپارێزێت و هەرکەس لێرەوە رووبکاتە میسر، چاکەکاری لەگەڵ دەکات و هیچ ئازارێکی پێ ناگات.

معاویە دەڵێت: دەمویست ئەمە بۆ لایەنگرانی خۆم لەعێراق بنووسم تا سیخوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەعێراق و شام بیبیستن.

دەڵێت: ئەم هەواڵە بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب ئەم هەواڵەیان پێگەیاند و کاتێك ئەمەی بیست، دڵی لەقەیس ڕەش بوو. نامەی بۆ نووسی تا شەڕ لەگەڵ خەڵکانی خەرەبتا بکات. لەو کاتەدا خەڵکانی خەرەبتا دە هەزار کەس بوون، قەیس لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەوان خۆی بەدوور گرت و نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی کەئەوان سەرکردەکان و گەورەکان و بڕواپێکراوانی میسرن و بەمە دڵخۆشن کە خەڵکەکەیان لەئەماندا بێت و من مانگانەیان بدەم. هەستم بەوە کرد خوازیارن شوێن معاویە بکەون، هیچ فریوێك ئاسانتر لەکارەکەی من نییە، ئەگەر بۆ جەنگی ئەوان بڕۆن، دەتوانن خۆڕاگری و بەرابەری لەگەڵ من بکەن چوونکە سەرکردەکانی عەرەبن و لەناویان بوسر کوڕی ئەرتات و مەسلەمە کوڕی

موخەلید و معاویە کوڕی حەدیج دەبینرێن. مۆڵەت بەمن بدە چوونکە باشتر دەزانم چۆن لەگەڵ ئەوان بسازێم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێداگری کرد تا قەیس لەگەڵ ئەوان بجەنگێت بەڵام قەیس رازی نەبوو. قەیس نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی ئەگەر لەمن ڕەشبینیت، من لەسەر کار لابە و کەسێکی دیکە ڕەوانە بکە.

عەلی، مالکی ئەشتەری وەك فەرمانڕەوای میسر ڕەوانە کرد و کاتێك گەیشتە قەلزەم، شەربەتی هەنگوینی خوارد کەبووە هۆی کوژرانی ئەو. کاتێك معاویە و عەمرۆ لەم ڕووداوە ئاگادار بوونەوە، عەمرۆ وتی: خواوەند سوپایەکی لەهەنگوین هەیە.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمردنی ئەشتەر ئاگادار بوویەوە، محەممەد کوڕی ئەبی بەکری وەك فەرمانڕەوای میسر ڕەوانە کرد.

بەڵام گێڕانەوەی هوشام کوڕی محەممەد بەمشێوەیە کەدەڵێت: دوای ئەوەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەمیسر لەناوچوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری وەك فەرمانڕەوای میسر نارد.

سەهل کوڕی سەعد دەڵێت: کاتێك معاویە لەگوێرایەڵی قەیس بێ هیوا بوو، نیگەران و ترسا چوونکە بوێری و دوورئەندێشی ئەوی دەزانی. واینیشانی کەسانی نزیکی خۆیدا کەقەیس شوێنەکەوتەی ئەوانە و داوای کرد بۆی بپارێنەوە و یەکەم نامەی قەیس کەکەمێك نەرمی نواندبوو، بۆ ئەوان خوێندەوە.

دەڵێت: معاویە نامەیەکی لەزمانی قەیس کوڕی سەعدەوە نووسی و بۆ خەڵکانی شامی خوێندەوە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بۆ فەرمانڕەوا معاویە کوڕی ئەبی سوفیان

لەقیس کوڕی سەعد

سڵاو لەتۆ و سپاسی خواوەند دەکەم چوونکە جگە لەو خوایەك نییە. کاتێك ئەندێشەم کرد دڵنیا بووم پشتیوانی کردن لەو خەڵکەی پێشەوا و ئیمامی موسوڵمانانیان کوشتووە، ئەگەری نییە. لەخواوەند بۆ بەخشینی گوناحەکانی

خۆم داوای بەخشش دەکەم و دەخوازم دینەکەمان بپارێزێت. دڵنیابە من ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئێوە دەگرمەبەر و بەبانگەوازەکەی تۆ بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان رازی دەبم، لەماڵ و پیاوی شەڕکەر، هەرچەند دەخوازیت، داوا بکە تا بیخەمە بەردەستی تۆ. والسلام))

دەڵێت: لەناو خەڵکی شام بڵاو بوویەوە کەقەیس کوڕی سەعد بەیعەتی لەگەڵ معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بەستووە و سیخوڕەکان ئەم هەواڵەیان بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیاند. ئەو، سەریسوڕما و مناڵەکانی خۆی بانگ کرد، هەروەها عەبدوالله کوڕی جەعفەریش و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

عەبدوالله کوڕی جەعفەر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران کەسێك کەلێیان دڵنیاییت وەك فەرمانڕەوا دیاری بکە و ئەو کەسەی گومانت لێی هەیە، لەسەر کار لایببە، قەیس لەفەرمانڕەوایی میسر دوور بخەرەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: سوێند بەخوا باوەڕ بەو قسانە ناکەم.

عەبدوالله وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو لەسەر کار لاببە، سوێند بەخوا ئەگەر راست بێت، دەست لەکارەکەی هەڵناگرێت.

دەڵێت: لەو کاتەدا نامەیەکیان لەقەیس کوڕی سەعد بەدەست گەیشت بەم ناوەرۆکە:

((بەڵام دواتر، سەروەری باوەڕداران ئاگادار دەکەمەوە کە لێرە کەسانێك دەژین خۆیان بەدوور گرتووە و داویان لەمن کردووە، دەست لەکاروباریان وەرنەدەم تا ئەو کاتەی بارودۆخی موسوڵمانان سەقامگیر دەبێت و ئێمە ئەندێشە دەکەین و ئەوانیش بەهەمان شێوە. بۆچوونی من ئەوەیە دەستیان لێ هەڵبگرم و بۆ جەنگ لەگەڵ ئەوان نەکەومە پەلەپەل، لەم ماوەدا بەشێوەیەکی چاك، هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکەم ئەگەری هەیە خواوەند دڵیان نەرم و ڕێگەی راستیان نیشان بدات و لەگومڕایی رزگاریان بکات، بەخواستی خوا.))

عەبدوالله کوڕی جەعفەر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران دەترسم ئەمە بەهۆی مەبەستەکەی قەیسەوە بێت، فەرمانی پێ بدە تا بجەنگێت.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ نووسی:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەڵام دواتر، هێرش بکە سەر ئەو خەڵکەی باست کردووە، ئەگەر پەیوەستی موسوڵمانان بوون، چ باشتر و گەرنە لەگەڵیان بجەنگە، بەخواستی خوا.))

دەڵێت: کاتێك نامەکەی بەدەستی قەیس کوڕی سەعد گەیشت و خوێندییەوە، نەیتوانی خۆی بگرێت و بەمشێوەیە وەڵامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی دایەوە:

((بەڵام دواتر، ئەی سەروەری باوەڕداران، لەفەرمانەکەی تۆ سەرم سوڕماوە، بەمن دەڵێی لەگەڵ ئەو کەسانەی نەیاری تۆ نین و بۆ جەنگ لەگەڵ دوژمنانت دەستی تۆیان ئاوەڵا کردووە، بجەنگم تا ئەو کاتەی لەگەڵ ئەوان دەجەنگیت، دژی تۆ هاوکاری دوژمنەکەت بکەن! ئەی سەروەری باوەڕداران، لەمن ببیستە و دەست لەوان هەڵگرە بۆچوونی راست ئەوەیە دەست لەوان هەڵگریت. بەخواستی خوا))

دەڵێت: کاتێك نامەکەی بەدەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، عەبدوالله کوڕی جەعفەر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر وەك فەرمانڕەوای میسر ڕەوانە بکە و قەیس لەسەر کار لاببە. سوێند بەخوا بیستوومە قەیس دەڵێت: حکومەتێك کەتەنیا بەکوشتنی مەسلیمە کوڕی موخەلەد سەقامگیر نەبێت، حکومەتێکی لاواز و خراپە. سوێند بەخوا حەز ناکەم فەرمانڕەوایەتی شام تا میسر لەدەستی مندا بێت و کوڕی موخەلەد بکوژم.))

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی جەعفەر لەدایکەوە برای محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب، محەممەد کوڕی ئەبی بەکری وەك فەرمانڕەوای میسر ڕەوانە کرد و قەیسی لەسەر کار لابرد.

## فەرمانڕەوایەتی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەمیسر

حارس کوڕی کەعبی والبی ئەزدی لەباوکی دەگێڕێتەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاوڕێ لەگەڵ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر نامەیەکی بۆ خەڵکانی میسر نووسی و کاتێك نامەکەی بەقەیسدا وتی: سەروەری باوەڕداران چی بەسەر دێت، چ شتێك ئەوی گۆڕیوە، ئایا کەسێك کەوتۆتە نێوانمان؟

وتی: نا، ئەم حکومەتە حکومەتی تۆیە.

وتی: نا سوێند بەخوا یەك کاژێر لەگەڵ تۆدا نامێنمەوە، لەسەر کار لابرانی خۆی تورە بوو و لەمیسر ڕۆشتەدەر و ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە مەدینە، حسان کوڕی سابت بۆ سەرکۆنە کردن ڕۆشتە لای. حسان شوێنکەوتەی عوسمان بوو، پێی وت: عوسمانت کوشت و عەلی لەسەر کار لایبردیت، گوناحەکە لەئەستۆی تۆدا دەمێنێتەوە و کەس ڕێزی لێنەگرتیت.

قەیس کوڕی سەعد پێی وت: ئەی دڵکوێری دڵ ڕەش، سوێند بەخوا ئەگەر لەترسی دروست بوونی جەنگ لەنێوان هۆزەکەی من و تۆ نەدەبوو، دەمکوشتی، برۆ.

دەڵێت: قەیس لەگەڵ سەهل کوڕی حەنیف ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و قەیس لەپێشهاتەکان ئاگاداری کردەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتەکانی پشتڕاست کردەوە. دوای ئەوە قەیس و سەهل شان بەشانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەشداری جەنگی سەفینیان کرد.

زوهری دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕووی کردە میسر و قەیس میسری بەجێهێشت و ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر. مەروان و ئەسوەد کوڕی باوکی بەختەری هەڕەشەیان لێکرد و ترسا بیگرن و بیکوژن. سوار چوارپێکەی بوو و بەرەو لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت.

معاویە کەسی بۆ لای مەروان و ئەسوەد نارد و توڕەیی خۆی نیشاندا، وتی: قەیس کوڕی سەعد و بۆچوون و پێگەی ئەوتان بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد. سوێند بەخوا ئەگەر سەد هەزار پیاوی شەڕکەرتان بۆ هاوکاری عەلی

دەنارد بەو ئەندازەیە منی توڕە نەدەکرد کە قەیستان بۆ لای عەلی نارد.

دەڵێت: قەیس ڕۆشتە لای عەلی و کاتێک بەسەرهاتەکەی بۆ باس کردەوە و هەواڵی کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری پێگەیشت، زانی قەیس بەدوور ئەندێشی بارودۆخی ڕاگرتووە و ئەو کەسەی ئەوی بۆ لەسەر کار لابردنی قەیس هانداوە، کەسێکی چاکەکار نەبووە. دوای ئەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەهەموو کارەکاندا ڕاوێژی بەقەیس دەکرد.

کەعبی والبی لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکرە هاتە میسر، هاوڕێیەتی ئەوم دەکرد. کاتێك هات، فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بۆ خەڵکان خوێندەوە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە فەرمانی بەندەی خوا عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەروەری باوەڕدارانە بۆ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئەو کاتەی ئەوی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان کرد. فەرمانی پێدەدات بەئاشکرا و نهێنی چاکەکار و شوێنکەوتەی فەرمانەکانی خواوەند بێت و لەخواوەند بترسێت. لەگەڵ موسوڵمانان ڕێگەی سازگاری بگرێتەبەر و لەگەڵ خراپەکار توندوتیژی و لەگەڵ شوێنکەوتەکانی ئیسلام (ناعەرەب) دادپەروەری بکاتە پیشە و لەگەڵ ستەمکار بەشێوەیەکی توند هەڵس و کەوت بکات و تا ئەو جێگەی دەتوانێت چاکەکاری لەگەڵ خەڵك بگرێتەبەر چوونکە خواوەند پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە و تاوانباران سزا دەدات.

هەروەها فەرمانی پێدەدا کەسانی سنوورەکەی خۆی بۆ پەیوەست بوون بەموسوڵمانان هانبدات چوونکە چاکەی ئەوانی تێدایە و پاداشتی گەورە چاوەڕوانیانە بەشێوەیەك ئەندازەکە و چۆنیەتییەکەی نازانن.

فەرمان دەدات خەراجی زەوی بەو ئەندازەیە وەربگرێت کەپێشتر وەریاندەگرت، هیچی لێ کەم نەکاتەوە و هیچی پێ زیاد نەکات. دواتر خەراج لەنێوان نیازمەندان دابەش بکات بەهەمان شێوە کەپێشتر دەیانکرد و لەگەڵ ئەوان نەرمی بنوێنێت و بەرابەری لەنێوان ئەوان سەقامگیر بکات بەشێوەیەك دوور و نزیك وەك یەك بن.

فـەرمان دەدات لـەنێوان خـەڵکان دادپـەروەری بکاتـە پیـشە و نەبێتـە شوێنکەوتەی هەوەسەکانی و بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند لەسەرکۆنەی سەرکۆنەکەر نەترسێت. خواوەند پشتیوانی کەسێکە خواپەرەستی بکاتە پیشە و پەرەستن و گوێرایەڵی ئەو بکاتە پێش گوێرایەڵی کردنی کەسانیتر.

عەبدوالله کوڕی باوکی رافیع کۆیلەی ئازاد کراوی پێغەمبەر (د.خ) لەمانگی رەمەزان نووسی.))

دەڵێـت: دوای ئـەوە محەممـەد کـوڕی ئـەبی بـەکر وتـارێکی پێـشکەش کـرد، سپاسـی خـوای کـرد، وتـی: سـپاس بـۆ ئـەو خوایـەی ئێمـە و ئێـوەی بـۆ ڕێگـەی راسـت رێنـوێنی کـرد و زۆربـەی ئـەو شـتانەی نەزانـەکان لـەبینینی کـوێر بـوون، نیـشانەی ئێمەیـدا. ئاگـادارین سـەروەری بـاوەڕداران کاروبارەکـانی ئێـوەی بـەمن سـپاردووە و بـەو شـێوەیە فـەرمانی پێـداوم کـە بیـستتان و پێـشنیاری زۆری پێکردووم و تا ئەو جێگەی بتوانم بۆ بەرژەوەندی ئێوە هەوڵ دەدەم و سەرکەوتن تـەنیا بـەهاوکاری و پشتیوانی خواوەنـد ئەگـەری دەبێـت، پـشت بەپـەروەردگار دەبەستم و بۆ لای ئـەو دەگەڕێمـەوە، ئەگـەر فەرمانڕەوایی و کردەوەکـانی منتـان لەسـەر بنـەمای فەرمانـەکانی خواوەنـد بینی، سپاسـی خواوەنـد بکـەن چوونکە رێنیشاندەرە و ئەگەر بینیتـان یـەکێك لـەکارگوزارەکانی مـن نافـەرمانی دەکـات و لەرێگـە لادەچێت، ئاگـادارم بکەنـەوە و سـەرکۆنەم بکـەن چـوونکە ئـەوەم زیـاتر پێخۆشە و ئێوە شیاوی ئەم کارەن. خواوەند بەرەحمەت و بەزەیی خۆی ئێمە بۆ ئەنجامدانی کردەوە باشەکان رێنوێنی بکات.

ئەمەی وت و هاتەخوار.

یەزید کوڕی زەبییانی هەمەدانی دەڵێت: محەممـەد کـوڕی ئـەبی بەکر، کاتێك فەرمانڕەوایـەتی میـسری گرتەدەسـت، نامـەی بـۆ معاویـە کـوڕی ئـەبی سـوفیان نووسی.

بێـژەری ئـەو قـسە ئامـاژەی بەنامـەکان داوە بـەلام مـن حـەز بەگێڕانـەوەی نامـەکان ناکـەم چـوونکە بابـەتی ئـەوتۆی تیـا نووسـراوە، شـیاوی خوێندنـەوەی خەڵکان نییە.

دەڵێت: یەك مانگ لەنیشتەجێ بوونی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر تێنەپەڕیبوو کەکەسی بۆ لای ئەو کەسانەی خۆیان بەدوور گرتبوو، نارد. ئەو دەستەی قەیس ڕێگەی سازانی لەگەڵ ئەوان گرتبووە بەر، وتی: ئەی خەڵکینە، یا شوێنکەوتەی فەرمانەکانی ئێمە بن یا ئەوەی سەرزەمینی ئێمە بەجێبێڵن.

ئەو دەستەیە وەڵامیان دایەوە. ئەو کارە ناکەین، ڕێگەمان بدە تا بزانین سەرئەنجامی کارەکانمان چی دەبێت و بۆ جەنگ دژی ئێمە پەلە مەکە.

بەڵام محەممەد رازی نەبوو، ئەوانیش سەرکێشیان کرد و لە محەممەد دەترسان و تا ئەو کاتەی جەنگی سەفین ڕوویدا، بەهەمان شێوە لە محەممەد دەترسان. کاتێك ئاگادار بوویەوە کەمعاویە و خەڵکانی شام لەبەرابەر عەلی خۆڕاگرییان کردووە و عەلی و خەڵکانی عێراق لەڕووبەڕوو بوونەوەی معاویە و خەڵکانی شام گەڕاونەتەوە و سەرئەنجامی کێشەکەیان بەداوەری کۆتایی هاتووە، لەبەرابەر محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بوێر بوون و شەڕیان دەستپێکرد.

دەڵێت: کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئەمەی بینی، حارس کوڕی جومهانی جوعەفی بۆ لای خەڵکانی خەرەبتا نارد. یەزید کوڕی حارسی کەنانی لەناو سوپاکەی ئەودا بوو. حارس لەگەڵ ئەوان جەنگی و کوژرا. محەممەد یەکێك لەخەڵکانی کەلبی بەناوی کوڕی موزاهیم ڕەوانە کرد کەئەویشیان کوشت.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەمساڵەدا وەك ئاماژەیان پێداوە ماهویەی سنووورداری مەرو ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەلی نووسراوێکی بۆ نووسی.

بۆ جووتیارەکانی مەرو و سوارچاکەکان و سوپاسالاران و خەڵکانی مەرو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندە و مێهرەبان

سڵاو لەوکەسەی شوێنکەوتەی رزگاری بێت، بەڵام دواتر، ماهویەی سنووردار هاتە لای من، لێی رازیم.

لەساڵی سی و شەش نووسرا.

دەڵێت: دواتر ئەو دەستەیە ناباوەڕ بوون و ئەبەر شەهریان داخست.

## ڕەوانە کردنی خولەید کوڕی تەریف لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ خوراسان

ئەسبەع کوڕی نوباتەی موجاشعی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، خولەیەد کوڕی قوڕەی یەربوعی و بەوتەیەك خولەید کوڕی تورەیفی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد.

## وتار سەبارەت بەعەمرۆ کوڕی عاس و بەیعەت کردنی لەگەڵ معاویە

لەمساڵەدا یانی ساڵی سی و شەشەم عەمرۆ کوڕی عاس بەیعەتی لەگەڵ معاویە کرد و بۆ دژایەتی کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، پەیمانیاندا.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کە لەگێڕانەوەی باوکی عوسمان و کەسانی دیکە ئاماژەی پێدراوە. بەمشێوە بوو: کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان، عەمرۆ کوڕی عاس لەمەدینەوە بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ شام بەرێکەوت و وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، سوێند بەخوا هەر کەس لەمەدینەدا بێت و عوسمان کوڕی عەفان بکوژرێت، خواوەند ئەو بەریسوایی ئەو کەسانەی نەیانتوانی هاوکاری بکەن، گرفتار دەکات. دەبێت ڕابکەین.

دەڵێت: عەمرۆ ڕۆشت و دوو کوڕەکەی عەبدوالله و محەممەد هاوڕێیەتیان دەکرد. دوای ئەو، حەسان کوڕی سابتیش بەرێکەوت و کەسانی دیکە دوای ئەوان ملی ڕێگەیان گرتەبەر.

باوکی عوسمان دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس لەعیجلان دانیشتبوو، دوو کوڕەکەی لەگەڵدا بوون، سوارێك لای ئەوان تێپەڕی.

وتیان: لەکوێوە دێیت؟

وتی: لەمەدینە.

عەمرۆ وتی: ناوت چییە؟

وتی: حەسیرە.

وتی: گەمارۆیان خستۆتە سەر عوسمان کوڕی عەفان؟

وتی: چ هەواڵێکت پێیە؟

وتی: ئەو پیاوە گەمارۆی لەسەر بوو.

عەمرۆ وتی: دەکوژرێت.

دەڵێت: چەند رۆژێك تێپەڕی و سوارێکی دیکە لای ئەوان گوزەری کرد.

وتیان: لەکوێوە دێیت؟

وتی: لەمەدینە.

عەمرۆ وتی: ناوت چییە؟

وتی: قتال.

عەمرۆ وتی: ئەو پیاوە کوژرا، دەنگ و باس چییە.

وتی: عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و تا ئەو کاتەی من هاتم، هیچ دەنگ و باسێکی دیکە لەئارادا نەبوو.

دەڵێت: چەند رۆژێکی دیکە تێپەڕی و سوارێکی دیکە لای ئەوان گوزەری کرد.

وتیان: لەکوێوە دێیت؟

وتی: لەمەدینە.

عەمرۆ وتی: ناوت چییە؟

وتی: حەرب.

عەمرۆ وتی: جەنگ دەست پێدەکات. دەنگ و باس چییە؟

وتی: عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان کرد.

وتی: بەمن دەڵێن باوکی عەبدوالله، جەنگ روودەدات و لەکاتی جەنگ، دەست لەهەر دومەڵێك بدەیت، سەردەکاتەوە، خواوەند عوسمان ببەخشێت و لێی رازی بێت.

دەڵێت: سەلامە کوڕی زەنباعی جوزامی وتی: ئەی قورەیشییەکان لەنێوان ئێوە و عەرەبەکان دەرگایەك بوو، هەنووکە ئەو دەرگایە شکا، بەدوای دەرگایەکی دیکەدا بگەڕێن.

عەمرۆ وتی: ئەوە مەبەستی ئێمەیە، چاك کردنەوەی دەرگاکە پێویستی

بەئامێرێکـــە تـــا راســـتییەکان لـــەناو گێـــژاوی جەنگـــدا دەربێنێـــت و خـــەڵك لەدادپەروەریدا هاوشێوەی یەك بن. دواتر هۆنراوەیەکی وەك نمونە خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئەی درێغ بۆ مالك

مەگەر درێغ، چارەنووس دەگۆڕێت

مەگەر گەرما لەناوی بردن تاچاوپان لێ بپۆشین

یاخەڵکەکەی من سەرخۆش بوون.))

دواتـر پیـادە بەرێکـەوت و هاوشـێوەی ژن دەگریـا، دەیـوت: ئـەی هـاوار بـۆ عوسمان، حەیا و دین لەناوچوو. درێژەی بەرێگەکەیدا تا گەیشتە دیمەشق.

دەڵێت: ئەو دەیتوانی پێشبینی پێشهاتەکانی داهاتوو بکات و بەپێی ئەوە دەجووڵایەوە.

باوکی عوسمـان دەڵێت: پێغەمبـەر (د.خ) عـەمرۆی بۆ عـەمان ناردبوو. لـەوێ لەیـەکێك لـەزاناکانی جوولەکـە شـتێکی بیسـت و تـا لـەوێ بـوو، راسـتی وتەکـەی زانای بۆ دەرکەوت. زاناکەی بانگ کرد و وتی: باسی مردنی پێغەمبەرم بۆ بکە و پێم بڵێ دوای ئەو کێ دەسەڵات دەگرێتەدەست؟

وتـی: ئـەو کەسـەی نامـەی بـۆ تـۆ نووسـی، دوای ئـەو دێتـە سـەر کـار بـەڵام ماوەکەی کورت دەبێت.

وتی: دوای ئەو؟

وتی: یەکێك لەخەڵکەکەی ئەو کە پێگەی هاوشێوەی یەکەمە.

وتی: ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی چەندە دەخایەنێت؟

وتی: ماوەیەکی زۆر و دوای ئەو دەکوژرێت.

وتی: بەشێوەیەکی لەناکاو یا ئەوەی بەئاگادار بوونی گشتی؟

وتی: بەشێوەیەکی لەناکاو.

وتی: دوای ئەو کێ دێتە سەرکار؟

وتی: کەسێکی دیکەی هاوشێوەی ئەو.

وتی: ماوەی خەلافەتی ئەو چەندە دەخایەنێت؟

وتی: ماوەیەکی زۆر و دواتر دەکوژرێت.

وتی: لەناکاو یا بەئاگادار بوونی خەڵك؟

وتی: بەئاگادار بوونی خەڵکان.

وتی: ئەمە کارەساتە. دوای ئەو کێ دەسەڵات دەگرێتە دەست؟

وتی: کەسێك کەخەڵك لەدەوری بڵاوەی لێدەکەن و لەسەردەمی ئەو جەنگێکی دژوار لەناو خەڵکان سەرهەڵدەدات و پێش ئەوەی خەڵکان لەدەوری کۆببنەوە، دەکوژرێت.

وتی: بەشێوەیەکی لەناکاو یا بەئاگادار بوونی هەمووان؟

وتی: بەشێوەیەکی لەناکاو و دوای ئەو، کەسی هاوشێوەی ئەوان دەسەڵات ناگرێتەدەست.

وتی: دوای ئەو کێ فەرمانڕەوایەتی دەکات؟

وتی: ئەمیری سەرزەمینی پیرۆز کەپاشایەتییەکەی درێژە دەکێشێت و خەڵکان لەدەوری ئەو کۆدەبنەوە و دواتر دەمرێت.

بەوتەی واقدی، کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس لەهەواڵی کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار بوویەوە، وتی: من باوکی عەبدوڵڵەم و لەوادی ئەلسەباع بووم و ئەوم کوشت، دوای ئەو کێ خەلافەت دەگرێتە دەست؟ ئەگەر تەڵحە ببێتە خەلیفە، بۆ بەخشش، جوامێری عەرەبە وئەگەر کوڕی ئەبی تالیب خەلافەت بگرێتەدەست، رێز لەراستییەکان دەگرێت، بەڵام حەز بەخەلافەتی ئەو ناکەم.

دەڵێت: دوای ئەوەی عەمرۆ ئاگادار بوویەوە خەڵکان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان کردووە، ئەم هەواڵەی پەسەند نەکرد. چەند رۆژێك چاوەڕوانی هەڵوێستی خەڵکانی کرد. ئاگادار بوویەوە تەڵحە و زوبەیر و عایشە بەرێکەوتوون و بەخۆی وت: چاوەڕێ دەبم تا بزانم دەرئەنجامی کارەکەی ئەوان چی دەبێت.

دواتر لەکوژرانی تەڵحە و زوبەیر ئاگادار بوویەوە و سەریسوڕما. کەسێك پێی وت: معاویە لەشامە و ناخوازێت بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکات. باشترە ببیتە هاودەستی معاویە.

دەڵێت: معاویەی زیاتر لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب خۆش دەویست. پێیان وت: معاویە کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان بەکارەسات و قێزەون لەقەڵەم دەدات و بانگەشەی تۆڵەسەندنەوەی ئەو دەکات.

عەمرۆ وتی: محەممەد و عەبدوالله بێنن بۆ لای من. کاتێك هاتن، وتی: بیستووتانە کەعوسمان کوژرا و خەڵکان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان کردووە و چاوەڕێ دەکرێت معاویە دژایەتی بکات. وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟ هیچ هیوایەکمان بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب نییە چوونکە پیاوێکە شانازی بەرابردووی خۆیەوە دەکات و هیچ کارێك بەمن ناسپێرێت.

عەبدوالله کوڕی عەمرۆ وتی: پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوایی کرد و لەتۆ رازی بوو، ئەبوبەکر کۆچی دووایی کرد و لەتۆ رازی بوو، عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد و لەتۆ رازی بوو، بۆچوونی من ئەوەیە دەست هەڵگرێت و لەماڵەوە دابنیشیت تا ئەو کاتەی خەڵکان لەسەر خەلیفەیەك یەکدەگرن.

محەممەد کوڕی عەمرۆ وتی: تۆ یەکێك لەسەرکردەکانی عەرەبیت و نابێت ئەم کارە سەربگرێت بێ ئەوەی قسە و کاریگەری تۆی پێوە دیار نەبێت.

عەمرۆ وتی: ئەی عەبدوالله! ئەوەی باسی دەکەیت بۆ ئەو دنیام باشترە و لەروانگەی دینییەوە تەندروستر، بەلاَم ئەی محەممەد، ئەوەی باسی دەکەیت بۆ ئەم دنیام باشترە و بۆ ئەو دنیام خراپتر.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس لەگەڵ دوو کوڕەکەی خۆی بەرێکەوت و ڕۆشتە لای معاویە و بینی معاویە خەڵك بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان هاندەدات. عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئێوە لەسەر راستین، تۆڵەی خوێنی خەلیفەی ستەملێکراو بستێنن.

لەم کاتەدا معاویە گرنگی بەوتەکەی عەمرۆ کوڕی عاس نەدا، دوو کوڕەکەی پێیان وت: مەگەر نابینی معاویە گرنگی بەوتەکانی تۆ نادات، بڕۆ لای کەسێکی دیکە.

دەڵێت: عەمرۆ ڕۆشتە لای معاویە و وتی: سوێند بەخوا سەیرە، بەمشێوەیە هاتوومەتە لای تۆ و تۆ گرنگی بەمن نادەیت، سوێند بەخوا ئەگەر شان بەشانی

تۆ بجەنگین، خوێنی خەلیفەمان دەوێت، بەڵام نیگەرانی ئەوەین دەبێت لەگەڵ کەسێك بجەنگین کە لەپێشی و چاکەکاری و رابردووی ئەو دەزانیت، مەبەستی ئێمە ئەم دنیایە. معاویە لەگەڵی رێککەوت و لێی نزیك بوویەوە.

## ڕەوانە کردنی جەریر کوڕی عەبدوڵڵەی بوجلی لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ لای معاویە و پێشنیاری ملکەچ بوونی ئەو

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکاتی گەڕانەوە لەبەسرە بۆ کوفە و کۆتایی هاتنی جەنگی جەمەل، جەریر کوڕی عەبدوڵڵەی بۆ لای معاویە نارد تا پێشنیاری بەیعەتی پێ بکات. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ جەنگی نەیارەکانی خۆی لەبەسرە ڕۆشت، جەریر لەهۆزی هەمەدان و کارگوزاری ئەو ناوچە بوو. عوسمان کوڕی عەفان ئەوی بۆ ئەم کارە راسپاردبوو. ئەشعەس کوڕی قەیس بەنوێنەرایەتی عوسمان کوڕی عەفان کارگوزاری ئازەربایەجان بوو. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەسرەوە بۆ کوفە گەڕایەوە، نامەی بۆ ئەوان نووسی و فەرمانی پێدان لەخەڵکی ناوچەکەی خۆیان بەیعەتی بۆ وەربگرن و دواتر بڕۆنە لای. ئەوان، بەیعەتیان لەخەڵکان وەرگرتن و ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب . کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب مەبەستی ئەوەی کرد کەسێك بۆلای معاویە بنێرێت، جەریر کوڕی عەبدوڵڵە وتی: من ڕەوانە بکە چوونکە هاورێی منە، با من بڕۆم و پێشنیاری بەیعەتی تۆی پێبکەم.

ئەشتەر بەعەلی وت: ئەو ڕەوانە مەکە چوونکە بەگومانی من خوازیاری پەیوەست بوون بەمعاویەیە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بابڕوات با بزانین دەرئەنجامی کارەکەی چی دەبێت. ئەوی بۆ لای معاویە نارد و نامەیەکی بۆ نووسی و لەرێککەوتنی موهاجیر و ئەنسارەکان و پەیمان شکێنی تەڵحە و زوبەیر و جەنگ لەگەڵ ئەوان ئاگاداری کردەوە و پێشنیاری بەمعاویە کرد هاوشێوەی موهاجیر و ئەنسارەکان شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بێت.

کاتێك جەریر ڕۆشتە لای معاویە، خۆی لەوەڵامدانەوە دەدزییەوە دەیوت

چاوەڕوان بێت. عەمرۆ کوڕی عاسی بانگ کرد و راوێژی لەگەڵ کرد. عەمرۆ وتی: کەس بۆ لای سەرکردەکانی شام بنێرە و خوێنی عوسمان کوڕی عەفان بخەرە ئەستۆی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەهاوکاری خەڵکانی شام لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بجەنگە. معاویە ئەوکارەی کرد.

بەپێی گێڕانەوەی محەممەد، بارودۆخی خەڵکانی شام بەمشێوە بوو کەنەعمان کوڕی بەشیر کراسەکەی عوسمان کوڕی عەفان کە لەکاتی کوژران لەبەریدا بوو و خوێناوی بوو و هەروەها پەنجەکانی نائیلە هاوسەری عوسمان کوڕی عەفانی - دو پەنجە و کەمێك لەبەرەدەست و دوو پەنجە لەبن و پەنجەی ناوەڕاست لەنیوەوە بڕابوویەوە- بۆ شام برد. معاویە کراسەکەی خستە سەرمینبەرەکە و هەواڵەکەی بۆ ویلایەتەکان نووسی. خەڵکان لەدەوری کراسەکە کۆبوونەوە و ساڵێك گریان. پیاوەکانی شام سوێندیان خوارد نەڕۆنە لای ژنەکانی خۆیان و بۆ (غوسڵ) ئاو لەخۆیان نەدەن مەگەر بەهۆی لەش پیسی و لەسەر جێگە نەخەون تا ئەو کاتەی بکوژەکانی عوسمان و هەموو ئەو کەسانەی پشتیوانیان لێدەکەن، دەکوژن یا لەم رێگەدا دەکوژرێن.

یەك ساڵ بەدەوری کراسەکەدا سووڕانەوە و هەموو رۆژێك دەیانخستە سەرمینبەرەکە، پەنجەکانی نائیلەیشیان لەوێ دانابوو. هەندێ کات کراسەکەیان دەشاردەوە و پەردەیەکیان پیا دەدا.

عەوانە دەڵێت: جەریر کوڕی عەبدوالله گەڕایەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و رێککەوتنی معاویە و خەڵکانی شامی بۆ جەنگ دژی ئەو، پێ راگەیاند و ئاگاداری کردەوە لەوەی بۆ عوسمان دەگرین و دەڵێن عەلی ئەوی کوشتووە و پەنای بەبکوژەکانی داوە و دەستی لێهەڵناگرن تا ئەو کاتەی بکوژەکانی عوسمان بکوژێت یا خۆیان بیانکوژن.

ئەشتەر بەعەلی وت: بەتۆم وت جەریر ڕەوانە نەکەیت و لەدوژمنی و دەغەڵکاری ئەو ئاگادارم کردیتەوە، ئەگەر منت ڕەوانە دەکرد باشتر لەو پیاوە بوو کەلای معاویە مایەوە تا ئەو کاتەی هەموو هیواکان لەناچوون و هەموو دەرگاکان داخران.

جەریر وتی: ئەگەر تۆ دەڕۆشتیت، دەیانکوشتیت چوونکە تۆیش لەیەکێك لەبکوژەکانی عوسمان دەزانن.

ئەشتەر وتی: ئەی جەریر، سوێند بەخوا ئەگەر من ڕۆشتبوومە لای ئەوان، چاوەڕوانی وەڵامم نەدەکرد و کارێکم دەکرد معاویە دەرفەتی بیرکردنەوەی نەبێت، ئەگەر سەروەری باوەڕداران گوێی لەبۆچوونەکەی من دەگرت تۆ و کەسانی وەك تۆی لەزینداندا دەهێشتەوە و ڕێگەی هاتنەدەرەوەی پێنەدەدان تا بارودۆخ سەقامگیر ببێت.

جەریر کوڕی عەبدوالله ڕووی کردە قرقیسیا و نامەی بۆ معاویە نووسی و ئەویش وەڵامی دایەوە وداوای لێکرد بڕواتە لای. سەروەری باوەڕدارانیش بەڕێکەوت و لەنوخەیلە ئوردووی لێدا و عەبدوالله کوڕی عەباس لەگەڵ ئەو دەستە لەخەڵکانی بەسرە کەهاوڕێیەتی ئەویان دەکرد، ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

## بەڕێکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەو سەفین

ئەبوبەکری هوزەلی دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب، عەبدوالله کوڕی عەباسی لەبەسرە وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و لەوێوە بەرەو کوفە بەڕێکەوت و بۆ ڕۆشتن بۆ سەفین خۆی ئامادە دەکرد، لەگەڵ کەسانی دەوروبەری راوێژی کرد. دەستەیەکیان وتیان سوپایەك بنێرێت و خۆی بمێنێتەوە و دەستەیەکی دیکە وتیان خۆی بڕوات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب خۆی بەڕۆشتن رازی بوو و کەسانی کۆکردەوە.

دەڵێت: ئەم هەواڵە بەمعاویە گەیشت و عەمرۆ کوڕی عاسی بانگ و راوێژی پێکرد.

عەمرۆ وتی: ئێستا کەئاگادار بوویتەوە ئەو خۆی بەرێدەکەوێت، تۆیش خۆت بەڕێکەوە و کەڵك لەبیر و چارەسەر و دوورئەندێشییەکانی خۆت وەربگرە.

معاویە وتی: ئەی باوکی عەبدوالله ئەو کارە دەکەم و سەرقاڵی کۆکردنەوەی خەڵکان بوو. عەمرۆ ڕۆشت و خەڵکانی هاندەدا و عەلی و هاوەڵانی ئەوی بەکەم

لەقەڵەم دەدا و دەیوت خەڵکانی عێراق پرژ و بڵاو بوونەتەوە و مەزنی خۆیان لەدەست داوە و بڵاوەیان بەهێزەکانی خۆیانیان کردووە، خەڵکانی بەسرەیش نەیاری عەلین چوونکە ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشتووە. لەجەنگی جەمەل سەردارانی خەڵکی بەسرە و کوفە لەناوچوون و عەلی تەنیا لەگەڵ دەستەیەکی کەم لەوان بەرێکەوتووە کەهەندێکیان بکوژەکانی خەلیفەی ئێوەن، ئەی خواوەندا، ئەی پەروەردگارا، رێگەمەدەن راستییەکان بەفیڕۆ بڕوات و خوێنەکەتان بەفیڕۆ بڕوات.

دەڵێت: معاویە نامەی بۆ ولایەتەکان نووسی و ئاڵایەکی بۆ عەمرۆ بەست. هەروەها بۆ کۆیلەکەی ئەو، ( وەردان) و دوو کوڕەکەی عەبدوالله و محەممەد ئاڵای بەست.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ کۆیلەکەی خۆی قەنبەر ئاڵایەکی بەست.

عەمرۆ عاس هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((کاتێك بوێرەکان زریێ دەپۆشن

ئایا وەردان دەتوانێت قەنبەر لەمن دوور بخاتەوە؟

و هۆزی سەکوون، دەتوانێت حەمیر لەمن دوور بخاتەوە؟))

ئەم هۆنراوەیە بەگوێی عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بەحەفتا هەزار پیاوی ناوچاو بەستوو

کەئەسپەکان بەدوای وشترەکان رادەکێشن

و زرێکانیان لەپشتەوە هەڵواسیوە

رووبەرووی عاس (سەرکێش) کوڕی عاسی دەبمەوە.))

کاتێك معاویە ئەمەی بیست، وتی: کوڕی ئەبوتالیب ماف تۆیدا.

معاویە بەرێکەوت و بەهێواشی رێگەی دەبڕی. نامەی بۆ هەموو ئەو کەسانە نووسی کە لەعەلی دەترسان یارمەتیان لێدەگرت و هەروەها بۆ هەموو ئەوکەسانەی لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان تورە بوون و داوای هاوکاری لێکردن.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب، زیاد کوڕی نەزری حارسی لەگەڵ هەشت هەزار کەس وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد، شورەیح کوڕی هانی لەگەڵ چوارهەزار کەس لەگەڵ ئەودا نارد، دواتر لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەنوخەیلەوە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە مەداین، جەنگاوەرانی ئەو ناوچەیە پەیوەستی بوون. سەعد کوڕی مەسعودی سەقەفی مامی موختار کوڕی باوکی عوبەیدی وەك فەرمانڕەوای مەداین دەستنیشان کرد و مەعقەل کوڕی قەیسی لەگەڵ سێ هەزار کەس لەوێوە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەرێگەی موسڵەوە بڕوات تا دەگاتە لای ئەو.

## فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ هەڵبەستنی پرد لەسەر ڕووباری فورات

کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشتە ڕەقە، وەك لەگێڕانەوەی عەبدوالله کوڕی عەماری بارقی ئاماژەی پێدراوە، بەخەڵکانی ڕەقەی وت: پردێك بۆ من هەڵبەستن تا لێرەوە بەرەو شام بڕۆم. بەڵام ئەوان خۆیان بەدوور گرت. کەشتییەکانیشیان بردبوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێوە بەرێکەوت تا لەپردی مەنبەج بپەڕێتەوە و ئەشتەری وەك فەرمانڕەوای ڕەقە بەجێهێشت. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ سوپاکەی بۆ پەڕینەوە لەپردی مەنبەج بەرێکەوت، ئەشتەر بەخەڵکانی ڕەقەی وت: ئەی خەڵکی قەڵا، سوێند بەخوا ئەگەر سەروەری باوەڕداران بڕوات و لەنزیك شارەکەتان پردی بۆ هەڵنەبەستن، شمشێر دەخەمە ناوتان و پیاوان دەکوژم و سەرزەمینەکەتان وێران دەکەم و دەست بەسەر سامانەکانتانا دەگرم.

دەڵێت: خەڵکانی ڕەقە کۆبوونەوە و تیان: ئایا ئەشتەر سوێندەکەی خۆی ناباتەسەر؟

وتیان: بۆنا.

کەسیان بۆ لای ئەونارد و وتیان پردتان بۆ دروست دەکەین، وەرن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە و پردەکەیان بۆ هەڵبەست کەهاوریێ لەگەڵ سوپاکەی و کەل و پەلەکان لەو پردە پەڕینەوە. فەرمانی بەئەشتەردا لەگەڵ سێ

هەزار سوار لەو ناوچەیە بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی هەموان پەڕینەوە و کەس نەمایەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوای هەمووان بەپیادە لەپردەکە پەڕییەوە.

دەڵێت: کاتێک سوپاکە دەپەڕییەوە، قەرەباڵغی دروست بوو و کڵاوەکەی عەبدوالله کوڕی باوکی حەسینی ئەزدی کەوت. دابەزی وکڵاوەکەی هەڵگرتەوە و دووبارە سوار بوویەوە. هەروەها کڵاوەکەی عەبدوالله کوڕی حەجاجی ئەزدی کەوت، ئەویش دابەزی و کڵاوەکەی هەڵگرتەوە و دووبارە سەرکەوتەوە، بەهاوەڵەکەی خۆی وت: ئەگەر گومانی پێشگۆیان لەرووی جووڵەی باڵندەکانەوە راست بێت، بەزووی من دەکوژرێم، هەروەها تۆیش دەکوژرێیت.

عەبدوالله کوڕی باوکی حەسین وتی: هیچ شتێکم زیاتر لەو وتەی تۆ پێخۆش نییە. هەردووکیان لەسەفین کوژران.

خالید کوڕی قەتنی حارسی دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەفورات پەڕییەوە، زیاد کوڕی نەزر و شورەیح کوڕی هانی بانگ کرد و لەگەڵ هەمان دەستە کە لەکوفەوە بەرێکەوتبوون، بۆ رووبەروو بوونەوەی معاویە بەرێی کردن. ئەوان لەکەنارەکانی فورات کەڕووی لەکوفە بوو، بەرێکەوتن تا گەیشتنە عانات و ئاگادار بوونەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیب رێگەی جەزیرەی گرتۆتەبەر. هەروەها ئاگادار بوونەوە معاویە لەگەڵ سوپاکەی شام بۆ رووبەروو بوونەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوتووە، وتیان: سوێند بەخوا ئەمە راست نییە ئێمە پێشڕەوی بکەین و لەنێوان ئێمە و موسوڵمانان ئەم رووبارە دووری دروست بکات، لەبەرژەوەندی ئێمەدا نییە بەم سوپاکەمە، دوور لەهەر هاوکارییەك، رووبەرووی سوپای شام ببینەوە.

دەڵێت: درێژەیان بەرێگەدا تا لەعانات بەرێکەوتن، بەڵام خەڵکی عانات رێگر بوون لەڕۆشتنی ئەوان بۆ ناوچەکەیان و کەشتییان پێنەدان، گەڕانەوە و لەهیس تێپەڕیان کرد و لەگوندێك لەنزیك قرقیسیا پەیوەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون. مەبەستی هێرش کردنە سەر خەڵکی عاناتیان کردبوو بەڵام ئەوان یا لەناو قەڵاکاندا خۆیان حەشاردا بوو یا هەڵاتبوون. کاتێك پێشەنگی سوپاکە گەیشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: پێشەنگی سوپاکەی من لەپشت

سەرمەوە دێت!.

زیـاد کـوڕی نـەزری حارسـی و شـورەیح کـوڕی هـانی هاتنـە پـێش و لەبەرێکەوتنی معاویە ئاگاداریان کردەوە، وتی: کارێکی چاکتان کرد.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و کاتێك لەفورات تێپەڕی، زیاد و شورەیحی وەك پیشەنگ بۆ ڕووبەڕوو بوونـەوەی معاویـە نـارد. کاتێك گەیشتنە سوور ئەالروم، باوکی ئەعوەری سولەمی، عەمرۆ کوڕی سوفیان، لەگەڵ سوپایەك لە خەڵکانی شام ڕووبەڕوویان بوویەوە. کەسیان بۆ لای عەلی کوڕی ئـەبی تالیب نـارد و ئاگاداریـان کـردەوە لـەوەی ڕووبـەڕووی بـاوکی ئـەعوەری سـولەمی و دەسـتەیەك لەسـوپای شـام بووینەتـەوە، پێـشنیاری بەیعـەت و فەرمانبـەریمان پێکـردن بـەڵام کـەس بەپێـشنیارەکەمان ڕازی نـەبوو، چـاوەڕوانی فەرمانـەکانی تۆین.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری بانگ کرد و وتی: ئەی مالك، زیاد و شـورەیح کەسـیان نـاردووە و ئاگاداریـان کردوومەتـەوە کەڕووبـەڕووی بـاوکی ئەعوەری سولەمی و دەستەیەك لەسوپای شام بوونەتـەوە. نێردراو لەڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ئاگاداری کردمەوە، هەرچی زووتر بۆ هاوکاری هاوەڵانی خۆت بەرێکەوە و کاتێك گەیشتیتە لای ئـەوان، سـەرکردەیان تۆیـت، لەگـەڵ شامییەکان پێش ئـەوەی پێنشیاری فەرمانبـەرییان پێبکـەیت، جـەنگ دەست پێمەکە مەگـەر ئـەوەی ئـەوان دەستپێـشخەر بـن، دوژمنایـەتی ئـەوان نەبێتـە هـۆی ئـەوەی پـێش ئـەوەی پێـشنیاری بەیعـەتیان پـێ بکـەیت، لەگـەڵیان بجـەنگیت. بـاڵی ڕاسـتی سـوپاکەت بـەزیاد و بـاڵی چـەپ بەشـورەیح بـسپێرە و خـۆت لەناوەڕاسـتی سـوپاکەدا بـە. لەرکەبـەرەکانی خـۆت بـەو ئەندازەیـە نزیـك مەبـەرەوە وەك بڵێـی دەخوازیت جەنگ دەست پێ بکەیت، هەروەها زۆر دوور مەبە وەك بڵێی لەجەنگ دەترسـیت، بمێنـەرەوە تـا دەگەمـە لای تـۆ، بـەخێرایی بـەدوایی تـۆدا دێـم، بەخواستی خوا..

دەڵێت: نێردراو، حارس کوڕی جومهانی جوحەفی بوو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ زیاد و شورەیح نووسی:

(( بەڵام دواتر، مالکم کردە سەرکردەی ئێوە، گوێرایەڵ و شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بن چوونکە سوێند بەخوا ئەو، لەو کارەی پێویستی بەخێرایی وپەلە کردنە، سستی لەخۆی نیشان نادات و لەو شوێنەی پێویستە لەسەر خۆ بێت، ناکەویتە پەلەپەل، هاوشێوەی ئەو فەرمانەی بەئێوەی دەدەم، فەرمانم بەویش داوە، یانی پێش ئەوەی دوژمنان نەبینیت و پێشنیاری بەیعەتیان پێنەکات، نابێت جەنگ دەست پێبکات))

دەڵێت: ئەشتەر بەرێکەوت تا پەیوەستی سوپاکەیان بوو و بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی لەجەنگ هەڵگرت. هەر دوو دەستە رووبەرووی یەك جێگیر ببوون تا ئەوەی شەوانە باوکی ئەعوەری سولەمی هێرشی کردە سەریان. سوپاکەی ئەشتەر خۆڕاگرییان کرد و تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم جەنگ بەردەوام بوو، دوای ئەوە خەڵکانی شام بەخێرایی گەڕانەوە. رۆژێکی دیکە، هاشم کوڕی عوتبەی زوهری لەگەڵ دەستەیەك سوار و پیادەی ئامادە، هێرشی کردە سەر خەڵکانی شام و باوکی ئەعوەر رووبەرووی بوویەوە و تەواوی رۆژیان بەجەنگ بەسەر برد. سوارەکان هێرشیان دەکردە سەر سوارەکان وپیادەکان هێرشیان دەکردە سەر پیادەکان.. هەر دوو سوپا خۆڕاگرییان کرد و دواتر لەیەك جویێ بوونەوە. ئەشتەریش هێرشی کردبوو. ئەو رۆژە عەبدوالله کوڕی مونزەری تەنوخی کوژرا. بکوژەکەی زەبیان کوڕی عەمارەی تەمیمی، گەنجێکی تازەپێگەیشتبوو بوو لەکاتێکدا تەنووحی بەسوارچاکی خەڵکانی شام هەژمار دەکرا.

ئەشتەر لەکاتی هێرش دەیوت: هاوار لەئێوە، باوکی ئەعوەرم نیشان بدەن. بەڵام باوکی ئەعوەر کەسانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و لەو شوێنەی یەکەم جار وەستا بوو، وەستا. ئەشتەر هات و هاوەڵانی خۆی لەبەرابەر باوکی ئەعوەر، ریز کرد، دواتر بەسەنان کوڕی مالکی نەخەعی وت: برۆ لای باوکی ئەعوەر و داوای شەڕی دەستەویەخەی لێ بکە.

وتی: شەڕ لەگەڵ من یا لەگەڵ تۆ؟

وتی: ئەگەر بڵێم شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ بکەیت، دەیکەیت؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا ئەگەر بڵێی بەشمشێر هێرش دەکەمە سەر ریزەکانی ئەوان تا ریزەکانیان تێك بشکێنم.

ئەشتەر پێی وت: ئەی کوڕی برام، خوا تەمەنت درێژ بکات، پێشنیاری شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ خۆمدا پیێ بکە، ئەگەر رازی ببێت تەنیا بۆ شەڕ لەگەڵ کەسێکی بەتەمەن و رێزدار و خاوەن پێگە دێت، تۆ رێزدار و خاوەن پێگەیت بەڵام هێشتا کەم تەمەنیت و ئەو لەگەڵ هاوتەمەنانی تۆ شەڕی دەستەویەخە ناکات، پێشنیاری شەڕ کردن لەگەڵ خۆمی پیێ بکە.

سەنان کوڕی مالك ڕۆشت و هاواری کرد: ئەمانم پێبدەن، نێردراوم. کاتێك ئەمانیان پێدا، ڕۆشتە پێش تا گەیشتە لای باوکی ئەعوەر.

نەزر کوڕی سالح لەسەنان دەگێڕێتەوە: لێی نزیك بوومەوە و وتم: ئەشتەر پێشنیاری شەڕی دەستەویەخەی پێکردوویت.

دەڵێت: ماوەیەك بێدەنگ بوو، ئەوسا وتی: نەزانی و نادوورئەندێشی ئەشتەر بوو ناچاری کرد کارگوزارانی عوسمان لەعێراق دەربکات، شۆڕشی ئەو دژی عوسمان چاکییەکانی ئەو بەکارە قێزەونەکان دەبات. هەروەها نەزانی و نادوور ئەندێشی ئەشتەر بووە هۆی ئەوەی هێرشی کردە سەر ماڵ و نشینگەی عوسمان و ئەوی لەگەڵ کەسانی دیکە کوشت. هەنووکە خوێنی عوسمان ئێستا لەگەردنی ئەودایە و من، پێویستم بەشەڕی دەستەویەخە لەگەڵ ئەو نییە.

دەڵێت: وتم: قسەی خۆت کرد، هەنووکە گوێبیستی وەڵامەکانی من بە.

وتی: پێویستم بەوەڵام و قسەکانی تۆ نییە، بڕۆ.

دەڵێت: هاوەڵانی هاواریان کرد و بەناچاری گەڕامەوە. ئەگەر گوێی دەگرت، بیانو و پاساوەکانی ئەشتەرم پێدەوت. گەڕامەوە بۆ لای ئەشتەر و وتم: باوکی ئەعوەر بەپێشنیارەکەت رازی نەبوو.

وتی: گیانی خۆی خۆش دەویست.

دەڵێت: بەهەمان شێوە ماینەوە تا شەو داهات، شەومان بەچاودێری کردن و کێشك گرتن بەسەر برد. بەرەبەیانان هەستمان کرد دوژمنەکەمان ڕۆشتووە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەیانیدا گەیشت و ئەشتەر و هاوەڵانی

ئەوی بۆ پێشەوە نارد کەگەیشتنە لای معاویە و لەبەرابەر ئەو ریزیان بەست. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخێرایی بەدوای ئەوندا هات و پەیوەستی ئەشتەر بوو. هەر دوو دەستە بۆ ماوەیەك رووبەرووی یەك وەستا بوون، دوای ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ئوردووکەی خۆی بەدوای شوێنێکدا گەڕا و کاتێك شوێنی مەبەستی دۆزییەوە، بەسوپاییەکانی وت باروبنەکانیان دابگرن. دواتر گەنج و کۆیلەکان بۆ ئاو هێنان ڕۆشتن بەڵام خەڵکانی شام رێگەیان لێگرتن. هەر دوو سوپا لەسەر ئاوەکە جەنگیان دەست پێکرد. ئەشتەر پێشتر عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ئاگادار کردبوویەوە کەخەڵکانی شام دەستیان بەسەر ئاو و شوێنە پان و بەرینەکەدا گرتووە، ئەگەر دەخوازیت دەڕۆینە ئەو گوندەی لەوێوە هاتوون کەبەدوای ئێمەدا دێن. کاتێك پەیوەستی ئێمە بوون، دادەبەزین و جێگەی ئێمە و ئەوان بەرابەر دەبێت. بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمەی پەسەند نەکرد و وتی: هەمووان تواناى ڕۆشتنیان نییە. لەهەمان شوێن دابەزی.

## جەنگ لەسەر ئاو

جوندەب کوڕی عەبدوالله دەڵێت: کاتێك رووبەرووی سوپاکەی معاویە بووینەوە کەپێش گەیشتنی ئێمە شوێنە پان و بەرینەکەیان لای ئاوەکە داگیر کردبوو، لەو ناوچەیە جگە لەو ئاوە، ئاوی دیکە نەدەبینرا. باوکی ئەعوەری ناردبوو تا ئەو شوێنە بپارێزێت و رێگە لەڕۆشتنی ئێمە بۆ سەر ئاوەکە بگرێت.

ئێمە بەکەنارەکانی فوراتا سەرکەوتین بەو هێوایەی ئاوێکی دیکە بدۆزینەوە و لەئاوەکەی ئەوان بێ نیاز ببین بەڵام هیچمان دەست نەکەوت.

گەڕاینەوە بۆلای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتمان: خەڵکان تینوون و تەنیا ئەو ئاوەی دوژمن دەستی بەسەردا گرتووە، لەم ناوچەیە بوونی هەیە.

وتی: بەجەنگ دەست بەسەر ئاوەکەدا بگرن.

دەڵێت: ئەشعەس کوڕی قەیسی کەندی هات و وتی: من دەڕۆم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بڕۆ.

دەڵێت: بەرێکەوت و ئێمەیش لەگەڵی ڕۆشتین. کاتێك لەئاوەکە نزیك

بووینەوە، هێرشیان کردە سەر ئێمە و تیرهاویشتنیان دەست پێکرد. ئێمەیش بۆ چەند ساتێك تیرمان هاویشت. دواتر بەرەو کەوتینە گیانی یەك، سەرئەنجام هەردوولا دەستمان بۆ شمشێر برد و ماویەك جەنگاین. یەزید کوڕی نەسەدی بوجلی هاوریێ لەگەڵ سوار وپیادە بۆ هاوکاری دوژمن هات، هێرشیان کردە سەرمان، بەخۆمم وت: سەروەری باوەڕداران هاوکاری بۆ ئێمە نانێرێت. کاتێك ڕۆشتمە پێش و جوان سەیرم کرد، بەئەندازەی سوپای دوژمن یا زیاتر، هێزی پشتیوانی ڕەوانە کردبوو تا لەبەرابەر یەزید و سوپای دوژمن هاوکاریمان بکەن. سەرکردەی هێزی پشتیوان شەیس کوڕی ڕێبعی ریاحی بوو. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و عەمرۆ کوڕی عاس هاوریێ لەگەڵ سوپایەك بۆ هاوکاری یەزید و باوکی ئەعوەر هات. ئەشتەریش لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاوریێ لەگەڵ سوپایەکی فراوان بۆ هاوکاری کردنی سوپاکەیان هات و کاتێك بینی عەمرۆ کوڕی عاس بۆ هاوکاری باوکی ئەعوەر و یەزید هاتووە، هاوکاری ئەشعەس کوڕی قەیس و شەیس کوڕی ڕێبعی کرد و ئاگری جەنگ زیاتر بڵێسەی سەند. هەرگیز هۆنراوەکەی عەبدوالله کوڕی عەوف ئەحمەری ئەزدی لەبیر ناکەم بەم ناوەرۆکە:

(( ئاوی ڕەوانی فورات بەر بدەن
یا ئەوەی لەبەرابەر سوپایەکی فراوان خۆڕاگری بکەن
لەبەرابەر پاڵەوانە گیانبەخشەکان
کە بەرەو هێرش دەکەن
و زەربەی کوشەندە لەسەری دوژمن دەدەن))

بێژەر دەڵێت: پیاوێك لەبنەماڵەی خارجە کوڕی تەمیمی پێی وتم زەبیان کوڕی عەمار ئەو ڕۆژە دەجەنگا و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی زەبیان مەگەر دەتوانی
لەسەر زەوی بێ ئاو بمێنیتەوە
سوێند بەخوای ئاسمان و زەوی، نە
کەواتە روخساری دوژمنی ناپیاو

لەگەرماوگەرمی جەنگ بەشمشێر بکوتە

تا دادپەروەری بکەنە پیشە))

زەبیان دەڵێت: سوێند بەخوا بەڕادەیەك شمشێرمان وەشاند تا سەر ئاوەکەیان چۆڵ کرد.

محەممەد کوڕی موخەنەف دەڵێت: ئەو ڕۆژە لەگەڵ باوکم، باوکی موخەنەف کوڕی سولەیم بووم، تەمەنم حەفدە ساڵ بوو و هێشتا مانگانەم وەرنەدەگرت. کاتێك ڕێگەی ئاوەکەیان لێگرتین، باوکم وتی: لەبارەکەی من دوور کەوەرەوە. بەڵام کاتێك موسوڵمانان بەرەو لای ئاوەکە دەڕۆشتن نەمتوانی خۆم بگرم، شمشێرم دەرکێشا و هاوڕێ لەگەڵ کەسەکانم بەشداری جەنگەکەم کرد.

دەڵێت: کۆیلەی یەکێك لەعێراقییەکانم بینی، مەشکەیەك ئاوی پێبوو، کاتێك بینی ڕێگەی خەڵکانی شامیان بۆ سەر ئاوەکە کردەوە، بەخێرایی ڕۆشت و مەشکەکەی پڕ کرد و گەڕایەوە. یەکێك لەخەڵکانی شام بەشمشێر لێیدا و لەپێی خست. مەشکەکە لەدەستی کەوتەخوار. هێرشم کردە سەر ئەو پیاوە و بەشمشێر زەربەیەکی کوشندەم لێدا. هاوەڵانی بەخێرایی هاتن و رزگارییان کرد. بیستم کەدەیانوت: لەتۆ ئاسوودە نین.

دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای کۆیلەکە، ئەوم هەڵگرتەوە، قسەی دەکرد، بەقورسی بریندار ببوو. مالك هات و ئەوی برد. مەشکەی ئاوەکەم هەڵگرت و بردمە لای باوکی موخەنەف، وتی: ئەم ئاوەت لەکوێ هێنا؟

وتم: کڕیم، نەمویست بەسەرهاتەکەی بۆ بگێڕمەوە نەوەك نیگەران ببێت.

وتی: ئاوەکە بدە بەخەڵکان.

دەڵێت: ئاوەکەم دەرخواردی خەڵکاندا، ئارەزووی جەنگەکەم دەکرد، ڕۆشتم و پەیوەستی جەنگاوەران بووم، ماوەیەك بەجەنگەوە سەرقاڵ بووین، دواتر شوێنی ئاوەکەیان چۆڵ کرد و لەکاتی شەو کەسانی ئێمە و کەسانی ئەوان بۆ هەڵگرتنی ئاو قەرەباڵغیان لەشوێنەکە دروست دەکرد، کەس ئازاری کەسی نەدەدا. لەکاتی گەڕانەوە خاوەنی کۆیلەکەم بینی، وتم: مەشکەکەی تۆ لای ئێمەیە، کەسێك بنێرە تا بۆت بگێڕینەوە یا شوێنەکەت بڵێ تا خۆمان بۆت

بنێرینەوە.

وتی: خوا بتبەخشێت، بەئەندازەی پێویست مەشکەمان هەیە.

ڕۆشـتم و ئـەویش ڕۆشـت. ڕۆژی دواتـر لای بـاوکم گـوزەری کـرد، وەسـتا، سلاوی کرد و منی لای ئەو بینی، وتی: ئەم گەنجە چی تۆیە؟

وتی: کوڕمە.

وتی: هیوادارم ببێتە هۆی دڵخۆشی تۆ. دوێنێکە کۆیلەکەی منی لەکوشتن ڕزگـار کـرد، گەنجـەکانی تایەفەکـەم پێیـان وتم دوێـنێ لەهـەمووان بوێرانـەتر جەنگاوە.

باوکم سەیری کردم، تووڕەییم لەروخساریدا بینی، بێدەنگ بوو تا پیاوەکە ڕۆشت، وتی: بەمشێوەیە فەرمانەکانی من جێبەجێ دەکەیت؟ سوێندی دام چیتر بێ مۆڵەتی ئەو بەشداری جەنگ نەکەم، جگە لەورۆژە، ڕۆژەکانی دیکە بەشداری جەنگەکەم نەکرد.

مێهـران کۆیلـەی یەزیـد کـوڕی هـانی دەڵێـت: سـوێند بـەخوا سـەروەری مـن لەسـەر ئاوەکـە دەجـەنگی و مەشـکەکەی بەدەسـتەوە بـوو، کاتێك خـەڵکانی شـام ئاوەکەیان چۆڵ کرد، ڕۆشتم ئاو بخۆمەوە بـەلام لـەو حاڵەیـشدا دەجـەنگام و تیرم دەهاویشت.

عەبـدوالله کـوڕی عـەوف کـوڕی ئەحمـەر دەڵێـت: کاتێك لەسـەفین ڕووبـەڕووی سـوپاکەی معاویـە و خـەڵکانی شـام بووینـەوە، بینیمـان لەشـوێنێکی بـەربلاو و بەرینـدا جـێگیر بـوون و دەسـتیان بەسـەر ئاوەکـەدا گرتـووە. بـاوکی ئـەعوەری سولەمی هـاوڕێ لەگـەڵ سـوار وپیادەکـان لـەوێ ریـزی بەسـتبوو. تیرهاوێژەکان، ریزی پێشەوە بـوون، ڕم و قەڵغانیان بەدەسـتەوە بـوو، خودەیـان لەسـەر کردبوو. بڕیاریانـدا بـوو ڕێگـە نـەدەن ئێمـە لەئاوەکـە بخۆینـەوە. ڕۆشـتینە لای سـەروەری باوەڕداران و لەم پێشهاتە ئاگادارمان کردنـەوە. ئەو، سەعسەعە کـوڕی سـوحانی بـانگ کـرد و وتـی: بـڕۆ لای معاویـە و بڵـێ، هـاتووین بـۆ ئێـرە و لەگـەڵ ئێـوە ناجـەنگین تـا ئەوکاتـەی پێـشنیار و قسەکانی خۆمـان بـەئێوە بڵـێین، تـۆ سـوار وپیادەکـانی خـۆت لەپێـشەوە نـاردووە و پـێش ئـەوەی جـەنگ دەسـتپێبکەین،

جەنگت دەست پێکردووە. دەمانەوێت دەست لەجەنگ هەڵبگرین و تۆ لەمەبەست وپێشنیارەکانی خۆمان ئاگادار بکەینەوە، ئەمە هەڵەیەکی دیکەیە پێی گرفتار دەبن کەرێگە نادەن خەڵکان دەستیان بەئاوەکە بگات، خەڵك دەست هەڵناگرن تا دەستیان بەئاوەکە دەگات، کەس بۆ لای سوپاکەی خۆت بنێرە تا رێگەی ئاو خواردنەوە لەکەس نەگرن تا ئەو کاتەی لەبارودۆخی خۆمان و خۆتان لێکۆڵینەوە دەکەین، ئەگەر دەخوازیت مەبەستەکەمان پشتگوێ دەخەین و رێگە دەدەین خەڵك لەسەر ئاوەکە بجەنگن تا ئەوکەسەی زاڵ دەبێت دەست بەسەر ئاوەکەدا بگرێت.

دەڵێت: معاویە بەهاوەڵانی خۆی وت: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وەلید کوڕی عوقبە وتی: رێگەی ئاوەکەیان لێدەگرین بەهەمان شێوە کەنەیانهێشت ئاو بەعوسمان کوڕی عەفان بگات. چل رۆژ گەمارۆیان خستەسەر و ئاو خواردنی پێنەگەیشت. لەتینوویەتی دەیانکوژین خوا بیانکوژێت.

عەمرۆ کوڕی عاس پێی وت: رێگەی ئاوەکەیان لێمەگرە چوونکە ئەم سوپایە بەتینویەتی نامێننەوە. تۆ شتێك جگە لەئاو بخۆیتەوە، بزانە جیاوازی نێوان تۆ و ئەوان چییە؟

بەڵام وەلید کوڕی عوقبە وتەکانی خۆی دووبارە کردەوە.

عەبدوالله کوڕی سەعد کوڕی باوکی سەرح وتی: تا شەو رێگە نادەم دەستیان بەئاوەکە بگات، ئەگەر دەستیان بەئاوەکە نەگەیشت دەگەڕێنەوە، ئەگەر گەڕانەوە بەمانای تێکشکانی ئەوانە. رێگەی ئاوەکەیان لێدەگرم بەو هیوایەی خواوەند لەرۆژی هەستانەوە رێگەی ئاویان لێ بگرێت.

سەعسەعە وتی: رۆژی هەستانەوە خواوەند کافرەکان و دووڕووەکان و شەرابخۆرانی وەك تۆ و ئەم ناباوەڕە -یانی وەلید- لەئاو خواردنەوە دوور دەخاتەوە.

دەڵێت: پەلاماریاندا و جوێنیان پێدا و هەڕەشەیان لێکرد.

معاویە وتی: دەست لەو پیاوە هەڵبگرن چوونکە نێردراوە.

عەبدوالله کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەر وتی: سەعسەعە گەڕایەوە بۆ لای ئێمە

و لەوتەکانی خۆی و وەڵامەکانی ئەوان ئاگاداری کردینەوە. پرسیمان: وەڵامی چی بوو؟

وتی: کاتێك دەمویست بگەڕێمەوە، وتم: چ وەڵامێك دەدەیتەوە؟

معاویە وتی: لەبۆچوونەکەی من ئاگادار دەبن. بینیمان سوارەکانی بۆ لای باوکی ئەعوەر نارد و فەرمانی پێدا رێگەی ئاوەکەمان لێ بگرن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئێمەی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان نارد. تیرمان هاویشت و رِممان بەکار برد. دواتر شمشێرەکان کەوتنە کار و بەسەریاندا سەرکەوتین. ئاوەکە کەوتە دەستی ئێمە و وتمان: سوێند بەخوا ئاویان پێنادەین.

بەلاَم عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسی بۆ لای ئێمە نارد و وتی: بەئەندازەی پێویست ئاو هەڵگرن و بۆ ئوردووگاکەتان بگەڕێنەوە. رێگەیان لێ مەگرن چوونکە خواوەند بەهۆی ستەمی ئەوان سەرکەوتنی بەئێوە بەخشی.

## عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێشنیاری پەیوەست بوون بەخەڵکان و فەرمانبەری کردن بەمعاویە دەدات

عەبدولمەلیك کوڕی باوکی حوڕەی حەنەفی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەمڕۆ بەهۆی غیرەتی خۆتانەوە سەرکەوتنتان بەدەست هێنا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوو ڕۆژی دیکە چاوەڕوان بوو، کەسی بۆ لای معاویە نەنارد، معاویەیش کەسی نەنارد. دوای ئەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوشر کوڕی عەمرۆ ئەنساری و سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی و شێبس کوڕی ڕێبعی تەمیمی بانگ کرد و وتی: بڕۆنە لای ئەو پیاوە و پیشنیاری پەیوەست بوون بەخەڵکانی پێ بکەن.

شەیس کوڕی ڕێبعی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بۆ تەماحی لا دروست ناکەیت ئەگەر بەیعەت لەگەڵ تۆ بکات، فەرمانڕەوایی سنوورێکی پێدەبەخشێت و پێگەیەکی بەرزی لای تۆ دەبێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بڕۆنە لای و پێشنیاری پێبکەن، بزانن بۆچوونی ئەو چییە؟

ئەمە لەسەرەتاکانی زی حەججەدا بوو.

دەڵێت: ڕۆشتنە لای معاویە، بوشر کوڕی عەمرۆ ناوی خوای هێنایە سەرزمان و سوپاسی کرد، وتی: ئەی معاویە، دنیا کۆتایی پێدێت و بەرەو ئەو دنیا دەڕۆیت، خواوەند بەهۆی کردەوەکانتەوە لێپرسینەوە لەگەڵ تۆ دەکات و جەزا و پاداشتت بۆ دادەنێت، سوێندت دەدەم بەخوا بڵاوە بەم خەڵکە مەکە و ڕێگە مەدە خوێنی یەك بڕێژن.

معاویە قسەکەی پێ بڕی و وتی: بۆ ئەمەت بەهاوڕێکەی خۆت نەوت؟

بوشر وتی: هاوڕێکەی من هاوشێوەی تۆ نییە، هاوڕێکەی من بۆ لەپێشی و چاکەکاری و پێشینەی لەئیسلام و نزیکی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) لەهەموو کەسێك بۆ خەلافەت شیاوترە.

وتی: چی دەڵێت؟

وتـی: دەڵێـت لەخواوەنـد بترسـە و بەبانگـەوازی کـوڕە مامەکـەی خـۆت کەپێشنیاری گەڕانەوە بۆ راستییەکانت پێدەکات، رازی ببە چوونکە هـەم بۆ ئەم دنیات باشترە هەم بۆ ئەو دنیا.

معاویە وتـی: خوێنی عوسمـان پشتگوێ بخـەین؟ نـا، سوێند بـەخوا هـەرگیز بەوە رازی نابم.

سـەعید کـوڕی قـەیس ویـستی قـسە بکـات، بـەڵام شێـبس کـوڕی ڕێبعـی پێشدەستی کرد، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، سپاسـی کـرد و وتـی: ئـەی معاویە! لەوەڵامەکـەی تـۆ تێگـەیشتم. سوێند بـەخوا ئـەوەی خوازیـاری پێـی، لای ئێمە شاراوە نییە، شتێکت دەست نەکەوت تـا بەهۆیـەوە خـەڵکان فریـو بدەیت و بیانکەیتە شوێنکەوتەی خـۆت جگـە لـەوەی بڵێـی پێشەواکەتان بەسـتەم کوژرا و ئێمـە داوای خـوێنی ئـەو دەکـەین. نەزانـەکان بەمـە رازی بـوون. دڵنیـایین بـۆ هاوکاری کردنی عوسمـان کەمتەرخـەمیت لـەخۆت نیشاندا و کوشتنی ئەوت بۆ پێگەکـەی ئێـستات ئـارەزوو دەکـرد. زۆر کـەس ئـارەزووی شـتێك دەکـات و خوازیـارە پێـی بـەڵام خواوەنـد بـەهۆی هێـزی خۆیـەوە رێگـەی لـێ دەگرێـت. زۆر کاتیش کەسی ئارەزوومەند زیاتر لەئارەزووەکەی خۆی پێبدەرێت. سوێند بەخوا هیچ کامی ئەم دووانە بۆ تۆ باش نییە، ئەگەر ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت، دەست نەکەوێت، دەبیتـە خـراپترینی عەرەبـەکان و ئەگـەر بەئارەزووەکـەی خـۆت بگـەیت، دەستت پێـی ناگـات مەگـەر ئـەو کاتـەی شیاو بیـت بـۆ ئـاگری جەهەننـەم. ئـەی معاویـە، لەخواوەنـد بترسـە و چـاو لـەم کـارە بپۆشـە و لەسـەر خەلافـەت دژایـەتی کەسێك مەکە کەشیاوە بۆی.

معاویـە نـاوی خـوای هێنایـە سـەرزمان، سپاسـی کـرد و وتـی: یەکـەم شـت کەهەسـتم پێکـرد نـەزانی و بـێ ئـاوزی تۆیـە، وتـەی ئـەو پیـاوە شـەریفەت بـڕی کەسـەرکردەی خەڵکەکەیـەتی، دواتـر بابـەتێکت هێنایـە سـەرزمان کـە لێـی بـێ ئاگایـت، درۆت کـرد و ناڕاسـتیت هێنایـە سـەرزمان، ئـەی عـەرەبی پـێ پـەیتی، هەمووی ئەوانەی باست کرد، دوور بوون لەراستی. بڕۆن چوونکە تـەنیا شمشێر لـەنێوان ئێمـە و ئێـوە داوەری دەکـات. معاویـە تـوڕە و نێردراوەکـان گەڕانـەوە.

شێبس کوڕی ڕێبعی دەیوت: ئێمە لەشمشێر دەترسێنیت، سوێند بەخوا لەزووترین کات شمشێرەکەی من یەخەت دەگرێت.

دەڵێت: گەڕانەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەوتەکانی معاویە ئاگاداریان کردەوە. ئەمە لەمانگی زیحەججەدا بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆژانە یەکێك لەکەسە بڕواپێکراوەکانی ڕەوانە دەکرد. ئەو کەسە لەگەڵ دەستەیەك دەڕۆشت و یەکێك لەهاوەڵانی معاویە ڕووبەڕووی دەبوویەوە. بەسوار و پیادە دەجەنگان، دواتر دەگەڕانەوە چوونکە حەزیان نەدەکرد بەهەموو سوپای خەڵکانی عێراق ڕووبەڕووی خەڵکانی شام ببنەوە دەترسان ئەم کارە ببێتە هۆی لەناوچوونی خەڵکان بەگشتی. جارێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕووی لەگۆڕەپان دەکرد، جارێك ئەشتەر، جارێك حوجر کوڕی عودەی کێندی، جارێك شێبس کوڕی ڕێبعی، خالید کوڕی مەعمەر، زیاد کوڕی نەزری حارسی، زیاد کوڕی خەفصەی تەمیمی، سەعید کوڕی قەیس، مەعقەل کوڕی قەیسی ڕیاحی، بەلام ئەشتەر زیاتر لەهەمووان بەشداری جەنگەکانی دەکرد.

دەڵێت: معاویە جارێك عەبدوالرەحمان کوڕی خالیدی مەخزومی یا باوکی ئەعوەری سولەمی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان دەنارد، جارێك حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری، موڕە کوڕی زوئەلکەلاعی حومەیری، عوبەیداللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب، شورەحبیل کوڕی سمیتی کێندی و جارێك حەمزە کوڕی مالکی هەمەدانی.

دەڵێت: بەمشێوەیە مانگی زیحەججەیان بەشەڕ بەسەر برد. هەندێ کات لەڕۆژێکدا دوو جار، سەرەتا و کۆتایی ڕۆژ دەجەنگین.

عەبدوالله کوڕی عامری فائیشی لەیەکێك لەپیاوانی هۆزەکەی دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك ئەشتەر لەگەڵ دوو ڕیز کەدەستەیەکیان لەخوێنەرانی قورئان بوون و دەستەیەکیان لەسوارچاکەکانی عەرەب، بەمەبەستی جەنگ ڕوویان لەگۆڕەپانەکە کرد. شەڕەکە قورس بوو. دواتر پیاوێك کەسوێند بەخوا کەسم لەو بەهێزتر و بالابەرزتر نەبینیوە، بەرەو لای ئێمە هات و داوای شەڕکەری کرد. کەس جگە

لەئەشتەر رووبەرووی نەبوویەوە. دوو زەربەیان لەیەکدا و ئەشتەر زەربەیەکی لێدا وکوشتی. سوێند بەخوا کاتێك ئەشتەر بۆ رووبەروو بوونەوەی رۆشت، لەکوژرانی دەترسام وکاتێك رەکەبەرەکەی کوشت، یەکێك لەهاوەڵانی وتی: سوێند بەخوا یا بکوژەکەی تۆ دەکوژم یا دەبێت منیش بکوژێت. هات وپەلاماری ئەشتەریدا. ئەشتەر شەڕی لەگەڵ کرد و لەئەسپەکەی فڕێدایە خوار. هاوەڵانی فریای کەوتن و بەبریندار لەگۆڕەپانەکە رزگاریان کرد. باوکی رەفیقەی فەهمی دەڵێت: ئەمە ئاگرێك بوو لەبەرابەر تۆفان خۆڕاگری دەکرد.

دەڵێت: هەردوو سوپا مانگی زیحەججەیان بەشەڕ بەسەر برد و کاتێك ئەو مانگە کۆتایی هات، باسی ئەوەیان کرد لەمانگی موحەڕەم دەست لەیەك هەڵبگرن ئەگەری هەیە خواوەند ئاشتی لەنێوان خەڵکان سەقامگیر بکات و جارێکی دیکە خەڵکان پەیوەستی یەك ببنەوە. بەمشێوەیە بۆ ماوەیەك دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

لەم ساڵەدا وەك لەگێڕانەوەی باوکی موعەشەر ئامارەی پێدراوە، عەبدوالله کوڕی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب، سەرپەرەستی حەجی گرتە ئەستۆ.

لەم ساڵەدا بەوتەی واقدی، قودامە کوڕی مەزعون کۆچی دوایی کرد.

ساڵی سی و حەوتەم دەستی پێکرد.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی سی و حەوت و کۆتایی هاتنی جەنگ لەنێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە

لەیەکەم مانگی ئەم ساڵەدا، یانی موحەڕەم، لەنێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە کۆتایی بەجەنگ هات و بڕیاریاندا تا کۆتایی مانگەکە جەنگ دەستپێنەکەن چوونکە هیوادار بوون ئاشتی لەنێوانیان سەقامگیر ببێت.

مەحەل کوڕی خەلیفەیی تایی دەڵێت: لەکاتی جەنگی سەفین عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە بۆ ماوەی یەك مانگ دەستیان لەجەنگ هەڵگرت، نێردراوەکان بەهیوای سەقامگیر کردنی ئاشتی هاتوچۆیان دەکرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب، عودەی کوڕی حاتەم و یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبیب و شێبس کوڕی ڕێبعی و زیاد کوڕی خەفسەی بۆ لای معاویە نارد کەهاوشێوەی جاری یەکەم ڕۆشتنە لای. عودەی کوڕی حاتەم، دەستی بەقسە کرد و وتی: هاتووینە لای تۆ و پێشنیاری کارێکت پێ دەکەین تا بەهۆیەوە خواوەند یەکمان بخاتەوە و خوێنەکان بپارێزێت و ڕێگەکان ئەمن و ئاشتی سەقامگیر ببێت. کوڕە مامەکەی تۆ سەرەوەری موسوڵمانانە و پێشینەی ئەو لەئیسلام زیاترە و نیشانەکانی موسوڵمانی لەودا زیاترە. خەڵك لەدەوری ئەو کۆبوونەتەوەو خواوەند ڕێنوێنی کردوون. کەس جگە لەتۆ و هاوەڵانت نەماوەتەوە. ئەی معاویە کۆتایی بەم کێشەیە بێنە، با خواوەند تۆ و هاوەڵانت گرفتاری جەنگێکی هاوشێوەی جەمەل نەکات.

معاویە وتی: دەڵێی بۆ هەڕەشە کردن هاتوویت نەك بۆ ئاشتی. ئەی عودەی هەرگیز؟ سوێند بەخوا من کوڕی حەربم و بەهەڕشە ناترسێم. سوێند بەخوا تۆ لەوکەسانەیت خەڵکت دژی کوڕی عەفان هاندا و یەکێکی لەبکوژەکانی ئەو، هیوادارم لەو کەسانە بیت خواوەند لەتۆڵەی خوێنی عوسمان دەیانکوژێت، هەرگیز! ئەی کوڕی حاتەم، چاوەڕوانییەکانت نابەجێن.

شێبس کوڕی ڕێبعی و زیاد کوڕی خەفسە کەوتنە ناو قسەی یەك و یەك وەڵامیان دایەوە: ئێمە بەمەستی سەقامگیر کردنی ئاشتی هاتووین و تۆ وتارمان

بۆ دەخوێنیتەوە، وتار و کرداری بێ ئەنجام پشتگوێ بخە و سەبارەت بەشتێك کەبەرژەوەندی گشتی بەدواوە دێت، قسە بکە.

یەزید کوڕی قەیس قسەی کرد و وتی: بۆ ئەوە هاتووین پەیامەکە بەتۆ بگەیێنین و وەلامەکانی تۆ ببەینەوە بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا لەئامۆژگاری کردنی تۆ بێ ئاگا نابین و لەهەر کارێك ببێتە هۆی پەیوەست بوونەوەی خەڵکان، درێغ ناکەین. هاورێکەی ئێمە ئەو کەسەیە لەپێشییەکانی ئەو دەزانیت و موسوڵمانانیش دەزانن، دەڵێی لای تۆ شاراوەیە کەموسوڵمانان کەس لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەبەرابەر نازانن. خەڵکان لەنێوان تۆ و ئەو دوودڵ نابن. ئەی معاویە لەخواوەند بترسە و دژایەتی کوڕی ئەبی تالیب مەکە چوونکە سوێند بەخوا کەسی هاوشێوەی ئەومان نەبینیوە پێبەندی خواپەرەستی وەلگری تایبەتمەندییە چاکەکان بێت.

دەڵێت: معاویە ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی: پێشنیاری پەیوەست بوون بەخەڵکان بەمن دەکەن، ئەو دەستەی پێشنیار دەکەن من پەیوەستیان ببم، لەگەڵ ئێمەدان بەلام ئەوەی ببینە شوێنکەوتەی هاوەڵەکەی ئێوە، ئەمە پەسەند ناکەین چوونکە خەلیفەکەی ئێمەی کوشتووە و بلاوەی بەدەستەکانمان کردو و بکوژەکانی خەلیفەی پەنا داوە. هاورێکەی ئێوە دەڵێت ئەو بکوژی خەلیفە نییە، ئێمە بەرپەرچی ئەمە نادەینەوە، ئایا بکوژەکانی عوسمانتان بینیوە؟ مەگەر نازانن ئەوان هاوەلانی ئێوە و لەناو سوپاکەی ئێوەدان؟ ئەوان تەسلیم ئێمە بکەن تا لەتۆڵەی خوێنی عوسمان بیانکوژین، دواتر بەپێشنیارەکانی ئێوە بۆ پەیوەست بوون بەکۆمەلانی خەڵك رازی دەبین.

شێبس وتی: ئەی معاویە، ئایا رازی دەبیت دەستت بەعەمار بگات و بیکوژیت؟

معاویە وتی: هیچ لەمپەرێك لەرێگەدا نییە، سوێند بەخوا ئەگەر دەستم بەکوڕی سومەییە بگات، ئەو لەتۆڵەی خوێنی عوسمان ناکوژم بەڵکو لەتۆڵەی خوێنی کۆیلەکەی عوسمان دەیکوژم.

شێبس وتی: سوێند بەخوای ئاسمان و زەوی کەسێکی دادپەروەر نیت، نا،

سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، دەستت بەعەمار ناگات مەگەر ئەوەی هەزاران سەر بکەوێتە سەرزەوی و زەوی بەوهەموو فراوانییە بۆ تۆ شوێنێکی تەسك و تەنگ بێت.

معاویە وتی: ئەگەر بەو شێوە بێت، هیوادارم زەوی بۆ تۆ تەسکتر بێت.

نێردراوان لەمعاویە جیا بوونەوە و کاتێك ڕۆشتن، معاویە کەسی بەدوای زیاد کوڕی خەفسەی تیمی نارد و بەتەنیا لەگەڵی دانیشت، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەی برای ڕەبیعی، عەلی ڕێزی لەپەیوەندی خزمایەتی نەگرت و پەنای بەبکوژەکانی خەلیفە داوە، داوات لێدەکەم لەگەڵ هۆز و کەسەکانی خۆت دژی ئەو ئالای شۆڕش بەرز بکەیتەوە، پەیمانی خوایی دەدەم ئەگەر بەسەر ئەودا سەرکەوتم، تۆ دەکەمە فەرمانداری یەکێك لەو دوو ویلایەتەی کەئارەزووی دەکەیت.

مەحەل کوڕی خەلیفە دەڵێت: بیستم زیاد کوڕی خەفسە ئەم حەدیسەی دەوت و دەیوت: کاتێك معاویە کۆتایی بەقسەکانی هێنا، سپاسی خوام کرد، ئەوسا وتم: من باوەڕم بەپەروەردگاری خۆم هەیە و نابمە پشتیوانی تاوانباران. هەستام و معاویە بەعەمرۆعاسی وت کەلای دانیشتبوو: هیچ کام لەئێمە قسە لەگەڵ هیچ کەسێك لەوان ناکات مەگەر ئەوەی وەڵامێکی جوان ببیستێت، بۆ بەمشێوەن. خواوەند گرفتاری شەڕیان بکات چوونکە دڵیان وەك یەکە.

عەبدوالله کوڕی عوبەید، باوکی ئەلکەنود دەڵێت: معاویە، حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری و شورەحبیل کوڕی سیمت و مەعن کوڕی یەزید کوڕی ئەخنەسی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد. کاتێك گەیشتنە لای، من دانیشتبووم. حەبیب ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی: عوسمان کوڕی عەفان خەلیفەیەك بوو ڕێنیشاندەر و پشتی بەکتێبی خواوەند دەبەست و شوێنکەوتەی فەرمانەکانی خواوەند بوو، بەڵام لەژیانی ئەوبێزار بوون، بۆ مەرگی ئەو پەلەتان کرد و هێرشتان کردەسەر و خوێنتان ڕشت. ئەگەر گومان دەکەیت بکوژی ئەو نیت، بکوژەکانی تەسلیمی ئێمە بکە تا لەتۆڵەی خوێنی خەلیفە بیانکوژین، ئەوسا دەست لەخەلافەت هەڵبگرە تا بەڕاوێژ کردن لەنێوان خۆیان

کەسێك وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: ئەی بێ دایك، تۆ کارت بەخەلافەت و دەست هەڵگرتن لەخەلافەت چییە؟ بێدەنگ بە چوونکە کەمتر لەوەیت مافی ئەو قسانەت هەبێت.

دەڵێت: حەبیب هەستا و وتی: لەبارودۆخێکدا دەمبینیت کەپەسەندی ناکەیت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەگەر هەموو سوار و پیادەکانی خۆت بێنیت، چی دەبیت، خواوەند لەناوت ببات ئەگەر من لەناو نەبەیت، سەیری سووکایەتی خۆت بکە. برۆ چیت پێخۆشە درێغی مەکە.

شورەحبیل کوڕی سیمت وتی: منیش ئەگەر لەگەڵ تۆ بدوێم هاوشێوەی هاورێکەی خۆم وەڵام دەبیستم، ئایا وەڵامێکی جیاوازت پێیە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بەڵێ، بۆ تۆ و هاورێکەت وەڵامێکی دیکەیشم هەیە. سپاسی خوای کرد و وتی:

خواوەند پێغەمبەری بەراستی نارد و بەهۆی ئەوەوە لەگومڕایی و بەدبەختی رزگارمان بوو و لەدوو بەرەکی رزگاری کردین. کاتێك ئەرکەکەی خۆی بەسەر برد، ئەوی بۆلای خۆی بردەوە. دوای ئەو خەلکان ئەبوبەکەریان وەك خەلیفەی خۆیان دەستنیشان کرد، ئەبوبەکریش عومەر کوڕی خەتابی وەك خەلیفە دەستنیشان کرد. هەردووکیان چاکەکار بوون و دادپەروەرییان کردە پیشە، ئێمە لەوان رەنجاو بووین چوونکە خەلافەتیان لەدەست بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) وەرگرت، بەڵام چاومان لەمە پۆشی. دوای ئەوان عوسمان خەلافەتی گرتەدەست و ئەو کارانەی کرد کەخەڵکان پەسەندیان نەکرد و هێرشیان کردەسەر و خوێنیان رشت. دوای ئەوە خەڵکان لەدەروی من کۆبوونەوە لەکاتێکدا لەکاروباری ئەوان بەدوور بووم، وتیان: بەیعەت بکە. ئەگەر بەیعەت نەکەیت، دوو بەرەکی لەناو خەڵکان دروست دەبێت. بەیعەتم کرد و نیگەرانیم نەبوو جگە لەنارازی بوونی دوو کەس کە بەیعەتیان لەگەڵ من کردبوو هەروەها دژایەتی معاویە کوڕی ئەبو سوفیان کەخواوەند لەم دینەدا هیچ پێشینەیەکی باشی

پێنەبەخشیوە. دەستەیەك بوون لەدەستەكانی دژی موسوڵمانان و باوكی دوژمنی خوا و پێغەمبەر (د.خ) بوو تا ئەو كاتەی بەناچاری باوەڕیان بەئیسلام هێنا. سەیرە ئێوە لەگەڵ ئەوان دژایەتی ئێمە دەكەن و شوێنكەوتە و گوێڕایەڵی ئەون و بنەماڵەی پێغەمبەرتان پشتگوێ خستووە لەكاتێكدا دژایەتی كردنی ئەوان ڕەوا نییە و نابێت كەس لەگەڵ ئەوان بەرابەر بكەن. دڵنیابن من پێشنیاری گەڕانەوە بۆ لای خواوەند و فەرموودەكانی ئەوتان پێدەكەم و دەمەوێت سوونەتەكانی پێغەمبەر (د.خ) دووبارە زیندوو بكەمەوە. ئەمە دەڵێم و بۆ ئێوە و هەر ژن و پیاوێكی باوەڕدار داوای بەخشین و لێخۆش بوون دەكەم.

وتیان: شایەتی بدە عوسمان كوڕی عەفان بەستەم كوژرا.

وتی: نەدەڵێم بەستەم كوژرا و نەدەڵێم ستەمگەر بوو بۆیە كوژرا.

وتیان: هەركەس باوەڕی بەوە نەبێت عوسمان بەستەم كوژراوە، ئێمە لێی بێزارین.

دواتر هەستان و ڕۆشتن و عەلی كوڕی ئەبی تالیب ئەم ئایەی خوێندەوە:

((انك لاتسمع الموتى و لا تسمع الصم الدعاء اذاولوا مدبرين و ما انت بهادى العمى عن ضلالتهم ان تسمع الامن يؤمن بآياتنا فهم مسلمون.

واتاكەی: بێگومان تۆ ناتوانیت ئەم بانگەوازە بخەیتە ناو دڵی مردوو و كەڕولاڵەكانەوە، بەتایبەت كاتێك ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەكەن. (بڕیاری داخستنی گوێ و دڵیان دەدەن) تۆ ناتوانیت ڕێنومایی كوێر و نابیناكان بكەیت و لەتاریكی ڕزگاریان بكەیت، تۆ تەنها دەتوانیت ڕاستی بدەیت بەگوێی ئەو كەسانەدا كەباوەڕ بەئایەتەكان و فەرمانەكانی ئێمە دەهێنن چوونكە ئەوانە هەمیشە ملكەچی فەرمانەكانی خواوەندی گەورەن.))

دواتر ڕووی كردە هاوەڵانی خۆی و وتی: ئاگادار بن ئەوان لەگومڕایی خۆیان و ئێوە لەسەر ڕاستی و فەرمانبەری كردنی پەروەردگار تێكۆشاتر نەبن.

جەعفەر كوڕی حوزەیفە لەبنەماڵەی عامر كوڕی جەوین دەڵێت: عابد كوڕی قەیسی حەزمەری لەسەفین ئالاكەی لەدەست عودەی كوڕی حاتەم وەرگرت چوونكە دەستەی حەزمەر لەمناڵەكانی عودەی، دەستەی حاتەم، زیاتر بوو.

عەبدوالله کوڕی خەلیفەی تایی بەولانی لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب دژایەتی ئەوانی کرد و وتی: ئەی منالەکانی حەزمەر! هێرش دەکەنە سەر عودەی، مەگەر لەنێوان ئێوە کەسێکی هاوشێوەی عودەی هەیە یا لەنێوان باوکانتان کەسێکی هاوشێوەی باوکی عودەی هەیە؟ مەگەر پاسەوانی مەشك نەبوو و لەرۆژی ئاوگرتن پارێزگاری لەئاوەکە نەکرد.؟ مەگەر باوکی یەك لەسەر چواری وەرنەدەگرت؟ مەگەر باوکی بەخشندەی عەرەب نەبوو؟ مەگەر باوکی مالی خۆی بێ دریغ نەدەبەخشی و پشتیوانی لەدراوسێکانی خۆی نەدەکرد؟ مەگەر کەسێك نەبوو ناپیاوی و خراپەکاری و نەزانی لێ نەدەبینرا و منەتی نەخستە سەرکەس و نەدەترسا؟ لەناو باوکانی خۆتان کەسێکی هاوشێوەی باوکی ئەو بدۆزنەوە یا لەنێوان خۆتان کەسێکی هاوشێوەی وەك ئەو. مەگەر لەئیسلام لەهەمووتان لەپێشتر نییە؟ مەگەر نێردراوی ئێوە بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) نەبوو؟ مەگەر لەرۆژی جەنگی نوخەیلە و رۆژی قادسیە و جەنگی مەداین و جەنگی جەلەولا و جەنگی نەهاوەند و جەنگی شوشتەر، سەرکردەی ئێوە نەبوو؟ چیتان لەو دەوێت! سوێند بەخوا کەس لەباوەڕداران لەگەڵ داواکەی ئێوەدا نییە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی کوڕی خەلیفە! بەسە. ئەی خەڵکینە کۆببنەوە و دەستەی تەی ش بێنن.

دەڵێت: کاتێك هەموویان هاتن، عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لەم جەنگانە کێ سەرکردەی ئێوە بوو؟

خەڵکانی تەی وتیان: عودەی.

کوڕی خەلیفە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەوان بپرسە ئایا لەسەرکردایەتی عودەی دڵخۆش نین؟

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پرسیاری کرد و وەلامیان دایەوە: بۆنا، دڵخۆشین.

وتی: ئالاکە بدەن بەعودەی چوونکە مافی خۆیەتی.

منالەکانی حەرمەز سکالایان کرد و عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەو پێش ئەمە سەرکردەتان بوو، هەمووان جگە لەئێوە بەسەرکردایەتی ئەو رازین. من گرنگی بەدەنگ و بۆچوونی زۆرینە دەدەم. عودەی ئالاکەی هەڵگرت.

## پێکهێنانی دەستەکان و ئامادە کردنی خەڵکان بۆ جەنگ

دەڵێت: خەڵکان چاوەڕوان بوون تا ئەو کاتەی کۆتایی مانگی موحەڕەم نزیک بوویەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەمورسەد کوڕی حارسی جوشەمی فەرمانیدا لەکاتی ئاوابوونی هەتاو لەنێوان خەڵکانی شام بەدەنگی بەرز هاوار بکات: ئاگاداربن سەروەری باوەڕداران پێتان دەڵێت مۆڵەتم پێدان بۆ ئەوەی بۆ لای راستییەکان بگەڕێنەوە و لەفەرموودەکانی خواوەند بەڵگەم بۆ ئێوە هێنایەوە و پێشنیاری گەڕانەوەم پێکردن بەلاّم دەستتان لەسەرکێشی هەڵنەگرت و بەراستییەکان رازی نەبوون. هەنووکە دادپەروەرانە شەڕ لەگەڵ ئێوە رادەگەیێنم چوونکە خواوەند خیانەتکارانی خۆش ناوێت.

دەڵێن: خەڵکانی شام بەهەلاّتن لەدەوری سەرکردەکانیان کۆبوونەوە، معاویە و عەمرۆ کوڕی عاص ڕۆشتنە ناو خەڵکان و سەرقاڵی ئامادە کردنی خەڵکان بوون و ئاگریان پێکرد.، عەلی کوڕی ئەبی تالیبش ئەو شەوەی بەئامادە کردەی سوپاکەی سەرقاڵ بوو، دەستەکانی پێکدەهێنا و بەناویاندا دەسوڕا و هانی دەدان.

عەبدولرەحمان کوڕی جوندەبی ئەزدبی لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەهەرجەنگێك شان بەشانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب رووبەرووی دوژمن دەبوینەوە، فەرمانی دەدا و دەیوت: جەنگ دەستپێمکەن تا ئەو کاتەی ئەوان جەنگ دەستپێدەکەن چوونکە سپاس بۆ خوا ئێوە بەڵگەتان بەدەستەوەیە و ئەوەی ئەوان جەنگ دەستپێدەکەن بەڵگەیەکی دیکەیە، کاتێك جەنگتان دەست پێکرد و شکستتان پێهێنان، هەلاّتووان مەکوژن، بریندارەکان بێ گیان مەکەن، شەرمی کەس ئاشکرا مەکەن، ئەندامی کوژراوەکان مەبڕنەوە. کاتێك گەیشتنە سەرزەمینی دوژمنەکەتان، هیچ پەردەیەك مەدڕێنن، بێ مۆڵەت مەڕۆنە هیچ ماڵێك و سامانەکانیان تالاّن مەکەن جگە لەو شتانەی لەئوردووگاکەیان دەستتان بەسەردا گرتووە، ئەگەر چی جوێنتان پێبدەن و ئیهانەی سەرکردە و سەروەرەکانتان بکەن چوونکە گیان و جەستەیان لاوازە.

حەزرەمی دەڵێت: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبم بیست لەسێ جەنگدا خەڵکی هان دەدا: لەجەنگی سەفین و جەمەل و نەهرەوان، دەیوت: ئەی بەندەکانی خواوەند، لەخوا بترسن، چاوەکان پشتگوێ بخەن و دەنگەکان دامرکێننەوە، کەمتر قسە بکەن و بۆ شەڕ و رووبەروو بوونەوە و شمشێر وەشاندن و پەلاماردان و دەستەویەخە بوون ئامادە بن. پێداگری بکەن و بەردەوام بیری خواوەند بکەنەوە، ئەگەری هەیە سەرکەوتن بەدەست بێنن، دووبەرەکی لەناوتاندا دروست نەبێت چوونکە شکست دەخۆن و هێزەکانتان لەناو دەچێت. خۆڕاگربن چوونکە خواوەند لەگەڵ خۆڕاگرانە. خواوەند سەبریان زیاد و سەرکەوتنیان پێ ببەخشە و پاداشتیان بۆ دیاری بکە.

دەڵێت: بەرەبەیانان عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسانێکی وەك فەرماندەی باڵی راست و چەپ و پیادە و سوارەکان دەستنیشان کرد.

فوزەیل کوڕی خودەیجی کێندی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری وەك فەرماندەی سوارەکانی کوفە دەستنیشان و سەهل کوڕی حەنیفی وەك فەرماندەی سوارەکانی بەسرە دیاریکرد. هاشم کوڕی عوتەبە هاورێیەتی دەکرد و ئاڵاکەی بەدەستەوە بوو، مەسعەر کوڕی فەدەکی تەمیمی وەك فەرماندەی قورئان خوێنەکانی بەسرە و فەرماندەیی قورئان خوێنەکانی کوفە بە عەبدوالله کوڕی بودەیل و عەمار کوڕی یاسر بوو.

قاسم موالی یەزید کوڕی معاویە دەڵێت: معاویە، کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیری وەك فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی و حەنیف کوڕی موسلیمەی فێهری وەك فەرماندەی باڵی چەپ دانا. ئەو رۆژەی لەدیمەشقەوە بەرێکەوت باوکی ئەعوەری سولەمی کەفەرماندەی سوارەکانی دیمەشق بوو، وەك پێشەنگ دەستنیشان کرد، عەمرۆ کوڕی عاس سەرکردەی هەموو سوارەکانی شام بوو، موسلیم کوڕی عوقەبەی موڕی سەرکردەی پیادەکانی دیمەشق و زوحاك کوڕی قەیسی فێهری سەرکردەی پیادەکان بوو. کەسانێك لەخەڵکانی شام پەیمانی مەرگیاندا و بەدەستارەکان خۆیان بەستەوە. ئەوانەی خۆیان بەستبوویەوە پێنج ریز بوون و هەموویان پێنج ریزیان پێکدەهێنا. خەڵکانی عێراقیش یانزە ریز

بوون.

دەڵێت: لەیەکەم رۆژی سەفین دوو دەستە جیابوونەوە و جەنگان.

لەم رۆژەدا سەرکردەی خەڵکانی کوفە ئەشتەر و سەرکردەی خەڵکانی شام حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری بوو. ئەم جەنگە لەرۆژی چوارشەممەدا بوو. رۆژیان بەجەنگێکی قورس بەسەر برد و دواتر گەڕانەوە. هەر دوو دەستەکە زیانێکی زۆریان لەیەکدا.

دوای ئەوە هاشم کوڕی عرتەبە لەگەڵ دەستەیەك سوار و پیادە وەکەرەستەی جەنگ رووی کردە گۆڕەپان و باوکی ئەعوەر رووبەرووی بوویەوە، رۆژیان بەجەنگ بەسەر برد. سوارەکان هێرشیان دەکردە سەر سوارەکان و پیادەکان هێرشیان دەکردە سەر پیادەکان. دواتر گەڕانەوە. هەردوو سوپا لەبەرابەر یەك خۆڕاگرییان کرد.

رۆژی سێیەم عەمار کوڕی یاسر هات، عەمرۆ کوڕی عاس رووبەرووی بوویەوە و جەنگێکی قورسیان دەستپێکرد. عەمار دەیوت: ئەی خەڵکانی عیراق دەتانەوێت کەسێك ببینن کەدوژمنایەتی پێغەمبەری خواوەندی دەکرد و لەگەڵ ئەوان جەنگی و دژی موسوڵمانان ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و هاوکاری نابـاوەڕانی دەکرد و کاتێك بینی خواوەند هێز بەدینەکەی و سەرکەوتن بە پێغەمبەرەکەی دەبەخشێت، لەترسا نەك بەدڵخواز باوەڕی بەئیسلام هێنا. دوای ئەوە پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوایی کرد. سوێند بەخوا ئەم پیاوە بەردەوام بۆ دژایەتی کردنی موسوڵمانان و ئاسانکاری بۆ خراپەکاران بەناوبانگ بووە، لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن و بجەنگن چوونکە دەخوازێت رووناکی خواوەند خامۆش بکات و سەرکەوتن بەدوژمنانی خواوەند ببەخشێت.

دەڵێت: زیاد کوڕی نەزر هاورێیەتی عەماری دەکرد و سەرکردەی سوارەکان بوو. عەمار پێی وت لەگەڵ سوارەکان هێرش بکە سەر سوارەکان. ئەو هێرشی بردو سوپاکەی عەمرۆ کوڕی عاس رووبەرووی بوونەوە و خۆڕاگرییان کرد. عەماریش شان بەشانی پیادەکان هێرشی کردە سەر پیادەکان و پاشەکشێی بەعەمرۆ کوڕی عاس کرد.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا زیاد کوڕی نەزر لەگەڵ زڕ براکەی خۆی لەدایکەوە بەناوی عەمرۆ، کوڕی معاویە کوڕی مونتەفیق ڕووبەڕوو بوویەوە. دایکیان ژنێك لەمنداڵەکانی یەزید بوو و کاتێك ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، ناو و ڕەچەڵکی خۆیان وت، کەمێك وەستان و دواتر لەیەك جیابوونەوە و گەڕانەوە بۆ ناو سوپاکەی خۆیان.

ڕۆژی دواتر محەممەد کوڕی عەلی و عوبەیداللە کوڕی عومەر هەرکام لەگەڵ دەستەیەکی فراوان ڕوویان کردە گۆڕەپانی جەنگ و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. عوبەیداللە کەسی بۆ لای کوڕی حەنیفە نارد و داوای کرد بڕواتە لای.

محەممەد کوڕی حەنیفە ڕازی بوو و بەڕێکەوت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی بینی و وتی: ئەم دوو شەڕکەرە کێن؟

وتیان: کوڕی حەنیفە و عوبەیداللە کوڕی عومەر.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوار چوارپێکەی خۆی بوو و هاواری لە محەممەد کرد و پێی وت: چوارپێکەی من ڕابگرە.

کوڕی حەنیفە چوارپێکەی گرت و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەو ڕووی عوبەیداللە کوڕی عومەر ڕۆشت و وتی: بۆ شەڕی تۆ هاتووم، وەرە پێش.

عوبەیداللە وتی: پێویستم بەشەڕ کردن لەگەڵ تۆ نییە.

وتی: وەرە.

وتی: نە.

دەڵێت: کوڕی عومەر گەڕایەوە، کوڕی حەنیفە بەباوکی خۆی دەوت: باوکە گیان بۆ ڕێگەت نەدا ڕووبەڕووی ببمەوە؟ سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگەت پێدەدام هیوادار بووم بتوانم بیکوژم.

وتی: ئەگەر ڕووبەڕووی دەبویتەوە هیوادار بووم بتوانی بیکوژیت بەلام ترسام بتکوژێت.

وتی: باوکە گیان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕۆشتیت! سوێند بەخوا ئەگەر باوکی دەیویست ڕووبەڕووی تۆ شەڕ بکات، ئەم کارەم بەشیاوی تۆ نازانی.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کوڕی خۆم، تەنیا بەچاکە ناوی ئەو بێنە سەر زمان.

دەڵێت: خەڵك لەیەك جیابوونەوە وگەڕانەوە بۆ ناو ئوردووگاکانی خۆیان.

دەڵێت:رۆژی پێنجەم عەبدوالله کوڕی عەباس و وەلید کوڕی عوقەبە روویان کردە گۆڕەپانی جەنگ و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. کوڕی عەباس لەوەلید کوڕی عوقەبە نزیك کەوتەوە، وەلید کوڕی عەبدولموتەلیبی جوێنباران کرد، دەیوت: ئەی کوڕی عەبلس، ڕێزتان لەپەیوەندی خزمایەتی.نەگرت.و پێشەواکەتان کوشت. بینیتان خواوەند چ بەڵایەکی بەسەر هێنان، ئەوەی خوازیار بوون پێی، بەئێوەی نەدا و بەئارەزووەکانتان نەگەیشتن، هیوادارم خواوەند لەناوتان ببات و سەرکەوتن بەنەیارەکانتان ببەخشێت.

دەڵێت: کوڕی عەباس کەسی نارد و پێشنیاری شەڕی دەستەویەخەی پێکرد بەڵام رازی نەبوو.

دەڵێت: لەو رۆژەدا کوڕی عەباس ئازایانە جەنگا و خۆی هێرشی دەکردە سەر دوژمنان، دوای ئەوە قەیس کوڕی سەعدی ئەنساری و کوڕی زی ئەلکەلاع حەمیری روویان لەگۆڕەپانی جەنگ کرد و شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد. ئەم جەنگە لەرۆژی شەشەم روویدا.

دوای ئەوان ئەشتەر هاتە گۆڕەپانی جەنگ و حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری رووبەرووی بوویەوە. ئەم جەنگە لەرۆژی حەوتەم بوو. شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد و لەکاتی نیمەڕۆ گەڕانەوە. هیچ کام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. ئەم جەنگە لەرۆژی سێ شەممە روویدا.

زەید کوڕی وەهب دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: تا کەی بەهەموو هێزی خۆمانەوە رووبەروویان نەبینەوە؟ ئێواری سێ شەممە و شەوی چوارشەممە لەناو خەڵکان وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی ئەوەی بیشکێنێت، خۆی ناگرێتەوە و هەرکەس بەهێز بکات، کەس ناتوانێت بیشکێنێت، ئەگەر دەیخواست دووکەس لەئافرێنراوەکانی دژایەتی یەکیان نەدەکرد و ئۆمەت سەبارەت بەهیچ شتێك لەکارەکانی خۆیان گرفتاری

دووبەرەکی نەدەبوون و خراپەکار حاشای لەلەپێشی کەسانی دیکە نەدەکرد. چـارەنووس، ئێمــە و ئــەو خەڵکــەی هێناوەتــە ئێــرە و رووبــەرووی یــەکی کردوویینەتەوە. هەنووکە خواوەند بینا و بیسەری ئێمەیە، ئەگەر دەیخواست بۆ سزادانی ئـەوان پەلـەی دەکـرد و ئاڵگۆڕێکی لـەم کـارەدا بـەدی دەهێنـا و سـزای ستەمکاری دەدا و سـەرئەنجام راسـتییەکانی ئاشـکرا دەکـرد بـەڵام خواوەنـد ئـەم دنیایی کردۆتە خانووی کردەوەکانی ئێمە و ئەو دنیایی وەك رۆژی لێپرسینەوە دیاری کردووە تا هەڵـەی خراپـەکاران سـزا و جـەزای خێری چاکەکاران بداتـەوە. بزانن بەیانی رووبەرووی ئەو خەڵکە دەبنەوە، ئەمشەو تا دەتوانن نوێژ بخوێنن و بـەردەوام قورئـان بخوێننـەوە و داوای سـەرکەوتن لـە خواوەنـد بکـەن. بـەیانی بەهەموو هێزتانەوە رووبەروویان ببنەوە و راست کردار بن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشت و خەڵك بۆ لای شمشێر و تیروکەوان و ڕمـەکانی خۆیـان ڕۆشـتن و سـەرقاڵی ئامـادە کردنیـان بـوون. کـەعب کـوڕی جوغـەیلی تەغلـەبی لای ئـەوان گـوزەری کـرد و هۆنراوەیـەکی خوێنـدەوە بـەم ناوەرۆکە:

((ئۆمەت گرفتاری کارێکی سەیر بووە
بەیانی پاشایەتی بۆ ئەو کەسە دەبێت سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت
وتەیەکی راست دێنمە سەر زمان و درۆی تیا نییە
بەیانی سەرکردەکانی عەرەب دەکوژرێن))

دەڵێت: کاتێك شەو داهات، عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتەدەر و هەموو شەوی بـەئامادە کردنـی سـوپاکەی بەسـەر بـرد و بـۆ بـەیانی، سـوپاکەی هێرشیان بـرد. معاویەیش لەگەڵ خەڵکانی شام هات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیوت: ئەمـە کـام هۆزە؟ ئەمە کام هۆزە؟

لەهۆزەکانی شام ئاگاداریان کردەوە و کاتێك ئەوانی ناسییەوە و شوێنەکانی ئــەوانی زانــی، بەخــەڵکانی ئــەزدی وت رووبــەرووی ئەزدییــەکان ببنــەوە، بەخەسـعەمییەکانی وت رووبـەرووی خەسـعەمییەکان ببنـەوە و بەهـەر هۆزێـك لەعێراقییەکانی وت رووبەرووی هۆزەکەی خۆیان لەخەڵکانی شام ببنـەوە مەگەر

ئەو هۆزەی لەخەڵکانی ئەوان لەناو سوپاکەی شامدا نەدەبینرا کەئەوانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هۆزەکانی دیکە نارد وەك بوجەیلە کەژمارەیەکی کەمی ئەوان لەشام ژیانیان بەسەر دەبرد و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی لەخمییەکان ئەوانی ڕەوانە کرد.

ڕۆژی چوارشەممە سوپاکە هێرشی برد و شەڕێکی گەورەیان دەستپێکرد. لەکاتی شەو گەڕانەوە بێ ئەوەی هیچ کامیان بتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن.

بەرەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەتاریك و ڕوونی بەیایندا نوێژی خوێند.

عەبدوالرەحمان کوڕی جوندەبی ئەزدی دەڵێت: هەرگیز نەمبینیبوو عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاوشێوەی ئەو شەوە لەتاریکیدا نوێژ بکات. دواتر لەگەڵ سوپاکەی هێرشی کردە سەر خەڵکانی شام و شەڕی دەستپێکرد. کاتێك هەستیان بەهێرشی ئەو دەکرد، ڕووبەڕووی دەبوونەوە.

زەید کوڕی وەهبی جوهەنی دەڵێت: بەرەبەیانی چوارشەممە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەڵکانی شام بەرێکەوت و کاتێك لەبەرابەر ئەوان جێگیر بوو، وتی: پەروەدگاری ئاسمانەکان و زەوی، سەرکەوتنمان پێ ببەخشە و لەدەستدرێژی بمانپارێزە ور استییەکان ئاشکرا بکە، ئەگەر سەرکەوتنت بەوان بەخشی، شەهادەت بەمن ببەخشە و پاشماوەی هاوەڵانم لەفیتنە و ئاژاوە بەدوور بگرە.

دەڵێت: ڕۆژی چوارشەممە سوپاکان هاتن و هەموو ڕۆژ تا ئاوا بوونی خۆریان بەجەنگ بەسەر برد. تەنیا لەکاتی نوێژ دەستیان لەجەنگ هەڵدەگرت. کوژراوەکان لەهەر دوو لا فراوان بوو. لەکاتی شەو لەیەك جیابوونەوە و کەسیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بوو.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەتاریکیدا نوێژی لەگەڵ خەڵکان خوێند، دواتر بۆ جەنگی خەڵکانی شام بەرێکەوت و کاتێك لەهاتنی ئەو ئاگادار بوونەوە، لەگەڵ سەرکردەکانی خۆیان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە هاتن. عەبدوالله کوڕی بودەیل فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی

تالیب و عەبدوالله کوڕی عەباس فەرماندەی باڵی چەپ بوو. فەرماندەی قورئان خوێنەکانی عێراق سێ کەس بوون: عەمار کوڕی یاسر و قەیس کوڕی سەعد و عەبدوالله کوڕی بودەیل. کەسان لەژێر ئاڵاکان و جێگەکانی خۆیانا بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ خەڵکانی مەدینە لەناوەڕاستی سوپا لەنێوان خەڵکانی کوفە و بەسرە جێگیر ببوو. زۆربەی خەڵکانی مەدینە کەهاورێیەتی ئەویان دەکرد لەئەنسارییەکان پێك دەهاتن. لەناو خەڵکانی خوزاعە و کەنانە و خەڵکانی مەدینە، جگە لەئەنسارییەکان خەڵکانێکی دیکە هاورێیەتی ئەویان دەکرد. بەم سوپایە هێرشی کردە سەر نەیارەکانی.

معاویە خێوەتێکی گەورەی هەڵدا بوو. زۆربەی خەڵکانی شام پەیمانی مەرگیان لەگەڵ بەستبوو. سوارەکانی دیمەشقی لەدەوری خێوەتەکەی خۆی جێگیر کردبوو. عەبدوالله کوڕی بودەیل لەگەڵ کەنارەکانی باڵی راستی سوپا هێرشی کردە سەر حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری و بەردەوام شەڕی لەگەڵ دەکردن و سوارەکانی ئەوی لەکەنارەکانی چەپ دوور دەکردەوە. لەکاتی نیمەڕۆ بۆ لای خێوەتەکەی معاویە پاشەکشێی پێکردن.

زەید کوڕی وەهبی جوهەنی دەڵێت: کوڕی بودەیل لەگەڵ هاوەڵانی خۆی دووا و وتی: ئاگاداربن معاویە بانگەشەی شتێك دەکات شیاو نییە بۆی و لەسەر خەلافەت نەیاری کەسێك دەکات کەهاوشانی ئەو نییە. بەهۆی ناڕاستییەوە دەخوازێت راستییەکان لەناو ببات. لەگەڵ بەدەوییەکان و ئەحزاب دژی ئێوە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و گومڕایی بۆ ئەوان رازاندۆتەوە و ئارەزوومەند بوون بۆ ئاژاوە و فیتنەی لەناو دڵی ئەواندا دروست کردووە. راستییەکانی لەوان شێواندووە و نەزانی ئەوانی زیاتر کردووە. ئێوە شوێنکەوتەی نووری ئیلاهین و بەڵگەی روونتان لەبەردەستایە. لەگەڵ ئەم یاخیە ستەمکارانە بجەنگن و لێیان مەترسن، چۆن لەوان دەترسن لەکاتێکدا کتێبی خواوەند لەدەستەکانی ئێوەدایە. لێیان مەترسن ئەگەر باوەڕدارن تەنیا دەبێت لەخواوەند بترسن. لەگەڵیان بجەنگن تا خواوەند لەسەر دەستی ئێوە ئازاریان بدات و ریسوایان بکات و سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت. جارێك شان بەشانی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ ئەوان جەنگاوین و

هەنووکە جاری دووەمە. سوێند بەخوا ئەم جارە خواپەرەستتر و راست کردارتر نین. هێرش بکەنە سەردوژمن هیوادارم خواوەند سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت.

دواتر لەگەڵ هاوەڵانی خۆی شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد.

باوکی عەمرەی ئەنساری دەڵێت: لەجەنگی سەفین عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوپاکەی هاندەدا و دەیوت: خواوەند ڕێگەیەکی بۆ کردوونەتەوە تا بەو شێوەیە لەئازابی گیان پروکێن رزگارتان بکات، یانی باوەڕ بە خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) و جیهاد لەرێگەی دین کەخولوەند چاکەی ئەم کارە دەکاتە هۆکاری لەناو بردنی گوناحەکان و ماڵە پاك و خاوێنەکان لەبەهەشتی عەدەن.

خواوەنــد فەرموویــەتی: ئــەو خەڵکــەی لەرێگــەی ئــەودا بــەریز دەجــەنگن کەهاوشێوەی بینایـەکی بـەهێز و تۆکەمـەن، خـۆش دەوێـت، ریزەکـانی خۆتـان هاوشێوەی بینایەکی تۆکمە و بەهێز دروست بکەن. زرێپۆشەکان لەپێشەوە بن و بێ زرێکان لـەدواوە. ددانـەکان لەیـەك گیر بکـەن تـا شمشێرەکان بۆیرانـە لـەکالآن دەربکێشن. دەوری ڕمـەکان دابپۆشـن چوونکە باشتر سـەری ڕمـەکان دەپارێزن. چـاوەکانتان ببەسـتن تـا دڵتـان بـەهێزتر بێـت و ناختـان ئاسـوودە. دەنـگ نـزم بکەنـــەوە چـــوونکە لەرێزدارییـــەوە نـــزیکترە و ســـەرنەکەوتن دوور دەخاتـــەوە. ئالآکانتـان خـوار مەکـەن و تـەنیا بەکەسـە بوێرەکـانی بـسپێرن چـوونکە ئـەوان پـارێزەری رێـز و خـۆڕاگری لـەکاتی ڕوودانـی کارەسـات و پێـشهاتە چـاوەڕوان نـەکراوەکانن، ئـەوان لـەدەوری ئالآکـە دەجـەنگن و هـیچ کـات پـشتگوێی ناخـەن و پشتی تێناکەن. خواوەند بتانبەخشێت، کەسێك ئەرکـەکانی خـۆی بەسـەر دەبـات کەبەرگری لەخۆی بکات و تا گیان هاوکاری کەسی نزیکی خۆی بکات و کارەکان و قورسایی کێشەکان نەخاتە سەرشانی کەسی تەنیشتی، ئەمە شیاوی سەرکۆنە کردنـە. شـیاو نییـە کەسـێك لەگـەڵ دوو کـەس بجـەنگێت و ئـەوی دیکـە دەسـتی هـەڵگرتبێت و قورسـایی شـەڕ لەگـەڵ دوو کەسـی خـستبێتە سـەر شـانی کەسـی تەنیشتی خۆی، هەرکـەس ئـەم کـارە بکـات خواوەنـد بەنەحلـەتی دەکـات. مەرۆنـە بەردەم دەرگای غەزەبی خواوەند چوونکە سـەرئەنجام هـەمووان بۆ لای خواوەند دەگەرێینەوە، بێژەری ئازیز بەدەستەیەك دەڵێت: ((لن ينفعكم الفرار ان فررتم مـن

الموت او القتل و اذا لا تمتعون الا قليلا.

واتاکەی: ئەگەر لەمردن یاکوژران هەڵبێن، هەلاتن هیچ سوودێکتان پێ نابەخشێت چوونکە لەم شێوەیە تەنیا ماوەیەکی کەم تەمەنتان درێژ دەبێتەوە))

سوێند بەخوا ئەگەر لەشمشێری گۆڕەپانی جەنگ پارێزراو بن لەشمشێری ئەو دنیا پارێزراو نین. لەراست کرداری و خۆڕاگری داوای هاوکاری بکەن چوونکە خواوەند دوای خۆڕاگری سەرکەوتن دەبەخشێت.

## تێکۆشان لەجەنگ

باوکی روەقی هەمەدانی دەڵێت: یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی خەڵکی هاندەدا و دەیوت: موسوڵمانی پاك ئەو کەسەیە دین و بۆچوونەکەی پاك بمێنێتەوە. سوێند بەخوا ئەم خەڵکە لەبەر ئەوە لەگەڵ ئێمە ناجەنگن کەدینمان بەفیرۆ دابێت یا راستییەکانمان پێشێل کردبێت، بۆ مەبەستەکانی ئەم دنیا لەگەڵ ئێمە دەجەنگن و دەبنە پاشا ستەمکارەکان، ئەگەر بەسەر ئێوەدا سەرکەوتن، هیوادارم خواوەند سەرکەوتنیان پێنەبەخشێت و دڵخۆشیان نەکات، کەسانی وەك سەعید و وەلید و عەبدوالله کوڕی عامری نەزان دەکەنە فەرمانڕەوا و سەرکردەی ئێوە کە لەدانیشتنێکدا بڕە پارەیەکی زۆر بەرابەر لەگەڵ خوێنی خۆی و باوکی وباوەگەورێی بەکەسێك دەبەخشێت و دەڵێت ئەمە سامانی خۆمە و هیچ هەڵەیەکم نەکردووە، دەڵێی میراتی دایك و باوکیان دەبەخشن و نازانێت ئەم سامانە تایبەتە بەخواوەند کە بەهۆی شمشێر و ڕم کردوویەتی بەتالانی ئێمە. ئەی خەڵکینە لەگەڵ ستەمکاران کەدژایەتی فەرموودەکانی خواوەند دەکەن، بجەنگن و بۆجەنگ لەگەڵ ئەوان لەسەرکۆنەی سەرکۆنەکەران مەترسن چوونکە ئەگەر بەسەر ئێوەدا سەرکەون دین و دنیایی ئێوە بەفیرۆ دەدەن. ئەوانتان ناسیوە و تاقیکراونەتەوە، سوێند بەخوا هەنووکە شەڕ و بەلای ئەوان زیادی کردووە.

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی بودەیل لەگەڵ بالی راست، شەڕێکی قورسی دەستپێکرد تا گەیشتنە خێوەتەکەی معاویە. ئەوانەی لەگەڵ معاویە پەیمانی

مـەرگیان بەسـتبوو، ڕۆشـتنە لای و پێـی وتـن: لەبەرابـەر كـوڕی بودەیـل و بـاڵی ڕاستی سوپاكەی، خۆڕاگری بكەن. كەسی عەلی كوڕی ئەبی تالیب بۆلای حەبیب كوڕی موسلیمەی فیهری نارد كە فەرماندەی باڵی چەپی سوپاكە بوو، فەرمانی پێدا هێرش بكاتە سەر باڵی ڕاستی سوپای خەڵكانی عێراق. حەبیب ئەو كارەی كـرد و شكـستی بـەباڵی ڕاسـتی سـوپای عێـراق هێنـا و پاشەكـشێیان كـرد. لەسـوپاكەیان جگـە لـەكوڕی بودەیـل و دووسـەد یـا سێـسەد كـەس لـەقورئان خوێنەكان كەس نەمایەوە. ئەم دەستەیە پشتیان بەپشتی یەكەوەدا و كەسانی دیكە هەڵاتن. عەلی كوڕی ئەبی تالیب فەرمانی بەسەهل كوڕی حەنیفدا و لەگەڵ سـوپاكەی خـۆی لەخـەڵكانی مەدینـە پێـشڕەوی كـرد و دەسـتەیەكی فـراوان لەشامییەكان بۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەیان هـاتن بـەڵام سـەهل سـوپاكەی خۆی بردە پێش تا پەیوەستی باڵی ڕاستی سوپاكە بوون.

دەڵێت: لەباڵی ڕاست لەنزیك شوێنی جێگیر بوونی عەلی كوڕی ئـەبی تالیـب، یەمەنییـەكان بـوون و كاتێـك پاشەكشێیان كـرد، شكـست لـە عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب نزیـك بوویـەوە و ئـەو پیـادە ڕووی كـردە بـاڵی چـەپی سـوپاكەی بـەڵام لەوێنیش موزێرییەكان پاشەكشێیان كرد و تەنیا خەڵكانی ڕەبیعە مانەوە.

زەیـد كـوڕی وەهـبی جوهـەنی دەڵێـت: عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب لەگـەڵ منداڵـەكانی خـۆی ڕووی كـردە بـاڵی چـەپ و مـن تیرەكـانم دەبینی بەسـەر شـانی ئـەودا گوزەریـان دەكـرد و منداڵـەكانی خۆیـان دەكـردە قـەڵغان بـۆی و پێـشی دەكـەوتن و لـەنێوان ئـەو خـەڵكانی شـام لەمپـەریان دروسـت دەكـرد بـەڵام عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب دەسـتی دەگـرتن و ئـەوانی دەخـستە بـەردەم یـا پشتەسەری خۆی.

ئەحمـەر كەكۆیلـەی ئەبوسـوفیان یـا عوسمـان یـا یـەكێكی دیكـە لەمنداڵـەكانی ئومەیە بوو، ئەوی بینی و وتی: سوێند بەخوای كەعبە، خوا بمكوژێت ئەگەر تۆ نەكوژم مەگەر ئەوەی من بكوژیت. هێرشی كـردە سـەر عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب. كیـسان، كۆیلەكـەی عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب ڕووبـەڕووی بوویـەوە و كۆیلـەی منداڵەكەی ئومەییە توانی كیسان بكوژێت. عـەلی كوڕی ئـەبی تالیـب ڕووبەڕووی

بوویەوە و دەستی خستە ناو گیرفانی زرێکەی و بەرزی کردەوە، دەڵێی هێشتا قاچەکانی دەبینم کە بەر شانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکەوت. ئەوسا بەتوندی کێشای بەزەویدا و هەر دووشانی شکاند. دوو منداڵەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب یانی حسەین و محەممەد هێرشیان کردەسەر و بەشمشێر لێیاندا. دەڵێی هێشتا عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەبینم کەوەستا بوو و منداڵەکانی بەشمشێر لەو پیاوەیان دەدا تا ئەوەی کوشتیان و بۆ لای باوکیان گەڕانەوە. حەسەن وەستا بوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کوڕەکەم، بۆ تۆیش هاوشێوەی دوو براکەت هێرشت نەکردە سەر ئەو پیاوە.

وتی: ئەی باوکە، تەنیا ئەوانی بەس بوو.

دەڵێت: خەڵکانی شام لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب نزیك بوونەوە. سوێند بەخوا نزیك بوونەوەی ئەوان بۆ پەلە کردن ناچاری نەکرد، حەسەن وتی: چی دەبێتە لەمپەر لەوەی رابکەیت و بەخێرایی بگەیتە لای هاوەڵانی خۆت کە لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگری دەکەن؟

وتی: کوڕی خۆم، باوکت ئەجەلێکی هەیە وچاوی لێ ناپۆشێت، درەنگتر لەکاتی خۆی ناگات و هێواش ڕۆشتنی من، ئەجەلەکەم پێش ناخات. سوێند بەخوا گرنگی بەوە نادەم مەرگ یەخەم بگرێت یا من یەخەی مەرگ بگرم.

فەزڵ کوڕی خودەیجی کێندی لەیەکێك لەکۆیلەکانی ئەشتەر دەگێڕێتەوە: کاتێك باڵی راستی سوپای عێراق تێکشکا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب رووی کردە باڵی چەپ، ئەشتەر لای ئەو گوزەری کرد کەبەخێرایی بۆ شوێنی شکستی باڵی راست دەڕۆشت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: مالك!

وتی: ئامادەی بیستنی فەرمانم.

وتی: بڕۆ لای ئەو خەڵکانە و پێیان بڵێ بۆ لەمردن کەرزگار نابن لێی بەرەو ژیان هەڵدێن لەکاتێکدا هەمیشەیی نییە.

دەڵێت: مالك ڕۆشت و رووبەرووی تێکشکاوەکان بوویەوە و لەوتەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگاداری کردنەوە و زیادی کرد: ئەی خەڵکینە لەدەوری من

کۆببنەوە، من مالك کوڕی حارسم، من مالك کوڕی حارسم. دواتر بیری کەوتەوە خەڵکان زیاتر ئەو بەناوی ئەشتەر دەناسن و وتی: من ئەشتەرم، ئەی خەڵکینە لەدەروی من کۆببنەوە. دەستەیەك لەدەوری کۆبوونەوە ودەستەیەکی دیکە ڕۆشتن، ئەشتەر هاواری کرد: ئەی خەڵکانی فلان، ئەمڕۆ گازیان لەباوکتان گرتووە، چەند ترسنۆکانە جەنگان، ئەی خەڵکینە لەدەوری من کۆببنەوە.

تایەفەی مەزحەج لەدەوری کۆبوونەوە، وتی: گازتان لەبەردی ڕەق گرتووە، خواوەندتان رازی نەکرد وبۆ لەناو بردنی دوژمنەکانی هەوڵتان نەدا، بۆ بەم شێوەیە، مەگەر ئێوە کوڕانی جەنگ و هەڵمەت بردن و مەزحەجییانی شمشێر وەشێن نین کەتۆڵە سەندنەوەی ئەوان شەوی بەسەردا نەدەهات و خوێنەکانیان بەفیڕۆ نەدەڕۆشت و پشتیان نەدەکردە گۆڕەپانی جەنگ، سوێند بەخوا ئێوە هێزی سەرزەمینەکەی خۆتانن و ئامادەترین هۆزی هۆزەکانتان، ئەوەی ئەمڕۆ دەیکەن، بەیانی دەیگێڕنەوە، لەوتەکانی بەیانی بترسن و لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگری بکەن و دڵنیابن خواوەند لەگەڵ ڕاست کردارانە. سوێند بەو خوایەی گیانی مالك لەدەستی ئەودایە، ئەم دەستەیە – بەدەستی خۆی ئاماژەی بۆ خەڵکانی شام کرد– لەبەرابەر محەممەدی پێغەمبەر (د.خ) هاوشێوەی باڵی مێشوولەیەك نین، جوان شمشێرتان نەوەشاند، هێرش بکەنە سەر ئەو خەڵکە، ئەگەر خواوەند تێکیان بشکێنێت، دوو باڵەکەیش شکست دەخۆن بەهەمان شێوە کەکۆتایی لافاو بەدوای سەرەتاکەیەوە دێت.

وتیان: بۆ کوێ پێت خۆشە بمانبە.

ئەو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کەنارەکانی باڵی ڕاست ڕۆشت و هێرشی برد و پاشەکشێی پێکردن. دەستەیەك لەگەنجەکانی هەمەدان ڕۆشتنە لای، ژمارەیان هەشسەد کەس بوو و کۆتاییەکانی سوپای دوژمنیان تێکشکاند و باڵی ڕاست بەرادەیەك خۆڕاگرییان کرد کەسەد و هەشتا کەسی دیکە لەوان کوژرا. دوانزەیان لەسەرکردەکان بوون. کاتێك یەکیان دەکوژرا، ئەوی دیکە ئاڵاکەی بەدەستەوە دەگرت. یەکەم کەسیان کورەیب کوڕی شورەیح بوو، دوای ئەو شورەحبیب کوڕی شورەیح، مورسید کوڕی شورەیح، هوبەیرە کوڕی شورەیح، بورەیم کوڕی

شورەیح و دواتر سەمیر کوڕی شورەیح.

کاتێك ئەم شەش برایە کوژران، سوفیان کوڕی زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و دوای ئەو عەبد کوڕی زەید، کورەیب کوڕی زەید. کاتێك ئەم سێ برایە کوژران، عومەیر کوڕی بەشیر ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت، دوای ئەو حارس کوڕی بەشیر کەهەر دووکیان کوژران. دوای ئەوان وەهب کوڕی کورەیب، برای قەلوس ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و مەبەستی ئەوەی کرد پێشڕەوی بکات. یەکێك لەخەڵکەکەی پێی وت: خوا بتبەخشێت، بەم ئاڵاوە بگەڕێرەوە چوونکە گەورەکانی خەڵکەکەت لەژێر ئەو ئاڵایە کوژران، خۆت و پاشماوەی خەڵکەکەت بەکوشتن مەدە.

ئەوان گەڕانەوە و دەیانوت: خۆزگە بەژمارەی ئێمە لەعەرەبەکان بوونیان دەبوو و لەگەڵ ئێمە پەیمانی مەرگیان دەبەست و پێکەوە پێشڕەویمان دەکرد یا دەکوژراین یا سەرکەوتنمان بەدەست دەهێنا. لەکاتێکدا ئەم قسەیان هێنایە سەرزمان، لای ئەشتەر گوزەریان کرد.

ئەشتەر وتی: هەنووکە من پەیمانی مەرگ لەگەڵ ئێوە دەبەستم و بڕیار دەدەم نەگەڕێینەوە تا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین یا دەکوژرێین.

ئەوان ڕۆشتن و شان بەشانی ئەشتەر وەستان.

کەعب کوڕی جوعەیل سەبارەت بەم وتەیە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((هەمەدانییە جەنگاوەرەکان بەدوای هاوپەیماندا دەگەڕان))

ئەشتەر رووی کردە کەنارەکانی باڵی ڕاست و دەستەیەك لەوان کەشەرمیان دەکرد و ئەمەکدار بوون، لەدەوری کۆبوونەوە. ڕووبەڕووی هەر دەستەیەك دەبوونەوە، شکستیان پێدەهێنا. لەم کاتەدا لای نەزر کوڕی زیاد گوزەری کرد کەبەرەو ئوردوگایان دەبرد، وتی: ئەمە کێیە؟

وتیان: زیاد کوڕی نەزر.

عەبدوڵڵە کوڕی بودەیل و سوپاکەی لەباڵی ڕاست دەجەنگان. زیاد هێرشی کردبوو و ئاڵاکەی لەبەرابەر باڵی ڕاست هەڵکردبوو. خۆڕاگرییان کرد و خۆیشی جەنگا تا لەپێ کەوت.

زۆری نەخایاند ئەشتەر لای یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی گوزەری کرد و

ئەویان بەرەو ئوردووگا دەبرد.

وتی: ئەمە کێیە؟

وتیان: یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی. ئەو کاتەی زیاد لەپێ کەوت، ئالاکەی خۆی لەبەرابەر دوژمن هەڵکرد و جەنگی تا لەپێ کەوت.

ئەشتەر وتی: سوێند بەخوا خۆڕاگری و چاکەکاری ئەمەیە، شەرمێنەرە کەسێك بگەڕێتەوە و کەس نەکوژێت یا نەکوژرێت یا ڕووبەڕووی کوژران نەبێتەوە.

حوڕ کوڕی سەیاحی نەخەعی دەڵێت: ئەو ڕۆژە ئەشتەر سوار ئەسپێك و شمشێرێکی یەمەنی بەدەستەوە بوو. کاتێك شمشێرەکەی رادەوەشاند گومانت دەکرد ئاوی لێ دەتکێت و کاتێك بەرزی دەکردەوە، درەوشانەوەی شمشێرەکە چاوی کوێر دەکرد. شمشێری دەوەشاند و دەیوت: سەختییەکان تێپەر دەبن.

دەڵێت: حارس کوڕی جومهانی جوعەفی ئەشتەری بینی بەڵام نەیناسییەوە چوونکە روخساری بەئاسن داپۆشرا بوو. لێی نزیك بوویەوە و وتی: خواوەند لەلایەن سەروەری باوەڕدارن و موسوڵمانان پاداشتی چاکەت بداتەوە.

دەڵێت: ئەشتەر ئەوی ناسییەوە و وتی: ئەی کوڕ جومهان کەسێکی وەك تۆ لەو گۆڕەپانەی منی تێدام، دوور دەکەوێتەوە؟

ئەشتەر پیاوێکی بالابەرزی چوارشانە و ریشێکی درێژی بوو. کوڕی جومهان سەیری کرد و ئەوی ناسییەوە، وتی: بەقوربانت بم، سوێند بەخوا ئێستا تۆم ناسییەوە و لێت جیا نابمەوە تا ئەو کاتەی دەکوژرێم.

دەڵێت: مینقەز و حومەیر، هەر دووکیان ناعتی، کوڕانی قەیس، ئەشتەریان بینی، مینقەز بەحومەیری وت: ئەگەر ئەوەی دەیبینم بەوشێوەیە دەجەنگێت، لەناو عەرەبدا هاوتای نییە.

وتی: دەترسم خوازیاری پاشایەتی بێت.

فوزەیل کوڕی خودەیج لەیەکێك لەکۆیلەکانی ئەشتەر دەگێڕێتەوە: کاتێك زۆربەی تێکشکاوەکانی باڵی راست لەدەوری ئەشتەر کۆبوونەوە، هانیدان و وتی: ددانەکانتان لەیەك گیر بکەن و بەسەرەوە هێرش بکەنە سەردوژمن.

بەشێوەیەك هێرش بەرن کەخەڵکی براکوژراو یا باوك کوژراو هێرش دەکاتە سەر دوژمنەکەی و خوازیاری مەرگن بۆ ئەوەی تۆڵەسەندنەوەیان دوا نەکەوێت و لەم دنیا شەرمەزار نەبن. سوێند بەخوا هیچ خەڵکێك زیانێکی گەورەتر لەزیانی دینی نەبینیوە. ئەم خەڵکە لەسەر دین دەجەنگن تا سوونەتەکان بسڕنەوە و داردە تازەکان بێننە کایەوە و ئێوە بەرەو گومڕایی ببەن. ئەی بەندەکانی خوا، بەشادمانییەوە بۆ زیندوو هێشتنەوەی دینی خواوەند گیان ببەخشن، پاداشتی ئێوە لەئەستۆی خواوەندە و هیوادارم خواوەند بەهەشتتان پێ ببەخشێت. بزانن هەڵاتن لەگۆڕەپانی جەنگ دەبێتە هۆی ریسوایی و ئابڕوچوون و شەرمەزاری ئەم دنیا و ئەو دنیا و لەدەست چوونی تاڵانییەکان.

هێرشی کردە سەر دوژمنان و پاشەکشێی پێکردن. لەکاتی نوێژی عەسر تا نوێژی ئێواریٰ، تا نزیك خێوەتەکەی معاویە پاشەکشیٰ بەدوژمن کرد و خۆی بە عەبدوڵڵە کوڕی بودەیل گەیاند کە لەگەڵ دەستەیەك لەقورئان خوێنەکان، دووسەد یا سێسەد کەس، هاوشێوەی جەستەکان کەوتبوونە سەرزەوی. خەڵکانی شام دەوری ئەوانیان چۆڵ کرد و عێراقییەکان گەیشتنە لای براکانی خۆیان و جارێکی دیکە بەبینینی ئەوان شاد بوونەوە. پرسییان: سەروەری باوەڕداران چی بەسەر هات؟

وتیان: زیندووە و سەرحاڵ، هەنووکە لەباڵی چەپدایە و خەڵکان لەبەردەم ئەودەجەنگن.

وتیان: سپاس بۆ خوا، گومانمان کرد کوژراوە و ئێوەیش لەناوچوون.

عەبدوڵڵە کوڕی بودەیل بەهاوەڵانی خۆی وت: پێشڕەوی بکەین.

ئەشتەر کەسی بۆ لای ئەو نارد و وتی ئەو کارە مەکە، لەگەڵ هاوەڵانی خۆت بمێنەرەوە و بجەنگە چوونکە بەمشێوەیە باشترە و تۆ وهاورێکانت پارێزراو دەبن.

دەڵێت: بەلام رازی نەبوو و لەگەڵ شەرکەرانی خۆی بۆ هێرش کردنە سەر معاویە بەرێکەوت. هاوەڵانی لەتەنیشت ئەو هاوشێوەی کێو بوون. دوو شمشێری بەدەستەوە بوو، لەپێش هاوەڵانی خۆی وەستابوو، هەرکەس لێی

نزیک دەکەوتەوە، بەشمشێر لێی دەدا و خوێنی دەڕشت. بەمشێوەیە حەوت کەسی کوشت.

عەبدوالله کوڕی بودەیل لەمعاویە نزیک کەوتەوە. دوژمن لەهەر لایێکەوە هێرشیان کردەسەر و گەمارۆیان خستە سەر خۆی و دەستەیەك لەهاوەڵانی. جەنگا تا کوژرا و دەستەیەك لەهاوەڵانیشی کوژران و دەستەیەکیان شکست خواردوو گەڕانەوە.

ئەشتەر، کوڕی جومهانی جوعەفی نارد تا هێرش بکاتە سەر ئەو سوپایەیی شوێن هەڵاتوان کەوتبوون. بەمشێوەیە گوشار و زەختی شامییەکانی کەم کردەوە و هەڵاتووان توانیان تەندروست بگەنە لای ئەشتەر. پێی وتن: بۆچوونی من باشتر لەبۆچوونی خۆتان نەبوو؟ مەگەر نەموت لەگەڵ ئێمە بمێننەوە.

معاویە کاتێك کوڕی بودەیل شمشێری دەوەشاند و پێشڕەوی دەکرد، وتبووی: گومان دەکەن ئەم سەرکردەی سوپاکەیە؟ کاتێك کوژرا، کەسی نارد و وتی: بزانن ئەو کێ بوو.

کەسانێك لەخەڵکی شام سەیریان کرد و وتیان: نایناسین.

معاویە خۆی ڕۆشتە سەر جەستەکەی و وتی: بەڵێ، عەبدوالله کوڕی بودەیلە، سوێند بەخوا ئەگەر ژنەکانی خوزاعە دەیانتوانی، لەگەڵ ئێمە دەجەنگان، بیکوژن. عەبدوڵلەیان کوشت و معاویە وتی: سوێند بەخوا بەو شێوەیە کەشاعیر دەڵێت:

(( پیاوی جەنگ، ئەگەر جەنگ گازی لێ بگرێت

ئەویش گاز لەجەنگ دەگرێت

ئەگەر ڕۆژێك جەنگ بارودۆخی لێ دژوار بکات

ئەویش بارودۆخ لەجەنگ دژوار دەکات))

هۆنراوەکە، هۆنراوەی حاتەمی تاییە.

ئەشتەر هێرشی کردە سەر خەڵکانی شام، معاویە لەگەڵ خەڵکانی عەك و ئەشعەرییەکان رووبەرووی بوویەوە. ئەشتەر بەهۆزی مەزحەجی وت: ئێوە رووبەرووی خەڵکانی عەك ببنەوە. خۆی پەیوەستی هەمەدانییەکان بوو و

بەخەڵکانی کیندەی وت: ئێوە رووبەرووی ئەشعەرییەکان ببنەوە. رووی کردە خەڵکەکەی خۆی و وتی: ئەوان ئەشعەرییەکان، هێرشیان بەرنەسەر. ئەوان هێرشیان دەکردە سەر سوارەکان و هۆنراوەیەکیان دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( هاوار لەدایکی مەزحەجی لەخەڵکی عەك

ئەوە دایکی مەزحەجییە بەردەوام دەگریت))

تا ئێوارێیان بەشەڕ کردن بەسەر برد. ئەشتەر لەگەڵ خەڵکانی هەمەدان و دەستەیەك لەخەڵکانی دیکە دژی ئەوان دەجەنگی و پاشەکشێی پێکردن تا ئەوەی گەیشتنە پێنج ریزی یەکەمی نزیك معاویە کە بەدەستار خۆیان بەستبوویەوە. هێرشی کردە سەر ریزەکانی ئەوان و چوار ریزی یەکەمی تێشکاند و کاتێك گەیشتنە ریزی پێنجەم، معاویە داوای ئەسپی کرد، وتبووی: دەمویست هەڵبێم بەڵام هۆنراوەکەی کوڕی ئەتنای ئەنساریم بیرکەوتەوە – کوڕی ئەتنا لەشاعیرانی رۆژگاری جاهلییەت بوو و ئەتنابە دایکی ژنێك لەهۆزی بەلقین بوو– کەدەڵێت:

((داوێن پاکیم و شەرمی ناخم

و ئامادەییم دژی بوێری تێکۆشەر

و سامانم کەبەشێوەیەکی ناڕەوا بەفیڕۆ دەڕۆشت

و وەسف و دەسخۆشییەکان کە بەهایەکی گران دەمکری

و ئەم وتەیە کاتێك گرژی دەکەوتە گیانم

دەموت: ئەی گیان لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە

یا دەسخۆشیت لێدەکرێت یا رزگارت دەبێت.

رێگەی نەدام هەڵبێم))

بیرخستنەوەی ئەم هۆنراوەیە رێگر بوو لەوەی گۆڕەپانی جەنگ بەجێبێڵم.

زەید کوڕی وەهب دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بینی باڵی راستی سوپاکەی هێزی خۆی بەدەست هێنایەوە و توانیویەتی پاشەکشێ بەدوژمنانی بەرابەری بکات، هات و پێی وتن: بینیم ریزەکانتان بەجێهێشت و یاخیانی ستەمگەر و عەرەبە پێ پەتییەکانی شام پاشەکشێیان پێکرد. ئێوە کەکەسانی

ناوداری عەرەبن و قورئان خوێنەکان و ڕێنیشاندەرانی ڕێگەی ڕووناکین، ئەگەر دوای بەجێهێشتنی گۆڕەپان نەدەگەڕانەوە و لەدوای پاشەکشێ کردن، هێرشتان نەدەکرد، گوناحی هەڵاتووانی جەنگ دەکەوتە سەرشانی ئێوە و لەناودەچوون بەڵام خەمم نەما و دڵم ئاسوودە بوو کاتێك بینیم بەوشێوەی پاشەکشێیان پێکردبوون، پاشەکشێتان پێکردن و بەهەمان شێوە کەدووریان خستبوونەوە، ئەوانتان لەشوێنەکانی خۆیان دوور خستەوە، شمشێرتان وەشاند و هاوشێوەی وشتر ڕەمتان پێکردن. هەنووکە خۆڕاگری بکەن چوونکە ئاسوودە بوون و خواوەند سەقامگیری پێبەخشین تا کەسی هەڵاتوو بزانێت دەبێتە هۆی تووڕە بوونی خواوەند و خۆی گرفتاری گوناح دەکات. هەڵاتن هۆکاری ڕەنجانی خواوەند و ریسوایی هەمیشەیی و خەمی لەدەست چوونی تاڵانییەکان و بەفیڕچوونی بژێوی. ئەوکەسەی لەجەنگ هەڵدێت، تەمەنی خۆی زیاد ناکات و لەرەزامەندی پەروەدگار بەدوورە. ئەگەر مرۆۋ لەرێگەی ڕاستیدا بمرێت و گرفتاری ئەم ریسواییانە نەبێت، باشترە لەوەی عادەتیان پێبگرێت وپشتیان پێ ببەستێت.

عەبدولسەلامی ئەحمەسی دەڵێت: لەجەنگی سەفین ئاڵای بوجەیلە لەدەستی باوکی شەداد قەیس کوڕی مەکشوح لەتیرەی ئەحمەس کوڕی غەوس بوو. خەڵکانی بوجەیلە پێیان وتبوو: ئاڵاکەی ئێمە بەدەستەوە بگرە.

وتی: یەکێتر لەمن باشترە.

وتیان: جگە لەتۆ بەکەس رازی نابین.

وتی: ئەگەر ئاڵاکە بەمن بسپێرن، ئێوە تاڵای خاوەنی قەڵغانی زێڕین دەبەم.

وتیان: هەرچیت دەخوازیت، ئەنجامی بدە.،

دەڵێت: ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و هێرشی برد تا لەخاوەنی قەڵغانی زێڕین نزیك کەوتەوە خاوەنی قەڵغانی زێڕین دەستەیەکی فراوان لەهاوەڵانی معاویەی لەگەڵدا بوو. وتوویانە: ئەو، عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلیدی مەخزومی بوو. هەر دوو سوپا لەوێ جەنگێکی قورسیان ئەزمون کرد. باوکی شەداد شمشێر بەدەست هێرشی کردە سەر خاوەنی قەڵغانی زێڕین، ڕۆمییەك

کەکۆیلـەی معاویـەی بـوو، ڕێگـەی لێگـرت و زەربەیـەکی لێـدا و قاچـی بـاوکی شەدادی قرتاند. باوکی شەداد زەربەیەکی وەشاند و کۆیلە روومییەکەی کوشت، ڕم بارانیان کرد تا ئەوەی کوشتیان و عەبدوالله کوڕی قەلعی ئەحمەسـی ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((خواوەند باوکی شەداد ببەخشێت

کەبەبانگێشتی بانگێشتکەران رازی بوو

شمشێر بەدەست هێرشی کردە سەردوژمنان

چەند جوامێر بوو لەکاتی جەنگ

و کاتی رووبەروو بوونەوەی لەگەڵ پیادەکان)).

جەنگا تا کوژرا، براکەی عەبدولرەحمان کوڕی قەلع ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و جەنگی تا کوژرا. دوای ئەو، عەفیف کوڕی ئەیاس ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و لەدەستیدا مایەوە تا هەر دوو سوپا لەیەك جویێ بوونەوە.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە حازم کوڕی باوکی حازمی ئەحمەسی، برای قەیس کوڕی بـاوکی حـازم کـوژرا، نـەعیم کـوڕی سوهەیبی بـوجلیش کـوژرا. کـوڕە مامەکـە و هاوناوەکەی، نەعیم کوڕی حارس کە لەهاوەڵانی معاویە بوو، ڕۆشتە لای و وتـی: ئەم کوژراوە کوڕە مامی منە، جەستەکەی بەمن بسپێرە تا بەخاکی بسپێرم.

وتـی: بـەخاکی مەسـپێرە چـوونکە شـیاوی ئـەوە نـین، سـوێند بـەخوا ئێمـە بەشێوەیەکی نهێنی کوڕی عەفانمان بەخاك سپارد.

وتـی: ڕێگـە بـدە بـەخاکی بـسپێرم وەگەرنـە دەڕۆمـە نـاو سـوپاکەی ئـەوان و بەجێت دەهێڵم.

معاویـە وتـی: گومـان دەکـەیت شـێخەکانی عـەرەب بـەخاك ناسـپێرین وا داوا لەمن دەکەیت کوڕە مامەکەت بەخاك بسپێری، ئەگـەر دەخـوازی بـەخاکی بـسپێرە یا پشتگوێی بخە. و بەخاکی سپارد.

حـارس کـوڕی حەسـیرەی ئـەزدی لـەپیرەکانی تایەفـەی نـەمری ئـەزد دەگێڕێتـەوە: کاتێـك ئەزدییـەکانیان بـۆ رووبـەروو بوونـەوەی ئەزدییـەکان نـارد، موخەنـەف کـوڕی سـولەیم سپاسـی خـوای کـرد و وتـی: هەڵەیـەکی گـەورە و

بەڵایەکی مەزن چوونکە ئێمەیان بۆ رووبەروو بوونەوەی خەڵکەکەی خۆمان ناردووە وئەوانیان بۆ جەنگ لەگەڵ ئێمە ناچار کردووە. سوێند بەخوا ئەوە دەستی خۆمانە دەیانبڕین و باڵی خۆمانە بەشمشێر دەیانقرتێنین، ئەگەر هاوکاری دەستەکەی خۆمان نەکەین و بۆ سەرکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب تێنەکۆشین، کافر دەبین و ئەگەر ئەو کارە بکەین، هێزی خۆمان لەدەست دەدەین و ئاگرەکەی خۆمان دەکوژێنینەوە.

جوندەب کوڕی زوهەیر پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر باوکیان دەبووین و ئەوان کوڕی ئێمە بوون، یا منالیان دەبووین وئەوان باوکانی ئێمە و لەدەستەکەی ئێمە جیادەبوونەوە و رەخنەیان لەخەلیفەکەی ئێمە دەگرت و ستەمیان لەئۆمەت وباجدەرەکانی ئێمە دەکرد، هەنووکە کەرووبەروو بووینەتەوە، جوێ نەدەبووینەوە تا ئەو کاتەی دەستیان لەکردەوەکانی خۆیان هەڵدەگرت و پەشیمان دەبوونەوە و بەبانگەشەی ئێمە رازی دەبوون یا ئەوەی کەسانێکی زۆر لەئێمە و ئەوان دەکوژران.

موخەنەف وەلامی ئەوی (کەکوڕە خاڵی بوو) دایەوە: خواوەند بەهۆی تۆوە، هێز بەورە ببەخشێت، سوێند بەخوا لەگەورەیی و منداڵی بەردەوام گۆشەگیر بووم، سوێند بەخوا لەرۆژگاری جاهلی و لەو کاتەی باوەڕم هێنا، هەمیشە کارە دژوارەکانم هەڵبژاردووە، خواوەندا ئەگەر تەندروستی باشتر لەوەیە کەگرفتارم بکەیت، بەهەر کام لەئێمە ئەو شتە ببەخشە کەدەخوازیت.

باوکی بەردە کوڕی عەوف وتی: خواوەندا بەو شێوەی جێگەی رەزامەندی تۆیە، لەنێوان ئێمە داوەری بکە. ئەی خەڵکینە دەبینن ئەم خەڵکە چی دەکەن، ئێمە شوێنکەوتەی موسوڵمانانین، دەزانن ئێمە لەسەر راستین یا ئەوان. سوێند بەخوا تا ئەو جێگەی دەزانین، شوێنکەوتنی شەڕ، لەژیان و ئەو جیهان، هۆکارێکە بۆ زیان.

جوندەب کوڕی زوهەیر رۆشتە پێش و لەگەڵ سەرکردەی ئەزدییەکانی شام جەنگی دەسپێکرد و ئەزدی خەڵکی شام جوندەبی کوشت. لەتایەفەی ئەو عیجل و سەعد کوڕانی عەبدوالله لەتیرەی منالەکانی سەعلەبە کوژران. موخەنەفیش

کوژرا. لەتایەفەی ئەو عەبدوالله و خالید کوڕانی ناجد و عەمرۆ و عامر کوڕانی عەویف و عەبدوالله کوڕی حەجاج و جوندەب کوڕی زوهەیر و باوکی زێنەب کوڕی عەوف کوژران. عەبدوالله کوڕی باوکی حەسین هاوڕێ لەگەڵ ئەو قورئان خوێنانەی لەگەڵ عەمار کوڕی یاسر بوون، رووی کردە گۆڕەپان و کوژرا.

حارس کوڕی حەسیرە لەیەکێك لەشێخەکانی نەمر دەگێڕێتەوە: عوقەبە کوڕی حەدیدی نەمری لەرۆژی جەنگی سەفین وتی: ئاگاداربن لەوەرگەی دنیا وشکی کردووە و دارەکەی شکاوە و تازەکەی کۆن بووە و شیرینیەکەی تاڵ، بەراستی لەمەبەستی خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە، لەدنیا بێزار بووم و چاوم لێ پۆشیوە، لەناو هەر سوپا و جەنگێکدا بووم، ئارەزووی شەهید بوونم لەسەر دابووە، بەلام خواوەند نەیویست مەگەر ئەوەی ئەمڕۆ بەمنی ببەخشێت. ئاگادار بن بەرەو شەهادەت دەڕۆم و هیوادارم لێی بێ بەش نەبم. ئەی بەندەکانی خواوەند، بۆ لەترسی مەرگێك کە بەناچاری بەرۆکتان دەگرێت، پشت دەکەن جیهاد لەگەڵ دوژمنانی خواوەند؟ بۆ لەیەك زەربەی شمشێر کەبە هۆیەوە لەجیاتی ئەم دنیا، پێشگای خواوەند و هاونشینی لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و چاکەکارانتان پێ دەبڕێت، خۆتان دوور دەخەنەوە؟ ئەوە بۆچوونێکی راست نییە.

دەڵێت: رووی کردە گۆڕەپان و وتی: ئەی برادەرینە، ئەم دنیام بەو دنیا فرۆشت و هەنووکە بەرەو ئەوێ دەڕۆنم، رێگەی ئێوە جیاواز نەبێت و خواوەند هیوابڕاوتان نەکات.

دەڵێت: براکانی عەبدوالله و عەوف و مالك بەدوایدا رۆشتن و وتیان: لەدوای تۆ چیتر خوازیاری دنیا نین، خواوەند ژیان دوای تۆ قێزەون بکات، خواوەند گیانی خۆمان بەتۆ دەبەخشین. روویان کردە گۆڕەپان و جەنگان تا کوژران.

باوکی موسلیم کوڕی عەبدوالله زەبابی دەڵێت: لەگەڵ تایەفەکەم بەشداری جەنگی سەفینم کرد، شیمر کوڕی زی ئەلجەوشنیش لەگەڵ ئێمە بوو. ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ تاقی کردەوە و بەشمشێر لەروخساری شیمریدا. شمیریش زەرەبەیەکی لێدا بەلام زیانی لێنەدا. شیمر بۆ

لای هاورێکەی خۆی گەڕایەوە و ئاوی خواردەوە، تینو بوو. دواتر ڕمێکی بەدەستەوە گرت و بەدەم هۆنراوە خوێندنەوە، هێرشی کردە سەر ئەدهەم و وتی: ئەمە لەبری ئەوە.

عەمرۆ کوڕی عەمرۆ کوڕی عەوف جوشەمی دەڵێت: بیشر کوڕی عیسمەی موزنی لەناو سوپاکەی معاویەدا بوو، کاتێك لەسەفین دوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، بیشر مالك کوڕی عەقدەبەی بینی کەبەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ریزەکانی سوپای شامی تێکدەشکاند. پیاوێکی بوێر و چاونەترس بوو. بیشر لەکارەکەی تورە و زەربەیەکی لێدا و ئەوی لەپێ خست. دواتر لەکارەکەی پەشیمان بوویەوە و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( چاوەڕوانی بەخشینی خواوەندم

و لەوەی لەبیرمدا گوزەر دەکات

لەناو تەپ وتۆزی جەنگ، ئەو کاتەی شمشێرەکان بەرز ببوونەوە

زەربەیەکەم لێدا.))

کاتێك ئەم هۆنراوە بەگوێی کوڕی عەقدەبە گەیشت، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((بەبیشر کوڕی عیسمە بڵێن

بێ ئاگا و سەرقاڵی کاری خۆم بووم

ناکاوگیرت کردم و زەرەبەیەکت لێدام

بەمشێوەیە شمشێر وەشاندن و شمشێر خواردنی بوێرەکان))

دەڵێت: عەبدواللە کوڕی توفەیلی بوکایی هێرشی کردە سەر دەستەیەك لەخەڵکانی شام و کاتێك گەڕایەوە، یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بەناوی قەیس کوڕی قورە لەو عێراقییانەی پەیوەستی سوپاکەی معاویە ببوو، هێرشی کردەسەر و ڕمەکەی لەنێوان دوو شانی عەبدواللە دانا. یەزید کوڕی معاویە کوڕە مامی عەبدواللە هاتە ناو جەنگەکە و شمشێرەکەی لەنێوان دوو شانی پیاوی تەمیمی دانا و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ڕمەکە لەپشتی بچەقێنێت، ڕمەکە لەپشتت دەچەقێنم.

پیاوی تەمیمی وتی: پەیمانی خوایی دەدەیت ئەگەر ڕمەکە لەسەر پشتی هاورێکەت هەڵگرم، ڕمەکە لەسەر پشتم هەڵدەگریت.

وتی: بەڵێ، پەیمانی خوایی دەدەم.

ڕمەکەی لەسەر شانی کوڕی توفەیل هەڵگرت و یەزیدیش ڕمەکەی هەڵگرت.

تەمیمی وتی: لەکام هۆزیت؟

وتی: لەمناڵەکانی عامر.

وتم: خوا بمکات بەقوربانی ئێوە، لە هەر شوێنێك بن بەخشندەن. من یانزەهەمین پیاوی بنەماڵە و عەشیرەکەمم کەئەمڕۆ لەسەر دەستی ئێوە کوژراوە، من دوایین کەسیانم.

دەڵێت: کاتێك خەڵکان گەڕانەوە بۆ کوفە، کوڕی توفەیل گلەیی لەکوڕە مامەکەی کرد، کوڕە مامەکەی بەم هۆنراوەیە وەڵامی دایەوە:

((مەگەر نەتبینی لەسەفین

کاتێك هەموو هاورێکانت پشتگوێیان خستی

هاورێیانە بەرگریم لەتۆ کرد

و پیاوی حەنزەلی کەڕمی لەسەر پشتی تۆ دانابوو

لەتۆم دوور کردەوە))

فوزەیل کوڕی خودەیج دەڵێت: یەکێك لەسوپای شام هات و داوای شەڕکەری کرد. عەبدولرەحمان کوڕی موحریزی کێندی ڕووبەڕووی بوویەوە. کاژێرێك بەجەنگەوە سەرقاڵ بوون. عەبدولرەحمان هێرشی کردە سەر پیاوی شامی و زەربەیەکی لەقوڕگی دا و لەپێ کەوت. دواتر لەئەسپەکەی هاتەخوار و زرێ و سیلاحەکەی هەڵگرت و بینی حەبەشییە، وتی: انا لله، بۆ کێ خۆم ڕووبەڕووی مەترسی کردەوە، بۆ پیاوێکی حەبەشی.

یەکێك لەخەڵکانی عەك هات و داوای شەڕکەری کرد. قەیس کوڕی فەهدانی کەنانی ڕووبەڕووی بوویەوە. پیاوی عەکی، هێرشی برد، قەیس زەربەیەکی لەڕکەبەرەکەیدا. هاوەڵانی هاتن و ئەویان ڕزگار کرد. قەیس هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((خەڵکانی عەك لەسەفین دەیانزانی
کاتێك دوو سوپاکە رووبەرووی یەك ببنەوە
بەقورسی شمشێر بارانیان دەکەین
و ئاڵاکانی جەنگ بەشێوەی شیاو بەرز دەکەینەوە
سپی دەیانبەین و سوور دەیانگێرینەوە))

هەروەها فوزەیل کوڕی خودەیج دەڵێت: قەیس کوڕی فەهدان هاوەڵانی خۆی هانـدەدا و دەیـوت: کاتێـك هێـرش دەبـەن، پێکـەوە هێـرش بـەرن و کاتێـك دەگەڕێنـەوە، پێکـەوە بگەڕێنـەوە. چـاوەکانتان دابخـەن، کـەمتر قـسە بکـەن، رووبەرووی دوژمن ببنەوە، نابێت عەرەبەکان لەلایەن ئێوەوە زیانیان پێ بگات)).

دەڵێت: قەیس کوڕی یەزید کە لەسوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە بۆ نـاو سوپاکەی معاویە هـەڵاتبوو، هاتـە نـاو گۆڕەپـان و داوای شـەڕکەری کرد، براکـەی باوکی عەرەمتە کوڕی یەزید رووبەرووی بوویـەوە، یـەکیان ناسییەوە و لەبەرابـەر یـەك وەسـتان. دواتـر هـەرکام بـۆ نـاو سـوپاکەی خـۆی گەڕایـەوە و هـەرکامیان دەیانوت: براکەی خۆی بینیوە.

جەعفـەر کـوڕی حوزەیفـە دەڵێـت: هـۆزی تـەی، لـەرۆژی سـەفین جـەنگێکی قورسیان کرد و دەستەیەکی فراوانیان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان نارد.

دەڵێت: حەمزە کوڕی مالك ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: لەکام هۆزن؟

عەبدوالـلە کوڕی خەلیفـەی بـەولانی کەشیعە و شـاعیر و وتـاردەر بـوو، وتـی: ئێمـە تاییـەکانی دەشـتین، تاییـەکانی ریخـەڵان و تاییـەکانی کوێـستان کەدارخورماکانمان یاساغە. ئێمە بـەرگریکارانی دوو کێوین تـا نێوان عوزەیب و عەبەس، ئێمە تاییەکانی ڕمین و تاییەکانی جەنگ و تاییەکانی هێرش.

حەمزە وتی: دەستخۆش، زۆر جوان وەسفی خەڵکەکەی خۆت دەکەیت.،

دەڵێت: بوێرانە جەنگان و عەبدواللە هـاواری دەکـرد، دەیـوت: ئـەی خـەڵکانی تەی، نویێ و کۆنە بەقوربانی ئێوە بێت، بۆ رێزی خۆتان بجەنگن.

باوکی سـەڵتی تـەمیمی دەڵێـت: پیرانـی تایەفـەی مـەحاریب پێیـان وتم یـەکێك لـەوان بـەناوی خەنسەرە کـوڕی عوبەیـد، پیـاوێکی بـوێر بـوو. لەجـەنگی سـەفین

کاتێك دوو سوپا رووبەرووی یەك بوونەوە، هاوەڵانی خۆی بینی کەهەڵدەهاتن. هاواری کرد: ئەی خەڵکانی قەیس، مەگەر فەرمانبەری کردنی شەیتانتان لەرەحمان پێ باشترە؟ هەڵاتن گوناحێکی گەورەیە و هۆکارێکە بۆ تورە بوونی خواوەند، خۆڕاگری فەرمانبەری کردنی خواوەندە و هۆکاری رەزامەندی ئەو، چۆن تورە بوونی خواوەند پێش رەزامەندی ئەو دەخەن، ئاسوودەیی دوای مردن تایبەتە بەو کەسەی بمرێت و لەرێگەی خوادا بکوژرێت.

دەڵێت: جەنگا تا برینداربوو، دواتر لەگەڵ ئەو پێنسەد کەسەی لەگەڵ فەروە کوڕی نەوفلی ئەشجەعی لەجەنگ خۆیان بەدوور گرتبوو، ڕۆشت و لەدەسکەرە و بەندینجین دابەزین. لەورۆژە نەخەعییەکان بوێرانە جەنگان و لەدەستەکەی ئەوان بەکر کوڕی هوزە و حەیان کوڕی هوزە و شوعەیب کوڕی نەعیم لەمناڵەکانی بەکر کوڕی نەخەع و رەبیعە کوڕی مالك و ئەبی کوڕی قەیس برای عەلقەمە کوڕی قەیس، کوژران. عەلقەمە قاچی قرتا، دەیوت: حەزم نەدەکرد قاچم نەقرتێت چوونکە بەمشێوەیە چاوەڕوانی پاداشتی خواوەندم، دەمویست براکەم یا یەکێك لەبراکانم لەخەودا ببینم، براکەم لەخەودا بینی و وتم: چیت بینی؟

وتی: ئێمە و خەڵکەکەمان لەبەردەم پێشگای خواوەند رووبەروو بووینەوە و بە بەڵگەوە ئەوانمان سەرکوت کرد، لەو کاتەوەی ئاوزم پێبڕاوە، هیچ کات و لەهیچ شتێك بەئەندازەی ئەم خەوە، رازی نەبووم.

حەسین کوڕی مونزەر دەڵێت: پێش جەنگ، کەسانێك ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتیان: خالید کوڕی مەعمەر نامەی بۆ معاویە نووسیوە و دەترسین بڕواتە ناو سوپاکەی ئەو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەو و چەند کەسێك لەسەرکردەکانی ئێمەی بانگ کرد، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و وتی: بەڵام دواتر، ئەی خەڵکانی رەبیعە، ئێوە هاوەڵانی منن و بەبانگەوازەکەی من رازی بوون، لای من بڕواپێکراوترین هۆزی عەرەبن، بیستوومە معاویە نامەی بۆ خالید کوڕی مەعمەر ناردووە، ئەوم هێنا و ئێوەم بانگ کرد تا وەك شایەت ئامادە بن و لەوتەکانی من

ئاگادار ببنەوە. دواتر رووی کردە خالید و وتی: ئەی خالید کوڕی مەعمەر، ئەگەر ئەوەی بیستوومە ڕاست بێت، خواوەند و موسوڵمانانی ئێرە بەشایەت دەگرم لەئەماندایت تا دەگەیتە سەرزەمینی عێراق و حیجاز یا هەر سەرزەمینێکی دیکە کەمعاویە دەستی بەسەردا نەگرتووە. و ئەگەر درۆیان بۆ تۆ هەڵبەستووە، دڵمان ئاسوودە بێت.

دەڵێت: خالید سوێندی خوارد نامەی بۆ معاویە نەنوسیوە و دەستەیەك لەپیاوەکانی ئێمە وتیان: ئەگەر دەمانزانی ئەوکارەی کردووە، ئەندامەکانی جەستەیمان دەبڕییەوە.

دەڵێت: شەقیق کوڕی سووری سەدووسی وتی: خالید کوڕی مەعمەر سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت ئەگەر هاوکاری معاویە و خەڵکانی شامی کردبێت دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەڵکی ڕەبیعە.

دەڵێت: زیاد کوڕی خەفسەی تەمیمی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خالید کوڕی مەعمەر سوێند بدە تا خیانەت لەتۆ نەکات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوێندیدا و گەڕاینەوە.

دەڵێت: بۆ ڕۆژی پێنج شەممە خەڵکانی مەیمەنە شکستیان خوارد، عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتە لای ئێمە، کوڕەکانیشی لەگەڵدا بوون، بەدەنگی بەرز و بێ گرنگیدان بەباروودۆخی کەسان وتی: ئەم ئالأیانە تایبەتە بەکام هۆز؟

وتمان: ئالأکانی ڕەبیعەیە.

وتی: نا، ئەوە ئالأکانی خواوەندە، خواوەند خەڵکەکەی بپارێزێت و خۆڕاگرییان پێ ببەخشێت. دواتر بەمنی وت: ئەی کوڕی گەنج، یەك زەراع ئالأکەی خۆت نابەیتە پێش؟

وتم: بۆنا، سوێند بەخوا دەزەراع دەیبەم. ئالأکەم بەرز کردەوە و بردمە پێش تا ئەوجێگەی وتی: بەسە، لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە. لەو شوێنەی فەرمانیدا بوو، مامەوە و هاوەڵانم کۆبوونەوە.

باوکی سەڵتی تەمیمی دەڵێت: لەپیرەکانی تایفەی تیم الله ی سەعلەبەم بیست، دەیانوت: ئالأی خەڵکانی کوفە و خەڵکانی بەسرەی ڕەبیعە لەدەستی

خالید کوڕی مەعمەردا بوو. ئەو یەکێك لەخەڵکانی بەسرە بوو.

دەڵێت: هەروەها بیستم کەدەیانوت: خالد کوڕی مەعمەر و سوفیان کوڕی سور بۆ هەڵگرتنی ئالاکە کێبڕکێیان دەکرد. بەرێککەوتن، ئالای بەکر کوڕی وائیلیان بەحەسین کوڕی مونزەری زوهلی سپارد کەیەکێك بوو لەخەڵکانی بەسرە، وتیان: ئەم گەنجە لەئێمەیە و کەسێکی رێزدارە، ئالاکە بەو دەسپێرین تا دواتر. دوای ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئالای هەموو خەڵکانی رەبیعەی بەخالید کوڕی مەعمەر سپارد.

دەڵێت: معاویە بۆ هۆزی حەمیر لەسێ هۆزی عێراق کە قەرەباڵغتر لەوان لەناو هۆزەکانی عێراقدا نەبوو، یانی رەبیعە و هەمەدان و مەزحەج، تیروپشکی کرد و تیروپشکی حەمیر بەناوی رەبیعە لەناو دەرهات. زوئەلکەلاع وتی: چەند تیروپشکێکی شووم و قێزەونە.

زوئەلکەلاع لەگەڵ خەڵکانی حەمیر و موالییەکان هات. عوبەیداللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ چوار هەزار کەس لەقورئان خوێنەکانی شام هاورێیەتی ئەوانی دەکرد. زوئەلکەلاع فەرماندەی باڵی راستی سوپاکە بوو، هێرشیان کردە سەر خەڵکانی رەبیعە کە باڵی چەپی سوپای عێراق بوون. عەبدوللە کوڕی عەباس لەگەڵ ئەوان و فەرماندەیی کەنارەکانی سوپایی لەدەستا بوو. زوئەلکەلاع و عوبەیداللە کوڕی عومەر بەسوار و پیادە بەهەموو هێزیانەوە هێرشیان کردە سەریان، ئالاکەی رەبیعە لەشوێنەکانی خۆیان هەڵکەنران و جگە لەدەستەیەکی کەمیان کەسیان لەشوێنی خۆیان نەمانەوە.

دەڵێت: خەڵکانی شام گەڕانەوە و زۆری نەخایاند سەرلەنوێ هێرشیان هێنایەوە.

عوبەیداللە کوڕی عومەر دەیوت: ئەی خەڵکانی شام، ئەم هۆزە عێراقییە، بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان و هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن، ئەگەر شکست بەم هۆزە بێنن، تۆڵەی خوێنی عوسمانتان کردۆتەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەڵکانی عیراق لەناو دەچن.

دەڵێت: خەڵکانی شام بەهەموو هێزییانەوە هێرشیان برد و خەڵکانی رەبیعە

جگـە لەدەسـتەیەکی کـەم لـەلاواز و ترسـەنۆکەکان، خۆڕاگرییـان کـرد. ئالاّکـان بەخۆڕاگری شەڕکەران لەشـوێنی خۆیـان مانـەوە، بوێرانـە جـەنگان. خالید کوڕی مەعمەر کاتێك بینی کەسانێك لەخەڵکەکەی پاشەکشێیان کردووە، پاشەکشێی کرد بەلاّم کاتێك خۆڕاگری هاوەلاّنی بینی، گەڕایەوە و هاواری لەهەلاّتووان کـرد. ئـەوانیش گەڕانـەوەوە، وتـی: کەسـانێك لەخەڵکەکـەی کەدەیانویـست ریـسوایی بکـەن، مەبەسـتی هـەلاّتنیان کـرد بـەلاّم کاتێـك خـۆڕاگریی خەڵکەکـەیان بـینی، گەڕانەوە. هەروەها وتی: کاتێك بینیم دەستەیەك لەئێمە هەلاّتوون، ویستم پێیـان بگەمــەوە و بیانگێڕمــەوە، ئــەوان گوێڕایــەڵی قــسەکانم بــوون و گەڕانــەوە. کردەوەکانی ئاڵۆز و نادیار بوو.

موحریز کوڕی عەبدولرەحمانی عیجلی دەڵێت: ئەو رۆژە خالید وتی: ئەی خـەڵکانی رەبیعـە، خواوەنـد هـەرکام لـەئێوەی لەزادگەکەتانـەوە هێناوەتـە ئێـرە، لەوکاتەوەی لەسەر زەوین، بەمشێوەیە کۆنەبوونەتـەوە، ئەگـەر دەست هـەڵگرن و پشت بکەنە دوژمن و گۆڕەپانی جەنگ بەجێبێڵن، خواوەند لەکارەکەی ئێوە رازی نابێت. هەرکـەس ببینن لەگـەورە و بچوك، پێتـان دەڵێت: رەبیعـە ئابڕو و رێـزی خۆی شکاند و گۆڕەپـانی جـەنگی بەجێهێشت و عەرەبەکان لەناوچەی ئەوانـەوە زیانیـان بەرکـەوت. ئاگـادارین عەرەبـەکان و موسـوڵمانان ئێـوە بەشـووم نـەزانن، پێشڕەوی بکەن و گیانی خۆتان بەخواوەند بسپێرن چوونکە پێشڕەوی عـادەتی ئێوەیە و خۆڕاگری تایبەتمەندی ئێوە، خۆڕاگر بن بۆ ئەوەی پاداشتی خواییتـان پێ ببڕێت. پاداشتی ئەو کەسەی لەم جەنگە مەبەستی خواوەندە، شـەرەفی دنیایـە و رێزی ئەو دنیا، خواوەند هیچ کات پاداشتی چاکەکاران لەبیر ناکات.

دەڵێت: کەسێك قسەی کرد و وتی: سوێند بەخوا لەو کاتەوەی کاروبارەکانی رەبیعـە کەوتـە دەسـت تـۆ، فێرۆیـی و گەنـدەڵی دروسـت بـوو، پێمـان دەڵێیـت پاشەکشێ نەکـەین و گۆڕەپـانی جـەنگ بـەجێ نـەهێڵین تـا بکوژرێین و خوێنمـان برژێت، مەگەر نابینی زۆربەی کەسان رۆشتوون و گۆڕەپانیان بەجێهێشتووە.

دەڵێـت: چـەند کەسـێك بەرپەرچـی قسەکانیان دایـەوە و سـەرکۆنەیان کـرد، خالید وتی: ئەم کەسـە لـەناو خۆتـان دەرکـەن چوونکە ئەگـەر بمێنێتـەوە زیانتـان

پێ دەگەیێنێت و ئەگەر بڕوات نابێتە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی ئێوە. ئەمە کەسێکە ژمارەی ئێوە کەم ناکات و هیچتان پێ زیاد ناکات. ئەی وتەبێژی مەلعونی خەڵکان! چۆن پشت دەکەیتە پاداشتە خواییەکان!.

دەڵێت: جەنگی نێوان رەبیعە و حەمیر و عوبەیدالله کوڕی عومەر قورس بوویەوە و کوژراوەکان لەهەر دوولا فراوان بوو. یەکێك لەوان سەمیر کوڕی ریان کوڕی حارسی عێجلی بوو. ئەو پیاوێکی بوێر بوو.

زەید کوڕی بەدری عەبدی دەڵێت: زیاد کوڕی خەفسە لەرۆژی جەنگی سەفین رۆشتە لای تایەفەی عەبدقەیس، هۆزەکانی حەمیر لەگەڵ زی ئەلکەلاع و عوبەیدالله کوڕی عومەر رووبەرووی تایەفەی بەکر کوڕی وایل ببوونەوە. خەڵکانی بەکر بوێرانە جەنگان بەشێوەیەك مەترسی لەناوچوونیان لێدەکرا. زیاد کوڕی خەفسە وتی: ئەی خەڵکانی عەبدقەیس، چیتر هیچ بەکرییەك نەما. سوار ئەسپەکانمان بووین و رۆشتین و پەیوەستیان بووین. زۆری نەخایاند زوئەلکەلاع بریندار و عوبەیدالله کوڕی عومەر کوژرا. هەمەدانییەکان وتیان: هانی کوڕی خەتابی ئەرحەبی ئەوی کوشت. حەزەرمەوتییەکان وتیان: مالك کوڕی عەمرۆ تەنعی ئەوی کوشت. خەڵکانی بەکر وتیان: موحریز کوڕی شەحشەحی بەنی عایشی ئەوی کوشت وزوئەلوەشاح، شمشێرەکەی هەڵگرت. معاویە لەکوفە خەڵکانی بەکری سەرکۆنە کرد. وتیان: یەکێك لەخەڵکانی بەسرەی ئێمە بەناوی موحریز کوڕی سەحمەح ئەوی کوشت. معاویە کەسی بۆ بەسرە نارد و شمشێرەکەی وەرگرتەوە. هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: بکوژی عوبەیدالله کوڕی عومەر، موحریز کوڕی سەحسەح بوو. زوئەلوەشاح شمشێرەکەی ئەوی هەڵگرتەوە. شمشێرەکە هی عومەر کوڕی خەتاب بوو. کەعب کوڕی جەمیلی تەغلەبی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((چاوەکان بۆ سوارێك دەگری
کە لەسەفین بوو ئەو کاتەی کە
سوارەکانی ئەو رۆشتن
خۆڕاگر وەستا بوو))

لەو ڕۆژەدا لەحەمیرییەکان بیشر کوڕی موڕە کوڕی شورەحبیل و حارس کوڕی شورەحبیل کوژران. ئەسما کچی عەتارد کوڕی حاجەبی تەمیمی ژنی عوبەیداللە کوڕی عومەر بوو. دواتر حەسەن کوڕی عەلی ئەوی وەك هاوسەر دەستنیشان کرد.

غیاس کوڕی لەقیتی بەکری دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای خەڵکانی ڕەبیعە، بەیەکیان وت: ئەگەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەنای بۆ ئاڵاکەی ئێوە هێناوە و لێرە زیانی بەرکەوێت، ڕیسوا دەبن. شەقیق کوڕی سور وتی: ئەی خەڵکانی ڕەبیعە، ئەگەر یەکێك لەئێوە زیندوو بێت و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکەوێتە دەستی دوژمن، دەبێت لای عەرەبەکان بەڵگەی شیاوتان هەبێت و ئەگەر پارێزگاری لێ بکەن، بۆ هەمیشە بەرێزداری دەمێننەوە. خەڵکانی ڕەبیعە دوای ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لایان، بوێرانە جەنگان. هیچ کات بەو شێوەیە نەجەنگابوون.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەمشێوەیە:

((ئاڵا ڕەشەکە هی کێیە؟

کە سێبەرەکەی دەلەرزێت

و کاتێك دەڵێی حەسین ئاڵاکە بۆ پێشەوە ببە

لەناو قوڵایی مەرگ پێشڕەوی پێکرد

لەوێ کەچاڵە مەترسیدارەکان

لێوانلێون لەمەرگ و خوێن

زەربەکانی شمشێرمان بەکوڕی حەرب چێشت

بەشێوەیەك پشتی تێکردین و ڕۆشت

خواوەند پاداشتی ئەو خەڵکە بداتەوە کە

لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ مەرگ خۆڕاگرییان کرد

چەندە گیانبەخش و ڕێزدارن

یانی خەڵکانی ڕەبیعە

کە لەبەرابەر دوژمنان بوێرن.))

## کوژرانی عەمار کوڕی یاسر

عەبدولمەلیك کوڕی ئەبی حوڕی حەنەفی دەڵێت: عەمار کوڕی یاسر هاتە ناو خەڵکان و وتی: ئەی خوایە، تۆ دەزانی ئەگەر دەمزانی ڕەزامەندی تۆ لەوەدایە خۆم بخەمە ناو ئەو ڕووبارەوە، خۆم دەخست. خواوەندا تۆ دەزانی ئەگەر دەمزانی ڕەزامەندی تۆ لەوەدایە نووکی شمشێرەکەم بخەمە سەر سینەی خۆم و خۆم بدەم بەسەریدا تا لەپشتمەوە بێتەدەر، ئەو کارەم دەکرد. هەنووکە هیچ کارێك بەباشتر لەجیهاد لەگەڵ ئەم دوو ڕوانە نازانم ببێتە هۆکاری ڕەزامەندی تۆ، ئەگەر دەمزانی کارێکی دیکە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی زیاتری تۆ، سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەو کارە دەبووم.

سەعقەب کوڕی زوهەیری ئەزدی دەڵێت: بیستم عەمار دەیوت: سوێند بەخوا دڵنیام ئەم دەستەیە زەربەیەکی ئەوتۆ لەئێوە دەدەن دەبێتە هۆی بەدگومانی خراپەخوازان، سوێند بەخوا ئەگەر بمانکوژن و تا باخی دارخورماکانی هیجر پاشەکشێمان پێ بکەن، دڵنیایین ئێمە لەسەر ڕاستین و ئەوان هەڵەن.

حوبە کوڕی جوەینی عورەینی دەڵێت: من و باوکی مەسعود لەمەداین ڕۆشتینە لای حوزەیفە، وتی: بەخێر بێن، لەهۆزەکانی عەرەب کەسم زیاتر لەئێوە خۆش ناوێت. وتم: ئەی باوکی عەبدوللە، حەدیسێکمان بۆ بگێڕەوە چوونکە لەئاژاوەکان دەترسین. وتی: لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کەکوڕی سومەییە لەگەڵ ئەوانە چوونکە لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: دەستەیەکی یاخی لەرێ دەرچوو، دەیکوژن و دوایین خواردنی ئەو شیری تێکەڵ بەئاو دەبێت.

دەڵێت: لەجەنگی سەفین بینیم دەیوت: دوایین خواردنی من لەم دنیایە بێنن. شیری تێکەڵ بەئاویان بۆ هێنا، لەکاسەیەکی گەورە کەئاڵقەیەکی سووری پێوە بوو. حوزەیفە بەئەندازەی یەك تاڵە موو، هەڵەی نەکردبوو.

عەمار وتی: ئەمڕۆ چاوم بەهاوڕێکانم، پێغەمبەر (د.خ) و دەستەکەی دەکەوێت، سوێند بەخوا ئەگەر لێمان بدەن و تا دارخورماکانی هیجر دوورمان بخەنەوە، ئێمە لەسەر ڕاستین و ئەوان هەڵەن. دواتر وتی: مەرگ لەژێر

ڕەمەکاندایە و بەهەشت لەژێر شمشێر.

زەید کوڕی وەهبی جوهەنی دەڵێت: عەمار کوڕی یاسر ئەو ڕۆژە وتی: چ کەسێك بەدوای ڕەزامەندی خواوەند دەگەڕێت و ئارەزووی بینینەوەی ماڵ و منداڵەکەی ناکات؟ دەستەیەك لەدەوری کۆبوونەوە، وتی: ئەی خەڵکینە هێرش دەکەینە سەر ئەو کەسانە کەگومان دەکەن خوازیاری تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفانن و دەڵێن بەستەم کوژراوە، سوێند بەخوا ئەوان خوازیاری خوێنی عوسمان نین، بەڵکو تامی ئەم دنیایان کردووە و دڵیان بەدنیا بەستووە و دەزانن ئەگەر پشت بەراستییەکان ببەستن، لەنێوان ئەوان و خۆشییەکانی دنیا دەبێتە لەمپەر و چوونکە هیچ پێشینەیەکیان لەئیسلامدا نییە کەشیاوی شوێنکەوتن و خەلافەتی ئەوان بێت، شوێنکەوتەکانی خۆیان فریوداوە دەڵێن پێشەواکەی ئێمە بەستەم کوژراوە تا بەمشێوەیە ببنە پاشا ستەمکارەکان. بەهاوکاری ئەم فریوە گەشتوونەتە ئەو جێگەی دەیبینن و ئەگەر بەو شێوە نەدەبوو، هیچ کات دوو کەس نەدەبوە شوێنکەوتەی ئەوان. خواوەندا ئەگەر سەرکەوتنمان پێ ببەخشیت، چەندین بار سەرکەوتنت پێ بەخشیوین و ئەگەر کاروبارەکان بەوان دەسپێریت، بەهۆی ئەو کارەسات و بەڵایانەی بەسەر بەندەکانتا دەیهێنن، ئازابێکی مەترسیداریان بۆ دابنێ.

دەڵێت: عەمار ڕۆشت و ئەو دەستەیەی بەبانگەوازەکەی ڕازی ببوون، هاوڕێیەتیان دەکرد تا ئەوەی لەعەمرۆ عاس نزیك بوویەوە، پێی وت: ئەی عەمرۆ، بۆ وەرگرتنی میسر، دینەکەی خۆت فرۆشت، نەحلەتت لێ بێت چوونکە بەردەوام خوازیاری گومڕایی و بەلاریێ بردنی ئیسلام بوویت. بەعوبەیداللە کوڕی عومەری وت: خواوەند لەناوت ببات، دینی خۆت بەدوژمنی ئیسلام و کوڕی دوژمنی ئیسلام فرۆشت.

وتی: نە، تەنیا خوازیاری تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمانم.

وتی: تۆ دەناسم و شایەتی دەدەم لەکردەوەکانی خۆت تەنیا مەبەستت ڕەزامەندی خواوەندە. ئەگەر ئەمڕۆ نەکوژرێیت، بەیانی دەمریت، بزانە کاتێك بەئەندازەی نییەتییان بەخشش بەکەسان دەدەن، نییەتی تۆ چییە؟

باوکی عەبدولرەحمان کوڕی سولەمی دەڵێت: لەعەمار کوڕی یاسرم بیست کە لەسەفین بەعەمرۆ کوڕی عاسی وت: سێ جار لەگەڵ خاوەنی ئەم ئالأیە کەهاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) بوو، جەنگاویت و ئەمە چوارەم جارە. لەجارەکانی پێشوو نەچاکترە و نە باشترە.

باوکی عەبدولرەحمانی سولەمی دەیوت: لەسەفین هاورێیەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیبم دەکرد، دوو کەسمان بۆ ئەسپەکەی ئەو دانابوو تا پارێزگاری لێ بکەن و رێگە نەدەن هێرش بەرێت. کاتێك ئەو دووانە لێی بێ ئاگا دەبوون، هێرشی دەبرد و کەدەگەڕایەوە، شمشێرەکەی خوێناوی بوو. رۆژێك هێرشی برد و کاتێك گەڕایەوە، شمشێرەکەی خوار ببوو. شمشێرەکەی فرێدا و وتی: ئەگەر خوار نەدەبوو، نەدەگەڕامەوە.

یەکێك پێی وت: شمشێر وەشاندنی پیاوی بەبڕشت بەم شێوەیە.

باوکی عەبدولرەحمان وتی: خەڵکان شتێکیان بیستووە کەدەیگێڕنەوە و درۆ ناکەن.

دەڵێت: عەمارم بینی کەرووی دەکردە هەرکام لەدۆڵەکانی سەفین، هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) بەدوایدا دەڕۆشتن. بینیم رووی کردە مێرقال کوڕی هاشم کوڕی عوتبە، ئالأداری عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: هاشم ترسەنۆکیت و یەك چاو، یەك چاوێك بوێری لەخۆی نیشان نەدات، باش نییە. لەم کاتەدا یەکێك لەناو دوو ریز دەرکەوت و عەمار وتی: سوێند بەخوا ئەمە سەرپێچی پێشەواکەی خۆی دەکات و لەسوپاکەی بەجێ دەمێنێت و هەوڵەکانی بێ هۆ دەبێت. هاشم سوار بە.

دەڵێت: هاشم سەرکەوت و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەو یەك چاوەی بەدوای شوێنێك بۆ کەسانی خۆی دەگەڕا

ئەوەندە ژیاوە، بێزار بووە

ناچار دەبێت تێکبشکێنێت یا تێکبشکێت))

عەمار دەیوت: هاشم پێشڕەوی بکە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە و مەرگ لەسەر نووکی رمەکان. دەرگای ئاسمانیان کردۆتەوە و حۆرییەکان

خۆیان رازاندۆتەوە، ئەمرۆ پێغەمبەر (د.خ) و هاوەڵانی دەبینم.

دەڵێت: نەگەڕانەوە تا ئەو کاتەی کوژران.

دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) کە لەوێ بوون، دەیانوت ئەوان دەیانزانی.

دەڵێت: کاتێک شەو داهات بەخۆم وت دەڕۆم لای نەیارەکانمان بۆ ئەوەی بزانم ئەوانیش سەبارەت بەکوژرانی عەمار هەمان بۆچوونیان هەیە؟ کاتێک دەستمان لەجەنگ هەڵدەگرت، ئەوان لەگەڵ ئێمە قسەیان دەکرد و ئێمەیش بەهەمان شێوە. سوار ئەسپەکەم بووم، خەڵکان ئارامیان گرتبوو، ڕۆشتم و چوار کەسم بینی کەپێکەوە پیاسەیان دەکرد: معاویە و باوکی ئەعوەری سولەمی و عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدوڵلە کوڕی عەمرۆ کە لەهەموویان باشتر بوو. ئەسپەکەم بۆ لای ئەوان غار پێدا بۆ ئەوەی قسەکانیان ببیستم.

عەبدوڵلە بەباوکی وت: باوکە گیان، ئەمڕۆ ئەو پیاوەیان کوشت کە پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەو بەوشێوەیە قسەی کردبوو.

وتی: چی فەرموو بوو؟

وتی: مەگەر لەگەڵ ئێمە نەبوویت کاتێک مزگەوتەکەمان دروست دەکرد و خەڵکان بەرد و خشتەکانیان یەك یەك دەهێنا بەلاَم عەمار دوو خشت و بەردی دەهێنا و لەهۆش چوو. پێغەمبەر (د.خ) هات و تەپ و تۆزی لەروخساری پاك کردەوە و دەیفەرموو: هاوار لەتۆ، کوڕی سومەییە! خەڵك یەك یەك بەرد و خشت دەهێنێت بەلاَم تۆ بەمەبەستی وەرگرتنی پاداشتی خوایی دوو دوو دەیهێنیت، ئەی هاوار، یاخییەکان تۆ دەکوژن.

عەمرۆ ئەسپەکەی خۆی لەئەسپەکەی معاویە نزیك کردەوە و وتی: معاویە! دەبیستی عەبدوڵلە چی دەڵێت؟

وتی: چی دەڵێت؟

عەمرۆ بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

معاویە وتی: پیرەپیاوێکی ئەحمەقیت، هێشتا حەدیس دەگێڕێتەوە بەلاَم لەگمیزەکەی خۆت هەڵدەخلیسکێیت. ئێمە عەمارمان نەکوشت، ئەو کەسە کوشتی ئەوی هێنا بۆ گۆڕەپانی جەنگ. کەسان لەخێوەتەکان سەریان دەرهێنا و

دەیانوت: ئەو کەسە عەماری کوشت کە ئەوی هێنا بۆ گۆڕەپانی جەنگ.

دەڵێت: نازانم کامیان سەرسوڕهێنەرتر بوو، ئەو یا ئەوان؟

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دەگێڕنەوە ئەو کاتەی عەمار کوژرا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخەڵکانی رەبیعە و هەمەدانی وت: ئێوە زریێ و ڕمی منن. نزیکەی دوانزە هەزار کەس لەوان ئامادە بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوار لەسەر ئێسترەکەی خۆی پێشڕەوی و هێرشی کرد. ئەو دەستەیەیش پێکەوە هێرشیان برد و ریزەکانی سوپای شامیان تێکشکاند. بەهەر کەسێك گەیشتن، کوشتیان تا ئەوەی لەمعاویە نزیك بوونەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((شمشێر دەوەشێنم

بەڵام معاویەی چاوگێڕی ورگ زل نابینم.))

معاویە هاواری کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی معاویە بۆ خەڵکان بەکوشتن دەدەیت، با داوەری بەخواوەند بسپێرین، هەرکەس ئەوی دیکەی کوشت، کاروبارەکان تەسلیم بەو بکرێت.

عەمرۆ وتی: ئەم پیاوە دادپەروەری کردە پیشە.

معاویە وتی: دادپەروەری نابینم، دەزانی هەرکەس رووبەرووی ئەو ببێتەوە، دەکوژرێت.

عەمرۆ وتی: شیاو نییە رووبەروو نەبیتەوە.

معاویە وتی: تەماحی ئەوەت هەیە دوای من خلافەت بەدەست بێنیت.

## بەسەرهاتی هاشمی مێرقال و گێرانەوەی ( لیله الهریر )

باوکی سەلمە دەڵێت: کاتی شەو هاشم کوڕی عوتبەی زوهری خەڵکانی کۆکردەوە و وتی: هەرکەس مەبەستی ڕەزامەندی خواوەند و پاداشتی ئەو دنیایە، لەدەوری من کۆببێتەوە. کەسانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە و لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکان بەبەردەوامی هێرشی دەکردە سەر سوپای شام. هێرشی کردە سەر هەر شوێنێك ڕووبەرووی خۆڕاگری خەڵکانی شام بوویەوە. شەڕێکی قورسی ئەزموون کرد. بەهاوەڵانی خۆی وت: لەخۆڕاگری ئەوان مەترسن چوونکە عەرەبەکان بەردەوام لەژێر ئاڵاکانی خۆیان خۆڕاگری دەکەن بەڵام ئەوان لەسەر گومڕایین و ئێوە لەسەر ڕاستی، ئەی خەڵکینە خۆڕاگری بکەن و کۆببنەوە، هێدی و لەسەر خۆ بەرەو ڕووی دوژمن دەڕۆین، لەوێ خۆڕاگر بن و هاوکاری یەك بکەن، بەردەوام ناوی خواوەند بێنە سەرزمان، کەس لەتەنیشتەکەی خۆی هیچ نەپرسێت، سەیری دەوروبەر مەکەن و هاوشێوەی نەیارەکانتان بەرگری بکەن. بەمەبەستی بەدەست هێنانی پاداشی خوایی بجەنگن تا ئەو کاتەی خواوەند لەنێوان ئێمە و ئەوان داوەری بکات چوونکە خواوەند باشترینی داوەرەکانە.

دەڵێت: لەگەڵ دەستەیەك لەقوڕئان خوێنەکان ڕۆشت و شەوانە، خۆی و هاوەڵانی جەنگێکی قورسیان دەست پێکرد و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

لەم حاڵەدا بوون کەگەنجێك هاتە لایان و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((من منالی غەسانم کەپاشایەتیان هەبوو
هەنووکە شوێنکەوتەی دینی عوسمانم
شتێکم بیست و خەمبار بووم
لەوەی عەلی کوڕی عەفانی کوشتووە))

هێرشی هێنا و ئاوڕی نەدایەوە. شمشێری دەوەشاند و جوێنی دەدا و سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بەنەحلەت دەکرد.

هاشم کوڕی عوتەبە وتی: ئەی بەندەی خوا، ئەم وتانەی تۆ دوژمنایەتی لێ دەکەوێتەوە و دوای ئەم جەنگە، ڕۆژی هەستانەوەمان هەیە، لەخواوەند بترسە چوونکە دەڕۆیتە پێشگای ئەو و پرسیاری مەبەستی ئێستات لێ دەکات.

وتی: لەگەڵ ئێوە دەجەنگم چوونکە بەو شێوەی پێیان وتووم هاوڕێکەی ئێوە و خۆتان نوێژ ناخوێنێت. لەگەڵ ئێوە دەجەنگم چوونکە پێشەواکەی ئێوە خەلیفەی ئێمەی کوشتووە و ئێوە داوای کوشتنی خەلیفەتان لێکردووە.

هاشم وتی:-تۆ چ کارێکت بەکوڕی عەفان هەیە، هاوەڵانی محەممەد و منالی هاوەڵانی و قورئان خوێنەکانی خەڵك، ئەویان کوشت چوونکە دیاردە تازەکانی لەناو ئیسلامدا دروست کرد و پێچەوانەی فەرموودەکانی قورئان دەجووڵایەوە، بکوژەکانی ئەو خاوەنانی دین بوون و لە تۆ و هاوەڵانت بۆ کاروباری دین شیاوتر و شارەزاتر. گومان ناکەم کاری ئەم دینە و ئەم ئۆمەتە بۆ یەك خولەك پشتگوێ خرابێت.

وتی: بۆنا، سوێند بەخوا درۆ ناکەم چوونکە درۆ زیانی هەیە و سوودی نییە.

وتی: شارەزایان باشتر بۆ ئەم کارە شارەزان. ئەم کارە بەوان بسپێرە.

وتی: گومان دەکەم چاکەخوازی من بیت.

وتم: ئەوەی دەڵێی پێشەواکەی ئێمە نوێژ ناکات، ئەو یەکەم کەسە نوێژی خوێند و لەهەمووان زیاتر شارەزای دینە و لە پێغەمبەر (د.خ) نزیکترە، ئەو کەسانەی لەگەڵ من دەیانبینی، هەموویان قورئان خوێنەکانن، هەمووان شەوانە بەئاگان و سەرقاڵی شەو نوێژن. ئاگادار بە ئەم بەدبەختە لەرێ دەرچووانە گومرات نەکەن.

گەنج وتی: ئەی بەندەی خوا، تۆ بەکەسێکی پارێزکار دەبینم، ئایا دەتوانم تۆبە بکەم؟

وتی: بەڵێ، ئەی بەندەی خوا تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز بکەرەوە تا لێت ڕازی ببیت چوونکە ئەو بەتۆبەی بەندەکانی ڕازی دەبێت و لەخراپەکان چاو دەپۆشێت و چاکەکارانی خۆش دەوێت.

دەڵێت: گەنجەکە گەڕایەوە. یەکێك لەخەڵکانی شام هاواری دەکرد: ئەو عێراقییە فریویدای، ئەو عێراقییە فریویدای.

وتی: نا فریوی نەدام، بەڵکو ئامۆژگاری کردم.

دەڵێت: هاشم و هاوەڵانی بەقورسی دەجەنگان، هاشمیان بەمێرقال ناودەبرد لەبەر ئەوەی بۆ کاروباری جەنگ خێرا بوو. خۆی و هاوەڵانی جەنگی کرد تا ئەوەی بەسەر نەیارەکانی خۆیان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ئەوەندی نەمابوو خەڵکانی شام بەتەواوی شکست بخۆن. لەکاتی خۆرئاوا، دەستەیەك لەخەڵکانی تەنوخ بۆ رووبەروو بوونەوە هاتن و هێرشی کردە سەر ئەوان. هاشم هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((یەکچاو بەدوای شوێنێك بۆ کەسانی خۆی دەگەڕێت

ئەوەندە ژیاوە لەژیان بێزار بووە

و شەڕکەرانی لەزی ئەلکعوب لەپێ دەخست.))

دەڵێت: ئەو رۆژە نۆ یا دە کەسی کوشت. ئەوسا حارس کوڕی مونزەری تەنوخی هێرشی کردەسەر و زەربەیەکی لێدا و لەپێ کەوت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسی بۆ لای ئەو ناردبوو تا ئاڵاکەی خۆی بباتە پێش. بەنێردراوی وت: سەیری سکی من بکە. کاتێك سەیری کرد، سکی هەڵدرا بوو.

حەجاج کوڕی غەزیەی ئەنساری هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر لەکوشتنی کوڕی بودەیل و هاشم شانازی بەخۆتانەوە دەکەن

ئێمەیش زوئەکەلاع و حەوەشبمان کوشت

ئێمە بووین دوای رووبەروو بوونەوە و جەنگ،

عوبەیداللەی هاورێیی ئێوەمان لەت لەت کرد

ئێمە بووین گەمارۆمان خستە سەر وشتر و هاوەڵانی وشتر

ئێمە بووین ژەهر خواردمان کردن.))

زەید کوڕی وەهبی جوهەنی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای دەستەیەك لەخەڵکانی شام گوزەری کرد کەوەلید کوڕی عوقبە لەناویاندا دەبینرا. خەلیفەیان جوێنباران کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای هاوەڵانی خۆی کە

ڕووبەڕووی ئەوان وەستا بوون، وەستا و وتی: هێرشیان بکەنەسەر چوونکە ئێوە ڕێز و گەورەیی ئیسلام و ڕوخساری خوپارێزانتان هەیە. سوێند بەخوا سەرکردەکەیان معاویە و ڕوسپی زادە و باوکی ئەعوەری سولەمی لەهەمووان لەنەزانییەوە نزیکترن و کوڕی باوکی موعیت کە لەئیسلامدا قامچی بارانیان کرد، ئەمانە دەبێت ڕەخنە لەمن بگرن. پێشتریش بۆ جەنگی من هاتبوون. پێشنیاری ئیسلامم پێکردن و ئەوان پێشنیاری پەرستنی بتەکانیان دەکرد، سپاس بۆ خوا کەدوو ڕووەکان لەکۆنەوە دژایەتی منیان دەکرد.بەڵام خواوەند ئەوانی بەزاند و سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنن. ئەمە بەڵایەکی گەورەیە. ئەم خراپەکارانە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان بەردەوام مەترسی بوون. بەشێکی ئەم ئۆمەتەیان گومڕا کردووە و بۆ ئاژاوەنانەوە هانیان داون و بەدرۆ و تۆمەتی ناڕەوا، هەوەسەکانی ئەوانیان بزواندووە. هەنووکە بۆ جەنگی ئێمە هاتوون تا ڕووناکی ئاینی خواوەند بکوژێننەوە. خواوەندا هاودەستەکانیان لەیەك بپچڕێنە و بڵاوە بەکۆبوونەوەیان بکە، سزای گوناحەکانیان بدە چوونکە هەرکەس هاوڕێی تۆ بێت، هیچ کات ڕیسوا نابێت و هەرکەس دوژمنی تۆ بێت، هیچ کات بەهێز نابێت.

شەعبی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای دەستەیەك لەخەڵکانی شام گوزەری کرد. لەشوێنی خۆیان نەدەجووڵان و خەڵکیان دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاندەدا. پێیان وت ئەوان لەخەڵکانی غەسانن. وتی: ئەوان شوێنەکانی خۆیان بەجێ ناهێڵن مەگەر بەزەبری شمشێر بۆ ئەوەی لەناویان ببات و ئێسقانەکانی سەریان بشکێنێت، ئەوانەی خوازیاری پاداشتن، لەکوێن؟

دەڵێت: دەستەیەك لەموسوڵمانان لەدەروی کۆبوونەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب، محەممەدی کوڕی بانگ کرد و وتی: لەسەر خۆ بۆ لای ئەو دەستەیە پێشڕەوی بکە و کاتێك ڕمەکانیان بۆ سەر سنگیان بەرز کردەوە، دەست ڕاگرە تا ئەو کاتەی فەرمانی منت پێدەگات.

دەڵێت: محەممەد ئەو کارەی کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستەیەکی هاوشێوەی دەستەکەی ئەوان ئامادە کرد و کاتێك نزیك بوونەوە، ڕمەکانیان بەرز

کـردەوە. عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب فـەرمانی هێرشـی بـەهاوەڵانی خۆیـدا. محەممەدیش لەگەڵ سوپاکەی ژێر دەسـتی خۆی هێرشـی برد و توانییـان چەند کەسێکیان لێ بکوژن و لەشوێنەکەی خۆیان دووریان بخەنەوە. دوای ئاوا بوونی خۆر، جـەنگ بەقورسـی بـەردەوام بـوو. زۆربـەی کەسـان تـەنیا بەئیشارە نوێژیان خوێند.

ئەبوبەکری کێندی دەڵێت: لەجەنگی سەفین عەبدوالله کوڕی کەعبی مورادی لەپێکەوت، ئەسـوەد کـوڕی قەیسـی مـورادی لای ئـەو گـوزەری کـرد.کەوتی: ئـەی ئەسوەد.

ئەسوەد وەڵامی دایەوە و ئەوی ناسییەوە، وتـی: سوێند بـەخوا خـەمبارم کە لەپێ کەوتیت، سوێند بەخوا ئەگەر لێرە دەبووم هاوکاری و بەرگریم لێدەکردیت، ئەگەر بکوژەکەی تۆم دەناسی ڕێگەم نەدەدا لەدەستم دەرباز ببێت تـا ئـەو کاتـەی دەمکوشت یا پەیوەستی تۆ دەبووم.

لەئەسپەکەی هاتەخوار و وتی: جیرانەکانت هیچ کات خراپەیان لەتۆ نەبینی، بەردەوام لەبیری خواوەندا بوویت، خوا بتبەخشێت، ئامۆژگاریم بکە.

وتـی: لەخواوەنـد بترسـە و چاکەخوازی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب بـە، شـان بەشانی ئەو شەڕی گومڕاکان بکـە تـا ئـەو کاتـەی سـەرکەوتن بەدەسـت دێنێت یا دەگەڕێیتەوە بۆ لای خواوەند. لەمنەوە سڵاوی بگەیێنە و پێی بڵـێ لـەم گۆڕەپانـە ئەوەنـدە بجەنگـە تـا لەپـشت سـەرت جێـی دێڵێـت چـوونکە بـەیانی هەرکـەس گۆڕەپـانی لەپـشت سـەری بەجێهێـشتبێت، سـەرکەوتن بەدەسـت بێنێـت. زۆری نەخایاند مرد.

دەڵێت: ئەسوەد ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئاگاداری کردەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتـی: خواوەنـد بیبەخشێت، لەژیانـدا شـەڕی لەگـەڵ دوژمنەکانی ئێمە کرد و کاتی مەرگ، چاکەخوازمان بوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق مـوالی منداڵەکانی موتـەلیب دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی حەنبەلی جومەحی بوو لەجەنگی سەفین بەمـشێوەیە قسەی لەگـەڵ عـەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد.

عەوانــە دەڵێــت: کــوڕی حەنبــەل ئــەو ڕۆژە هۆنراوەیــەکی خوێنــدەوە بــەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر بمکوژن، کوڕی حەنبەلم

من ئەو کەسەم وتم نەعسەل لەنێوان ئێوەدایە))

باوکی موخەنەف دەڵێت: ئەو شەوە کەسان تابەرەبەیان جەنگان کەشەوی (لیلە الهریر) بوو. تا ئەو جێگەی ڕمەکان شکان و تیرەکان کۆتاییان پێهات و بەناچاری دەستیان بۆ شمشێر برد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڕۆشتە لای باڵی چەپ و ڕاست و فەرمانی بەدەستەی قورئان خوێنەکان دەدا هێرش بکەنە سەر ریزەکانی بەرامبەر بەخۆیان. بەردەوام بەم کارەوە سەرقاڵ بوو. تا بەرەبەیان بەناو هەموو بەرەکانی جەنگدا دەگەڕا. ئەشتەر فەرماندەی باڵی ڕاست و کوڕی عەباس فەرماندەی باڵی چەپ وا خۆی فەرماندەیی ناوەڕاستی سوپاکەی دەکرد. ئاگری جەنگ لەهەموو بەرەکاندا بڵێسەی سەندبوو. ئەم شەوە، شەوی هەینی بوو.

دەڵێت: ئەشتەر لەگەڵ باڵی ڕاست هێرشی برد و دەجەنگی. شەوی پێنج شەممە و هەینی تا هەڵاتنی خۆر بەمشێوە بوو. لەم کاتەدا بەهاوەڵانی خۆی دەوت: بەئەندازەی ئەم ڕمە پێشڕەوی بکەن. کاتێک بەو ئەندازەیە پێشڕەوییان دەکرد دووبارە داوای لێدەکردن بەو ئەندازەیە پێشڕەوی بکەن تا ئەوەی زۆربەی خەڵك لەپێشڕەوی کردن ناتەوان بوون. کاتێك ئەمەی بینی، وتی: پەنا بەخوا، ئەگەر دەخوازن پاشماوەی ڕۆژ شیر بەمەڕەکان بدەن. داوای ئەسپەکەی خۆی کرد و ئاڵاکەی بەحەیان کوڕی هوزەی نەخەعی سپارد. بەناو دەستەکاندا دەسووڕایەوە و دەیوت: کێ گیانی خۆی بەخواوەند دەفرۆشێت و شان بەشانی ئەشتەر دەجەنگێت تا ئەو کاتەی سەرکەوتن بەدەست دێنێت یا بۆ لای خواوەند دەگەڕێتەوە؟ هەرکەس لەگەڵ ئەو و حەیان کوڕی هوزە پێشڕەوی کرد، لەشوێنی خۆی نەدەجوولا.

عــەمار کــوڕی ڕەبیعــەی جــورەمی دەڵێــت: ســوێند بــەخوا ئەشــتەر لای مــن گــوزەری کــرد، لەگــەڵی ڕۆشــتم، ژمارەیــەکی زۆر لەخــەڵکان لــەدەوری کۆبوونــەوە.

ئەشتەر ڕۆشت تا گەیشتە کەنارەکانی باڵی ڕاست و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی وەستا، وتی: مام و خاڵەکانم قوربانتان بن، هێرش بەرن، هێرش بردنێك ببێتە هۆی ڕەزامەندی خواوەند، بەمشێوەیە هێز بەم دینە ببەخشن، کاتێك هێرش دەبەم، ئێوەیش هێرش بەرن.

دەڵێت: لەئەسپەکەی هاتەخوارو بەئاڵادارەکەی خۆی وت: پێشڕەوی بکە. سوپاکەی هێرشی برد و پاشەکشێیان بە خەڵکانی شام کرد تا لەئوردووگاکەیان نزیك بوونەوە. لەوێ جەنگێکی-قورسیان ئەزمون کرد و ئاڵادارەکەی ئەشتەر کوژرا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك بینی سوپاکەی لەسەرکەوتن نزیك بۆتەوە، دەستەیەکی بۆ هاوکاری ئەوان نارد.

جویرییە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس لەجەنگی سەفین بەوەردانی وت: دەزانی نموونەی من و تۆ هاوشێوەی چییە؟ هاوشێوەی ئەسپێکی سوورمووکەئەگەر پێشڕەوی بکات لەپێ دەکەوێت و ئەگەر بگەڕێتەوە، دەکوژرێت، سوێند بەخوا ئەگەر پاشەکشێ بکەیت، دەتکوژم. وتی: بەندێکم بۆ بێنن و قاچەکانی بەستەوە.

وەردان وتی: سوێند بەخوا ئەی باوکی عەبدوالله تا سنووری مەرگت دەبەم، دەستی خۆت بخە سەرشانی من. ئەوسا ڕۆشتە پێش، هەندێ کات سەیری عەمرۆی دەکرد و دەیوت: بۆ سنووری مەرگت دەبەم.

باوکی موخەنەف دەڵێت: کاتێك عەمرۆ عاس بینی خەڵکانی عێراق لەسەرکەوتن نزیك بوونەتەوە و لە لەناوچوونی خۆیان ترسا، بەمعاویەی وت: دەتەوێت پێشنیاری کارێکت پێ بکەم تا هێز بەسوپاکەی ئێمە ببەخشێت و بڵاوە بەسوپای ئەوان بکات.

وتی: بەڵێ.

وتی: قورئانەکان بەرز دەکەینەوە و دەڵێین ئەوەی لەناو قورئاندا هەیە لەنێوان ئێمە و ئێوە داوەری بکات، ئەگەر دەستەیەك لەوان ڕازی نەبن، دەستەیەك لەوان ڕازی دەبن و دوو بەرەکی لەناو ئەواندا دروست دەبێت و ئەگەر بڵێن ڕازی بووین، ئەم بەڵا و کوشتارەمان لەسەر هەڵدەگیرێت.

دەڵێت: قورئانەکانیان لەسەر ڕمەکان بەرز کردەوە و وتیان: کتێبی خواوەند لەنێوان ئێمە و ئێوە داوەر بێت. دوای خەڵکانی شام، کێ پارێزگاری لەسنوورەکان دەکات؟ دوای خەڵکانی عێراق کێ پارێزگاری لەسنوورەکانی عێراق دەکات؟

کاتێك خەڵکان بەرز کردنەوەی قورئانەکانیان بینی، وتیان: رازی دەبین و بۆ فەرموودەکانی قورئان دەگەڕێینەوە.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەبەرز کردنەوەی قورئان و پێشنیاری داوەری

جوندەبی ئەزدی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بەندەکانی خوا، درێژ بەجەنگ دژی دوژمن بدەن چوونکە معاویە و عەمرۆ کوڕی عاس و کوڕی باوکی موعیت و حەبیب کوڕی موسلیمە و کوڕی باوکی سەرح و زوحاك کوڕی قەیس شوێنکەوتەی دین و قورئان نین. ئەوان باشتر لەئێوە دەناسم، لەمناڵییەوە ئەوانم بینیوە و لەگەورەییشدا دەیانناسم، خراپترینی مناڵان بوون و خراپترینی پیاوان، ئەوانەی هەنووکە قورئانیان بەرز کردۆتەوە، نازانن چی تیا نوسراوە، تەنیا بۆ فرت و فێڵ ئەو کارە دەکەن.

وتیان: کاتێك پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەندمان پێدەکەن، ناتوانین رازی نەبین.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بۆیە لەگەڵ ئەوان دەجەنگم تا ملکەچی فەرموودەکانی ئەم کتێبە بن، فەرمان و پەیمانی خواوەندیان لەبیر و قورئانەکەیان بەدەستی فەرامۆشی سپاردبوو.

مەسعەر کوڕی فەدەکی تەمیمی و حەسین تایی سەنبەسی لەگەڵ دەستەیەك لەقورئانە خوێنەکانی هاودەستیان، وتیان: ئەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب! هەنووکە کەپێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند دەکەن، رازی ببە و گەرنە تۆ و بنەماڵەکەت تەسلیمی ئەوان دەکەین یا ئەو بەڵایەت بەسەر دێنین کە بەسەر کوڕی عەفاندا هێنامان. ئێمە لێپرسراوین لەوەی فەرموودەکانی ناو قورئان جێبەجێ بکەین و پێی رازی ببین. سوێند بەخوا ئەگەر رازی نەبیت بەوشێوەیە

هەڵس و کەوتت لەگەڵ دەکەین.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بیرتان بێت ڕێگەم لێگرتن و وتەکانی خۆتان لەبیر بێت، ئەگەر فەرمانەکانی من جێبەجێ دەکەن، بجەنگن و ئەگەر نافەرمانی دەکەنە پیشە، ئەوەی دەخوازن ئەنجامی بدەن.

وتیان: نە، کەسێك بەدوای ئەشتەر بنێرە تا بگەڕێتەوە.

یەکێك لەخەڵکانی نەخەع ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری لای مەسعەب کوڕی زوبەیر بینیبوو، وتبووی: کاتێك خەڵك عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان بۆ ڕازی بوون بەداوەری کردن ناچار کرد و وتیان کەس بەدوای ئەشتەر ڕەوانە بکە تا بگەڕێتەوە، لەوێ بووم.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، یەزید کوڕی هانی سەبیعی بۆ لای ئەشتەر نارد کە بگەڕێتەوە. ئەو ڕۆشت و پەیامەکەی گەیاند.

ئەشتەر وتی: پێی بڵێ ئێستا کاتی ئەوە نییە من لێرە دوور بخەیتەوە، هیوادارم سەرکەوتن بەدەست بێنم، بۆ بانگ کردنەوەم پەلە مەکە.

دەڵێت: یەزید کوڕی هانی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە و پەیامەکەی پێگەیاند. هەمان سات لای ئەشتەرەوە دەنگ بەرز بوویەوە و ئەو دەستەیە وتیان: گومان دەکەین فەرمانی جەنگت بەئەشتەر داوە.

وتی: چۆن بەو شێوەیە گومان دەکەن؟ مەگەر بەگوێی نێردراوەکەدا چرپاندم؟ مەگەر لەبەر چاوی خۆتان ئەوم نەنارد و ئێوەیش نەتانبیست؟

وتیان: کەس بنێرە با بگەڕێتەوە وەگەرنە لەتۆ جیا دەبینەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بڕۆ لای ئەشتەر و پێی بڵێ بگەڕێتەوە چوونکە ئاژاوە سەری هەڵداوە. ئەم پەیامەی بەئەشتەر گەیاند، وتی: بەهۆی بەرز کردنەوەی قورئانەکان؟

وتی: بەڵێ.

وتی: سوێند بەخوا کاتێك قورئانەکانیان بەرز کردەوە، دڵنیا بووم ئاژاوە و دووبەرەکی دێتە ئاراوە، ئەمە ڕاوێژی رووسپی زادەیە، مەگەر نابینی خواوەند چۆن ڕێگەی بۆ تەخت کردووین، ڕەوایە ئێرە بەجێبێڵم وبگەڕێمەوە.

یەزید کوڕی هانی دەڵێت: پێم وت: دەخوازیت لێرە سەرکەوتن بەدەست بێنیت بەڵام لەویٚ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکوژن یا تەسلیمی بکەن؟

وتی: نا، سوێند بەخوا، سبحان الله.

وتم: ئەوان دەیانوت: کەس بەدوای ئەشتەر ڕەوانە بکە تا بگەڕێتەوە وەگەرنە بەهەمان شێوە کەکوڕی عەفانمان کوشت، تۆیش دەکوژین.

دەڵێت: ئەشتەر گەڕایەوە، وتی: ئەی خەڵکی عێراق، ئەی کەسانی سست و لاواز، کاتێك بەسەر ئەواندا سەرکەوتن و زانییان بەتەواوی لەناویان دەبەن، قورئانەکانیان بەرز کردەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی قورئانتان پێدەکەن، لەکاتێکدا هەم فەرموودەکانی قورئان و هەم سوونەتی پێغەمبەریان پشتگویٚ خستبوو، گوێیان لیٚ مەگرن، بەئەندازەی ڕاکردنی ئەسپێك مۆڵەتم پێبدەن چوونکە دڵنیام سەرکەوتن بەدەست دێنم.

وتیان: بەمشێوەیە ئێمەیش لەگوناحەکەی تۆ دەبینە شەریك.

وتی: هەنووکە کەکەسە ناودارەکانی ئێوە کوژراون و تەنیا کەسانی پەست و بیٚ بەها لەناو ئێوەدا ماونەتەوە! پێم بڵیٚ، کەس لەسەر ڕاستی بوون؟ ئەو کاتەی دەکوژران و کەسە ناودارەکانتان دەکوژران؟ ئەگەر ئێستا دەست لەجەنگ هەڵبگرن، بەهەڵەدا چوون. یا ئەوەی ئێستا لەسەر ڕێگەی ڕاستین و کەسە چاکەکارەکانتان هەنووکە لەناو جەهەننەمدان؟

وتیان: ئەی ئەشتەر، وازمان لیٚ بێنە، بۆ ڕەزامەندی خواوەند دژی ئەوان جەنگاین و هەنووکە بۆ ڕەزامەندی خواوەند دەست لەجەنگ هەڵدەگرین، هەنووکە شوێنکەوتەی تۆ و هاوەڵانی تۆ نین، خۆت لەئێمە بەدوور بگرە.

وتی: سوێند بەخوا فریویاندان و فریوتان خوارد. داویان کرد دەست لەجەنگ هەڵبگرن و ڕازی بوون. ئەی بەدبەختەکان، گومانم دەکرد نوێژەکانی ئێوە لەنائارەزوومەندیتانە بۆ دنیا و دیداری خواوەند. بەڵام دەبینم لەترسی مەرگ ئامێز بۆ دنیا دەکەنەوە. نەحلەت لەئێوە کەهاوشێوەی وشترە گلاوەکانن. دوای ئەمە چیتر ڕێزداری بەخۆتانەوە نابینن، بەنەحلەت بن بەهەمان شێوە کەستەمکاران گرفتاری نەحلەتن.

دەڵێت: ئەشتەریان جوێنباران کرد. ئەویش وەڵامی دانەوە و بەقامچی کەوتنە تەوێڵی ئەسپەکەی. ئەویش بەقامچی لەتەوێڵی ئەسپەکانی ئەوانیدا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب داوای لێکرد ئارام بن و ئارام بوون. دواتر بەخەڵکانی وت: رازی بووین بەوەی قورئان لەنێوان ئێمە و خۆیان بکەنە داوەر.

دەڵێت: ئەشعەس کوڕی قەیس هاتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: وەك دەبینم ئەم خەڵکە رازی بوون بەوەی وەڵامی بانگەوازی ئەوان بۆ داوەری کردن بدەنەوە، ئەگەر دەخوازیت، دەڕۆمە لای معاویە و لەمەبەستی ئەم کارەی دەپرسم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەگەر دەخوازیت، بڕۆ لێی بپرسە.

ئەشعەس ڕۆشتە لای معاویە و وتی: ئەی معاویە، بۆ قورئانەکانتان بەرز کردۆتەوە؟

وتی: بۆ ئەوەی ئێمە و ئێوە بۆ فەرموودەکانی خواوەند بگەڕێینەوە. ئێوە لەخۆتان کەسێك دەنێرن، ئێمەیش کەسێك دەنێرین. بەڵێن و پەیمانی خواییان لێ وەردەگرین پشت بەفەرموودەکانی ناو قورئان ببەسن و سنوورەکانی نەبەزێنن. دواتر لەسەر هەرچی رێککەوتن، پشتی پێ دەبەستین.

ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: کارێکی ڕەوایە. بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە و لەوتەکانی معاویە ئاگاداری کردەوە.

خەڵکان وتیان: ڕەزامەندین و رازی.

دەڵێت: خەڵکانی شام وتیان: ئێمە عەمرۆ کوڕی عاس هەڵدەبژێرین.

ئەشعەس کوڕی قەیس و ئەو دەستەی دواتر خەواریجیان پێك هێنا، وتیان: ئێمە بەباوکی موسا رازی دەبین.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لەسەرەتای ئەم کارە نافەرمانی منتان کرد، چیتر نافەرمانی من مەکەن. بۆچوونی من ئەوە نییە ئەم کارە بەباوکی موسا بسپێرم.

ئەشعەس وزەید کوڕی حەسین و مەسعەری فەدەکی وتیان: تەنیا بەو رازی دەبین چوونکە ئەو ئێمەی لەم گێژاوە دوور دەخستەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: باوەڕم پێی نییە چوونکە پشتی کردە من و خەڵکانی لەمن دوور دەخستەوە، دواتر لەدەستی من هەڵات تا ئەو کاتەی ئەمانم پێ بەخشی. ئەم کارە بەکوڕی عەباس دەسپێرین.

وتیان: جیاوازی چییە تۆ بیت یا کوڕی عەباس؟ کەسێکمان دەوێت بەیەك چاو بڕوانێتە تۆ و معاویە و کەستان لای ئەو گەورەتر و لەپێشتر نەبێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کەواتە ئەشتەر هەڵدەبژێرین.

باوکی جونابی کەلبی دەڵێت: ئەشعەس وتی: مەگەر کەس لەئەشتەر هۆکاری ئەم ئاژاوەیە؟

عەبدولرەحمان کوڕی جوندەب لەباوکی دەگێڕێتەوە: ئەشعەس وتی مەگەر فەرمانەکانی ئەشتەرمان جێبەجێ نەکردووە؟

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: فەرمانەکانی ئەشتەر چییە؟

وتی: ئەوەی بەشمشێر بکەوینە گیانی یەك یا ئەوەی تۆ دەخوازیت و ئەو دەخوازێت، ئەنجام بدرێت.

وتی: جگە لەباوکی موسا بەکەس رازی نابن؟

وتیان: نە.

وتی: چی دەخوازن ئەنجامی بدەن.

دەڵێت: کەسیان بۆ لای باوکی موسا نارد. ئەو بەشداری جەنگەکەی نەکرد و لەعەرز، نیشتەجێ ببوو. کەسێك ڕۆشتە لای و وتی: ئاشتی لەنێوان خەڵکان سەقامگیر بوو.

وتی: الحمدلله رب العالمین.

وتیان: تۆیان وەك داوەر هەڵبژاردووە.

وتی: انا لله و انا الیه راجعون.

باوکی موسا هاتە ئوردووگا، ئەشتەر ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: من ڕەوانە بکە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئەگەر بیبینم دەیکوژم.

ئەحنەفیش ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: ئەی سەروەری

باوەڕداران، بەردێکیان تێگرتوویت و قورساییەکی کەم بەهایان بەسەر تۆدا سەپاندووە لەبەرابەر کەسێك کە لەسەرەتای ئیسلامەوە شەڕی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) و ئیسلامدا کردووە، من ئەم پیاوە دەناسم، چارەسەری لای نییە و کەم ئاوزە، بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەو خەڵکە دەبێت کەسێکی بەتوانا لێیان نزیك ببێتەوە تا تای تەرازوو بەلای ئێمەدا بشکێتەوە، ئەگەر ناخوازیت من بکەیتە داوەر، بمکەرە کەسی دووەم یا سێیەم، دڵنیا بە عەمرۆ عاس هەر گرێیەك لێ بدات، دەیکەمەوە و گرێیەکی قایمتر لێدەدەم.

بەلاّم خەڵکان تەنیا بەباوکی موسا رازی بوون و پشتیان بەفەرموودەکانی قورئان بەست.

ئەحنەف وتی: ئەگەر تەنیا بەو رازی دەبن بەکەسانی دیکە پشتگەرمی بکەن.

ئەوسا ئەمەیان نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحيم، ئەمە فەرمانی داوەری کردنی عەلی سەروەری باوەڕدارانە.

عەمرۆ وتی: ناوی خۆی و ناوی باوکی بنووسە، ئەو پێشەوای ئێوەیە، پێشەوای ئێمە نییە.

ئەحنەف بەعەلی وت: نیشانەی فەرمانڕەوایی موسوڵمانان مەسڕەوە چوونکە دەترسم ئەگەر ئەوکارە بکەیت، هیچ کات فەرمانڕەوایی بۆ تۆ نەگەڕێتەوە. ئەوکارە مەکە تەنانەت ئەگەر خەڵکان یەکتر کوشتار بکەن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ماوەیەك لەرۆژ بەسڕینەوەی نیشانی فەرمانڕەوایەتی رازی نەبوو، دواتر ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: ئەم ناوە بسڕەوە هیوادارم خواوەند بیسرێتەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەو کارەی کرد و وتی: الله اکبر، کردەوەیەك دوای کردەوەیەك و نموونەیەك دوای نموونەیەك. سوێند بەخوا لەرۆژی حودەیبییە بەئامادە بوونی پێغەمبەر (د.خ) دەمنووسی کەپێیان وت: تۆ پێغەمبەری خوا نیت و ئێمە دان بەودا نانێین. ناوی خۆت و ناوی باوکت بنووسە. پێغەمبەر (د.خ) ئەو کارەی کرد.

عـەمرۆ کـوڕی عـاس وتـی: سـبحان الله، بـەم نمونەیـە ئێمـە بـەناباوەڕان دەشوبهێنن.

عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب وتـی: ئـەی روسـپی زادە، بـەردەوام دووڕوو و خراپەخوازی موسوڵمانان بوویت، هاوشێوەی دایکتی کەتۆی هێنایە دنیا.

عەمرۆ هەستا و وتی: چیتر هەرگیز لەیەك شوێندا لەگەڵ تۆ دانانیشم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتـی: هیـوادارم خواوەنـد لەدانیشتنی کەسـانی وەك تۆ دوورم بخاتەوە. نامەکەیان نووسی.

ئەحنەف دەڵێت: معاویە نامەی بۆ عـەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسـی: ئەگـەر دەخوازیت ئاشتی سەقامگیر ببێت، نیشانی سەروەری باوەڕداران بسڕەوە. عـەلی کوڕی ئەبی تالیب راوێژی کـرد. خێـوەتێکی بـوو و منالـەکانی هاشـم دەیـانتوانی سەردانی بکەن، منیش لەگەڵ ئـەوان ڕۆشـتمە ژوور. وتـی: سـەبارەت بـە داواکـەی معاویە بۆ سڕینەوەی نیشانی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونتان چییە؟

دەڵێـت: وتـی: ((ناوی پیرۆز)) یانی سەروەری باوەڕداران.

وتیـان: خواوەنـد لەناویان ببـات. پێغەمبـەریش ئـەو کاتـەی پـەیمانی ئاشـتی لەگـەڵ خـەڵکانی مەککـە نووسـی نوسیبووی: محەممـەد پێغەمبـەری خـوا. بـەڵام بەمـە رازی نـەبوون. تـا نووسـی: ئەمـە پـەیمان نامـەی ئاشـتی محەممـەد کـوڕی عەبدوڵلایە.

پێم وت: ئـەی پیـاو! بارودۆخی تـۆ لەگـەڵ پێغەمبـەر (د.خ) جیـاوازە، سوێند بەخوا ئەم بەیعەتەمان لەبەر تۆ نەکرد، ئەگەر کەسێکی شیاوتر لەتۆمان دەناسی، بەیعەتمان لەگەڵ دەبەست و شەرمان لەگەڵ تۆ دەکرد. سوێند بەخوا ئەگـەر ئـەو ناوە بسڕیتەوە، هیچ کات ناتوانیت ببیتەوە بەسەروەری باوەڕداران.

بێژەر دەڵێت: سوێند بەخوا بەوشێوە بوو کەپێشبینی کـرد. کـەمتر روویـدەدا بۆچوونی ئەو لەبەرابەر بۆچوونێکی دیکەدا بێت و نەیێتەدی.

باوکی موخـەنەف دەڵێت: نامەکەیان بەمشێوەیە نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحیم

ئەمـە نامـەی داوەری کردنـی عـەلی کوڕی ئـەبی تالیـب و معاویـە کـوڕی ئـەبو

سوفیانە.

عەلی بەنوێنەرایەتی خەڵکانی کوفە و هاوەڵانیان کەباوەڕدارن و موسوڵمان، خوازیاری داوەرییە. معاویەیش بەنوێنەرایەتی خەڵکانی شام و هاوەڵانیان کەباوەڕدارن و موسوڵمان، خوازیاری داوەرییە. ئێمە بەفەرموودەکانی خواوەند و فەرمانەکانی قورئان رازی دەبین و جگە لەوە، هیچ شتێك لەنێوان ئێمەدا نابێت.

کتێبی خواوەند لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەنێوان ئێمەدایە، ئەوەی زیندووی دەکاتەوە، زیندووی دەکەینەوە و ئەوەی بەهەڵە لەقەڵەمی بدات، بەهەڵەی دەزانین. داورەکان یانی باوکی موسا ئەشعەری و عەمرۆ کوڕی عاس، هەرچییان لەقورئان دەستکەوت، پشتی پێدەبەستن و ئەگەر لەقورئاندا دەستیان نەکەوت پشت بەسوونەت و حەدیسەکان دەبەستن.

داوەرەکان لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە کوڕی ئەبوسوفیان پەیمان و لەخەڵکان دڵنیاییان وەرگرتووە کەگیانی خۆیان و کەسەکانیان لەئەماندایە و خەڵك بەگشتی بۆ ئەم کارە پشتیوانییان لێ دەکەن. پەیمان و بەڵێنی خوایی لەسەر موسوڵمانانی هەر دوو سوپایە. ئێمە پشت بەم پەیمان نامەیە دەبەستین و فەرمانەکانی دەبێت لەلایەن هەموو موسوڵمانانەوە جێبەجێ بکرێت. بۆ هەر کوێ دەڕۆن، گیانی خۆیان وکەسەکانیان و سامانیان پارێزراوە بێ ئەوەی سیلاح لەئارادا بێت.

بەڵێن و پەیمانی خوایی لەسەر شانی عەبدوالله کوڕی قەیس و عەمرۆ کوڕی عاسدایە تا لەنێوان ئەم ئۆمەتە داوەری بکەن و جارێکی دیکە رێگە نەدەن جەنگ و ئاژاوە سەرهەڵبداتەوە.

ماوەی داوەری کردن تا مانگی رەمەزانە.

ئەگەر بیانەوێت ماوەکە درێژ بکەنەوە، بەرەزامەندی ئەو کارە دەکەن. ئەگەر یەکێك لە دوو داوەرەکە بمرێت، سەرکردەی ئەودەستەیە کەسێکی دیکە هەڵدەبژێرێت و دەبێت کەسێکی دادپەروەر بێت.

شوێنی داوەری کردن، شوێنێك لەنێوان خەڵکانی کوفە و شامدا دەبێت.

ئەگەر دوو داوەر بخوازن دەتوانن دەستنیشانی بکەن کەس جگە لەخۆیان لەو شوێنە ئامادە نەبێت.

دووداوەرەکە بەدڵخوازی خۆیان دەتوانن کەسان بەشایەت بگرن و شایەتی نامەی ئەوان لەناو ئەم پەیمان نامەدا بنووسن. خواوەند هاوکاریمان لەتۆ دەوێت دژی ئەو کەسەی گرنگی بەناوەرۆك و بەندەکانی ئەم پەیمان نامە نادات.

لەهاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئەشعەس کوڕی قەیسی کێندی و عەبدوالله کوڕی عەباس و سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی و وەرقا کوڕی سومی بوجلی و عەبدوالله کوڕی موعجەلی عێجلی و حیجر کوڕی عودەی کێندی و عەبدوالله کوڕی توفەیل عامری و عوقەبە کوڕی زیادی حەزرەمی و یەزید کوڕی حەجییەی تەمیمی و مالك کوڕی کەعبی هەمەدانی وەك شایەت دەستنیشان کران.

لەهاوەڵانی معاویە، باوکی ئەعوەری سولەمی، عەمرۆ کوڕی سوفیان، حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری ، موخاریق کوڕی حارسی زەیدی و زەمل کوڕی عەمرۆ عوزری و حەمزە کوڕی مالکی هەمەدانی و عەبدولرەحمان کوڕی خالیدی مەخزومی، سەبیع کوڕی یەزیدی ئەنساری، عەلقەمە کوڕی یەزیدی ئەنساری، عوتەبە کوڕی ئەبی سوفیان و یەزید کوڕی حوڕی عەنسی وەك شایەت دەستنیشان کران)).

عەمارە کوڕی رەبیعەی جورەمی دەڵێت: کاتێك پەیمانەکەیان نووسی: ئەشتەریان بۆ شایەتیدان بانگ کرد، وتی: دەستی راستم لەجەستەم جیا ببێتەوە و دەستی چەپم هیچ کەڵکێکی نەبێت ئەگەر لەم پەیمان نامە، واژۆ لەسەر ئاشتی یا دەست هەڵگرتن لەجەنگ بکەم، مەگەر جیاواز لەوەیە بەڵگەی تەواوم بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنەکەم هەیە؟ مەگەر لەسەرکەوتن نزیك نەبوونەوە کە بەناڕەوا دەستتان لەجەنگ هەڵگرت؟

ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: سوێند بەخوا نە لەسەرکەوتن نزیك ببوویتەوە و نە شتێکی ناڕەوات بینی، دڵنیابە دەست لەتۆ هەڵناگرین.

ئەشتەر وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا لە دنیا بەهۆی دنیا و لەئاخیرەت بەهۆی

ئاخیرەت لە تۆ جیابوومەتەوە. خواوەند بەشمشێرەکەی من خوێنی کەسانێکی ڕشت کە نەلەوان باشتری نە لای من ڕێز و پێگەی بەرزترت هەیە.

عەمارە دەڵێت: ئەو پیاوە یانی ئەشعەسم بینی، دەتوت خۆڵەمێشیان بەروخساریدا کردووە.

باوکی حوباب دەڵێت: ئەشعەس پەیمان نامەکەی برد و بۆ خەڵکانی خوێندەوە. نیشانیدان و خوێندیانەوە تا ئەوەی لای دەستەیەك لەمناڵەکانی تەمیم گوزەری کرد. عوروە کوڕی ئەدییە، برای بیلال لەناو ئەواندا دەبینرا. پەیمان نامەکەی بۆ خوێندنەوە.

عوروە کوڕی ئەدییە وتی: چۆن خەڵکانێ لەکاروباری خواوەند دەکەنە داوەر، داوەری کردن تەنیا تایبەتە بەخوا. دواتر شمشێر بەدەست هێرشی کردە سەر ئەشعەس کوڕی قەیس و زەربەیەکی لەسمتی ئەسپەکەی دا. هاوەڵانی هاواریان کرد دەست ڕاگرە و ئەو گەڕایەوە. خەڵکی هۆزەکەی ئەشعەس وکەسانێکی زۆر لەم کارە تووڕە بوون. ئەحنەف کوڕی قەیسی سەعدی و مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی و مەسعەر کوڕی فەدەکی و ژمارەیەکی زۆر لەمناڵەکانی تەمیم ڕۆشتنە لای ئەشعەس و داوای بەخشنییان کرد. ئەشعەس ڕازی و لێی خۆش بوو.

عەبدوالله کوڕی ئەودی دەڵێت: یەکێك لەتایەفەی ئود بەناوی عەمرۆ، کوڕی ئەوس، لەسەفین لەناو سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەجەنگی و یەکێك بوو لەو کەسانەی وەك ئەسیر کەوتە دەستی سوپاکەی معاویە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس پێی وت: بیانکوژە.

عەمرۆ کوڕی ئەوس وتی: تۆ خاڵی منیت، مەمکوژە. دواتر مناڵەکانی ئەود ڕۆشتنە لای و وتیان: براکەی ئێمە بەخۆمان ببەخشە.

معاویە وتی: وازی لێ بێنن، سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر ڕاستگۆ بێت پێویستی بەپاڕانەوەی ئێوە نییە و ئەگەر درۆزن بێت، پاڕانەوەی ئێوە سوودی پێناگەیێنێت.

دواتر بەعەمرۆی وت: لەکوێوە من بووم بەخاڵی تۆ، سوێند بەخوا هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی لەنێوان من و تایفەی ئوود بوونی نییە.

وتی: ئەگەر بیڵێم و راستگۆ بم، لەئەماندام؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەزانی دایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیان هاوسەری پێغەمبەر (د.خ) بوو.

وتی: بەڵێ.

وتی: من کوڕی ئەوم و تۆیش برای ئەویت، کەواتە تۆ خاڵی منیت.

وتی: دەستخۆش، لەناو ئەم هەموو خەڵکە کەس جگە لەتۆ هەستی بەم بابەتە نەکرد.

دواتر بەخەڵکانی ئەودی وت: ئەو پێویستی بەپاڕانەوەی ئێوە نییە، ئازادی بکەن.

شەعبی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەنگی سەفین ژمارەیەکی زۆر ئەسیری گرت و ئازادی کردن و گەڕانەوە بۆ لای معاویە، عەمرۆ بەمعاویەی وتبوو ئەسیرەکان بکوژێت. کاتێك ئەسیرەکان ئازاد کران، بەعەمرۆی وت: ئەگەر سەبارەت بەئەسیرەکان بۆچوونەکەی تۆم بەکار دەبرد، کارێکی قێزەونم ئەنجام دەدا، مەگەر نابینی ئەسیرەکانی ئێمەیان ئازاد کرد. فەرمانیدا هەموو ئەسیرەکان ئازاد بکەن.

جوندەب کوڕی عەبدواللە دەڵێت: لەجەنگی سەفین عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخەڵکانی وت: کارێکتان کرد هێزێکی گەورەی لەناو برد و دەسەڵاتێکی رووخاند و ریسوایی لێکەوتەوە. کاتێ: لەسەرکەوتن نزیك ببوونەوە و دوژمنەکانتان لەزاڵ بوونی ئێوە دەترسان وکوژراوەکان لەناو ئەواندا فراوان ببوو و هەستیان بەئازاری شکست کرد، بۆ فریودانی ئێوە قورئانەکانیان لەسەر نووکی رمەکان بەرز کردەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ قورئانیان پێکردن تا شمشێرەکانتان لەخۆیان دوور بخەنەوە و ئاگری جەنگ دامرکێنن و لەچاوەڕوانی پێشهاتەکان بمێننەوە. ئێوەیش نەرمیتان نیشاندا و فریوتان خوارد. سوێند بەخوا چیتر گومان ناکەم سەرکەوتن بەدەست بێنن.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پەیمان نامەکەی نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و

معاویە کوڕی ئەبوسوفیان وەك دەڵێن، ڕۆژی چوارشەممە، سیانزە ڕۆژی یەکەمی مانگی سەفەری ساڵی سی و حەوت نووسرا و بڕیاردرا عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە هەردووکیان لەمانگی ڕەمەزان بڕۆنە شوێنی داوەرەکان لەدومە ئەلجەندەل و هەرکام چوارسەد کەس لەهاوەڵانی خۆیان هاوڕێیەتی بکەن.

زوهری دەڵێت: سەعسەعە کوڕی سوحان لەکاتی جەنگەکە، کاتێك دووبەرەکی خەڵکانی بینی، وتی: ببیستن و بزانن، سوێند بەخوا ئەگەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرکەوێت هاوشێوەی ئەبوبەکر و عومەر کوڕی خەتاب دەبێت و ئەگەر معاویە سەرکەوێت، هیچ کات ڕەچاوی ڕاستییەکان ناکات.

زوهری دەڵێت: خەڵکانی شام قورئانەکانی خۆیان کردەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ قورئانیان کرد و خەڵکی عێراق ڕازی بوون و کاروبارەکانیان بەدوو داوەرەکە سپارد. خەڵکی عێراق باوکی موسا ئەشعەرییان هەڵبژارد و خەڵکانی شام عەمرۆ کوڕی عاس. کاتێك بڕیاری داوەری کردن درا و خەڵکان بڵاوەیان لێکرد، بڕیاردرا داوەرەکان باشترینی کار و بڕیارەکان بۆ ئۆمەتی محەممەد هەڵبژێرن و لەدومە ئەلجەندل کۆببنەوە و ئەگەر کۆنەبوونە ساڵێکی دیکە لەئەزەرح کۆ ببنەوە.

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەڕێکەوت، حەرورییەکان دژایەتییان کرد و ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە. ئەمە یەکەم قۆناغی دەرکەوتنی ئەم دەستەیە بوو کە جەنگیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕاگەیاند و ڕەخنەیان لەوە گرت بۆ بڕیاردان وداوەری کردنیان بەمناڵەکانی ئادەم سپاردووە چوونکە ئەو کارە تایبەتە بەخوا. بەمشێوەیە زاری جەنگیان هەڵدا.

دەڵێت: کاتێك داوەرەکان لەئەزەرح کۆبوونەوە، موغەیرە کوڕی شوعبە یەکێك بوو لەئامادە بووان. حەکەمەکان کەسیان بۆ لای عەبدوڵڵە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر نارد کە لەگەڵ کەسانێکی زۆر هاتن. معاویە لەگەڵ خەڵکانی شام هات بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب وخەڵکانی عێراق لەهاتن خۆیان بەدوور گرت. موغەیرە کوڕی شوعبە بەچەند کەسێك لەکەسانی شارەزایی قوڕەیشی وت: بەبۆچوونی ئێوە کەس دەتوانێت بەشێوەیەك بزانێت

ئایا داوەرەکان لەسەر کارێك ڕێککەوتوون یا جیاوازییان هەیە؟

وتیان: گومان ناکەین کەس ئەمە بزانێت.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بەتەنیایی لەگەڵ ئەوان دانیشم، دەتوانم هەستی پێ بکەم.

دەڵێت: ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی عاس و دەستی بەقسە کرد، وتی: ئەی باوکی عەبدوڵڵە، وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەرەوە. بۆچوونی تۆ سەبارەت بەئێمە کە لەم کارە خۆمان بەدوور گرتووە، چییە؟ چوونکە ئێمە بۆ دەسپێکردنی جەنگ و بەشداری کردن لەجەنگ، دوودڵ بووین و ئێوە دڵنیا. ئێمە بڕیارماندا لێکۆڵینەوە بکەین و چاوەڕێ بین تا ئەم خەڵکە دووبارە کۆدەبنەوە.

وتی: بەبۆچوونی من ئێوە لەپشت سەری چاکەکارانەوە بوون و لەبەردەم خراپەکاران.

موغەیرە زیاتر لەمە هیچی نەپرسی و ڕۆشتە لای باوکی موسا و هەمان پرسیاری لەوەیش کرد.

باوکی موسا وتی: بەبۆچوونی من، بۆچوونی ئێوە لەهەمووان ڕوونتر بوو، ئێوە پاشەکەوتی موسوڵمانانن.

دەڵێت: موغەیرە لەمە زیاتر هیچی لیێ نەپرسی و ڕۆشت. دواتر ئەو دەستەی قوڕەیشییەی بینی، وتی: ئەم دوو کەسە لەسەر یەك شت ڕێناکەون.

کاتێك داوەرەکان کۆبوونەوە و قسەیان کرد، عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئەی باوکی موسا، بەبۆچوونی من یەکەم بڕیاری ڕاست ئەوەیە سەبارەت بەڕاست پەیمانی خەڵکانی خاوەن بەڵێن و ناڕاستی خەڵکانی بیێ بەڵێن داوەری بکەین.

باوکی موسا وتی: چۆن؟

عەمرۆ کوڕی عاس وتی: مەگەر نازانیت معاویە و خەڵکانی شام لەکاتی وادەی دیاریکراوی خۆیان هاتن؟

وتی: بۆنا.

وتی: ئەمە بنووسە.

باوکی موسا ئەمەی نووسی.

عەمرۆ وتی: ئەی باوکی موسا ئەگەر دەتوانی کەسێك ناو ببە تا کاروباری ئەم ئۆمەتە بەوبسپێرین، ئەگەر شوێنکەوتنی تۆ شیاو بێت، شوێن تۆ دەکەوین و گەرنە تۆ دەبێت شوێنکەوتەی بڕیارەکەی من بیت.

باوکی موسا وتی: عەبدوالله کوڕی عومەر.

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی عومەر یەکێك بوو لەوکەسانەی بەشداری جەنگەکەی نەکرد.

عەمرۆ وتی: من معاویە کوڕی ئەبوسوفیان پێشنیاری دەکەم.

دەڵێن: بەهەمان شێوە کەقسەیان دەکرد، کۆتاییان بەکارەکەیان هێنا. دواتر هاتنە ناو خەڵکان. باوکی موسا وتی: من عەمرۆم وەك کەسێك بینی کەخواوەند دەفەرمێت: ((واتل علیهم نبأ الذی آیاتنا فانسلخ منها.

واتاکەی: بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بۆ بگێڕەوە کە ئایەکانی خۆمان فێکرد و گومڕا بوو))

کاتێك باوکی موسا بێدەنگ بوو، عەمرۆ قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە نمونەی باوکی موسا وەك کەسێك دەبینم کەخواوەند دەفەرمێت: ((مثل الذین حملوا التوریة ثم لم یحملوها کمثل الحمار یحمل اسفارا.

واتاکەی: بەسەرهاتی ئەو کەسانەی بڕیاریاندا تەورات هەڵبگرن بەلاّم بەرگەیان نەگرت هاوشێوەی کەرەکان کەکتێبەکانیان لێ بار دەکەن))

دواتر هەرکام ئەو نمونەی بۆ هاورێکەی خۆی نووسیبوو، بۆ ویلایەتەکان نووسی.

باوکی شەهاب دەڵێت: شەوانە معاویە لەناو خەڵکان قسەی کرد. سپاسی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی: هەرکەس دەخوازێت، قسە بکات، بێت.

عەبدوالله کوڕی عومەر وتی: خۆم ئامادە کرد و ویستم بڵێم ئەو کەسانە لەمبارەوە قسە دەکەن کە بۆ سەرخستنی ئیسلام لەگەڵ باوکی تۆ جەنگاون، دواتر ترسام لەوەی قسەیەك بکەم و ببمە هۆکاری ئاژاوە و دووبەرەکی لەناو خەڵکان یا خوێن برژێت یا قسەیەکی ناڕەوا بێنمە سەرزمان. بەڵێنەکانی خواوەندم بۆ گەیشتن بەبەهەشت زیاتر پێ خۆش بوو. کاتێك گەڕامەوە بۆ

ماڵەکەی خۆم، حەبیب کوڕی موسلیمە هات و وتی: کاتێك معاویە قسەی کرد، بۆ هیچت نەوت؟

وتم: دەمویست قسە بکەم بەلاّم ترسام شتێك بێنمە سەرزمان ببێتە هۆی ئاژاوە یا دووبەرەکی خەڵکان یا قسەیەکی ناڕەوا بێنمە سەرزمان. زیاتر حەزم بەگەیشتن بەبەڵێنەکانی خواوەند لەبەهەشت دەکرد.

حەبیب کوڕی موسلیمە وتی: خۆت پاراست.

فوزەیل کوڕی خودەیج کێندی وتی: دوای ئەوەی پەیمانەکە نووسرا، بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وت ئەشتەر نایەوێت پەیمانەکە واژۆ بکات، بۆچوونی ئەوەیە لەگەڵ نەیارەکان دەبێت بجەنگێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: سوێند بەخوا منیش رازی نەبووم و حەزم نەدەکرد ئێوەیش رازی ببن. کاتێك پێداگری ئێوەم بینی، بەم کارە رازی بووم. هەنووکە کە رازی بووم و پەشیمان بوونەوە ڕەوا نییە مەگەر ئەوەی نافەرمانی خواوەند بکەن و سنوورەکانی قورئان ببەزێنن و ئەو کاتە دەبێت لەگەڵ هەر کەسێك فەرمانەکانی خواوەند پێشێل دەکات، بجەنگین. ئەوەی دەڵێن ئەشتەر نافەرمانی منی کردووە، بەوشێوە نییە و لەنافەرمانی ئەو نیگەران نیم. خۆزگە لەنێوان ئێوە کەسێکی وەك ئەو دەبوو و دەیتوانی بەو شێوەیە دوژمنی ببینێت کەمن دەیبینم. ئەوسا ئەرکی ئێوە بۆم ئاسان دەبوو و هیوادار بووم لەوەی لەگومڕایی دەرباز ببن. لەوەی ئەنجامتاندا، دوورم خستنەوە بەلاّم نافەرمانی منتان کرد. من و ئێوە بەوشێوەین کەشاعیری هوازینی دەڵێت:

(( من لەدەستەی غەزیەم کە ئەگەر

گومڕا ببێت منیش گومڕا دەبم

و ئەگەر رزگاری بێت، منیش رزگارم دەبێت))

دەڵێت: دەستەیەك لەهاوەڵانی وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، جگە لەوەی تۆ ئەنجامتدا، هیچمان نەکردووە.

وتی: بەڵێ، بۆ ئەو کاتەی وتیان دەست لەجەنگ هەڵبگرن، رازی بوون؟ سەبارەت بەداوەری کردن پەیمانمان داوە و هیوادارم گومڕا نەبن.

دەڵێت: پەیمان نامەکە لەمانگی سەفەردا بوو و کاتی دیاریکراو لەمانگی رەمەزان، هەشت مانگیان بۆ داوەرەکان دانا، خەڵك کوژراوەکانی خۆیان بەخاك سپارد و عەلی کوڕی ئەبی تالیب، فەرمانی بەیەك چاودا تا جاڕی بەرێکەوتن لەناو سوپاکەی بدات.

جوندەب دەڵێت: کاتێك لەسەفین گەڕاینەوە، لەرێگەیەکی دیکەوە ڕۆشتینەوە. لەکەنارەکانی فورات رێگەی دەشتمان گرتەبەر تا گەشتینە هبت. دواتر لەسەر رێگەی سەندودا درێژەمان بەرێگەکەماندا. تایەفەی منداڵەکانی سەعد کوڕی حوزامی ئەنساری بۆ پێشوازی کردن لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتن و داویان لێکرد شەو لای ئەوان دابەزێت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب شەوی لەوێ گوزەراند. رۆژی دواتر بەرێکەوتین و لەنوخەیلە گوزەرمان کرد و ماڵەکانی کوفە دەرکەوت. پیرەپیاوێکمان بینی لەسێبەری ماڵێکدا دانیشتبوو. نیشانەی نەخۆشی بەروخسارییەوە دیار بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە پێش، ئێمەیش هاورێیەتمان دەکرد، سلاوی لێکرد. ئێمەیش سلاومان دایەوە و بەباشترین شێوە وەلامی داینەوە. دڵنیا بووین لەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ناسیوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: رەنگی روخسارت گۆڕاوە، هۆکارەکەی چییە؟ لەنەخۆشییەوە سەرچاوەی گرتووە.

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەگەری هەیە لەوەوە دڵگران بیت.

وتی: ناخوازم ئەم نەخۆشییە بەجەستەیەکی دیکەوە بێت؟

وتی: لەبەر پاداشتەکەی لەو دنیا؟

وتی: بەڵێ.

وتی: لەبەزەیی پەروەردگار و بەخشینی گوناحەکانی خۆت دڵخۆش بە، تۆ کێیت؟

وتیك سالح کوڕی سولەیم.

وتی: لەکام هۆز؟

وتی: ئەسلەم لەتایەفەی سەلامانە لەهۆزی تەی. بەڵام مەوالی منداڵەکانی سەلیم کوڕی مەنسورم.

وتی: سبحان الله، ناوی خۆت و ناوی باوکت و باوگەورێت زۆر جوانە، ئایا لەگەڵ ئێمە بەشداری ئەم جەنگەت کرد؟

وتی: نا، سوێند بەخوا، دەمویست، بەڵام لاوازی و تا کەنیشانەکانی بەروخسارمەوە دەبینی، ڕێگر بوو لەبەشداری کردنم.

وتی: کەسانی نەخۆش و پەککەوتە و ئەوکەسانەی خەرجی ڕێگەیان نییە، لەجەنگ بەخشراون بەو مەرجەی چاکەخوازی خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) بن، بۆ چاکەکاران هیچ دژوارییەك لەئارادا نییە و خواوەند بەخشندەیە. پێم بڵێ، خەڵکان سەبارەت بەوەی لەنێوان ئێمە و خەڵکانی شام ڕوویدا، چی دەڵێن؟

وتی: دەستەیەکیان خۆشحاڵن، ئەوانە خراپەکاران و ڕەشبینانن، دەستەیەکی دیکە لەوەی ڕوویداوە، نیگەرانن و ئەوان چاکەخوازەکانی تۆن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب درێژەی بەڕێگەکەیدا و وتی: ڕاست دەکەیت، هیوادارم خواوەند ئەم نەخۆشییە بکاتە هۆکاری بەخشینی گوناحەکانی تۆ. نەخۆشی پاداشتی نییە بەڵام دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناحەکان چوونکە پاداشت لەوتاردایە و کردەوە بەدەست و پێ. خواوەند بەهۆی نییەت پاکی زۆر لەبەندەکانی خۆی دەخاتە بەهەشت.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەڕێکەوت و زۆر دوور نەکەوتبوویەوە عەبدوللە کوڕی وەدیعەی ئەنساری ڕووبەڕووی بوویەوە، نزیك کەوتەوە و سڵاوی کرد و شان بەشانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب درێژەی بەڕێگەدا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خەڵکان سەبارەت بەئێمە چی دەڵێن؟

وتی: دەستەیەك ئەو کارەیان پەسەند کردووە و دەستەیەك بەناپەسەندی دەزانن. بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت: بەردەوام لەجیاوازیدا دەبن مەگەر ئەوەی پەروەردگار بەزەیی پیایاندا بێتەوە.

وتی: وتاری خەڵکانی بیرمەند لەمبارەوە چییە؟

وتی: دەڵێن: عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستەیەکی فراوانی لەبەردەستا بوو و

بلاوەی پێکردن، قەلایەکی بەهێزی بوو و وێرانی کرد، کەی ئەوەی خاپووری کردووە، دەتوانێت بنیاتی بکاتەوە؟ کەی دەتوانێت ئەوەی بلاوەی پێکردووە، کۆبکاتەوە؟ ئەگەر ئەو کاتەی خەڵکان نافەرمانی ئەویان کرد، لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی درێژەی بەجەنگ دەدا تا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا یا دەکوژرا، کارێکی دوور ئەندێشانە بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: من خاپوورم کرد یا ئەوان کردیان؟ من بلاوەم پێکرد یا ئەوان بلاوەیان پێکرد؟ بەلام ئەوەی دەڵێن ئەو کاتەی نافەرمانی منیان کرد دەبوا لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی دەجەنگا یا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا یا دەکوژرا، کارێکی دوور ئەندێشانە بوو، سوێند بەخوا لەمە بێ ئاگا نەبووم، ئارەزوومەندی دنیا نیم و لەمەرگیش ناترسم. دەمویست ئەوکارە بکەم بەلام بینیم ئەم دووانە، حەسەن و حسەین، پێشدەستییان کرد و ئەم دووانە عەبدوالله کوڕی جەعفەر و محەممەد کوڕی عەلی پێشم کەوتن. زانیم ئەگەر حەسەن و حسین بکوژرێن، پێغەمبەر (د.خ) وەچەی نامێنێت. نەمویست ئەوان بکوژرێن. زانیم ئەگەر لەبەر من نەبوایە ئەم دوو کەسە، یانی محەممەد کوڕی عەلی و عەبدوالله کوڕی جەعفەر، نەدەڕۆشتنە پێش. سوێند بەخوا ئەگەر دوای ئەمە چاوم بەوان بکەوێت لەئوردووگا یا لەماڵەوە نابێت.

دەڵێت: درێژەمان بەرێگەماندا و لەگەڕەکی منالەکانی عەوف گوزەرمان کرد و لەلای راستی خۆمان حەوت یا هەشت گۆڕمان بینی.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەم گۆڕانە چییە؟

قودامە کعیجلانی ئەزدی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوای ڕۆشتنی تۆ خەباب کوڕی ئەرت مرد و وەسیەتی کرد لەزەوییەکی کراوە، بەخاك بسپێردرێت، چوونکە پێشتر خەڵکانیان لەناو ماڵەکاندا بەخاك دەسپارد. ئەویان لەو زەوییە کراوەدا بەخاك سپارد و دوای ئەو کەسانی دیکەیش ئەو کارەیان لەگەڵ مردووەکانی خۆیان کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خواوەند خەباب ببەخشێت، بەئارەزووی خۆی باوەڕی بەئیسلام هێنا و بەرەزامەندی خۆی کۆچی کرد، لەژیاندا جیهادی کرد و

هەزاران بەڵای لەسەر جەستەی خۆیدا بینی، خواوەند پاداشتی کەسێکی ئاوا لەبیر ناکات.

دەڵێت: هاتە سەر گۆڕەکان و وتی: سڵاو لەئێوە ئەی پیاوان و ژنانی باوەڕدار کەخەڵکی سەرزەمینی ترسن، ئێوە پێش ئێمە ڕۆشتن و ئێمەیش بەزوویی پەیوەستی ئێوە دەبین، خواوەندا ئێمە و ئەوان ببەخشە و بەبەزەییەکانی خۆت لەئێمە خۆش ببە.

وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی ئێوەی لەخۆڵ ئافراند و بۆ خۆڵتان دەگێڕێتەوە و لەوێوە زیندوو دەکرێنەوە. خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی ڕۆژی هەستانەوەی لەبیر بێت و بیر لەپاشەڕۆژی خۆی دەکاتەوە و بەئەندازەی پێویست بەسەندە دەکات و بەبیرکردنەوەی خواوەند شادمان بێت.

دەڵێت: بەرێکەوت تا گەیشتە کۆڵانی سەورییەکان، وتی: بڕۆنە ناو ئەم ماڵانە.

عەبدوالله کوڕی عاسم فائیشی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای تایەفەی سەورییەکان گوزەری کرد، دەنگی گریانی بیست. وتی: ئەم دەنگانە بۆ چییە؟

وتیان: بۆ کوژراوەکانی سەفین دەگرین.

وتی: شایەتی دەدەم ئەوانەی خۆڕاگرییان کرد و لەرێگەی خوادا جەنگان و کوژران، پێگەی شەهیدیان هەیە.

دەڵێت: لای خەڵکانی فائیشە گوزەری کرد، دەنگی گریانی ئەوانی بیست و وتەکانی خۆی دووبارە کردەوە. دواتر ڕۆشت تا گەیشتە شەبامییەکان. دەنگە دەنگی زۆری لەو ناوچەیە بیست و لەوێ وەستا. حەرب کوڕی شورەحبیلی شەبامی هاتە لای. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ژنەکانتان بەسەرتاندا زاڵ بوون بۆ رێگەی گریانیان پێ دەدەن؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر ماڵێک، یا دوو ماڵ یا سێ ماڵ دەبوو، دەکرا رێگەیان لێ بگرین بەڵام لەم تایەفەیە سەد و هەشتا کەس کوژراوە، هیچ ماڵێک نییە پرسەی تیا نەبێت. ئێمەی پیاو ناگرین و بەدەرئەنجامەکان رازین. بۆ رازی نەبین ئەوان شەهید بوون.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خواوەند کوژراو و مردووەکانی ئێوە ببەخشێت.

دەڵێت: شورەحبیل هاوڕێ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڕۆشت و ئەو سوار بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بگەڕێرەوە. وەستا. وتی: بگەڕێرەوە، پیادە ڕۆشتنی تۆ لەگەڵ کەسێکی وەك من هۆکاری ئاژاوەی دەسەڵاتدارە و ریسوایی باوەڕدار.

درێژەی بەرێگەدا تا گەیشتە گەڕەکی ناعتییان. زۆربەیان شوێنکەوتەی عوسمان کوڕی عەفان بوون. یەکێك لەوان بەناوی عەبدولرەحمان کوڕی یەزید لەناعتییەکانی منداڵەکانی عوبەید دەیوت: سوێند بەخوا عەلی هیچی نەکرد. ڕۆشت و بێ ئەنجام گەڕایەوە. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان بینی، پەرێشان بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دەستەیەك دەبینم کەسانی بوێریان تیا نییە. بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەوکەسانەی ئێستا لێیان جیابووینەوە، باشتر لەمانەن. هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە خوێندەوە:

(( هاورێی تۆ کەسێکە کاتێك بەڵایەك بەسەر تۆدا دەبارێت
بەردەوام لەخەمی تۆ خەمبار بێت
هاورێی تۆ کەسێك نییە ئەگەر پەرێشانی رووی تێکردی
بەردەوام سەرکۆنەت بکات))

دەڵێت: بەرێکەوت و بەردەوام ناوی خواوەندی دەهێنایە سەرزمان تا ڕۆشتە ناو کۆشکەکەی.

عەمارە کوڕی رەبیعە دەڵێت: کاتێك خەڵکان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەو سەفین دەڕۆشتن، هاورێ و هاوەڵی یەکتر بوون. کاتێك گەڕانەوە ببوونە دوژمن. ئەوکاتەی ئودرووگای سەفینیان بەجێهێشت، باسی داوەری هاتە ئاراوە و بەدرێژایی رێگە گفتوگۆیان لەسەر ئەو بابەتە دەکرد. جوێنیان بەیەك دەدا و یەکتریان قامچی باران دەکرد. خەواریج دەیانوت: ئەی دوژمنانی خوا، بۆ بەئەنجام گەیاندنی مەبەستەکانی خواوەند سستی و لاوازیتان لەخۆتان نیشاندا

و بەداوەری کردن رازی بوون. دەستەیەکی دیکە دەیانوت: لەپێشەواکەی ئێمە جیابوونەوە و دووبەرەکیتان خستە ناو خەڵکان.

دەڵێت: کاتێک عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە ناو کوفە، لەگەڵ ئەو نەڕۆشتنە ناو شارەکە، روویان کردە حەرورا و دوانزە هەزار کەس لەو شوێنە کۆبوونەوە. جارچییەکەیان جاریدا کەسەرکردەی جەنگ شبس کوڕی ڕێبعی تەمیمییە و پێشەوای نوێژ عەبدوالله کوڕی کوا یەشکورییە. دوای سەرکەوتن راپەڕاندنی کاروبارەکان بەراوێژ دەبێت و بەیعەت لەگەڵ خواوەند و پێشنیاری چاکە و رێگرتن لەخراپە.

## ڕەوانە کردنی جەعدە کوڕی هوبەیرە بۆ خوراسان لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵەدا وەك دەڵێن عەلی کوڕی ئەبی تالیب، جەعدە کوڕی هوبەیرەی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد.

شەعبی دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەفین گەڕایەوە، جەعدە کوڕی هوبەیرەی مەخزومی بۆ خوراسان نارد. جەعدە تا ئەبەر شەهر ڕۆشت کەخەڵکەکەی ناباوەڕ ببوون و خۆڕاگرییان کرد. جەعدە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە. ئەو، خولەید کوڕی قورەی یەربوعی ڕەوانە کرد. خولەید گەمارۆی خستە سەر خەڵکانی نەیشابوور تا ئەوەی بەپێشنیاری ئاشتی رازی بوون. خەڵکانی مەرویش پێشنیاری ئاشتییاندا. دوو کچ لەکچی شازادەکان کەوتە دەستی خولەید. ئەوانی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕەوانە کرد کەپێشنیاری پێکرد باوەڕ بێنن و بەهاوسەریان بدات.

وتیان: دوو کوڕەکەی خۆت بکە هاوسەری ئێمە.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب رازی نەبوو. یەکێك لەجووتیاران وتی: ئەوان بکە بەهاوسەری من و بەمشێوەیە رێز لەمن دەگریت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوو کچەکەی بەو سپارد و لای ئەو مانەوە، فەرشی سووری بۆ رادەخستن و لەدەفری زێرین خواردنی پێ دەدان. دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ خوراسان.

## خۆ دوورخستنەوەی خەواریج لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب وهاوەڵانی ئەو و دووبارە گەڕانەوەیان

لەم ساڵەدا خەواریج لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و هاوەڵانی خۆیان دوور خستەوە. بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی لەگەڵ کردن و گەڕانەوە و ڕۆشتنە ناو کوفە.

عەمارە کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە بۆ ناو کوفە و خەواریج لێی جیابوونەوە، شیعەکان ڕۆشتنە لای و وتیان: بەیعەتی دووەم لەئەستۆ دەگرین. ئێمە هاوڕێی ئەو کەسەین هاوڕێی تۆ بێت و دوژمنی ئەو کەسەین دوژمنی تۆ بێت.

خەواریج وتیان: ئێوە و خەڵکانی شام هاوشێوەی ئەسپی کێبڕکێ لەڕێگە کوفردا غاردەدەن: خەڵکانی شام بەیعەتیان لەگەڵ معاویە کردووە و ئێوە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەت دەکەن و هاوڕێی ئەو کەسەن هاوڕێی ئەو بێت و دوژمنی ئەو کەسەن دوژمنی ئەو بێت.

زیاد کوڕی نەزر بەوانی وت: ئێمە لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سونەتی پێغەمبەر (د.خ) بەیعەتمان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەست بەڵام کاتێك ئێوە دژایەتیتان کرد، شیعەکانی ئەو هاتن و وتیان ئێمە هاوڕێی ئەو کەسەین هاوڕێی تۆ بێت و دوژمنی ئەوکەسەین دوژمنی تۆ بێت. ئەمەمان وت چوونکە ئەو لەراستییەوە نزیکە و هەرکەس دژایەتی ئەو بکات گومڕایە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کوڕی عەباسی بۆ لای خەواریج نارد و وتی: لەکاری وەڵامدانەوە و پرسیار کردن لەوان پەلە مەکە تا خۆم دێم. کوڕی عەباس ڕۆشتە لایان، گفتوگۆیان کرد. چاوەڕێی هاتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی نەکرد و سەرقاڵی گفتوگۆ بوو، وتی: چ ڕەخنەیەکتان لەداوەری کردن هەیە لەکاتێکدا خواوەند فەرموویەتی: ((ان یریدا اصلاحا یوفق الله بینهما.

واتاکەی: ئەگەر خوازیاری ئاشتی بن، خواوەند ئاشتی لەنێوانیاندا سەقامگیر دەکات و بۆ کاروباری خەڵکانیش بەمشێوەیە دەبێت.))

وتیان: ئێمە دەڵێین ئەوەی خواوەند داوەری کردنەکەی خستۆتە ئەستۆی مرۆڤەکان و فەرموویەتی لێی ورد ببنەوە وچاکسازی تیا بکەن، تایبەتە بەخەڵکان. بەڵام ئەوەی فەرمانی داوە و دیاری کردووە، مرۆڤەکان مافی ئەوەیان نییە گۆڕانکاری تیا بکەن. سەبارەت بەکەسی زیناکار فەرمانیداوە سەد قامچی لێ بدەن و سەبارەت بەکەسی دز، فەرمانی داوە دەستی ببڕنەوەو. مرۆڤەکان ناتوانن گۆڕانکاری لەم فەرمانانە بەدیبێنن.

کوڕی عەباس وتی: خواوەند دەفەرمێت: دوو کەسی دادپەروەری لەئێوە سەبارەت بەوان بڕیار بدەن.

وتیان: داوەری کردن سەبارەت بەکێشەی ژن و پیاو بەداوەری کردن سەبارەت بەخوێنی موسوڵمانان دەشوبهێنیت؟

خەواریج دەیانوت: بەکوڕی عەباسمان وت: ئەم ئایە لەنێوان ئێمە و تۆدا بێت، بەڵام ئایا عەمرۆعاس کەتا دوێنی لەگەڵ ئێمە دەجەنگی و خوێنی ئێمەی دەڕشت، کەسێکی دادپەروەرە؟ ئەگەر ئەو دادپەروەرە، کەواتە ئێمە دادپەروەر نین کەدژی ئەوجەنگاوین. ئێوە لەکاروباری خواوەند کەسانێکتان کردە داوەر. فەرمانی خواوەند سەبارەت بەمعاویە و سوپاکەی ئاشکرایە یانی یا دەبێت بکوژرێن یا پەشیمان ببنەوە. پێشتر ئێمە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی خواوەندمان پێکردن بەڵام رازی نەبوون. دواتر ئێوە لەنێوان خۆتان و خەڵکانی شام پەیمانێکتان نووسی و بڕیاری گفتوگۆ و دەست هەڵگرتن لەجەنگتاندا. بەڵام لەو کاتەوەی سوڕەی (برائت) ڕەوانە کراوە، گفتوگۆ و دەست هەڵگرتن لەجەنگ لەگەڵ کافرەکان ڕێگەی پێنەدراوە مەگەر ئەوەی بەدانی جەزیە رازی بن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب زیاد کوڕی نەزری بۆ لای خەواریج نارد و وتی: بزانە لای کام یەك لەسەرکردەکانیان کۆدەبنەوە. زیاد بینی و ئاگاداری کردەوە کەزۆربەیان لای یەزید کوڕی قەیس کۆدەبنەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەو لای خەورایج بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی یەزید کوڕی قەیس. لەوێ دەستنوێژی گرت و دوو رەکعەت نوێژی

خوێند و ئەوی وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان و ڕەی دیاری کرد. دواتر ڕۆشتە لای خەواریج کەسەرقاڵی گفتوگۆ لەگەڵ کوڕی عەباس بوون. پێی وت: کۆتایی بەگفتوگۆکەت بێنە، خوا بتبەخشێت مەگەر نەموت گفتوگۆ نەکەیت تا دێم؟

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی بەقسە کرد، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: خواوەند هەر کەس دووبەرەکی لەناو خەڵکان دروست دەکات، لەڕۆژی هەستانەوە کەسێکی دوورخراوە بێت و هەرکەس قسە دەکات و پەرێشانی و ئاڵۆزی دێنێتە ئاراوە، لەڕۆژی هەستانەوە گومڕاتر بێت. وتی: پێشەوای ئێوە کێیە؟

وتیان: کوڕی کەوا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بۆ دژایەتی من دەکەن؟

وتی: بەهۆی داوەری سەفین.

وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا مەگەر نازانن ئەو کاتەی قورئانەکانیان بەرز کردەوە و وتیان پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەندتان پێدەکەین، وتم ئەم خەڵکە باشتر لەئێوە دەناسم چوونکە لەمناڵی و گەورەیی هاودەمیان بووم و ئەوانم ناسیوە کەخراپترینی مناڵەکان و خراپترینی پیاوەکان بوون. دەست لەجەنگ هەڵمەگرن چوونکە ئەوان تەنیا بۆ فرت و فێڵ قورئانەکانیان بەرز کردۆتەوە، بەڵام بەبۆچوون و قسەکانی من رازی نەبوون و وتتان: نا، رازی دەبین. پێم وتن: قسەکانی من و نافەرمانی کردنی خۆتان لەبیر بێت، بیرتان بێت و کاتێك بۆ رازی بوون پێداگریتان کرد لەگەڵ داوەرەکان مەرجمان کرد ئەوەی کتێبی خواوەند زیندووی دەکاتەوە، زیندووی بکەنەوە و ئەوەی لەناوی دەبات، لەناوی ببەن. ئێمە ناتوانین دژایەتی داوەرێك بکەین کە بەپێی فەرمانەکانی قورئان فەرمان دەدات. ئەگەر جیاواز لەمە بێت، لەکارەکەی ئەوان بێزارین.

وتیان: پێمان بڵێ ئایا ئەمە دادپەروەرییە پیاوان سەبارەت بەخوێنی موسوڵمانان داوەری بکەن؟

وتی: ئێمە پیاوەکانمان نەکردۆتە داوەر، قورئانمان کردۆتە داوەر. قورئان نووسراوێکە و قسە ناکات و خەڵکان لەزمانی قورئانەوە قسە دەکەن.

وتیان: پێمان بڵێ بۆ لەنێوان خۆت و ئەوان ماوەت دیاری کرد؟

وتی: بۆ ئەوەی نەزان بزانێت و زانا لێکۆڵینەوە بکات. ئەگەری هەیە بەمشێوەیە خواوەند ئاشتی و یەکگرتنەوە لەناو ئەم ئۆمەتە بەدیبێنێت. خواوەند بتانبەخشێت بگەڕێنەوە بۆ ناو شارەکەی خۆتان.

دەڵێت: هەموویان گەڕانەوە بۆ کوفە.

باوکی موخەنەف دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی جوندەبی ئەزدی هاوشێوەی ئەم گێڕانەوەیە لەباوکی دەگێڕێتەوە بەڵام خەواریج دەڵێن بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبمان وت: ڕاست دەکەیت، ئێمە بەو شێوە بووین کەباست کرد و ئەو کارەمان ئەنجامدا، بەڵام ئێمە کافر بووین و تۆبەمان کرد، تۆیش هاوشێوەی ئێمە تۆبە بکە تا دووبارە بەیعەتت لەگەڵ ببەستین وەگەرنە لەسەر دژایەتی کردن بەردەوام دەبین. دواتر بەیعەتمان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد و پێی وتین: بڕۆنە ناو شارەکە، شەش مانگ چاوەڕێ دەبین تا خەراج کۆبکرێتەوە و چوارپێکان قەڵەو بن. دواتر ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە و گرنگی بەوتەکانی ئەوان نادەین چوونکە درۆیان کرد.

دەڵێت: مەعن کوڕی یەزیدی سولەمی بەهۆی دواکەوتن لەکاروباری داوەری، ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: معاویە ڕێزی لەپەیمان نامەکە گرت، تۆیش ڕێزی لێ بگرە، بەدەوییەکانی بەکر و تەمیم بۆچوونی تۆ نەگۆڕن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی داوەرەکان لەسەر کارەکەیان بەردەوام بن. چوونکە کاتێك لەسەفین گەڕانەوە بڕیاردرا داوەرەکان هەرکام لەگەڵ چوارسەد کەس بەرەو دومەت ئەلجەندەل بڕۆن.

بەوتەی واقدی، سەعد لەگەڵ کەسانی دیکە لای داوەرەکان کۆبوونەوە و لەسەر داوای کوڕەکەی، عومەر، هاتە ئەزەرەح بەڵام داوتر پەشیمان بوویەوە و لەبیت المقدسەوە بەمەبەستی حەجی عەمرە، ئیحرامی بەست.

لەم ساڵەدا داوەرەکان کۆبوونەوە.

## گێڕانەوەی کۆبوونەوە داوەرەکان

زیاد کوڕی نەزری حارسی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب چوارسەد کەسی بەسەرکردایەتی شورەیح کوڕی هانی ڕەوانە کرد. عەبدوالله کوڕی عەباسی وەك پێشنوێژ لەگەڵ نارد و سەرپەرەستی کارەکانی بەوسپارد. باوکی موسای ئەشعەریش هاورێیەتی دەکردن. معاویەش عەمرۆ کوڕی عاسی لەگەڵ چوارسەد کەس لەخەڵکانی شام نارد و ڕوویان کردە دومەت ئەلجەندل لە ئەزەرح کۆبوونەوە.

دەڵێت: کاتێك معاویە نامەی بۆ عەمرۆعاس دەنارد، نێردراو دەهات و دەگەڕایەوە و کەس نەیدەزانی چی هیناوە و چی بردووە و خەڵکانی شام هیچیان لێ نەدەپرسی، بەڵام کاتێك نێردراوی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەهات، دەڕۆشتنە لای کوڕی عەباس و دەیانپرسی چی نووسیوە و ئەگەر دەیشاردەوە، دەیانوت: بەدڵنیاییەوە ئەمە و ئەوەی نوسیوە.

کوڕی عەباس دەیوت: بۆ ئەو کارە دەکەن؟ مەگەر نازانن نێردراوی معاویە دێت و کەس نازانێت چی هێناوە و دەڕوات و کەس نازانێت چی بردووە و هیچ دەنگێکیان لێ بەرز نابێتەوە. بەڵام ئێوە هەموو ڕۆژێك کۆمەڵێك گومان و گریمانە لای من کەڵەکە دەکەن.

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی عومەر و عەبدوالله کوڕی زوبەیر وعەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هوشامی مەخزومی و عەبدولرەحمان کوڕی عەبدیەغوسی زوهری و باوکی جوهم کوڕی حوزەیفەی عەدەوی و موغەیرە کوڕی شوعبەی سەقفی لەناو خەڵکاندا دەبینران.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد ڕۆشتە لای باوکی کە لەسارا لەسەر یەکێك لەئاوەکانی مناڵەکانی سولەیم بوو، پێی وت: باوکە گیان، لەپێشهاتەکانی سەفین ئاگاداریت؟ خەڵکان باوکی موسا و عەمرۆعاسیان وەك داوەر هەڵبژاردووە و دەستەیەك لەقورەیشییەکان لای ئەوان کۆبوونەتەوە. تۆیش ئامادە بە چوونکە هاورێی پێغەمبەر (د.خ) و یەکێك بوویت لەوکەسانەی عومەر کوڕی خەتاب بۆ

راوێژ کردن هەڵیبژاردیت. هیچ کارێکت نەکردووە ئەم خەڵکە پەسەندی نەکەن. ئامادە بە چوونکە لەهەمووان بۆ خەلافەت شیاوتریت؟

وتی: ئەو کارە ناکەم، بیستوومە پێغەمبەر (د.خ) دەیفەرموو: ئاژاوەیەك ڕوودەدات و باشترین خەڵکان ئەوەیە خۆی بەدوور بگرێت و سەرقاڵی خواپەرەستی بێت. سوێند بەخوا هەرگیز لەم کارەدا بەشداری ناکەم.

دەڵێت: داوەرەکان یەکتریان بینی، عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئەی باوکی موسا، دەزانی عوسمان کوڕی عەفان بەستەم کوژرا؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەزانی معاویە وکەسانی بنەماڵەکەی جێگرەکانی ئەون؟

وتی: بەڵێ.

وتی: خواوەند فەرموویەتی: ((ومن قتل مظلوما فقد جعلنا لولیه سلطانا فلایسرف فی القتل انه کان منصورا.

واتاکەی: هەرکەس بەستەم بکوژرێت، دەسەڵات بەکەسەکانی ئەو دەدەین بەلاّم لەکوشتن زێدەڕۆیی نەکات چوونکە ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.))

وتی: ئەی باوکی موسا، چ ڕێگرێك هەیە معاویە کەسەرپەرەستی خوێنی عوسمانە، وەك خەلیفە هەڵبـژێریت چوونکە بنەماڵەکەی لەناو قوڕەیش پێگەیەکی بەرزیان هەیە وەك دەزانی. ئەگەر دەترسی لەوەی خەڵکان بڵێن معاویەی وەك خەلیفە هەڵبژارد لەکاتێکدا هیچ پێشینەیەکی لەئیسلامدا نییە، بەڵگەت هەیە و دەتوانی بڵێی: بەلاّم خوێنی خەلیفەی ستەملێکراو بوو و خوازیاری تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەو، کەسێکی بەتوانا و چارەسەرکەرە، برای دایکی حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەرە، هاودەمی پێغەمبەر (د.خ) بووە و یەکێکە لەئەسحابەکانی ئەو.

دواتر پێشنیاری دەسەڵاتی پێکرد و وتی: ئەگەر معاویە دەسەڵات بگرێتە دەست، پێگەیەکت پێ دەبەخشێت، هیچ خەلیفەیەك ئەو کارەی نەکردبێت.

باوکی موسا وتی: ئەی عەمرۆ، لەخواوەند بترسە، ئەوەی سەبارەت بەپێگەی معاویە باسی دەکەیت بزانە خەلافەت بەهۆی پێگەوە بەکەسێك نادەن، ئەگەر

پێـوەر پێگـە و جێگـە دەبـوو خەلافـەت بـە بنەماڵـەی ئەبرەهـەی سـەباح دەبـڕا. خەلافــەت تایبەتــە بەکەســانی دینــدار و خواپەرەســت، ئەگــەر دەمویــست بەبڕواپێکراوترین کەسـی قورەیشی بدەم بەعەلی کوڕی ئەبی تـالیبم دەسپارد. ئەوەی دەڵێی معاویە خوازیاری تۆڵـە سـەندنەوەی خوێنی عوسمانـە و خەلافـەت بـەو بـسپێرە، دڵنیابـە کەسـێك نـیم کـاری خەلافـەت بەمعاویـە بـسپێرم و یەکـەم کۆچکەرانی ڕێگەی خوا لەبیر بکەم. ئـەوەی سـەبارەت بەپێدانی دەسـەڵات باسـی دەکەیت، سوێند بەخوا ئەگەر معلویە هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی بەمن بسپێرت، خەلافەت بەو ناسپێرم و سەبارەت بەکاروباری خواوەند، بەرتیل وەرناگرم. ئەگەر دەخوازی ناوی عومەر کوڕی خەتاب زیندوو دەکەینەوە.

باوکی خـەبابی کـەلبی دەیـوت: باوکی موسا وتبووی: سوێند بـەخوا ئەگـەر دەمتوانی ناوی عومەر کوڕی خەتابم زیندوو دەکردەوە.

عـەمرۆ کـوڕی عـاس پێـی وت: ئەگـەر دەخوازیـت بەیعـەت لەگـەڵ عەبدواللـە کوڕی عومـەر بکـەیت، بۆ بەیعـەت لەگـەڵ کوڕەکـەی مـن ناکـەیت، تـۆ لەپێـشی و چاکەکاری ئەو دەزانیت.

وتـی: کوڕەکـەی تـۆ کەسـێکی چـاکەکار و خواپەرەسـتە بـەڵام بـەم ئاژاوەیـە پیست کرد.

نافیع موالی عەبدواللە کوڕی عومەر دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس وتی: شیاوی ئەم کارە پیاوێکە ددانی هەبێت، بخوات و دەرخواردی خەڵکانی بدات.

دەڵێت: کوڕی عومەر لەم گفتوگۆیە بێ ئاگا بوو، عەبدواللە کوڕی زوبەیر پێی وت: سەرەنج بدە.

کـوڕی عومـەر سـەرنجیدا و وتـی: نـا، سـوێند بـەخوا هـەرگیز بـۆ خەلافـەت بـەرتیل نـادەم. دواتـر وتـی: ئـەی کـوڕی عـاس، خـەلکی عـەرەب دوای ئـەوەی بەشمـشێر یـەکیان کوشـتار کـرد و بـەڕم جـەنگان، کارەکـانی خۆیـان بـەتۆ سپاردووە، دووبارە ئاژاوە مەنێرەوە.

نـەزر کـوڕی سـاڵحی عەبەسـی دەڵێـت: لەجـەنگی سیـستان هـاوڕێی شـورەیح کـوڕی هـانی بـووم، پێـی وتم: عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب پێـی وتم چـەندین وتـە

بەعەمرۆ کوڕی عاس بڵێ، وتبووی: کاتێك ئەوت بینی، پێی بڵێ، عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: باشترین خەڵکان لای خواوەند کەسێکە کردەوەی راست لەناڕاست زیاتر پەسەند بکات هەرچەند ببێتە هۆی دابەزینی پێگە و جێگەی ئەو، ئەی عەمرۆ سوێند بەخوا دەزانی جێگەی راستییەکان لەکوێدایە، کەواتە خۆت بەنەزان لەقەڵەم مەدە چوونکە ئەگەر کەمێك دەسەڵاتی پێ ببەخشن بەهۆیەوە دەبێتە دوژمنی خواوەند وهاوڕێیانی خواوەند. هاوار لەتۆ، شوێنکەوتە و لایەنگری خیانەتکار و ستەمکاران مەبە، سوێند بەخوا دەزانم چ رۆژێك پەشیمان دەبیتەوە، لەرۆژی مەرگ ئارەزوو دەکەیت: خۆزگە دوژمنایەتی موسوڵمانانم نەدەکرد و بۆ داوەری کردن بەرتیلم وەرنەدەگرت.

شورەیح دەڵێت: ئەم قسانەم بەعەمرۆ کوڕی عاس وت. روخساری تێك چوو، وتی: من کەی راوێژم لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکرد یا شوێنکەوتەی فەرمانەکانی ئەو بووم یا گرنگیم بەبۆچوونەکانی ئەو داوە؟

وتم: ئەی رووسپی زادە، چ کێشەیەك هەیە ئەگەر بەبۆچوونی سەرەوەری خۆت کەدوای پێغەمبەر (د.خ)، پێشەوای موسوڵمانانە، رازی ببیت؟ کەسانێکی باشتر لەتۆ یانی ئەبوبەکر و عومەر کوڕی خەتاب راوێژیان پێدەکرد و بۆچوونەکانیان بەکار دەبەست.

وتی: کەسێکی هاوشێوەی من لەگەڵ کەسێکی هاوشێوەی تۆ قسە ناکات.

وتم: لەبەر کێ شەرم لەمن دەکەیت، باوکی نەزانت یا دایکی رووسپیت؟

دەڵێت: لەشوێنەکەی خۆی هەستا، منیش هەستام.

باوکی جونابی کەلبی دەڵێت: کاتێك باوکی موسا و عەمرۆ کوڕی عاس لەدومەت ئەلجەندەل کۆبوونەوە، عەمرۆ لەهەموو قسەکاندا باوکی موسای پێش دەخست، دەیوت: تۆ هاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) و لەمن گەورەتریت، قسە بکە تا من دوای تۆ قسە بکەم. ئەوی فێر کردبوو لەهەموو شتێکدا پێش بکەوێت. لەهەموو ئەم کارانەی مەبەستی ئەوە بوو پێشی بخات تا عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەر کار لاببات.

دەڵێت: لیکۆڵینەوەیان لەسەر دانیشتن و مەبەستەکەی خۆیان کرد. عەمرۆ

دەیویست ئەو بەخەلافەتی معاویە رازی ببێت بەلاّم رازی نەبوو، ویستی بەخەلافەتی کوڕەکەی رازی ببێت بەلاّم رازی نەبوو. باوکی موسا ویستی عەمرۆ بەخەلافەتی عومەر کوڕی عەبدوالله رازی ببێت بەلاّم رازی نەبوو. دواتر عەمرۆ پێی وت: لەبۆچوونی خۆت ئاگادارم بکەرەوە؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە ئەم دوو پیاوە لەسەر کار لاببەین و کار بەموسوڵمانان و راوێژ کردن بسپێرین تا کەسێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

عەمرۆ وتی: بۆچوونی راست ئەوەیە.

دواتر هاتنە ناو خەڵکان. عەمرۆ وتی: ئەی باوکی موسا، خەڵکان لەیەك هەڵوێستی خۆمان ئاگادار بکەرەوە.

باوکی موسا قسەی کرد و وتی: هەڵوێستی من و عەمرۆ بەمشێوەیە و هیوادارم بەهۆیەوە خواوەند کاروبارەکانی ئەم ئۆمەتە سامان بدات.

عەمرۆ وتی: راستی هێنایە سەرزمان.

دواتر وتی: ئەی باوکی موسا پێش کەوە و قسە بکە.

دەڵێت: باوکی موسا ڕۆشتە پێش تا قسە بکات. کوڕی عەباس وتی: هاوار لەتۆ، گومان دەکەم فریوی داویت. ئەگەر لەسەر شتێك ڕێککەوتن، سەرەتا ئەو پێش بخە و تۆ دوای ئەو قسە بکە چوونکە عەمرۆ پیاوێکی خیانەتکارە و دەترسم لەگەڵ تۆ لەسەر شتێك ڕێککەوتبێت و دواتر لای خەڵکان دژایەتی تۆ بکات. دەڵێت: باوکی موسا کەسێکی خلەفاو بوو، وتی: ئێمە ڕێککەوتووین. هاتەپێش، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەی خەڵکینە، لەکاروباری ئەم ئۆمەتە ورد بووینەوە و بۆ چاکسازی و نەهێشتنی دووبەرەکی، من و عەمرۆ بەباشمان زانی معاویە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەر کار لاببەین و خەڵکان خۆیان کەسێك وەك خەلیفە هەڵبژێرن. من عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لەسەر کار لادەبەم، کەسێك وەك خەلیفەی خۆتان هەڵبژێرن. ئەمەی وت و هاتە دواوە.

دوای ئەو، عەمرۆ هات، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی: ئەم پیاوە، بابەتێکی هێنایە سەرزمان، بیستتان کەئەو هاورێکەی خۆی لەسەر کار لابرد،

منیش ئەو لەسەر کار لادەبەم بەڵام هاوڕێکەم، معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، وەك خەلیفە هەڵدەبژێرم چوونکە ئەو خوازیاری خوێنی عوسمانە و لەهەموو کەسەکان بۆ ئەو پێگەیە شیاوترە.

باوکی موسا وتی: خواوەند سەرکەوتنت پێ نەبەخشێت، بۆ خیانەتت کرد. نمونەی تۆ، نمونەی سەگێکە ئەگەر پەلاماری بدەیت، دەوەڕێت و ئەگەر پشتگوێی بخەیت، دەوەڕێت.

عەمرۆ وتی: تۆیش لەکەرێك دەچیت کەکتێبەکان دەگوازێتەوە.

شورەیح کوڕی هانی هێرشی کردە سەر عەمرۆ و بەقامچی لەسەریدا. یەکێك لەکوڕەکانی عەمرۆ پەلاماری شورەیحیدا و بەقامچی لێیدا. خەڵکان ئەوانیان لەیەك جیا کردەوە. دواتر شورەیح وتبووی: لەهیچ شتێك بەئەندازەی ئەمە پەشیمان نیم، بۆ بەقامچی لەعەمرۆم دا، بۆ بەشمشێر لێم نەدا و نەمکوشت.

دەڵێت: خەڵکانی شام شوێن باوکی موسا کەوتن، ئەو سوار چوارپێکەی خۆی رووی لەمەککە کرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: خواوەند بۆچوونەکەی باوکی موسا بەنەحلەت بکات، ئاگادارم کردەوە بەڵام تێنەگەیشت.

باوکی موسا دەیوت: کوڕی عەباس منی لەخیانەتی ئەو ریاکارە ئاگادار کردەوە بەڵام لەو دڵنیا بووم و گومانم کرد تەنیا چاکەی ئەم خەڵکەی دەوێت.

دەڵێت: عەمرۆ و خەڵکانی شام بۆ لای معاویە گەڕانەوە و هاوشێوەی خەلیفە سڵاویان بۆ نارد. کوڕی عەباس و شورەیح کوڕی هانی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕانەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك نوێژی بەیانی دەخوێند، لەکاتی سوجدە بردن دەیوت: خواوەندا، معاویە و عەمرۆ و باوکی ئەعوەری سولەمی و حەبیب و عەبدولرەحمان کوڕی خالید و زوحاك کوڕی قەیس و وەلید بەنەحلەت بکە. کاتێك ئەم هەواڵە بەگوێی معاویە گەیشت، ئەویش لەنوێژەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوڕی عەباس و ئەشتەر و حەسەن و حسەینی بەنەحلەت دەکرد. بەوتەی واقدی کۆبوونەوەی داوەران لەشەعبانی ساڵی سی و هەشتەم روویدا.

## گێڕانەوەی بەسەرهاتی خەواریج ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب باوکی موسای بۆ داوەری کردن ڕەوانە کرد و گێڕانەوەی جەنگی نەهرەوان

عەون کوڕی باوکی جۆحەیفە دەڵێت: کاتێک عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیویست باوکی موسا ڕەوانە بکات، دوو کەس لەخەواریج، زەرعە کوڕی بورجی تایی و حێرقوس کوڕی زوهەیری سەعدی ڕۆشتنە لای و وتیان: داوەری تایبەتە بەخوا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: داوەری تایبەتە بەخوا.

حێرقوس وتی: لەگوناحەکەی خۆت تۆبە بکە و لەم کارە چاوبپۆشە، ئێمە ڕووبەرووی دوژمن بکەرەوە تا بجەنگین یا لەم ڕێگەدا دەکوژرێین.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: پێشتر ئەو پێشنیارەم پێکردن بەڵام نافەرمانی منتان کرد. لەنێوان خۆمان و ئەوان پەیمانێکمان نووسیوە و مەرجمان داناوە. خواوەند فەرموویەتی: ((واوفوا بعهدالله اذاعاهدتم و لا تنقضوا الایمان بعد توکیدها و قد جعلتم الله علیکم کفیلا ان الله یعلم ما تفعلون.

واتاکەی: کاتێك پەیمانێکی خوایی دەبەستن، وەفادار بن بۆی، سوێندەکان دوای ئەوەی بەهێزتان کرد و خواوەندتان کردە زامن، مەشکێنن چوونکە خواوەند لەکردەوەکانی ئێوە ئاگادارە.))

حێرقوس وتی: ئەمە گوناحە و دەبێت تۆبە بکەیت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەمە گوناح نییە، بۆچوونێکی هەڵەیە و لاوازی لەکارەکان، پێشتر پێم وتبوون و لەم کارە ئاگادارم کردبوونەوە.

زەرعە وتی: ئەی عەلی، سوێند بەخوا ئەگەر کەسێك سەبارەت بەکتێبی خواوەند بکەیتە داوەر، دژی تۆ دەجەنگم و لەم کارەم بەدوای ڕەزامەندی خواوەند دەگەڕێم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: چارەڕەش بیت، چەندە بەدبەختی! لەئێستاوە دەتبینم کەکوژراویت و با بەسەر تۆدا هەڵیکردووە.

وتی: حەز دەکەم بەوشێوەیە بێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەگەر لەسەر ڕێگەی ڕاست دەبوویت، مەرگ لەڕێگەی ڕاستی، ئاسوودە بوون لەدنیایە، بەڵام شەیتان فریویداون، لەخواوەند بترسن چوونکە لەم دنیا کەبۆی دەجەنگن، هیچ خێرێکتان دەست ناکەوێت.

ئەوان ڕۆشتن و بەردەوام وتەکانی خۆیان دووبارە دەکردەوە. ((داوەری کردن تایبەتە بەخوا))

عەبدولمەلیك کوڕی باوکی حوڕەی حەنەفی دەڵێت: ڕۆژێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتارێکی دەخوێندەوە، لەدەرەوەی مزگەوت بانگیان بەرز کردەوە، داوەری کردن تایبەتە بەخوا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: الله اکبر، وتەیەکی ڕاستە بەڵام مەبەستەکەی ئەوان هەڵەیە. ئەگەر بێدەنگ بن یەکێکن لەئێمە، ئەگەر بەردەوام بن، بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین و ئەگەر دژی ئێمە ئالای شۆڕش بەرز بکەنەوە، دژیان دەجەنگین.

دەڵێت: یەزید کوڕی عاسمی مەحاربی هەستا و وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی ناتوانین لێی جیا ببینەوە. پەروەدگاری ئێمەیە و ناتوانین لێی بێ نیاز بین. خواوەندا، پەنا بۆ تۆ دەبەین ئەگەر لەدینەکەی خۆمان لاوازی نیشان بدەین، چوونکە لاوازی لەکاروباری دین، دوو ڕوویی لەکاروباری خواوەندە. ریسواییەك کەڕووبەڕووی مەترسی ئازابەکانی خواوەندمان دەکاتەوە. ئەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئێمە لەکوشتن دەترسێنیت، سوێند بەخوا هیوادارم لەزووترین کات جەنگ دژی ئێوە دەست پێ بکەین. ئەوسا دەبینی کێ جەنگاوەرە.

دواتر خۆی و سێ براکەی ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە و لەگەڵ خەواریج لەجەنگی نەهرەوان کوژران. یەکیان دوای نەهرەوان لەنوخەیلە کوژرا.

کەسیر کوڕی بەهزی حەزرەمی دەڵێت: ڕۆژێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەناو خەڵکان قسەی دەکرد، کەسێك لەسووچێکی مزگەوتەکە هەستاو وتی: داوەری تایبەتە بەخوا. کەسێکی دیکەیش وتەکەی ئەوی دووبارە کردەوە. دواتر چەند کەسێك وتەکانی ئەوانیان دووبارە کردەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: الله اکبر، وتەیەکی ڕاستە بەڵام مەبەستەکەی

ئەوان هەڵەیە. سەبارەت بەئێوە ڕێز لەسێ شت دەگرین: تا ئەو کاتەی لەگەڵ ئێمەدا بن، دەرگای مزگەوتەکانی خواوەند بۆ ئێوە کراوەیە و دەتوانن لەوێ، لەخواوەند بپارێنەوە، تا ئەو کاتەی شان بەشانی ئێمە بجەنگن، لەتالآنییەکان بێ بەشتان ناکەین. شەڕ لەگەڵ ئێوە ناکەین تا ئەو کاتەی خۆتان زاری جەنگ هەڵدەدەن.

دوای ئەم قسانە، درێژەی بەوتارەکەی خۆیدا.

هاشم کوڕی وەلید دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی سەعیدی بوکایی شوێنکەوتەی بۆچوونی خەواریج بوو، ڕۆژێک کاتێک عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتاری دەخوێندەوە، هاتە پێش و ئەم ئایەی خوێندەوە:

((ولقداوحی الیك و الی الذین من قبلك لالئن اشرکت لیحبطن عملك و لتکونن من الخاسرین.

واتاکەی: بۆ تۆ ئەو کەسانەی پێش تۆبوون وەحی هاتەخوار، ئەگەر شرك و ناباوەڕی بکەیتە پیشە، کردەوە چاکەکانت بەفیڕۆ دەچێت و دەبیتە یەکێك لەزیانکاران.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەم ئایەی خوێندەوە:

((فاصبران وعدالله حق و لا یستخفنك الذین لایوقنون.

واتاکەی: چاوەڕێ بە چوونکە بەڵێنەکانی خواوەند راستە و ئەو کەسانەی دڵنیا نین، بۆ کارە نەشیاو و کەم باییەکان ناچارت نەکەن.))

باوکی ڕەزین دەڵێت: کاتێک داوەری کۆتایی پێهات و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەفین گەڕایەوە، لەکاتی گەڕانەوە، خەواریج لێی جیابوونەوە و کاتێك گەیشتنە ڕووباری نەهرەوان، لەوێ مانەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ کەسانی دیکە ڕۆشتنە ناو شاری کوفە. خەواریج لەحەرورا جێگیر بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب، عەبدوالله کوڕی عەباسی بۆ لای ئەوان نارد کەگەڕایەوە بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی دەستکەوتبێت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشت و قسەی لەگەڵ کردن و بەمشێوەیە هاتنە ناو کوفە. دواتر کەسێك هاتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: ئەم کەسانە گومان دەکەن بەبۆچوونی ئەوان لەگوناحەکەی

خۆت پەشیمان بوویتەوە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نوێژی نیمەڕۆی لەگەڵ خەڵکان خوێند و ئاماژەی بەکاروباری خەواریجدا و رەخنەی لێگرتن. ئەوان لەدەوروبەری مزگەوتەکە کۆبوونەوە و دەنگیان بەرز کردەوە: داوەری تایبەتە بەخوا.

یەکێك لەوان هاتە پێش وئایەی (ولقد اوحی) خوێند. عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش ئایەی (فاصبران وعدالله)ی خوێندەوە.

عەبدولمەلیك کوڕی باوکی حوڕە دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب باوکی موسای بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی ڕەوانە کرد، خەوریج چاویان بەیەك کەوت و لەماڵی عەبدوڵڵە کوڕی وەهبی راسبی کۆبوونەوە. عەبدوڵڵە ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، دواتر وتی: سوێند بەخوا ئەو کەسانەی باوەڕیان بەڕەحمان هەیە و شوێنکەوتەی فەرمانەکانی قورئانن، نابێت ئەم دنیا پێش فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە بکەن چوونکە ڕەزامەندی و خۆشحاڵی لەم دنیا دەبێتە هۆی ڕەنج و بەدبەختی. هەرکەس لەم دنیا ڕەنج و بەدبەختی ببینێت لەو دنیا پاداشتە خواییەکانی پێدەبڕێت و جێگەی بۆ هەمیشە لەبەهەشتایە. با بەنیشانەی رەخنە گرتن لەم دیاردە تازە گومڕاکەرانە لەم گوندە کەخەڵکەکەی ستەمکارانن، بۆ یەکێك لەویلایەتە کوێستانەکان یا شارەکان بڕۆین.

حێرقوس کوڕی زوهەیر وتی: بەهرەوەری لەدنیا کەمە و جیابوونەوە لێی نزیکە. رازاوەیی و زینەتەکان نەبێتە هۆی ئارەزوومەندی ئێوە بۆ دنیا و ناچارتان نەکات دەست لەماف و راستییەکان هەڵبگرن چوونکە خواوەند، خواپەرەست و چاکەکارانی خۆش دەوێت.

حەمزە کوڕی سەنانی ئەسەدی وتی: ئەی خەڵکینە بۆچوونی راست ئەوەی ئێوەیە، کاروباری خۆتان بەیەکێك لەخۆتان بسپێرن چوونکە دەبێت کۆڵەکەیکتان هەبێت و ئالأیەك تا لەدەوری کۆبکەنەوە.

دەڵێت: سەرکردایەتییان بەزەید کوڕی حەسینی تایی پێشنیاری کرد بەڵام رازی نەبوو. بەحەمزە کوڕی سەنانی ئەسەی و شورەیح کوڕی ئەوفی ئەسەدی،

پێشنیاریان کرد بەڵام رازی نەبوون. پێشنیاریان بە عەبدوڵڵە کوڕی وەهبی راسبی کرد، وتی: رازیم، سوێند بەخوا لەترسی مەرگ نییە کەپێی رازی نابم بەڵام بەهۆی ئارەزوومەندیم بۆ دنیا نییە کەپێی رازی دەبم.

دەڵێت: دە رۆژ لەمانگی شەوال تێپەڕی کە لەگەڵ عەبدوڵڵە بەیعەتیان کرد. ئەویان بە (ذوالثفنات[1]) ناو دەبرد.

دەڵێت: دوای ئەوە لەماڵی شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەسی کۆبوونەوە. کوڕی وەهب وتی: دەڕۆینە شارێك و لەوێ بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند کۆدەبینەوە چوونکە ئێوە لەسەر راستین.

شورەیح وتی: دەڕۆینە مەداین و لەوێ نیشتەجێ دەبین، دەروازەکان دەگرین و خەڵکەکەی دەردەکەین و کەس بۆ لای هاوەڵانی خۆمان لەخەڵکانی بەسرە دەنێرن تا پەیوەستی ئێمە ببن.،

زەید کوڕی حەسین وتی: ئەگەر بەدەستە و بەکۆمەڵ بڕۆنەدەر، شوێنتان دەکەون. یەك یا دوو دوو شارەکە بەجێبێڵن. لەمەداین کەسێك هەیە و دەبێتە ڕێگرتان، لەنزیك پردی نەهرەوان جێگیر ببن و بۆ براکانی خۆتان لەخەڵکی بەسرە نامە بنووسن.

وتیان: بۆچوونێکی راستە. عەبدوڵڵە کوڕی وەهب نامەی بۆ خەواریج نووسی و لەهەڵویستی خۆیان ئاگاداری کردنەوە. هانیدان تا پەیوەستیان ببن.

کاتێك نامەکەیان پێگەیشت، وەڵامیان دانەوە کە لەزووترین کات پەیوەستیان دەبن.

کاتێك خەواریجی کوفە مەبەستی ڕۆشتنیان کرد، هەموو شەوی هەینیان بەنوێژ کردن و پاڕانەوە بەسەر برد و رۆژی شەممە بەرێکەوتن. شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەسی کاتێك بەرێکەوت، ئەم ئایەی دەخوێندەوە: ((فخرج منها خائفا يترقب قال رب نجني من القوم الظالمين. ولما توجه تلقاء مدين قال عسى ربي ان يهديني سواء السبيل.

[1] (ثفنة) بەمانای پینەیە. بەئەگەری زۆر بۆیە بەم ناوە بانگیان دەکرد چوونکە ناوچاوی چەندین پینەی پێوە بوو لەبەر ئەوەی بەردەوام نوێژی دەخوێند

واتاکەی: لەو شارە ترساو نیگەران ڕۆشتەدەر و وتی: پەروەردگارا، لەدەستەی ستەمکاران، رزگاریم پێ ببەخشە. کاتێك ڕووی لەمەدین کرد، وتی: ئەگەری هەیە پەروەدگار من بۆ نیوەی ڕێگە ڕێنوێنی بکات.))

دەڵێت: تورفە کوڕی عودەی کوڕی حاتەم لەگەڵیان ڕۆشتەدەر. باوکی شوێنی کەوت بەڵام نەیتوانی بیگرێت. تامەداین ڕۆشت و گەڕایەوە و کاتێك گەیشتە سابات، عەبدوالله کوڕی وەهبی راسبی لەگەڵ بیست سوار ڕووبەرووی بوویەوە. دەیویست بیکوژێت بەڵام عەمرۆ کوڕی مالکی نەبهانی و بیشر کوڕی زەیدی بولانی ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرت. دوای ئەوە عودەی کەسی بۆ لای سەعد کوڕی مەسعود نارد کەکارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەداین بوو و ئەوی لەمەبەست وکاری خەواریج ئاگادار کردەوە. ئەویش خۆی ئامادە کرد و دەروازەکانی بەست. لەگەڵ دەستەیەك سوار بەرێکەوت و برازاکەی موختار کوڕی باوکی عوبەیدەی وەك جێگری خۆی دانا. عەبدوالله کوڕی وەهب ئاگادار بوویەوە، ڕێگەکەی خۆی گۆڕی و ڕووی کردە بەغداد. سەعد کوڕی مەسعود شەوانە لەکەرخ هاوریێ لەگەڵ پێنسەد سوار پێی گەیشتەوە و عەبدوالله لەگەڵ سی سوار ڕووبەرووی بوویەوە و جەنگان. دواتر هاوەڵانی سەعد دەستیان لەجەنگ لەگەڵ خەواریج هەڵگرت و پێیان وت: بۆ چ مەبەستێك لەگەڵ ئەوان دەجەنگیت چوونکە هیچ فەرمانێکت لەوبارەوە پێ نەدراوە؟. ڕێگەیان بۆ بکەرەوە و نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بنووسە. ئەگەر فەرمانی پێدابیت شوێنیان دەکەویت و ئەگەر کەسێکی دیکەی بۆ ئەو مەبەستە نارد، ئەرکی سەرشانی تۆی لابردووە.

بەڵام سەعد رازی نەبوو. کاتێك شەو داهات، عەبدوالله کوڕی وەهب بەرێکەوت و بەتێپەڕین لەسەرزەمینی دیجلە گەیشتە سەرزەمینی جوخی و لەوێوە ڕووی کردە نەهرەوان. پەیوەستی هاوەڵانی خۆی بوو. ئەوان لەبینینی ئەو بێ هیوا ببوون، وتبوویان: ئەگەر کوژرا بێت، زەید کوڕی حەسین یا حێرقوس کوڕی زوهەیر وەك سەرکردە هەڵدەبژێرین.

دەڵێت: دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە بەدوای خەواریج بەرێکەوتن تا

پەیوەستیان ببن و بۆ گەڕانەوە ناچارییان بکەن. قەعقاع کوڕی قەیسی تایی مامی تەرماح کوڕی حەکیم و عەبدوللە کوڕی حەکیم بوکایی لەناویاندا دەبینران.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە کەسالم کوڕی ڕەبیعەی عەبەسی مەبەستی ڕۆشتنەدەری هەیە. ئەوی بانگ کرد و ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت و ئەویش بەوتەکانی رازی بوو.

دەڵێت: کاتێک خەواریج لەکوفە ڕۆشتنەدەر، هاوەڵان و شیعەکانی عەلی لەدەوری کۆبوونەوە و دووبارە بەیعەتیان لەگەڵ کردەوە، وتیان: هاوڕێی هەر کەس بیت، هاوڕێیەتی دەکەین و دوژمنی هەرکەس بیت، دوژمنایەتی دەکەین. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لایەنگری لەسوونەتەکانی پێغەمبەری وەك مەرج دانا.

دەڵێت: ڕەبیعە کوڕی شەدادی خەسعەمی ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەپێی وت: لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) بەیعەت بکە.

ڕەبیعە وتی: لەسەر بنەمای سوونەتی ئەبوبەکر و عومەر.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: هاوار لەتۆ، ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر لەسەر بنەمای شتێك جیاواز لەکتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) بەیعەتیان دەکرد، لەسەر حەق نەبوون. ڕەبیعە بەیعەتی لەگەڵ کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەیری کرد و وتی: دەڵێی دەتبینم لەگەڵ خەواریج دەڕۆیت و دەکوژرێیت و لەژێر سمی ئەسپەکان پێشێل دەبیت. ئەو لەجەنگی نەهرەوان شان بەشانی خەواریجی بەسرە دەجەنگا و کوژرا.

دەڵێت: پێنسەد کەس لەخەواریجی بەسرە کۆبوونەوە. مەسعەر کوڕی فەدەکی تەمیمیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد. کوڕی عەباس ئاگادار بوویەوە و باوکی ئەسوەدی دوئەلی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد و لەنزیك پردی گەورە پێیان گەیشتەوە. ڕووبەڕووی یەك وەستان تا شەو داهات. مەسعەر کەئەشرەس کوڕی عەوف شەیبانی فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی بوو، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی شەوانە لەنێوان خەڵکان گوزەری کرد و لەنەهرەوان پەیوەستی

عەبدوالله کوڕی وەهب بوو.

دەڵێت: کاتێك خەواریج ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە، باوکی موسا بۆ کوفە هەڵات و عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کوڕی عەباسی بۆ بەسرە نارد. خۆی لەکوفە وتارێکی خوێندەوە و وتی: سپاس بۆ خوا، هەرچەند رۆژگار، بەڵا و کارەساتی گەورە بخولقێنێت، شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای گەورە بوونی نییە و محەممەد پێغەمبەری خوایە. بەڵام دواتر، سەرکێشی هۆکاری پەشیمانی و سەرکۆنە کردنە.

سەبارەت بەم دوو پیاوە و ئەم داوەرییە، لەفەرمانەکانی خۆم ئێوەم ئاگادار کردەوە و بۆچوونی خۆم نیشاندان.

بەڵام تەنیا بەبۆچوونی خۆتان رازی بوون. بەسەرهاتی من و ئێوە بەوشێوەیە کە شاعیری هەوازینی دەڵێت:

((فەرمانەکانی خۆم لەقولایی دۆڵەکە بەوان وت

بەڵام تا نیمەڕۆی رۆژی دواتر رێگەی چاکەیان نەزانی.))

بزانن ئەم دوو پیاوە وەك داوەرتان هەڵتانبژارد، فەرمانەکانی قورئانیان پشتگوێ خست و ئەوەی قورئان لەناوی بردبوو، زیندوویان کردەوە و هەرکامیان دوور لەفەرموودەکانی خواوەند، شوێن هەوا و هەوەسی خۆیان کەوتن و بێ بەڵگەیەی روون و ئاشکرا، داوەرییان کرد و لەکارەکەی خۆیان گرفتاری جیاوازی بوون. هیچ کامیان بەرێگەی راستدا نەڕۆشتن و خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) و باوەڕداران لێیان بێزارن. ئامادەی بەرێکەوتن بەرەو شام بن. بەخواستی خواوەند، رۆژی دووشەممە لەئوردووگاکانی خۆتان بن.

دەڵێت: کاتێك دابەزی، نامەیەکی بۆ خەواریج نووسی کە لەنزیك رووباری نەهرەوان بوون:

((بسم الله الرحمان الرحيم

لەبەندەی خوا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سەرورەری باوەڕداران بۆ زەید کوڕی حەسین و عەبدوالله کوڕی وەهب و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوانن.

بەڵام دواتر، ئەم دوو پیاوەی بەداوەری کردنی ئەوان رازی بووین، دژایەتی

کتێبی خوایان کرد و بێ ڕێنوێنی خواوەند، شوێن هەوا و هەوەسەکانی خۆیان کەوتن. بەپێی سوونەتەکان نەجوولانەوە و فەرمانەکانی قورئانیان جێبەجێ نەکرد و خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) و باوەڕداران لێیان بێزارن. کاتێك نامەکەی منتان بەدەست گەشت، پەیوەستمان بن چوونکە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن دەڕۆین و بەهەمان شێوەی یەکەم لەگەڵیان دەجەنگین.))

لەوەلامدا نووسیان:

((بەلام دواتر، تۆ بەگەڕاندنەوەی ڕاستییەکان و ڕەزامەندی پەروەردگار ناجەنگیت بەڵکو بۆ خۆت ئەو کارە دەکەیت، ئەگەر شایەتی بۆ گوناحەکەی خۆت دەدەیت و تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز دەکەیتەوە، لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خۆمان دەکەین و گەرنە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە جەنگ لەگەڵ تۆ رادەگەیێنین چوونکە خواوەند خیانەتکارانی خۆش ناوێت.))

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەکەی ئەوانی خوێندەوە، لێیان هیوابڕاو بوو. بەباشی زانی پشتگوێیان بخات و هێرش بکاتە سەر خەڵکانی شام و بجەنگێت.

جەبر کوڕی نەوف هەمەدانی دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەنوخەیلە دابەزی و لەخەواریج هیوابڕوا بوو، هەستایە سەرپێ، سپاسی خواوەندی کرد، دواتر وتی: هەرکەس جهاد لەڕێگەی خواوەند پشتگوێ بخات و دووڕوویی بکاتە پیشە، لەلێواری هەڵدێری مەرگە مەگەر ئەوەی خواوەند بەبەزەیی خۆی ڕزگاری بکات. لەخواوەند بترسن و لەگەڵ دوژمنەکانی بجەنگن تا تاوانبارانی گومڕا و ستەمگەر کەقورئان ناخوێنن و شارەزایی کاروباری دین نین و زانستی شیکردنەوە و شرۆڤە کردنی قورئانیان نییە، لەناوبچن. سوێند بەخوا ئەگەر ببنە خەلیفەی ئێوە، کردەوکانیان هاوشێوەی هێرقل و خوسرەو دەبێت. خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنانی ڕۆژئاوای خۆتان. کەسمان بۆ لای براکانتان لەبەسرە ناردووە تاپەیوەستی ئێوە بن و کاتێك هاتن و کۆبووینەوە، بەرێدەکەوین. بەخواستی خوا، سەرکەوتن بەدەست دێنین.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەیەکی بۆ کوڕی عەباس نووسی و

بەعوتەبە کوڕی ئەخنەس لەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر ڕەوانەی کرد:

((بەڵام دواتر، ئێمە لەئوردووگاکەمان لەنوخەیلە کۆبووینەتەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر دوژمنانی ڕۆژئاوامان هەیە. خەڵکان بەرێ بکە تا نێردراوەکەی من لای تۆ دەگەڕێتەوە و لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە، تافەرمانەکانی من دەگات. والسلام))

کاتێک نامەکەی بەدەستی کوڕی عەباس گەیشت، نامەکەی بۆ خەڵکان خوێندەوە و وتی: لەگەڵ ئەحنەف کوڕی قەیس بەرێکەوت. هەزار و پێنسەد کەس لەوان بەرێکەوتن. عەبدوالله کوڕی عەباس ئەم ژمارە کەمەی بینی و لەناو خەڵکان وتارێکی پێشکەش کرد، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: ئەی خەڵکانی بەسرە، فەرمانی سەروەری باوەڕداران هاتووە تا ئێوە ڕەوانە بکەم. فەرمانم پێدان لەگەڵ ئەحنەف کوڕی قەیس بەرێکەون و زیاتر لەهەزار و پێنسەد کەس ئامادەی ڕۆشتن نەبوون. بەڵام ئێوە بێ کۆیلە و موالی و مناڵەکانتان، شەست هەزار کەسن. لەگەڵ جاریە کوڕی قودامەی سەعدی بەرێکەن و هیچ کەس بەڵگە و پاساو نەهێنێتەوە. هەرکەس بمێنێتەوە و نافەرمانی سەروەری خۆی بکات، سەرکۆنە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکەم. فەرمانم بەباوکی ئەسوەدی دوئەلی داوە ئێوە ڕەوانە بکات. هەرکەس ببێتە هۆکاری سەرکۆنە کردنی خۆی، تەنیا دەبێت خۆی سەرکۆنە بکات.

دەڵێت: جاریە بەرێکەوت و ئوردووی لێدا. باوکی ئەسوەدیش خەڵکانی بۆ ڕۆشتن هان ددا. هەزار و حەوتسەد کەس لەدەروی جاریە کۆبوونەوە و بەرێکەوت تا لەنوخەیلە پەیوەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەنوخەیلە مابوویەوە تا ئەو دوو سوپای بەسرە کەژمارەیان سێ هەزار و دووسەد کەس بوو، پەیوەستی بوون.

دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرکردەکانی کوفە و سەرکردەکانی حەوت ناوچە و سەرکردەی هۆز و گەورەکانی خەڵکی کۆکردەوە، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: ئەی خەڵکانەی کوفە، ئێوە بۆ زیندوو کردنەوەی ڕاستییەکان، هاوەڵ وبراکان و لەجیهاد لەرێگەی خوا، پشتیوانی منن. بەهاوکاری ئێوە

نەیارەکان سەرکوت و شوێنکەوتەکان بۆ فەرمانبەری کردنی تەواو، ناچار دەکەم. کەسم بۆ لای خەڵکانی بەسرە نارد تا پەیوەستی ئێوە بن بەڵام زیاتر لەسێ هەزار و دووسەد کەس نەهاتن. بەراوێژ کردنێکی ئاشکرا هاوکاریم بکەن. هەمووان کۆببنەوە دەخوازم سەرکردەی هەر خەڵکێك ناوی هەموو جەنگاوەران و منداڵەکان کەتەمەنیان بەتەمەنی جەنگ گەیشتووە، بنووسن هەروەها ناوی موالی تایەفەکان.

سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئێمە هەموو گوێرایەڵین و چاکەخواز، من خێراتر لەهەمووان ئەوەی داوات کردبوو، هێنام. مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحیش هەستا و هاوشێوەی ئەو قسەی هێنایە سەرزمان. عودەی کوڕی حاتەم و زیاد کوڕی خەسفە و حوجر کعودەی و سەرکردە و گەورەیی خەڵکان هەستان و هاوشێوەی ئەوان دووان.

دەڵێت: دوای ئەوە سەرکردەکان ناوی جەنگاوەرانی خۆیان نووسی و تەسلیم بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان کرد. منداڵ و کۆیلە و موالییەکانی خۆیان نووسی تا لەگەڵ ئەوان بەشداری جەنگەکە بکەن. کەس بەجێ نەما. ناوی چل هەزار جەنگاوەر و حەفدە هەزار کەس لەو کوڕانەی تەمەنیان بەتەمەنی جەنگ گەشتبوو لەگەڵ هەشت هەزار لەموالی و کۆیلەکانیان تەسلیم بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، لە جەنگاوەران و منداڵەکانیان و ئەوانەی توانای جەنگیان هەیە، ئەوانەی بەهێز و بوێرن، فەرمانمان پێداون لەگەڵ ئێمە بەرێکەون. دەستەیەکیش ناتەوانن و لەناو زەوی و زار و ماڵەکاندا ماونەتەوە و سەرقاڵی کارە پێویستەکانن.

دەڵێت: لەعەرەبەکانی کوفە پەنجا و حەوت هەزار کەس کۆببوونەوە لەگەڵ حەوت هەزار کەس لەموالی و کۆیلەکانیان. کۆی گشتی ئەوان شەست و پێنج هەزار کەس بوو. سێ هەزار و دووسەد کەس لەخەڵکانی بەسرەیش لەناو ئەواندا دەبینران. بەمشێوەیە ژمارەی سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگەیشتە شەست و هەشت هەزار و دووسەد کەس.

باوکی سەڵتی تەمیمی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ سەعد

کوڕی مەسعودی سەقەفی نووسی کەکارگوزاری خۆی لەمەداین بوو: زیاد کوڕی خەسفەم بۆ لای تۆ نارد، جەنگاوەرانی کوفە بۆ لای من ڕەوانە بکە. هەرچی زووتر باشتر.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە کەخەڵکان دەڵێن: باشتر بوو سەرەتا ئێمەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حەروورییەکان دەبرد و سەرەتا لەوانەوە دەستمان پێدەکرد. کاتێک ئەوانمان سەرکوت کرد، ڕووبەڕووی نەیارەکانمان دەبووینەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەناو خەڵکان وتارێکی خوێندەوە، سوپاسی خواوەندی کرد و وتی: بیستوومە دەڵێن باشترە سەرەتا سەرورەری باوەڕداران ئێمە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەواریج ببات کەدژی ئێمە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. سەرەتا ئەوان لەناو ببەین و دواتر ڕووبەڕووی گومڕاکان ببینەوە. بەڵام بەبۆچوونی من گومڕاکان لەخەواریج زۆر گرنگترن. جەنگ لەگەڵ ئەوان لەبیر بکەن و ڕووبەڕووی ئەو خەڵکە ببنەوە کەدژی ئێوە دەجەنگن چوونکە ئەگەری هەیە ببنە پاشا ستەمکارەکان و بەندەکانی خواوەند بکەنە بەندەی خۆیان. کەسانێك لەناو خەڵکان هاواریان کرد کە: تۆ سەرورەری ئێمەیت و بۆ جەنگی هەر کەسێك دەخوازیت، بمانبە.

دەڵێت: سەیفی کوڕی فوسەیلی شەیبانی هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی سەرورەری باوەڕداران، ئێمە هاوەڵانی تۆ، لەگەڵ هەر کەس بجەنگیت، دەجەنگین و هاوڕێی ئەو کەسەین شوێنکەوتەی تۆ بێت. ئێمە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنان ببە، لەهەر کوێ بن و هەرکەسێك بن. بەخواستی خوا، هیچ کێشە و کەم وکوڕییەکت نابێت.

موحریز کوڕی شەهابی تەمیمی لەتایەفەی مناڵەکانی سەعد هەستا و وتی: ئەی سەرورەری باوەڕداران، شیعەکانی تۆ هاوشێوەی یەك کەس بۆ هاوکاری کردن و جەنگ لەگەڵ دوژمنانت، هاودەنگن. دڵخۆش بە چوونکە سەرکەوتن تایبەتە بەتۆ. بۆ هەرکوێ دەخوازیت بمانبە، ئێمە شیعەی تۆین و لەشوێنکەوتن وگوێڕایەڵی تۆ، چاوەڕوانی پاداشتی چاکە دەکەین.

حەمید کوڕی هیلال لەیەکێك لەخەڵکانی عەبدقەیس کە لەناو سوپای

خەواریج و دواتر لێیان جیابوویەوە، دەگێڕێتەوە: ڕۆشتنە گوندێك، عەبدوللە کوڕی خەباب کەهاوەڵی پێغەمبەری خوا بووە، بەشێوەیەکی ترساو هات، عاباکەی خۆی رادەکێشا، پێیان وت: مەترسە.

وتی: سوێند بەخوا منتان ترسان.

وتیان: تۆ عەبدوللە کوڕی خەبابی کەهاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) بووە.

وتی: بەڵێ.

وتیان: بیستووتە باوکت لە پێغەمبەر (د.خ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە سەبارەت بەئاژاوەیەك کە لەو ئاژاوەدا هەرکەس دانیشتبێت لەکەسی وەستاو باشترە و هەرکەس وەستا بێت، لەو کەسە باشترە بەرێگەدا دەڕوات و ئەو کەسەی دەڕوات، لەوەی رادەکات باشترە و دەفەرمێت: ئەی بەندەی خوا، ئەگەر لەو کاتەدا بوویت، هەوڵ بدە کوژراو بیت.

بێژەر دەڵێت: تەنیا ئەوە دەزانم کەفەرموو بووی: ئەی بەندەی خوا، بکوژ مەبە.

عەبدوللە وتی: بەڵێ.

دەڵێت: ئەویان بردە لای رووبارەکە و کوشتیان. خوێنەکەی کەوتە ناو ئاوەکە. سکی کەنیزەکەیشیان هەڵدڕی و منداڵی ناو سکیان دەرهێنا.

حەمید کوڕی هیلال دەڵێت: خاریجە کە لەبەسرە بەرێکەوتبوو، هات تا لەسەر کەنارەکانی رووبار پەیوەستی هاوەڵانی خۆی بوو. دەستەیەك لەوان ڕۆشتن و چاویان بەکەسێك کەوت کەژنێکی سوار کەرێك کردبوو. ئەویان گرت، هەڕەشەیان لێکرد و ترساندیان. وتیان: کێیت؟

وتی: عەبدوللە کوڕی خەبابم کەهاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) بووە. چەمایەوە تا عاباکەی خۆی هەڵبگرێت چوونکە کاتێك ئەویان ترساند، عاباکەی کەوتە خوار.

وتیان: تۆمان ترساند؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: مەترسە، حەدیسێك لەباوکی خۆت بگێڕەوە کە لە پێغەمبەری

بیستبێت، ئەگەری هەیە بەوشێوەیە سوودێکمان پێ بگات.

وتی: باوکم لە پێغەمبەر (د.خ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە، پێی وتم ئاژاوەیەك ڕوودەدات کە لەو ئاژاوەدا دڵی پیاو دەمرێت بەهەمان شێوە کەجەستەی دەمرێت. هەرکەس شەو باوەڕدار بێت، بەیانییەکەی کافر دەبێت و هەرکەس کافر بێت، شەوەکەی باوەڕدار دەبێت.

وتیان: پرسیاری ئەم حەدیسەمان دەکرد. سەبارەت بەئەبوبەکر و عومەر کوڕی خەتاب دەڵێی چی؟

عەبدوالله وەسفی کردن.

وتیان: سەبارەت بەعوسمان کوڕی عەفان لەسەرەتا و کۆتایی خەلافەتەکەی، بۆچوونت چییە؟

وتی: لەسەرەتا و لەکۆتایی، لەسەر ڕێگەی ڕاست بوو.

وتیان: سەبارەت بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب، پێش ڕازی بوون بەداوەری و دوای ئەو کارە، بۆچوونت چییە؟

وتی: ئەو، خواوەند باشتر لەئێوە دەناسێت و بۆ کاروباری دین شارەزاترە.

وتیان: تۆ شوێنکەوتەی هەوا و هەوەسیت و خەڵکانت بەهۆی ناوەکانیانەوە خۆش دەوێت نەك کردەوەکانیان. سوێند بەخوا بەشێوەیەك دەتکوژین، کەسمان بەوشێوەیە نەکوشتبێت.

ئەویان گرت و دەستیان بەستەوە. هاوڕێ لەگەڵ ژنەکەی کەدووگیان بوو، ئەوانیان بردە ژێر دار خورمایەك. دەنکی خورما کەوتەخوار. یەکیان هەڵیگرتەوە و خستییە ناو دەمی. یەکیان وتی: بەناڕەوا خواردت بێ ئەوەی بەهاکەی بدەیت. خورماکەی فڕێدا. دواتر شمشێرەکەی خۆی هەڵگرت. بەرازێك لەوێوە گوزەری کرد. بەشمشێر لەبەرازەکەیدا و خوێنی ڕشت، وتیان: ئەمە فیڕۆیی لەسەر زەوی دروست کردووە. لەبەر ئەوە ڕۆشتە لای خاوەنی بەرازەکە و ڕەزامەندی ئەوی وەرگرت.

دەڵێت: کاتێك کوڕی خەباب کردەوە و هەڵس و کەوتی ئەوانی بینی، وتی: ئەگەر ڕاست بکەن، لەئێوە نیگەران نیم چوونکە موسوڵمانم و داهێنانێکی تازەم

نەهێناوەتە بوون، ئەمانتان پێداوم و وتتان: مەترسە.

ئەویان هێنا و دایاننیشاند. سەریان بڕی و خوێنی ڕژایە ناو ئاوەکە. دواتر پەلاماری ژنەکەیاندا، وتی: من ژنم، مەگەر لەخوا ناترسن؟ سکیان هەڵدڕی. دوای ئەو، سێ ژنی دیکەیان لەهۆزی تەی کوشت. دایکی سەنانی سەنداویشیان کوشت.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب و موسوڵمانانی هاوڕێی، لەکردەوەی خەواریج ئاگادار بوونەوە و زانیان عەبدوالله کوڕی خەبابیان کوشتووە و ڕێگە لەکەسان دەگرن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب حارس کوڕی موڕەی عەبدی ڕەوانە کرد تا لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی ئەوان بکات و ڕاستییەکانی بۆ بنووسێت بێ ئەوەی هیچی لێ بشارێتەوە.

حارس ڕۆشت تا گەیشتە نەهرەوان تا پرسیاری ئەوان بکات، بەڵام خەواریج هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و موسوڵمانان ئاگادار بوونەوە و لەدەوری کۆبوونەوە، وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران بۆ ئەم کەسانە لەپشت سەری ئێمە بەجێ دێڵیت تا بەسەر ژن و ماڵ و منداڵی ئێمەدا زاڵ بن؟ ئێمە بۆ جەنگی ئەوان ببە و کاتێك لەسەرکوت کردنی ئەوان تەواو بووین، بۆ جەنگی دوژمنی سەرەکی دەڕۆین.

دەڵێت: ئەشعەس کوڕی قەیسی کێندی هەستاو قسەی هاوشێوەی هێنایە سەرزمان. خەڵکان گومانیان دەکرد ئەشعەس ئارەزوومەندی پەیوەست بوون بەخەواریجە چوونکە لەڕووداوی سەفین وتبووی: ئەو دەستەی پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی خواوەندمان پێدەکەن، دادپەروەرییان کردۆتە پیشە. و کاتێك پێداگری لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد بۆ ئەوەی بۆ جەنگ دژی خەواریج بەڕێکەوێت، خەڵکان زانیان ئەو هاودڵی ئەوان نییە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بڕیاریدا و جاری بەڕێکەوتنی بەرز کردەوە. بەڕێکەوت و لەپرد تێپەڕی و نزیك ئەو شوێنە دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند. دواتر لەدێری عەبدولرەحمان دابەزی. دوای ئەو شوێنە، لەدێری باوکی موسا و دواتر لەگوندی شایی گوزەری کرد. دوای ئەو ناوچانە لەدەباها و فورات پەڕییەوە.

لەکاتی ڕێگە، ئەستێرە ناسێکی بینی، پێی وت: لەکاتێکی دیاریکراو لەرۆژ بەرێکەوێت. وتی: ئەگەر لەکاتێکی دیکەدا بەرێکەوێت، تۆ و سوپاکەت گرفتاری ڕەنج و سەختی زۆر دەبن. بەلام پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەوی بەکار برد، کاتێك لەرووبار پەڕییەوە، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: ئەگەر گرنگیمان بەوتەی ئەستێرەناسەکە دەدا، نەزانەکان دەیانوت: لەو کاتەی ئەستێرەناسەکە بۆی دیاریکرد، بەرێکەوت تا سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

عەبدوالله کوڕی عەوف دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیویست لەئەنبارەوە بەرەو سوپاکەی نەهرەوان بەرێکەوێت، قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادە پۆشتە لای و پێی وت بەرەو مەداین بڕوات و لەوێ بمێنێتەوە تا فەرمانەکانی دەگات. دواتر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەواریج بەرێکەوت.

قەیس و سەعد کوڕی مەسعودی سەقەفی لەنزیك رووبار پەیوەستی بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسی بۆلای خەواریج نارد و داوای کرد بکوژەکانی عەبدوالله کوڕی خەباب وکەسانی دیکە تەسلیم بکەن تا بۆ تۆڵە سەندنەوە بیانکوژین. کارمان بەئێوە نییەو لەگەڵ ئێوە ناجەنگین تا ڕووبەڕووی خەڵکانی شام ببینەوە. ئەگەری هەیە خواوەند دڵی ئێوە بگۆڕێت و بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیتان بکات.

دەڵێت: خەواریج کەسیان نارد و وەڵامیان دایەوە: ئێمە هەمووان بکوژەکانی ئەوانین و خوێنی ئەوان و ئێوە بەحەڵاڵ دەزانین.

عەبدوالله کوڕی باوکی کەنود وتی: قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادە بەخەواریجی وت: ئەی بەندەکانی خوا، خوێنبایییەکانی ئێمە بدەن و بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە و لەگەڵ ئێمە بۆجەنگی دوژمنی خۆتان و ئێمە بێن. کارێکی سەیرە و شایەتی بۆ ناباوەڕی ئێمە دەدەن و ئەم کارە ستەمێکی گەورەیە. خوێنی موسوڵمانانتان ڕشت و بەناباوەڕیان دەزانن.

عەبدوالله کوڕی شەجەرەی سولەمی وتی: ڕاستییەکان بۆ ئێمە ئاشکرا بوون، نابینە شوێنکەوتەی ئێوە مەگەر ئەوەی کەسێکی وەك عومەر کوڕی خەتاب بکەنە خەلیفە.

سەعد وتی: لەناو خۆمان جگە لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسێکی هاوشێوەی ئەو ناناسین، ئێوە کەس لەناو خۆتاندا دەناسن؟ وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا خۆتان بەکوشت مەدەن چوونکە دڵنیام ئاژاوە بەسەر ئێوەدا زاڵ بووە.

باوکی ئەییووب، خالید کوڕی زەیدی ئەنساری، قسەی لەگەڵ کردن و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، ئێمە و ئێوە لەحاڵی خۆماندایین وەك هەمیشە و هیچ دوورییەك لەنێوان ئێمەدا نییە. لەسەر چی لەگەڵ ئێمە دەجەنگن؟

وتیان: ئەگەر ئەمڕۆ بەیعەتتان لەگەڵ ببەستین، سبەی بەداوەری کردن رازی دەبن.

وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا لەترسی فیتنەی ساڵی داهاتوو، ئەم ساڵە ئاژاوە مەنێنەوە.

زەید کوڕی وەهب وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ رووبەروو بوونەوەی خەواریجی نەهرەوان هات، قسەی بۆ کردن و وتی: ئەی ئەو خەڵکانە لەسەرسەختی خۆتانەوە بۆ جەنگی ئێمە هاتوون و هەوا و هەوەس لەرێگەی راست بەدەری کردوون، گرفتاری بەڵایەکی گەورە بوون، ئاگادار بن، سبەی خەڵکان دەتانبینن کە لەکەنار ئەم رووبارە لەپێ کەوتوون و کوژراون بێ ئەوەی لەلایەن خواوە هیچ بەڵگەیەکی روون و ئاشکراتان لەبەر دەستا بێت. مەگەر نازانن لەرازی بوون بەداوەری کردن دوورم خستنەوە و پێم وتن ئەوان تەنیا بۆ فریودانی ئێوە قورئانەکانیان بەرز کردۆتەوە. مەگەر پێم نەوتن ئەوان موسوڵمان و شارەزای دین و قورئان نین و ئەوان باشتر لەئێوە دەناسم، لەمناڵی و گەورەیی لەگەڵ ئەوان بووم، ئەوان کەسانێکی درۆزن و فێڵبازن. ئێوە ئەگەر بەرپەرچی بۆچوونەکەی من بدەنەوە، پێچەوانەی دوورئەندێشییە. بەڵام نافەرمانی منتان کرد تا ئەوەی تەسلیمی خواستی ئێوە بووم و بەداوەری کردن رازی بووم. بەڵام بۆ ئەو کارەیش مەرجم دانا و پەیمانمدا و لەداوەرەکان پەیمانم وەرگرت تا ئەوەی قورئان زیندووی دەکاتەوە، زیندووی بکەنەوە و ئەوەی قورئان لەناوی دەبات، لەناوی ببەن، بەڵام دژایەتی منیان کرد و پێچەوانەی قورئان و سوونەت

جوولاّنەوە. گرنگیمان بەبۆچوون و کاری ئەوان نەدا و هەنووکە دەخوازین بۆ سەرکوت کردنی ئەوان بڕۆین، ئێوە چیتان بەسەر دێت و لەچی دەترسن؟

وتیان: ئێمە بەداوەری کردن رازی بووین و گوناحبارین و بەم هۆیەوە ناباوەڕ بووین. دواتر تۆبەمان کرد، ئەگەر تۆیش هاوشێوەی ئێمە تۆبە بکەیت، لەگەڵ تۆین و هاورێی تۆین و ئەگەر تۆبە نەکەیت، خۆت لەئێمە بەدوور بگرە چوونکە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە جەنگ دژی تۆ رادەگەیێنین و دڵنیابە خواوەند خیانەتکارانی خۆش ناوێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: گرفتاری بەلاّ بوون و کەس لەئێوە نەمایەوە. لەو کاتەوەی باوەڕم بە پێغەمبەر (د.خ) هێنا و کۆچم کرد، لەرێگەی خوادا جەنگاوم، هەنووکە دان بەگوناحباری و کوفری خۆمدا بنێم؟ بەمشێوەیە گومڕا دەبم و لەرزگار بووان نیم. ئەوانی بەجێهێشت.

باوکی سەلمەی زوهری کەدایکی کچی ئەنس کوڕی مالك بوو، دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخەواریجی نەهرەوانی وت: ئەی خەڵکینە، نەفسی ئێوە، دژایەتی کردن لەگەڵ داوەری بەپەسەند دەزانێت، بەلاّم خۆتان دەستتان پێکرد و من نارازی بووم، پێم وتن ئەوان تەنیا بۆ فریودانی ئێوە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ قورئانتان پێدەکەن. بەلاّم رازی نەبوون و دژایەتی منتان کرد و نافەرمانیتان کردە پیشە، منیش بەبۆچوونەکەی ئێوە رازی بووم. سوێند بەخوا دەستەیەکی کەم و بێ ئاوزن، ئەی بێ باوکینە، هیچ کارێکی حەرامم ئەنجام نەداوە و ئێوەم بەرەو گومڕایی نەبردووە و هیچ شتێکم لەئێوە نەشاردۆتەوە، نەفریوم داون نەبوومەتە هۆکاری رەنج و مەینەتی بۆتان، کاری ئێمە کاری موسوڵمانان بوو. بڕیارتاندا دوو کەس هەڵبژێرن و ئێمە بەڵێنمان لێوەرگرتن بەپێی فەرموودەکانی قورئان بجوولێنەوە و سنوورەکانی نەبەزێنن. بەلاّم گومڕا بوون و راستییەکانیان بەئاشکرا پشتگوێ خست و رێگەی ناڕاستیان گرتەبەر. لەکاتێکدا بەڵێنمان لێوەرگرتن دادپەروەری بکەنە پیشە و بەرگریکاری راستییەکان بکەن. هەنووکە کە لەرێگەی راست دوور کەوتوونەتەوە و گرفتاری هەڵە بوون، بەڵگەی تەواومان لەبەردەستایە. روونی بکەنەوە بۆ جەنگ و جیابوونەوە لەئێمە بەرەوا دەزانن

لەبەر ئەوەی خەڵکان دوو کەسیان هەڵبژارد؟ بۆ شمشێرەکانتان خستۆتە سەرشان و ڕێگە لەخەڵکان دەگرن و خوێنیان دەڕێژن چوونکە ئەمە ستەمکارییەکە ئاشکرا. سوێند بەخوا ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە مریشکێك بکوژن، خواوەند پێی خۆش نییە چ بگات بەوەی مرۆڤێك کەکوشتنی لای خواوەند حەرامە.

خەواریج دەنگیان بەرز کردەوە و وتیان: قسەیان لەگەڵ مەکەن و بۆ دیداری خواوەند ئامادە بن. بەرەو پێش، بەرەو بەهەشت.،

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشت و سوپاکەی ڕازاندەوە. فەرماندەیی باڵی ڕاستی بەحوجر کوڕی عودەی و باڵی چەپی بە شیبس کوڕی ڕێبعی یا مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی سپارد. باوکی قتادەی ئەنساری وەك فەرماندەی پیادەکان دەستنیشان و قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادەی وەك فەرماندەی خەڵکانی مەدینە دانا کەژمارەیان حەوتسەد کەس بوو.

دەڵێت: خەواریجیش خۆیان ئامادە کرد: زەید کوڕی حەسینی تایی فەرماندەیی باڵی ڕاستی گرتەئەستۆ، شورەیح کوڕی ئەوف عەبەسی فەرماندەیی باڵی چەپی گرتە ئەستۆ، حەمزە کوڕی سەنانی ئەسەدییان وەك فەرماندەی سوارەکان دانا و حێرقوس کوڕی زوهەیر فەرماندەی پیادەکانی گرتە ئەستۆ.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەسوەد کوڕی یەزیدی مورادی لەگەڵ دوو هەزار کەس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حەمزە کوڕی سەنانی ئەسەدی ڕەوانە کرد کەسێسەد سواری لەگەڵدا بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئالأی ئەمانی بەدەستی باوکی ئەییووب سپارد. باوکی ئەییووب هاواری کرد: هەرکەس لەدەوری ئەم ئالأیە کۆببێتەوە و کەسی نەکوشتبێت و ڕێگەی لەکەس نەگرتبێت، لەئەماندایە، هەرکەس بەرەو کوفە یا مەداین بڕوات و لەم دەستەیە خۆی دوور بخاتەوە، لەئەماندایە، ئێمە دوای ئەوەی خوێنی بکوژەکانی براکانی خۆمان ڕشت، پێویستمان بەکوشتنی ئێوە نییە.

فەروە کوڕی نەوفلی ئەشجەعی وتی: سوێند بەخوا نازانم بۆ دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەجەنگم؟ بۆچوونی ڕاست ئەوەیە بڕۆم تا سەبارەت بەجەنگ

دژی خۆی و سوپاکەی دڵنیا ببم. لەگەڵ پێنسەد سوار ڕۆشت و لەدۆڵی نەیجین و دەسکەرە جێگیر بوو. دەستەیەکی دیکە بەشێوەیەکی بەربڵاو ڕۆشتن و گەڕانەوە بۆ ناوکوفە. نزیکەی سەد کەس لەوان پەیوەستی سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوویەوە. ژمارەی هەموویان چوار هەزار کەس بوو. ئەوانەی لەگەڵ عەبدوالله کوڕی وەهب مابوونەوە، دوو هەزار و هەشتسەد کەس بوون و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب. عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوارەکانی خۆی بەبێ پیادەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد و کەسانیتری لەپشت سوارەکانەوە ریز کرد: تیرهاوێژەکانی لەریزی پێشەوە جێگیر کرد و بەهاوەڵانی خۆی وت: دەست رابگرن تا جەنگ دەست پێدەکەن چوونکە زۆربەیان پیادەن. ئەگەر هێرش بکەنە سەر ئێوە، ئەو کاتەی دەگەنە لای ئێوە، شەکەت و ماندوون، ئێوە بەرگری بکەن و پاشەکشێیان پێ بکەن. خەواریج هاتن و کاتێك نزیك کەوتنەوە، بانگی یەزید کوڕی قەیسیان کرد. ئەو کارگوزاری ئیسفەهان بوو. وتیان: ئەی یەزید، داوەری کردن تایبەتە بەخوا، هەرچەند کارگوزاری ئیسفەهان نەخوازێت.

عەباس کوڕی شەریك و قەبیسە کوڕی زەبیعە، هەردووکیان عەبەسی، هاواریان کرد: ئەی دوژمنانی خوا، مەگەر شورەیح کوڕی باوکی ئەوفی ستەمکار، لەناو ئێوەدا نییە؟ مەگەر ئێوەیش هاوشێوەی ئەو نین؟

وتیان: دژی ئەو کەسەی گرفتاری ئاژاوە بووە و تۆبەی کردووە، چ بەڵگەییتان بەدەستەوەیە؟

هاواریان کرد: بۆ پێشەوە، بەرەو بەهەشت. هێرشیان برد. سوارەکان لەبەردەم پیادەکان بوون، سوارەکانی سوپای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەیانتوانی بەرگری بکەن چوونکە هێرشەکەیان قورس بوو. بوون بەدوو دەستە، دەستەیەك روویان کردە باڵی راست و دەستەیەك روویان کردە باڵی چەپ. خەواریج هێرشیان کردە سەر پیادەکان.

تیرهاوێژەکان تیربارانیان کردن و سوارەکان لەقۆڵی چەپ وراست هێرشیان کردە سەریان و پیادەکان بەشمشێر و ڕم پەلاماریاندان. سوێند بەخوا، زۆری

نەخایاند لەناویان بردن. حەمزە کوڕی سەنان کاتێك لەکوژرانی خۆیان دڵنیا بوو، فەرمانی بەسوارەکاندا لەچوارپێکانیان بێنەخوار. بەڵام هێشتا لەسەر زەوی جێگەیان نەگرتبوو کەئەسوەد کوڕی قەیسی مورادی هێرشی کردەسەریان. لەلایەن عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە سوارەکان هێرشیان هێناو لەماوەیەکی کەمدا لەناویان بردن.

حەکیم کوڕی سەعد دەڵێت: رووبەرووی خەڵکانی بەسرە بووینەوە و زۆری نەخایاند وەك بڵێی فەرمانی مردنیان پێدرابێت و پێش ئەوەی هێزی خۆیان نیشان بدەن و لەناو بردنیان دژوار ببێت، گیانیاندا.

باوکی خەباب دەڵێت: ئەیووب ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، زەید کوڕی حەسینم کوشت.

وتی: چیت پێ وت و چی وەڵام دایتەوە؟

وتی: بەرم لەسینەییمدا و لەپشتیەوە هاتەدەر، وتم: ئەی دوژمنی خوا، بڕۆ بۆ جەهەننەم.

وتی: دەبینیت کێ دەچێتە جەهەننەم.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ بوو.

باوکی جوناب دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: ئەو شیاوی جەهەننەمە.

دەڵێت: عایز کوڕی حەملەی تەمیمی هات و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کەلابم کوشت.

وتی: کارێکی باشت کرد، تۆ لەسەر راستیت و ئەو لەسەر ناڕاستی.

دەڵێت: هانی کوڕی خەتابی ئەرحەبی و زەیاد کوڕی خەسفە هاتن و سەبارەت بەکوشتنی عەبدوالله کوڕی وەهبی راسبی گفتۆگۆیان دەکرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: چیتان کرد؟

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، کاتێك ئەومان بینی و ناسیمانەوە، پێشدەستیمان کرد و بەرم، کوشتمان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: جیاوازی لەنێوان ئێوەدا دروست نەبێت،

هەردووکتان ئەوتان کوشتووە.

دەڵێت: جەیش کوڕی رەبیعە، باوکی موعتەمەری کەتانی، هێرشی کردە سەر حێرقوس کوڕی زوهەیر و کوشتی. عەبدواللـە کوڕی زەحری خەولانی هێرشی کردە سەر عەبدوالله کوڕی شەجەرەی سولەمی و کوشتی. ئورەیح کوڕی باوکی ئەوفی لەبن دیوارێك سەنگەری گرتبوو، لەکەلێنی دیوارەکەوە بۆ ماوەیەك لەرۆژ جەنگا و سێ کەس لەخەڵکانی هەمەدانی کوشت. هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((کیژی عەبەسی

کە بەناز و نیعەمەت

ژیان بەسەر دەبات

دەزانێت ئەمشەو بەرگری لەکەلێنەکەم دەکەم))

قەیس کوڕی معاویەی دەهەنی هێرشی کردەسەر و لەپێی خست. ئەو، لەجەنگ بەردەوام بوو و دەیوت:

((پیاو لەپاشماوەی خۆی بەرگری دەکات))

جارێکی دیکە قەیس کوڕی معاویە هێرشی کردەسەر و خوێنی ڕۆشت و هۆنراوەیەك بەم ناوەرۆکە کەوتە سەرزاران:

((هەمەدانییەکان رۆژێك لەگەڵ کەسێك جەنگان

لەبەرەبەیانەوە تا ئێواریێ سەرقاڵ بوون

وخواوەند ئەو پیاوەی بۆ هەمەدانییەکان لەناو برد!))

شورەیح هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((شمشێر دەوشێنم و ئەگەر باوکی حەسەن ببینم

بەشمشێر لێی دەدەم تا لەجووڵە بکەوێت))

عەبدولمەلیك کوڕی باوکی حوڕە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەدوای ((مەمکدار، ذوالثدیە) ڕۆشتەدەر. سلێمان کوڕی سەمامەی حەنەفی و ریان کوڕی سەبرە هاورێیەتیان دەکرد. ریان ئەو کەسەی لەکەنار رووبارەکە لەناو چاڵێك لەنێوان چل یا پەنجا کوژراو دۆزییەوە.

دەڵێت: کاتێك هێنایانەدەر، سەیری بازووی کرد، لەتە گۆشتێك بەسەر شانییەوە بوو هاوشێوەی مەمك کەگۆی هەبوو، چەند تاڵێك مووی ڕەشی پێوە بوو و کاتێك رایان دەکێشا، بەئەندازەی دەستەکەی دیکە درێژ دەبوو و کاتێك بەریان دەدا، بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕایەوە و دەبووە هاوشێوەی مەمك.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: الله اکبر، درۆم نەکرد و درۆیان لەگەڵ نەکردم، سوێند بەخوا ئەگەر ترسی ئەوە نەبێت لەکردەوە چاکەکان دوور بکەونەوە، پێم دەوتن خواوەند لەسەر زمانی پێغەمبەر (د.خ) بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەمانە دەجەنگن، چ پاداشتێکی دیاری کردووە.

دەڵێت: بەناو کوژراوەکاندا گەڕا و وتی: ئەی بەدبەختینە، ئەو کەسەی فریوویدان، زیانی پێگەیاندن.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، کێ فریووی دان؟

وتی: شەیتان و نەفسی خراپەخواز، بەئارەزووەکان فریوویدان و ناشیرینییەکانی بۆ جوان کردن و بەڵێنی سەرکەوتنی پێدان.

دەڵێت: ئەوانەی هێشتا گیانیان بەبەرمابوو، کۆیان کردنەوە. نزیکەی چوارسەد کەس دەبوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمانیدا و ئەوانیان بۆ خێڵەکانیان گەڕاندەوە، وتی: بیانبەن و چارەسەریان بکەن، کاتێك باش بوونەوە، بیانهێنن بۆ کوفە و ئەوەی لەئوردووگاکانی ئەواندایە، تالآنی بکەن.

دەڵێت: سیلاح و چوارپێ و کەرەستەکانی لەناو موسوڵماناندا دابەش کرد. کەرەستەکانی دیکە و کەنیز و کۆیلەکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.

دەڵێت: عودەی کوڕی حاتەم بەدوای تورفە، کوڕەکەی خۆیدا دەگەڕا و دۆزییەوە و بەخاکی سپارد و وتی: هەرچەندە جێگەی تۆ خاڵییە، بەڵام سپاس بۆ خوا منی گرفتاری مەرگی تۆ کرد. کەسانی دیکە سەرقاڵی بەخاك سپاردنی کوژراوەکان بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك ئاگادار بوویەوە، وتی: بەرێکەون، دەیانکوژن و دواتر بەخاکیان دەسپێرن؟ خەڵکان بەرێکەوتن.

موحەل کوڕی خەلیفە دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی سەدووس بەناوی عیزار کوڕی ئەخنەس کەشوێنکەوتەی خەواریج بوو، بۆ لای ئەوان بەرێکەوت و لەنزیك

مەداین عودەی کوڕی حاتەمی بینی کەئەسوەد کوڕی قەیس و ئەسوەد کوڕی یەزید، هەردووکیان مورادی، هاوڕێیەتیان دەکرد. عیزار کاتێك عودەی بینی، وتی: تەندروست و لەگەڵ تالانییەکان گەڕایتەوە یا ستەمکار و گوناحبار؟

دوو پیاوی مورادی پێیان وت: بۆیە ئەم قسەیەت هێنایە سەرزمان، چوونکە خراپەت لەدڵدایە، ئەی عیزار تۆ دەناسین و دەزانین شوێنکەوتەی خەواریجی، لەگەڵمان بە تا بتبەینە لای سەروەری باوەڕداران و لەمەبەست و کارەکانی تۆ ئاگاداری بکەینەوە.

دەڵێت: زۆری نەخایاند عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەرکەوت و لەمەبەست و بەسەرهاتی عیزار ئاگاداریان کردەوە، وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، شوێنکەوتەی خەواریجە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خوێنی حەڵاڵ نییە، بەڵام زیندانی دەکەین.

عودەی کوڕی حاتەم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ئەو بەمن بسپێرە و دڵنیابە لەلایەن ئەوەوە هیچ شتێکی ناسازگار نابینیت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی بەعودەی سپارد.

عەبدولرەحمان کوڕی جوندەب دەڵێت: لەهاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب تەنیا حەوت کەس کوژرا.

باوکی دوردا دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەنگی خەواریج تەواو بوو، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، سپاسی کرد و وتی: خوا چاکەی لەگەڵ کردن و سەرکەوتنی پێ بەخشین، بێ درەنگ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمن بەرێکەون.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، تیرەکانمان تەواو بووە و شمشێرەکانمان کولە، سەری ڕمەکان شکاوە، بۆ شارەکەمان بگەڕێرەوە تا جارێکی دیکە خۆمان ئامادە و تەیار بکەین، ئەگەری هەیە بتوانیت شوێنی کەسە کوژراوەکانی ئێمە پڕ بکەیتەوە و بەوشێوەیە بەئاسانی دەتوانین ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە. ئەشعەس کوڕی قەیس بێژەری ئەم قسەیە بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت تا گەیشتە نوخەیلە، فەرمانی بەخەڵکاندا

لەئۆردووگاکان بمێننەوە و بۆ جیهاد خۆیان ئامادە بکەن، کەمتر بچنە لای ژن و منداڵەکانی خۆیان و بۆ رووبەرووبوونەوەی دوژمن بەرێکەون.

دەڵێت: خەڵکان بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەئۆردووگا مانەوە، دواتر بەنهێنی رۆشتنە ناو شارەکە. جگە لەسەرکردەکانی خەڵك، ئۆردووگا کەسی تیا نەما و کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمەی بینی، رۆشتە ناو کوفە و بۆچوون و مەبەستی ئەو بۆ رووبەرووبوونەوە لەگەڵ دوژمن، شکستی هێنا.

زەید کوڕی وەهب دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی لەگەڵ خەڵکان کرد. ئەمە یەکەم جار بوو دوای جەنگی نەهرەوان قسەی بۆ دەکردن. وتی:

((ئەی خەڵکینە، بۆ رووبەرووبوونەوە لەگەڵ دوژمنێك کەجەنگ لەگەڵ ئەوان هۆکاری نزیك بوونەوەیە لەخواوەند، ئامادەبن. ئەو کەسانەی لەرێگەی راست لایانداوە و لەکتێب و دین دوورکەوتوونەتەوە و کوێرانە لەگومڕاییدا رێگە دەبڕن و لەگێژاوی نەزانیدا، مەلە دەکەن، تا ئەو جێگەی دەتوانن، هێز و ئەسپ و شمشێر دژی ئەوان کۆبکەنەوە، پشت بەخوا ببەستن چوونکە باشترینە و تەنیا هاوکاری و هاریکار.

دەڵێت: بەڵام نەبەرێکەوتن نەخۆیان ئامادە کرد. چەند رۆژێك ئەوانی پشتگوێ خست و کاتێك لەبەرێکەوتنی ئەوان هیوابڕاو بوو، سەرکردە و گەورەکانی خەڵکی بانگ کرد و پرسی: چ بۆچوونێکیان هەیە و هۆکاری چاوەڕوان بوونی ئەوان چییە؟

دەستەیەك خۆیان دوادەخست، دەستەیەك نارازی بوون و ئەو کەسانەی ئامادە بوون، ژمارەیان کەم بوو. لەناویان وتارێکی خوێندەوە، وتی:

((ئەی بەندەکانی خوا، هۆکارەکەی چییە، کاتێك پێتان دەڵێم بەرێکەون، بەزەوییەوە دەلکێن، مەگەر لەجیاتی ئەو دنیا، دڵتان بەم دنیا خۆش کردووە و لەجیاتی رێز و گەورەیی، ریسواییتان هەڵبژاردووە، بۆکاتێك پێشنیاری جیهادتان پێدەکەم، چاوەکانتان زەق دەبێت؟ دەڵێی لەسەرەمەرگدان! دەڵێی دڵتان پەرێشانە و تێناگەن، چاوەکانتان بەستراوە و نابینن! لەکاتی حەسانەوە شێری دارستانن بەڵام کاتی جەنگ، رێوی هەڵاتوون، ئێوە بڕواپێکراوی من نین،

خـۆش رابـوێرانی شـەون، نەسـوارکارانن بـۆ هێـرش کـردن سـوودتان هـەبێت، نەبوێران ببنە پشت و پەناگە، جەنگاوەرانێکی ترسەنۆکن، فێڵتان لێدەکەن، بەڵام فێڵ ناکەن، لەسەرزەمینەکەتان دادەبڕن و دەستدرێژی ناکەن، کەسان لـەئێوە بـێ ئاگا نین بـەڵام ئێوە بـێ ئاگـان، جـەنگاوەر، بیرمەنـدە و دڵ زینـدوو، هەرکـەس بـێ جووڵە بێت، لەریسوایی نزیك دەبێتـەوە، ئەوانـەی بیـانوو دەهێننـەوە، دەبـەزێن و کەسی بەزاو، پێشێل دەکرێت و دەدۆڕێت.

دواتر وتی: من مافێکم لای ئێوەیـە و ئێـوەیش مافێکتـان لای مـن هەیـە، مـاق ئێوە لەسـەر مـن چاکەخوازییە تـا ئـەو کاتـەی لەگـەڵ ئێـوەدا بم و دابـەش کردنـی تالانییەکان و فێرکردنتان بۆ ئەوەی لەنەزانیـدا نەمێننـەوە و پـەروەردە کردنتـان، ماق من لەسـەر ئێـوە ئەوەیـە رێـز لەبەیعەتەکـەتان بگـرن و بـەبوون و نـەبوونی مـن چاکەخوازی من بـن، کاتێك بـۆ مەبەستێك بانگێشتتان دەکـەم رازی ببن و کاتێك فـەرمان دەدەم، گوێرایـەڵ بـن. لـەوەی پەسـەندی ناکـەم خۆتـان بـەدوور بگـرن و لـەوەی پەسـەندی دەکـەم، نزیـك ببنـەوە تـا بەمەبەسـتەکانی خۆتـان بگـەن و ئارەزووەکانتان بێتەدی.

بـەپێی گێڕانەوەیـەکی دیکـە، جـەنگی نێـوان عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب و خەواریج لەساڵی سی و هەشتەم روویدا. بێژەری ئەو گێڕانەوەیە باوکی مریەمـە کـەدەڵێت: شـێبس کوڕی رێبعـی و کوڕی کـەوا لەکوفـەوە روویـان کـردە حـەرورا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمانی بەخەڵکاندا سیلاح بەدەست بێنن، روویان کردە مزگـەوت بمەشـێوەیە مزگەوتەکـە پـڕ بـوو، کەسـی بـۆ لای ئـەوان نـارد و وتـی: کارێکی خراپتان کرد بەسیلاحەوە ڕۆشتنە ناو مزگەوت، بڕۆنە گۆڕستانی موراد تا فەرمانەکانی من بگات.

دەڵێت: ڕۆشتینە گۆڕستان و ماوەیەك لەرۆژ لـەوێ ماینـەوە. دواتـر بیستمان ئەوان گەڕاونەتەوە و هێرشیان هێناوە.

دەڵێت: بەخۆم وت بابڕۆم و سەیریان بکـەم. ڕۆشـتمە نـاو ریزەکانیـان و خـۆم گەیاندە لای شێبس کوڕی رێبعی و کوڕی کەوا، سوار ئەسپەکانی خۆیـان بوون. نێردراوەکـانی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب لای ئـەوان بـوون و سـوێندیان دەدان بۆ

ئەوەی بگەڕێنەوە. دەیانوت: لەترسی ئاژاوەی ساڵی داهاتوو، ئەمساڵ ئاژاوە مەنێنەوە. دواتر یەکێك لەوان هێرشی کردەسەر چوارپێی نێردراوەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەپێی خست. خاوەنی ئەسپەکە دابەزی و زینی ئەسپەکەی هەڵگرت و بەدەم وتنەوەی انا لله ئەوانی بەجێهێشت و گەڕایەوە.

دەڵێت: خەواریج دەیانوت:جگە لەجیابوونەوە لەوان خوازیاری هیچی دیکە نین و نێردراوەکان سوێندیان دەدان. ماوەیەك چاوەڕوان بووین، دواتر خەواریج گەڕانەوە بۆ ناو کوفە. وەك بڵێی ڕۆژی جەژنی قوربان یا ڕەمەزان بوو.

دەڵێت: پێشتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی بۆ کردبووین کەدەستەیەك لەئیسلام دەڕۆنەدەر بەهەمان شێوە کەتیر لەکەوان دەڕواتەدەر. نیشانەکەیان ئەوەیە یەکێك لەوان لەدەستەوە کەم ئەندامە.

دەڵێت: نافیع کەدەستی تەواو نەبوو، قسەکەی ئەوی بیست. بینیم خواردنەکەی بەناڕاحەتی دەخوات لەبەر بیستنی ئەو قسەیە.

دەڵێت: نافیع لەگەڵ ئێمە بوو، ڕۆژانە لەمزگەوت نوێژی دەخوێند و شەوانە لەوێ دەخەوت. کڵاوێکم پێدا بوو، ڕۆژی دواتر بینیم و پرسیم ئایا لەگەڵ ئەو کەسانە بووە کەڕوویان کردۆتە حەرورا.

وتی: ڕۆشتم و دەمویست پەیوەستی ئەوان ببم. کاتێك گەیشتمە گەڕەکی مناڵەکانی سەعد، چەندین مناڵ ڕووبەڕووم بوونەوە، سیلاحەکەیان لێ سەندم و گاڵتەیان پێکردم. دوای ساڵێك کەمتر خەواریج لەنەهرەوان کۆبوونەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕووبەڕوویان بوویەوە. من لەگەڵ ئەوان نەڕۆشتم بەڵام عەبدوڵڵەی برام لەناو ئەواندا بوو.

دەڵێت: باوکی عەبدوڵڵە پێی وتم: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەواریج بەڕێکەوت و کاتێك لەکەنارەکانی ڕووباری نەهرەوان ڕووبەڕوویان بوویەوە، کەسی نارد و سوێندیدان بگەڕێنەوە. نێردراوەکانی بەردەوام هاتوچۆیان دەکرد و سەرئەنجام نێردراوەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان کوشت. کاتێك ئەمەی بینی، لەگەڵ ئەوان جەنگی و شکستی پێهێنان. دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت: بەدوای کەم ئەندامەکەدا بگەڕێن. گەڕان و یەکیان

وتی: نەماندۆزییەوە.

کەسێکی دیکە وتی: لەناو ئەواندا نەبووە.

دەڵێت: کەسێك هات و مژدەی هێنا، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەومان لەجۆگەیەك لەژێر دوو کوژراوەدا دۆزییەوە،

وتی: دەستە ناتەواوەکەی ببڕن و بیهێنن بۆ من.

کاتێك هێنایان، دەستەکەی بەرز کردەوە و وتی: سوێند بەخوا درۆیان لەگەڵ نەکردووم و درۆم لەگەڵ نەکردن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: باوکی مریەم بەم وتەیە کەدەڵێت: گەڕامەوە و دوای یەك ساڵ یا کەمتر، ئاگادارمان دەکاتەوە کەجەنگی نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەوراریج روویدا، دوای ئەوە بوو کەحەرورییەکان سەبارەت بەداوەری کردن رەخنەیان لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گرت. وەك پێشتر دەرکەوت سەرەتایی ناڕەزایەتی لەساڵی سی و حەوتەمەوە دەستیپێکرد و ئەگەر گێڕانەوەی باوکی مریەم راست بێت، ئاشکرایە جەنگی نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەواریج لە ساڵی سی و هەشتم روویداوە.

شەعبی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوای گەڕانەوە لەسەفین جەعدە کوڕی هوبەیرەی مەخزومی کەدایکی، دایکی هانی کچی ئەبوتالیب بوو، بۆ خوراسان نارد و تا ئەبەر شەهر رۆشت کەخەڵکەکەی ناباوەڕ ببوون و لەپشت دیواری شارەکەوە سەنگەریان گرتبوو. جەعدە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە و ئەو، خولەید کوڕی قورەی یەربوعی ڕەوانە کرد کەگەمارۆی خستە سەر خەڵکانی نەیشابوور و دواتر رێگەی ئاشتییان گرتەبەر. هەروەها پەیمانی ئاشتی لەگەڵ خەڵکانی مەرو، واژۆ کرد.

لەم ساڵەدا، یانی ساڵی سی و حەوتەم، عوبەیدالله کوڕی عەباس کارگوزاری یەمەن و ویلایەتەکانی بەنوێنەرایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سەرپەرەستی حەج و حاجییەکانی گرتە ئەستۆ. کارگوزاری مەککە و تاییف، قێسەم کوڕی عەباس بوو.

کارگوزاری مەدینە، سەهل کوڕی حەنیفی ئەنساری وبەوتەیەك تەمام کوڕی

عەباس بوو.

کارگوزاری بەسرە، عەبدوللە کوڕی عەباس و سەرپەرەستی دامەزراوەی داد، لەئەستۆی باوکی ئەسوەدی دوئەلیدا بوو.

کارگوزاری میسر، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بوو.

کارگوزاری خوراسان، خولەید کوڕی قورەی یەربوعی بوو.

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب رووی کردە سەفین، باوکی مەسعودی ئەنساری وەك جێگری خۆی لەکوفە دانا. عەبدولعەزیز کوڕی رەفیع لەگێڕانەوەکەی خۆی ئاماژەی بەم بابەتە داوە.

شام لەژێر دەستی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بوو.

ساڵی سی و هەشت دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سی و هەشتەم

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەمیسر بوو. ئەو، کارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەو سەرزەمینە بوو. ئاماژەمان پێدا بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی کردە کارگوزاری ئەو ناوچەیە و قەیس کوڕی سەعدی لەسەر کار لابرد. هەنووکە ئاماژە بەهۆکاری کوژران و شوێنی کوژران و بەسەرهاتەکەی دەکەین.

زوهری دەڵێت: کاتێك قەیس کوڕی سەعد لەهاتنی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئاگادار بوویەوە و زانی وەك فەرمانڕەوا دێت، بەتەنیا لەگەڵی دانیشت و دوور لەگوێی خەڵکان پێی وت: لەلایەن کەسێکەوە هاتوویت بۆچوونەکەی پەسەند نییە، ئەوەی منتان لەسەر کار لابردووە، ڕێگر نابێت لەئامۆژگاری کردنی ئێوە چوونکە لەم کارەدا شارەزام و ئاگادار. بۆچوونی من ئەوەیە کەفێڵم لەگەڵ معاویە و عەمرۆ و خەڵکانی خەرەبتا بەکار دەبرد، تۆیش ئەو کارە بکە چوونکە جیاواز لەوە دەکوژرێیت.

دەڵێت: قەیس فێڵەکەی خۆی بۆ باس کرد بەڵام محەممەد کوڕی ئەبی بەکر، ئەو کارەی نەکرد و پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەوی بەکار برد. کاتێك محەممەد هات و قەیس بۆ مەدینە گەڕایەوە، محەممەد موزەرییەکانی بۆ هێرش کردنە سەر خەڵکانی خەرەبتا ڕەوانە کرد. جەنگان و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر شکستی خوارد.

معاویە و عەمرۆ ئاگادار بوونەوە و لەگەڵ خەڵکانی شام بەڕێکەوتن و دەستیان بەسەر میسردا گرت و محەممەد کوڕی ئەبی بەکریان کوشت. شام بەهەمان شێوە لەژێر دەسەڵاتی معاویەدا مایەوە تا ئەو کاتەی کاروبارەکانی بەتەواوەتی گرتەدەست.

دەڵێت: کاتێك قەیس کوڕی سەعد بۆ مەدینە گەڕایەوە، مەروان و ئەسوەد کوڕی باوکی بەختەری ئەویان ئاگادار کردەوە بەشێوەیەك لەگرتن و کوشتنی خۆی ترسا. سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

دوای ئەوە معاویە نامەی بۆ مەروان و ئەسوەد نووسی و سەرکۆنەی کرد کەبۆ قەیس کوڕی سەعد وبۆچوونەکانی ئەوتان بۆ هاوکاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناردووە. سوێند بەخوا ئەگەر سەد هەزار پیاوی شەڕکەرتان بۆ هاوکاری ئەو دەنارد بەمشێوەیە نیگەران نەدەبووم کەقەیستان بۆ لای ئەو نارد.

دەڵێت: قەیس ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کاتێك بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و هەواڵی کوژرانی محەممەدی پێگەیشت، زانی قەیس کارەگەورە و دژوارەکانی بەدوورئەندێشی چارەسەر کردووە و ئەوانەی بۆ لابردنی قەیس هانیانداوە، چاکەخوازی نەبوون.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر ئاماژەمان بەڕۆشتنی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بۆ میسردا. هەنووکە درێژەی بەسەرهاتەکەی ئەو لەگێڕانەوەی یەزید کوڕی زەبیانی هەمەدانی دەگێڕینەوە.

دەڵێت: کاتێك خەڵکانی خەرەبتا کوڕی موزاهیمی کەلبییان کوشت کەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانەی کردبوو، معاویە کوڕی حودەیجی کێندی سەکونی هەستاو بانگەوازی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفانی بەرز کردەوە و خەڵکان وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە. بەمشێوەیە کاروباری میسر شێوا. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە کەخەڵکی میسر دژی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئالای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە، وتی: میسر پێویستی بەیەکێك لەم دوو پیاوە هەیە: هاورێکەمان کە لەسەر کار لامانبرد، یانی قەیس کوڕی سەعد یا مالك کوڕی حارس، یانی ئەشتەر.

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەفین گەڕایەوە، ئەشتەری بۆ جەزیرە گەڕاندەوە چوونکە پێشتر کارگوزاری ئەو ناوچە بوو. بەقەیس کوڕی سەعدی وت: لەگەڵم بمێنەرەوە و سەرەپەرەستی پاسەوانەکان بگرە ئەستۆ تا ئەو کاتەی لەداوەری رزگارمان دەبێت، ئەوسا بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوە. قەیس کوڕی سەعد لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب مایەوە و سەرپەرەستی پاسەوانەکانی ئەوی گرتەدەست و کاتێك داوەری کۆتایی هات، عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ مالکی ئەشتەر نووسی کە لەنەسیبین بوو: تۆ یەکێکی لەو

کەسانەی بۆ سەقامگیر کردنی ئەم دینە پشتی پێ دەبەستم و بەهاوکاری ئەوان خراپەکاران سەرکوت دەکەم و سنووره مەترسیدارەکان دەپارێزم. محەممەد کوڕی ئەبی بەکرم وەك کارگوزاری میسر دیاری کردبوو. دەستەیەك لەخەواریج دژی ئەو راپەڕین. ئەو گەنجێکی تازەکار و ئەزمونی جەنگی نەبوو، بۆ لای من وەره تا لێکۆڵینەوە لەم بارودۆخە بکەین. یەکێك لەکەسە باوەڕپێکراوەکانی خۆت لەجێگەی خۆت دانێ و بەرێکەوە. والسلام.

دەڵێت: مالك هاتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەسەرهاتی خەڵکانی میسری بۆ باس کرد، وتی: کەس جگە لەتۆ پیاوی ئەم کارە نییە. خوا بتبەخشێت، بەرێکەوە چوونکە ئەگەر فەرمان نەدەم تەنیا بەبۆچوونی خۆت بەسەندە دەکەم. بۆ چارەسەر کردنی کارەکانی خۆت پشت بەخوا ببەستە، لەو شوێنەی دەبێت نەرمی بنوێنیت، نەرمی بنوێنە و کاتێك تەنیا بەتوند و تیژی کارەکان چارەسەر دەکرێت، ڕێگەی توند و تیژی بگرەبەر.

دەڵێت: ئەشتەر ڕۆشت و بۆ بەرێکەوتن بەرەو میسر خۆی ئامادە کرد. سیخورەکانی معاویە ئاگاداریان کردەوە کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری بۆ میسر ڕەوانە کردووە. معاویە گرنگی بەم کارەدا چوونکە چاوی تەماحی لەمیسر بڕیبوو. دەیزانی ئەگەر ئەشتەر بگاتە میسر، بۆ دژایەتی کردنی ئەو لەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر بەتواناترە.

دەڵێت: معاویە کەسی بۆ لای جایستار نارد. ئەو یەکێك لەخەراج وەرگران بوو، وتی: ئەشتەر بوو بەکارگوزاری میسر، ئەگەر ئەو لەناو ببەیت، تا ئەو کاتەی بمێنیت و بمێنم، باج لەتۆ وەرناگرم. ئەوەی دەتوانی بیکە. جایستار بەرەو قەلزەم بەرێکەوت و لەوێ مایەوە. ئەشتەر لەعێراقەوە بەرەو میسر بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە قەلزەم، جایستار بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشت، وتی: ئەوە مەنزڵ، ئەوە ئاڵف، من یەکێك لەخەراج وەرگرەکانم. ئەشتەر لەوێ دابەزی. ئاڵفی بۆ چوارپێکان و خواردنی بۆ خۆی ئامادە کرد. کاتێك لەخواردن تەواو بوو، شەربەتی هەنگوینی بۆ هێنا، پێشتر ژەهراوی کردبوو، ئەشتەر خواردی و مرد. معاویە بەخەڵکانی شامی وتبوو: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری بۆ

میسر ناردووە، لەخوا بپارێنەوە بۆ ئەوەی لەناوی ببات. خەڵکانی شام ڕۆژانە ئەشتەریان نفرین دەکرد.

دەڵێت: ئەو کەسەی ئەشتەری ژەهرخوارد کرد، ڕۆشتە لای معاویە و لەمەرگی ئەو ئاگاداری کردەوە. معاویە قسەی بۆ خەڵکان کرد، ناوی خوای هێنایە سەرزمان و وتی:

((بەلام دواتر، عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوو دەستی بوو، یەکیان لەجەنگی سەفین بڕایەوە، یانی عەمار کوڕی یاسر، هەنووکە دەستەکەی دیکەیشی لەدەستدا، یانی ئەشتەر.))

فوزەیل کوڕی حودەیج لەیەکێك لەکۆیلەکانی ئەشتەر دەگێڕێتەوە: کاتێك ئەشتەر مرد، نامەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبمان لەناو باروبنەی ئەودا دۆزییەوە، ناوەرۆکی نامەکە بەمشێوە بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سەروەری باوەڕداران بۆ ئەو دەستە لەو موسوڵمانانەی کاتێك نافەرمانی خواوەند لەزەویدا بلاو بوویەوە و ستەم باڵی بەسەر چاکەکار و خراپەکاردا کێشا و هیچ ڕاستییەك نەما پەنای بۆ ببەن، بۆ ڕەزامەندی خواوەند ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە.

سلاو لەئێوە، سپاسی خواوەند دەکەم چوونکە جگە لەو خوایەك بوونی نییە.

بەلام دواتر: یەکێك لەبەندەکانی خوام بۆ لای ئێوە نارد کە لەکاتی ترس ناخەوێت و لەترسی کارەسات و پێشهاتەکان لەدوژمن ڕاناکات و بۆ کافرەکان لەبلێسەی ئاگر مەترسیدارترە یانی مالك کوڕی حارسی مەدحەجی، گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی بن چوونکە یەکێکە لەشمشێرەکانی خواوەند و شمشێرەکەی هیچ کات هەڵە ناکات و کول نابێت. ئەگەر فەرمانی پێشڕەوی پێدان، پێشڕەوی بکەن و ئەگەر فەرمانی گەڕانەوەی پێدان، بگەڕێنەوە چوونکە ئەوتەنیا بەفەرمانی پێشڕەوی وپاشەکشێ دەکات. من ئەوم بۆ لای ئێوە نارد لەکاتێدا بوونی ئەو لای خۆم بەپێویست دەزانی. چاکەخوازی ئێوەیە و لەگەڵ

دوژمنان سەختگیرە. هیوادارم خواوەند ڕێگەی ڕاستتان نیشان بدات. والسلام.))

دەڵێت: کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئاگادار بوویەوە کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەشتەری ڕەوانە کردووە، ڕەنجا. کاتێك ئەشتەر کوژرا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەڕەنجانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئاگادار بوویەوە، نامەیەکی بۆ نووسی بەمشێوەیە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا، عەلی، سەروەری باوەڕداران بۆ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر.

سلاو لەتۆ، بیستوومە لەوەی ئەشتەرم لەجیاتی تۆ نارد، ڕەنجاویت، ئەم کارەم بۆ ئەوە نەکرد کەبۆ جهاد لەڕێگەی خواوەند، کەسێکی کەمتەرخەم بوویت یا هەوڵی پێویستت نەداوە. ئەگەر فەرمانڕەوایەتی میسرم لەتۆ سەندەوە، فەرمانڕەوایەتی ویلایەتەکانی دیکەم پێ دەسپاردی کەڕاپەراندنی کاروبارەکانی ئاسانتر بێت و بۆ تۆ شیاوتر.

ئەو پیاوەی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشانم کرد چاکەخوازی ئێمە بوو و لەگەڵ نەیارانمان سەختگیر، ڕۆژگاری کۆتایی پێهات و مەرگ یەخەی گرت. ئێمە لەو ڕازی بووین هیوادارین خواوەند لێی ڕازی بێت و پاداشتی بداتەوە و جێگەی بەهەشت بێت. لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگری بکە و بۆ جەنگ ئامادە بە. بەردەوام خەڵکان بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، هانبدە، بەردەوام ناوی خواوەند وێردی سەرزمانت بێت و داوای هاوکاری لەو بکە و پشتی پێ ببەستە تا هاوکاریت بکات. هیوادارم خواوەند بۆ بەدی هێنانی مەبەستەکانمان هاوکاری من و تۆ بکات. سلاو لەتۆ، والسلام.))

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بەمشێوەیە وەلامی نامەکەی دایەوە:

بۆ بەندەی خوا، عەلی، سەروەری باوەڕداران، لەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر.

سلاو لەتۆ، سپاسی خواوەند دەکەم چوونکە جگە لەو خوایەك بوونی نییە.

بەلام داوتر، نامەی سەروەری باوەڕداران بەدەستم گەیشت، تێگەیشتم و ناوەرۆکەکەیم خوێندەوە. کەس وەك من بەبۆچوونی سەروەری باوەڕداران ڕازی نییە و دژی دوژمنەکانی هەوڵ نادات و لەگەڵ هاورێکانی ئەو، هاورێیەتی

ناکات. بەرێکەوتووم و دوو ڕۆژە ئوردووم لێداوە و ئەمانم بەخەڵکان بەخشیوە جگە لەوانەی بۆ جەنگی ئێمە دێن یا دژایەتیمان دەکەن. من شوێنکەوتە و گوێرایەڵی فەرمانەکانی سەروەری باوەڕدارانم. پەنای بۆ دەبەم و پشتی پێ دەبەستم. بەهەرحاڵ دەبێت داوای هاوکاری لەخواوەند بکەین. سلاٌو لەتۆ.))

عەبدوالله کوڕی خەوالەی ئەزدی دەڵێت: کاتێک خەڵکانی شام سەفینیان بەجێهێشت، چاوەڕێی کاری داوەرەکانیان دەکرد. کاتێک داوەرەکان ڕۆشتن خەڵکانی شام لەگەڵ معاویە بەیعەتیان کردو بەمشێوەیە هێزی ئەو زیادی کرد بەلاٌم خەڵکانی عێراق دژایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان کرد. تەنیا نیگەرانی معاویە، میسر بوو.

دەڵێت: خەڵکانی میسر لەمعاویە دەترسان چوونکە لەوانەوە نزیک بوو. ئەوان بەشێوەیەکی توند مامڵەیان لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان کردبوو. معاویە دەیزانی لەمیسر دەستەیەك لەخەڵکان لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان نیگەران و ڕەنجاون و دژایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکەن. هیوادار بوو ئەگەر بەسەر میسردا زاڵ ببێت، لەجەنگ دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرکەوتن بەدەست بێنێت، چوونکە ئەو خەراجەی لەمیسر کۆدەکرایەوە، فراوان بوو.

دەڵێت: معاویە قورەیشییەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، عەمرۆ کوڕی عاس، حەبیب کوڕی موسلیمە و بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات، زوحاك کوڕی قەیس، عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید و لەو کەسانەی قورەیشی نەبوون، باوکی ئەعوەر، عەمرۆ کوڕی سوفیانی سولەمی، حەمزە کوڕی مالکی هەمەدانی و شورەحبیل کوڕی سەمتی کێندی بانگ کرد و وتی: دەزانی بۆ ئێوەم کۆکردۆتەوە، بۆ کارێکی گرنگ، هیوادارم خواوەند هاوکاریمان بکات.

هەموویان یا دەستەیەکیان وتیان: خواوەند کەسی لەغەیب ئاگادار نەکردۆتەوە، نازانین مەبەستی تۆ چییە؟

عەمرۆ کوڕی عاس وتی: دەزانم، سوێند بەخوا کاروباری ئەو ویلایەتەی خەراج و دانیشتووان و کەرەستەی زۆر، تۆی نیگەران کردووە، ئێمەت کۆکردۆتەوە تا لەبۆچوونی ئێمە ئاگادار ببیتەوە. ئەگەر مەبەستەکەی تۆ ئەوەیە،

بڕیاربدە و بیخە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە چوونکە گرتنی ئەو ویلایەتە دەبێتە هۆی بەهێزی تۆ و شکستی دوژمنان و ریسوایی نەیاران.

معاویە لەوەلآمی ئەودا وتی: ئەی کوڕی عاس، مەبەستت خۆتە. بۆیە ئەم قسەی هێنایە سەرزمان چوونکە کاتێك عەمرۆ عاس بۆ جەنگ دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەیمانی لەگەڵ معاویە بەست، مەرجی تا دانابوو تا ئەو کاتەی زیندووە، میسر بۆ ئەو بێت.

معاویە رووی کردە هاوەڵانی خۆی و وتی: ئەم پیاوە، یانی عەمرۆ، گومانێکی کرد و گومانەکەی راستە.

وتیان: بەلآم ئێمە نازانین.

معاویە وتی: باوکی عەبدوالله راستی وت.

عەمرۆ وتی: بەباوکی عەبدوالله ناوم دەبەن.

معاویە وتی: باشترین گومان ئەوەیە هاوشێوەی راستی و دڵنیایی بێت.

معاویە سپاسی خواوەندی کرد، وتی: بینیتان خواوەند چە بەلآیەکی بەسەر دوژمندا هێنا، ئەوان هاتبوون و گومانیان دەکرد ڕەگ و ریشەی ئێوە دەردێنن بەلآم خواوەند پاشەکشێی پێکردن و لەمەبەستەکەیان دووری خستنەوە. ئێمە داوەریمان بۆ فەرموودەکانی خواوەند بەجێهێشت و لەبەرژەوەندی ئێمە و زیانی ئەوان کەوتەوە. دواتر دەستەکانی ئێمەی کۆکردەوە و ئاشتی لەناو ئێمەدا سەقامگیر کرد و بلآوەی بەدوژمنەکانمان کرد تا بۆکوفر و ناباوەڕی یەك شایەتی بدەن و خوێنی یەك برێژن. هیوادارم کاروباری موسوڵمانان بەتەواوی بکەوێتە دەستی ئێمە. بۆچوونم ئەوەیە مەبەستی ئێستامان خەڵکانی میسر بێت، بۆچوونی ئێوە چییە؟

عەمرۆ وتی: وەلآمی پرسیارەکەی تۆم دایەوە و لەبۆچوونی من ئاگاداریت.

معاویە وتی: عەمرۆ بۆچوونەکەمی پشتراست کردەوە بەلآم نەیوت دەبێت چی بکەین.

عەمرۆ وتی: هەنووکە دەڵێم دەبێت چی بکەین: بۆچوونی من ئەوەیە سوپایەکی گەورە بەفەرماندەیی پیاوێکی کارزان و لێهاتوو و دووربەندێش و

بڕواپێکراو ڕەوانــە بکــەیت تــا هێــرش بکاتــە ســەر میــسر و بڕواتــە نــاو ئــەو سەرزەمینە. ئەو کەسانەی لایـەنگری ئێمـەن، دژی ئـەو کەسـانەی نـەیاری ئێمـەن، هاوکاریمــان بکــەن و کاتێــك ســوپاکەی تــۆ لــەو ســەرزەمینە نزیــك دەبێتــەوە، ئــەوانیش بــۆ جــەنگ و هاوکــاری کردنــی ئێمــە ئامــادە بــن، هیــوادارم خواوەنــد هاوکاریمان بکات.

معاویە وتی: ئایا جگە لەمە شتێکی دیکە هەیە پێویست بکات لەنێوان ئێمە و ئەوان ئەنجام بدرێت.

عەمرۆ وتی: هیچ نازانم.

معاویــە وتــی: بــەلام مــن دەزانم. بۆچـوونی مـن ئەوەیـە نامـە بـۆ هاورێکانمـان لەمیسر بنووسین بەهـەمان شێوە بـۆ دوژمنـانیش. فـەرمان بـەهاورێکانمان بـدەین لەبۆچوون و مەبەسـتەکەی خۆیـان سوور بـن و بەهاوکاری کردنـی ئێمـە هیـوادار بن. پێشنیاری ئاشـتی بـەدوژمنانیش بکـەین و بـەرێزگرتنیان لەلایـەن خۆمانـەوە هیواداریان بکـەین و لەجـەنگ بیانترسێنین. ئەگـەر خـەڵکانی ئـەو سـەرزەمینە بـێ جـەنگ و خوێنڕشـتن ملکەچـی فەرمانـەکانی ئێمـە بـن، بەمەبەسـتەکەی خۆمـان گەیـشتووین و گەرنـە جیـاواز لەمـشێوەیە، بـۆ جـەنگی ئـەوان دەڕۆیـن. تـۆ ئـەی کوڕی عاس ئەو کەسـەیت لەپەلـە کـردن سوودت بینیـوە، بـەلام مـن بەپێچەوانەی تۆ، لەچاوەڕوان بوون.

عــەمرۆ وتــی: ئــەو ڕێگــەی گەڕانــەوە بــۆ لای خواوەنــدی نیــشانی داویــت، بیگرەبەر بەلام دڵنیام سەرئەنجامی کاری تۆ و ئەوان بەجەنگ کۆتایی دێت.

دەڵێت: لەم کاتەدا معاویـە بۆ موسـلیم کـوڕی موخەلیـدی ئەنـساری و معاویـە کوڕی حـودەیجی کێنـدی لەنـەیارەکانی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب نامـەی نووسـی بەم ناوەرۆکە:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەلام دواتر، خواوەند ئێوەی بۆ کارێکی گەورە دیاری کردووە و پاداشتێکی گەورە چاوەڕێتان دەکات، ناوی ئێوەی گەورە کردووە و لەناو موسوڵمانان ڕێز و پێگەی پێ بەخیشون چوونکە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان

ئـالأی شۆڕشـتـان بـەرز کردۆتـەوە، بـۆ ڕەزامەنـدی خواوەنـد هـەوڵ دەدەن لەبـەر ئـەوەی فـەرمان و فـەرموودەکانی خواوەنـد پـشتگوێ خـراوە و دژی ستەمکاران دەجەنگن. مزگێنیتان لـێ بێت بەهاوکاری خواوەند و هاوەڵـە نزیکەکانی خوا و هاوبەشـی لـەکاروباری دنیـا، لەسـنووری دەسـەلأتی ئێمـە کـەڵك وەربگـرن تـا ڕەزامەنـدی خواوەنـد بەدەسـت بێـنن و ئێمـەیش مـاف ئێـوە بـدەین و داهاتووتـان ئاشکرا ببێت. لەبەرابەر دوژمنانتان خۆڕاگر بن و پێشنیاری گەڕانـەوە بۆ ڕێگـەی ڕاسـت بەنـەیارەکانتان بکـەن. بـەم زووانـە هـەموو شـتە ناسـازگارەکانتان لـەناو دەچێت و بارودۆخ بەدڵخوازی خۆتان دەبێت. سلأوتان لێبێت.))

ئەم نامەی بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی سەبیع نارد. نێردراو ڕۆشت و لەمیسر چاوی بەوان کەوت لەکاتی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بۆ جەنگی ئـەوان ئوردووی لێـدابوو بـەلأم بـۆ دەسـتپێکردنی جەنگ سـستی لـەخۆی نیـشان دەدا. نامەی معاویەی تەسلیم مەسلمە کوڕی موخەلید کرد. هـەروەها نامەکـەی کوڕی حودەیجیشی بەو سپارد.

مەسلەمە وتی: نامەکەی معاویـە کوڕی حـودەیج بەدەسـتی خـۆی بگەیێنـە تـا بیخوێنێتەوە، دووبارە بیهێنە بۆ لای من تا لـەزمانی خـۆم و ئـەو وەلأمـی نامـەکان بدەمەوە.

دەڵێـت: نێـردراو نامەکـەی معاویـە کـوڕی حـودەیجی بـرد و فـەرمانی پێـدا بیخوێنێتـەوە. کاتێك خوێندییـەوە، وتـی: مەسـلمە کـوڕی موخەلیـد پێـی وتـووم کاتێك نامەکـەت خوێنـدەوە بیبەمـەوە بۆ لای ئـەو تـا بەنوێنەرایـەتی هـەردووکتان وەلأمی نامەکەی معاویە بداتەوە.

وتی: پێـی بڵـێ ئـەو کـارە بکـات. نامەکـەی بـۆ گەڕانـدەوە و نێـردراو جـارێکی دیکـە نامەکـەی بـۆ مەسـلەمە بـرد. ئـەو بەنوێنەرایـەتی خـۆی و معاویـە کـوڕی حودەیج بەمشێوەیە وەلأمی معاویەی دایەوە:

بەلأم دواتـر، ئـەم کـارەی گیـانی خۆمـان بـۆ دانـاوە و گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خواوەندین، کارێکە بەهۆیەوە چاوەڕوانی پاداشتی خواوەند و سەرکەوتن بەسەر نـەیارەکانمانین. یـانی ئـەو کەسـانەی دژی پێـشەوای ئێمـە ڕاپـەڕین و کوشـتیان.

ئێمە هەموو خەڵکە ستەمکارەکانمان لەسەرزەمینەکەمان دەرپەڕاندووە و دادپەروەران و چاکەکارانمان بۆ شۆڕش هانداوە. نووسیوەتە ئێمە لەدەسەڵاتەکانی خۆت دەکەیتە شەریك. ئێمە بۆ ئەو مەبەستە ئالآی شۆڕشمان بەرز نەکردۆتەوە. ئەگەر خواوەند مەبەستەکەی ئێمە بێنێتەدی و ئارەزووەکانمان بەراوەرد ببێت، دنیا و ئاخیرەت تایبەتە بەخواوەند چوونکە پەروەردگاری جیهانییانە و ئەم دنیا و ئەو دنیا بەدەستەیەك لەئافرێنزاوەکانی خۆی دەسپێرێت بەهەمان شێوە کە لەکتێبەکەی خۆیدا دەفەرمێت و بەڵێنەکانی ئەو دێتەدی. دەفەرمێت: خواوەند پاداشتی ئەم دنیا و ئەو دنیایان بداتەوە چوونکە خواوەند چاکەکارانی خۆش دەوێت.

سوار و پیادەکانی خۆت لەزووترین کات ڕەوانە بکە چوونکە دوژمن بۆ جەنگی ئێمە هاتووە و ژمارەی ئێمە بەبەراوەرد لەگەڵ ئەوان کەمە. بەڵام لەئێمە دەترسان و بەمشێوەیە لەئێستادا وەك ئەوانین. ئەگەر خواوەند هاوکارییەکانی بۆ بەئێمە بگەیێنێت، لەسەرکەوتنی خۆمان دڵنیایین. هیچ هێزێك بەبێ هێزی خواوەند بوونی نییە و خواوەند بۆ ئێمە بەسە.

سلاو لەتۆ بێت.))

دەڵێت: معاویە لەفلستین بوو. نامەکەی بەدەست گەیشت و کەسانی نزیکی لەخۆی کۆکردەوە و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: بۆچوونی راست ئەوەیە سوپایەك ڕەوانە بکەیت و هیوادارین بەهاوکاری خواوەند دەست بەسەر ئەو سەرەزەمینەدا بگریت.

معاویە وتی: ئەی باوکی عەبدوالله، یانی عەمرۆ کوڕی عاس، خۆت ئامادە بکە.

دەڵێت: عەمرۆعاسی لەگەڵ شەش هەزار کەس ڕەوانە کرد و بۆ ماڵئاوایی کردن لەو ڕۆشتەدەر. کاتی ماڵئاوایی پێی وت: ئەی عەمرۆ پێشنیاری چاکەکاری و خواپەرەستیت پێ دەکەم چوونکە هۆکاری ئارامییە. پێشنیارت پێدەکەم لەسەر خۆ بیت چوونکە پەلە کردن کاری شەیتانە. پێشنیار دەکەم لەگەڵ هاورێیان بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوت بکەیت و نەیارەکان

ببەخشیت ئەگەر بەدەسەلاتی ئێمە رازی بوون چ باشتر و گەرنە رێگەی توندوتیژی بگرە بەر و هێزی خۆت بنوێنە. پێشنیاری ئاشتی و سازان بەخەڵکان بکە و کاتێک سەرکەوتنت بەدەست هێنا، لەهەمووان زیاتر رێز لەهاوەڵانی خۆت بگرە و لەگەڵ هەمووان کەسێکی چاکەکار بە.

دەڵێت: عەمرۆ بەرێکەوت و گەیشتە سەرزەمینی میسر. شوێنکەوتەکانی عوسمان کوڕی عەفان لەدەوری کۆبوونەوە و لەگەڵ ئەوان مایەوە. نامەیەکی بۆ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر نووسی بەم ناوەرۆکە:

((بەلام دواتر، ئەی کوڕی ئەبوبەکر، گیانی خۆت دەرباز بکە چوونکە حەز بەکوشتنی تۆ ناکەم. خەڵکی ئەم سەرزەمینە بۆ نەیاری و دژایەتی کردنی تۆ رێککەوتوون و لەگوێرایەڵی و شوێنکەوتنی تۆ پەشیمان بوونەتەوە و لەکاتی مەترسی، تەسلیمت دەکەن. لەمیسر برۆ، دڵنیابە چاکەخوازی تۆم. والسلام.))

دەڵێت: عەمرۆ نامەی معاویە بۆ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر نارد بەم ناوەرۆکە:

((بەلام دواتر، ستەمگەری و یاخی بوون، دەرئەنجامی مەترسیداری هەیە، هەرکەس خوێنێکی ناڕەوا بڕێژێت، لەتۆڵەسەندنەوەی ئەم دنیا و دەرئەنجامە مەترسیدارەکانی پارێزراو نابێت. کەس ناناسین بۆ دژایەتی کردنی عوسمان کوڕی عەفان لەتۆ پێداگرتر و سەرسەختتر بووبێت، لەگەڵ نەیارەکانی بۆ لەناو بردنی ئەو هەوڵتدا، خوێنی ئەوتان ڕشت و گومان دەکەیت لەتۆ بێ ئاگام یا تۆم لەبیر کردووە و رێگە دەدەم فەرمانڕەوایەتی ولایەتێک بکەیت کەهاوسنوری من بێت و زۆربەی خەڵکەکەی هاورێی من و چاوەڕوانی فەرمان و وتارەکانی من بن و دژی تۆ داوای هاوکاریم لێ بکەن. سوپایەکم بۆ جەنگی تۆ ڕەوانە کردووە، ئەو کەسانەی رقی تۆیان لەدڵدایە و پەیمانیان بەستووە ئەندامەکانی جەستەت ببڕینەوە. تەنیا لەبەر ئەوە ئاگادارت بکەمەوە تا رێزم لەپەیوەندی خزمایەتی گرتبێت، حەز دەکەم بتکوژن چوونکە ستەمت کرد و رێزت لەپەیوەندی خزمایەتی نەگرت و هێرشت کردە سەر عوسمان کوڕی عەفان. بەلام من حەز بەبڕینەوە ئەندامەکانی پیاوێکی قورەیشی ناکەم، بەلام لەهەر کوێ بێت خواوەند

لەتۆڵە ناتپارێزێت. والسلام.))

دەڵێت: محەممەد هەردوو نامەکەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد و نامەیەکی نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بەڵام دواتر، کوڕی عاس بەسوپایەکی وێرانکەر و فراوان لەسەرزەمینی میسر دابەزیوە و زۆربەی خەڵکی ویلایەتەکان کەشوێنکەوتەی ئەوان بوون، لەدەوری کۆبوونەوە، ئەو کەسانەی لەگەڵ منن، سستی لەخۆیان نیشان دەدەن، ئەگەر پێویستت بەسەرزەمینی میسرە، بەسامان و پیاوە شەڕکەرەکان هاوکاریم بکە.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوەڵامدا نووسی:

((بەڵام دواتر، نامەکەی تۆ بەدەستی من گەیشت، وتووتە کوڕی عاس لەگەڵ سوپایەکی فراوان و وێرانکەر لەسەرزەمینی میسر دابەزیوە و شوێنکەوتەکانیان لەدەوری کۆبوونەتەوە، ئەوەی شوێنکەوتەکانی پەیوەستی ئەوان دەبن باشترە لەوەی لەناو سوپاکەی تۆدا بمێننەوە. دەڵێی ئەو کەسانەی لەگەڵ تۆدان سستی لەخۆیان نیشان دەدەن، تۆ سستی مەنوێنە، شوێنەکەی خۆت بەهێز و هاوەڵانت لەدەوری خۆت کۆبکەرەوە. کەنانە کوڕی بیشر کەکەسێکی چاکەخوازە و ناودارە، بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە بکە. منیش بەهەر شێوەیەك بێت شەڕکەران بۆ هاوکاری تۆ ڕەوانە دەکەم. لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگربە و پشت بەبۆچوونەکانی خۆت ببەستە و بوێرانە لەگەڵیان بجەنگە. بەبڕشت و نیەت پاك رووبەروویان بەرەوە هەرچەندە ژمارەی سوپاکەی تۆ کەمبێت چوونکە زۆر جار روویداوە خواوەند سوپایەکی کەمی بەسەر سوپایەکی فراواندا زاڵ کردووە و سوپا فراوانەکە ریسوا دەکات. نامەکەی کافر کوڕی کافر، معاویە و کافر کوڕی کافر، عەمرۆم خوێندەوە کە بۆ ئەنجامدانی گوناحەکان یەکیان گرتووە و حاشا لەراستییەکان دەکەن و لەم دەرفەتە کەڵك وەردەگرن بەهەمان شێوە کەباوك و باوەگەورێکانیان بۆ ئەو کارە ناودار بوون. لەهەڕەشەکانیان مەترسە و ئەگەر بەشێوەی پێویست وەڵامت نەداونەتەوە، دەتوانی وتارێکی گونجاو و بەپێز، بدۆزیتەوە. والسلام.))

محەممەد کوڕی یوسفی ئەنساری دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەوەڵامی نامەکەی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان نووسی:

((بەڵام دواتر، نامەکەی تۆ بەدەستم گەیشت. سەبارەت بەعوسمان هەندێ بابەتت ئاماژە پێداوە و حاشای لێناکەم، نوسیوتە لەتۆ دوورکەومەوە وەك بڵێی چاکەخوازی منیت، لەبڕینی ئەندامەکانی جەستەم دەمترسێنیت وەك بڵێی ڕزگارکەری منیت، هیوادارم سەرکەوتن بەمن ببڕێت و لەم جەنگەدا لەناوتان ببەم. ئەگەر سەرکەوتنتان بەدەست هێنا ـ لەم دنیا ـ کاروبارەکانتان گرتەدەست، زۆرجار هاوکاری ستەمگەرانتان کردووە و کەسانی باوەڕدارتان کوشتووە و ئەندامەکانی ئەوانتان بڕیوەتەوە بەڵام گەڕانەوەی ئێوە بۆ پێشگای خواوەندە و سەرئەنجامی هەموو کارەکان لای ئەوە کەبەخشەندەی بەخشەندەکانە. سەبارەت بەهەڕەشە و تۆقاندن و مەترسییەکانی ئێوە داوای هاوکاری لەخواوەند دەکەم.))

دەڵێت: هەروەها بەمشێوەیە وەڵامی عەمرۆ کوڕی عاسی دایەوە:

((بەڵام دواتر، ئەی کوڕی عاس، ئەوەی لەنامەکەی خۆت ئاماژەت پێداوە، تێگەیشتم. نووسیوتە حەز ناکەیت لەبەرابەر من سەرکەوتن بەدەست بێنیت و درۆ دەکەیت. نووسیوتە چاکەخوازی منیت، سوێند دەخۆم درۆ دەکەیت، نووسیوتە خەڵکی ویلایەتەکان دژی من ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە و دژایەتی من دەکەن و لەگوێڕایەڵی من پەشیمان بوونەتەوە، ئەوان لایەنگریانی تۆ و شەیتانی بەنەحلەت کراون. تەنیا خواوەند بۆ ئێمە بەسە کەپەروەردگاری جیهانیانە. پشت بەخوا دەبەستین. والسلام.))

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس مەبەستی هێرش کردنە سەر میسری کرد، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر وتارێکی بۆ خەڵکان خوێندەوە، سپاسی خواوەندی کرد و سڵاواتی بۆ پێغەمبەر (د.خ) نارد، وتی:

((بەڵام دواتر، ئەی موسوڵمانان و باوەڕداران، ئەو خەڵکەی ڕێز ڕێزدارانیان دەشکاند و گومڕاییان بڵاو دەکردەوە و ئاگری فیتنە و ئاژاوەیان داگیرساند و خوازیاری فەرمانڕەوایەتی کردن بەزۆر و ستەمن، بۆ دوژمنی وجەنگی ئێوە خۆیان ئامادە کردووە و لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوتوون. ئەی بەندەکانی

خواوەند، هەرکەس خوازیاری بەهەشت و بەخشینی خواوەندە، رووبەرووی ئەم خەڵکە ببێتەوە و لەرێگەی خوا، دژی ئەوان بجەنگێت. خوا لێتان خۆش بێت، لەگەڵ کەنانە کوڕی بیشر بەرێکەون.))

دەڵێت: نزیکەی دوو هەزار کەس لەگەڵ کەنانە بەرێکەوتن. محەممەد خۆی لەگەڵ دوو هەزار کەس بەرێکەوت. عەمرۆ عاس رووبەرووی کەنانە کوڕی بیشر بوویەوە کەپێشەنگی سوپاکەی محەممەد بوو. دەستەکانی سوپای یەك لەدوای یەك نارد و هەردەستەیەك کاتێك لەکەنانە نزیك دەکەوتەوە، هێرشی دەکردەسەر و بۆ لای عەمرۆ پاشەکشێی پێدەکرد.

ئەم کارە بەردەوام دووبارە دەبوویەوە. کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس ئەمەی بینی، کەسی بەدوای معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی نارد و لەگەڵ دەستەیەکی فراوان هاتن و گەمارۆیان خستە سەر کەنانە. کاتێك کەنانە ئەمەی بینی، لەئەسپەکەی هاتەخوار، هاوەڵانیش لەئەسپ هاتنەخوار. کەنانە ئەم ئایەی قورئانی دەخوێندەوە:

((و ما كان لنفس ان تموت الا باذن الله كتابا مؤجلا و من يرد ثواب الدنيا نؤته منها و من يرد ثواب الاخرة نؤتة منها و سنجزي الشاكرين[٢].

واتاکەی: هیچ کەس بەبێ فەرمانی خواوەند نامرێت، نووسراوێکە ماوەدار، هەرکەس خوازیاری پاداشتی دنیایە، پێی دەبەخشین و هەرکەس خوازیاری پاداشتی ئاخیرەتە، پێی دەبەخشین و پاداشتی سپاسکەران دەدەینەوە.))

شمشێر بەدەست جەنگا تا کوژرا.

دوای ئەو، عەمرۆ کوڕی عاس بۆ رووبەرووی بوونەوەی محەممەد بەرێکەوت. هاوەڵانی محەممەد دوای ئاگادار بوون لەکوژرانی کەنانە بڵاوەیان لێکرد و کەسی لەگەڵ نەمابوو. کاتێك ئەمەی بینی، پیادە بەرێکەوت تا گەیشتە کەلاوەیەك لەکەناری رێگەکە، پەنای بۆ کەلاوەکە برد.

عەمرۆ کوڕی عاس رۆشتە ناو فەستات و معاویە کوڕی حودەیجی بەدوای

---

[٢] (آل عمران، ئایەی ١٤)

محەممەد بەرێکەوت و لەرێگە چەند کەسێك لەدانیشتووانی ڕەسەنی ناوچەکەی بینی. پەرسیاری کرد: ئایا رێبوارێك لای ئێوە تێنەپەڕی؟

یەکیان وتی: نا سوێند بەخوا، بەڵام ڕۆشتمە ناو ئەو کەلاوەیە و بینیم کەسێك لەوێ دانیشتووە.

کوڕی حودەیج وتی: سوێند بەخوای کەعبە، خۆیەتی.

دەڵێت: دووان ڕۆشتنە ناو کەلاوەکە و محەممەدیان هێنایەدەر. لەتینواندا لەمردن نزیك ببوویەوە. ئەویان بۆ فەستاتی میسر برد.

دەڵێت: براکەی محەممەد، عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر لەناو سوپاکەی عەمرۆ کوڕی عاسدا بوو. هەستا وتی: بەدەست بەستراوی براکەی من دەکوژێت! کەس بۆ لای معاویە بنێرە ورێگەی ئەم کارەی لێبگرە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس کەسی بۆ لای معاویە نارد و فەرمانی پێدا محەممەد بباتە لای.

معاویە وتی: بەمشێوەیە؟ کەنانە کوڕی بیشرتان کوشت و من محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئازاد بکەم. هەرگیز! ئەم ئایەی قورئانی خوێندەوە:

((اکفارکم خیر من اولئکم ام لکم براة فی الزبر[٢].

واتاکەی: ئایا کافرەکانی ئێوە باشترن یا ئێوە لەناو کتێبە ئاسمانییەکاندا پارێزراون.؟))

محەممەد پێی وتن: ئاوم پێ بدەن.

معاویە کوڕی حودەیج وتی: هەرکەس ئاو بەتۆ بدات، هیوادارم خواوەند هەرگیز یەك دڵۆپە ئاوی پێ نەدات. ئێوە رێگەتان نەدا عوسمان کوڕی عەفان ئاو بخواتەوە و بەزمانی بەرۆژوو ئەوتان کوشت. سوێند بەخوا ئەی کوڕی ئەبوبەکر دەتکوژم تا خواوەند لەو دنیا ئاوی کوڵاو و چڵکاوت دەرخوارد بدات.

محەممەد وتی: ئەی زادەی ژنی جوولەکە، ئەمە پەیوەندی بەتۆ و کەسانی وەك تۆ نییە، پەیوەندی بەخواوەندەوە هەیە کەهاورێیانی خۆی تێراو دەکات و دوژمنەکانی یانی تۆ و کەسانی وەك تۆ، تینوو دەکات. سوێند بەخوا ئەگەر

---

[٢] قمر، ئایەی ٤٣

شمشێر لەدەستمدا دەبوو، نەتاندەتوانی بمگرن.

معاویە وتی: دەزانی چ بەڵایەکت بەسەردا دێنم، دەتخەمە ناو سکی کەرێك و هەردووکتان دەسوتێنم.

محەممەد وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەیت، هاوشێوەی ئەو کارەیان لەگەڵ هاوەڵانی خواوەند ئەنجام داوە. هیوادارم خواوەند ئەم ئاگرە بۆ من فێنك بکاتەوە بەهەمان شێوە کە بۆ ئیبراهیمی خەلیلی کرد. ئەو بەڵایش بەسەر تۆ و هاورێکانت بێنێت کەبەسەر نەمرود و هاوەڵانی ئەودا هێنای. خواوەند تۆ و هاورێکانت وپێشەواکەت (ئاماژەیە بۆ عەمرۆ کوری عاس) بەئاگرێك بسووتێنێت کەکوژانەوەی نەبێت و هەرکات رووی لەکزی کرد، خواوەند بڵێسەکەی زیاتر و فراوانتر بکات.

معاویە وتی: لەتۆڵەی خوێنی عوسمان کوری عەفان تۆ دەکوژم.

محەممەد وتی: تۆ چ پەیوەندییەکت بەعوسمانەوە هەیە؟ عوسمان ستەمی کردە پیشە و گۆرانکاری لەفەرموودەکانی خواوەند دروست کرد. خواوەند فەرموویەتی:

((و من لم یحکم بما انزل الله فاولئك هم الفاسقون[٤].

واتاکەی: هەرکەس بەپێی فەرموودەکانی خواوەند داوەری نەکات، ئەوان خۆیان، خراپەکارانن)).

ئێمە رەخنەمان لەکردەوەکانی ئەو گرت و خوێنی ئەومان رشت. تۆ و کەسانی وەك تۆ ئەم کارەتان پەسەند کرد و خواوەند ئەگەر ویستبێتی، گوناحەکەی ئێمەی پاك کردۆتەوە بەڵام تۆ لەگوناحی عوسمان و زۆربەی هەڵەکانی ئەو، بەشداریت و خواوەند ئەو بەڵایش بەسەرتۆدا دێنێت.

دەڵێت: معاویە کوری حودەیج تورە بوو، ئەوی هێنایە پێش و خوێنی رشت و دواتر کردییە ناو سکی کەرێك و گری تێبەردا.

کاتێك عایشە لەم کارە ئاگادار بوویەوە، ناراحەت و لەدووای هەموو نوێژێك، نفرینی معاویە و عەمرۆی دەکرد. ئەو، نانخۆرەکانی محەممەدی بردە لای خۆی.

---

[٤] (المائدە، ئایەی ٤٧)

قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر یەکێك بوو لەوان.

بەوتەی واقدی عەمرۆ کوڕی عاس لەگەڵ چوارهەزار کەس و لەناو ئەوان معاویە کوڕی حودەیج و باوکی ئەعوەری سولەمی بەرێکەوت و لەنزیك بەند، رووبەرووی محەممەد و سوپاکەی بوویەوە. شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد و کەنانە کوڕی بیشر کوڕی عەتابی تەجیبی کوژرا و کاتێك سوپاکەی محەممەد بلاوەیان لێکرد، هەلات و لای جەبەلە کوڕی مەسروق خۆی شاردەوە. معاویە کوڕی حودەیجیان لەشوێنەکەی ئاگادار کردەوە و گەمارۆی خستەسەر، محەممەد هاتەدەر و جەنگا تا کوژرا.

واقدی دەڵێت: رووداوی بەند لەمانگی سەفەری ساڵی سی و هەشتەم روویدا و بەسەرهاتی ئەزەرح لەشەعبانی هەمان ساڵ. مێژووی رووداونی هەردووکیان، یەك ساڵ بوو.

باوکی موخەنەف دەڵێت: کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس کەنانە کوڕی بیشر و محەممەد کوڕی ئەبی بەکری کوشت، نامەی بۆ معاویە نووسی:

((رووبەرووی سوپاکەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و کەنانە کوڕی بیشر بووینەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ رێگەی راست و سوونەتی پێغەمبەرمان پێکردن بەلام بەراستییەکان رازی نەبوون و لەسەر گومڕایی خۆیان پێداگرییان کرد. رووبەروویان بووینەوە و داوای سەرکەوتن و هاوکاریمان لەخواوەند کرد و خواوەند ئەوانی لەناو برد. خواوەند محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و کەنانە کوڕی بیشری لەسەر دەستی ئێمە کوشت. سپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان و سلاو بۆ تۆ.))

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە کوڕی عوتەیە کوڕی رەبیعە کوڕی عەبدشەمش، کوژرا.

## گێڕانەوەی کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە مێژوو نووسان سەبارەت بەکاتی کوژرانی ئەو بۆچوونیان جیاوازە:

واقدی دەڵێت: لەساڵی سی و شەشەم کوژرا.

دەڵێت: هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو معاویە و عەمرۆ بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو بەرێکەوتن کە لەمیسر و ئەو سەرزەمینەی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. لەعەین شەمس دابەزین و بۆ ڕۆشتنە ناو میسر هەوڵیاندا بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. فێڵیان لە محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە کرد و ئەو، لەگەڵ هەزار کەس بەرەو عورەیش بەرێکەوت و حەکەم کوڕی سەڵتی وەك جێگری خۆی لەمیسر دانا. کاتێك محەممەد رووی لەعورەیش کرد، لەوێ سەنگەری گرت. عەمرۆ مەنجەنیقی دانا و ئەو لەگەڵ سی لەهاوەڵانی لەناو سەنگەرەکان هاتنەدەر و کوژران.

دەڵێت: ئەم رووداوە پێش ئەوە بوو کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب قەیس کوڕی سەعد بۆ میسر ڕەوانە بکات.

بەڵام بەوتەی هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی، گرتنی محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە دوای کوشتنی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر روویدا و عەمرۆ کوڕی عاس ڕۆشتە ناو میسر و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت.

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ و سوپاکەی ڕۆشتنە ناو میسر، محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفەیان گرت و ئەویان بۆ لای معاویە لەفەلستین نارد. معاویە ئەوی لەزینداندا هێشتەوە و ماوەیەك، نەزۆر، لەزیندان مایەوە. دواتر لەزیندان هەڵات. ئەو کوڕە خاڵی معاویە بوو. معاویە وای نیشاندا لەهەڵاتنی ئەو شادومان نییە و بەخەڵکانی شامی وت: کێ بەدوای ئەودا دەڕوات؟.

دەڵێت: بەپێی بۆچوونی خەڵك، معاویە حەزی بەهەڵاتنی ئەو دەکرد و دەیویست گیانی خۆی رزگار بکات. یەکێك لەپیاوانی خەسعەم بەناوی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی زولآم کەپیاوێکی بوێر و لەشوێنکەوتەکانی عوسمان کوڕی عەفان بوو، وتی: من بەدوایدا دەڕۆم. دەستبەجێ شوێنی کەوت و لەسەرزەمینی

بەلقای خوران پێی گەیشتەوە کەپەنای بۆ ئەشکەوتێك بردبوو. چەند کەرێك ویستبوویانە بڕۆنە ناو ئەشکەوتەکە بەلاّم لەبەر ئەوەی کەسێکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بینیبوو، ڕەمیان کردبوو. دروێنەکەران و وەرزێرانی ئەو ناوچەیە وتبوویان سوێند بەخوا ڕەم کردنی کەرەکان بێ هۆ نییە. ڕۆشتن تا لەئەشکەوتەکە بڕوانن. محەممەدیان بینی و گەڕانەوە. لەم کاتەدا عەبدوالله کوڕی عەمرۆ خەسعەمی گەیشت و هەواڵی محەممەدی پرسی و تایبەتمەندییەکانی ئەوی باس کرد.

وتیان: لەو ئەشکەوتەدایە.

دەڵێت: پیاوی خەسعەمی هات و ئەوی لەناو ئەشکەوتەکە هێنایەدەر. نەیویست بیباتە لای معاویە و ئازادی بکات بۆیە لەهەمان شوێن ملی پەڕاند.

هوشام دەڵێت:......° لەلایەن محەممەد کوڕی ئەبی بۆ وەرگرتنی هاوکاری ڕۆشتبووە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەمحەممەد سەرکردەیان بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب خەڵکانی بۆ نوێژ کۆکردەوە. کۆبوونەوە و قسەی بۆ کردن، سپاسی خوای کرد و سڵاوانی بۆ پێغەمبەر (د.خ) نارد، دواتر وتی: هەنووکە هاواری هاوکاری محەممەد کوڕی ئەبی بەکر دەبیستن چوونکە زادەی ژنی رووسپی، دوژمنی خوا و دۆستی دوژمنی خوا هێرشیان کردۆتەسەر. ئاگادار بن گومڕاکان بۆ ئەنجامدانی کارە ناڕەواکانیان لەئێوە بۆ ئەنجامدانی کارە ڕەوا و راستەکانتان پێداگرتر نەبن. ئەوان جەنگیان لەگەڵ براکانی ئێوە دەستپێکردووە، بۆ هاوکاری کردنی ئەوان بەرێکەون. ئەی بەندەکانی خوا، میسر لەشام گەورەترە، بەرەکەتەکانی فراوانترە و ژمارەی خەڵکەکەی زۆرترە. ئاگادارین میسر لەدەست نەدەن چوونکە مانەوەی میسر لەسنووری فەرمانڕەوایەتی ئێوە، هۆکاری بەهێزی خۆتان و لاوازی دوژمنە. بەرەو جورعە لەنێوان کوفە و حیرە بەرێکەوت. بەخواستی خواوەند، سبەینێ لەوێ لای من ئامادە بن.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب پیادە بەرێکەوت و بەربەیانان

---

° هیچ نەنووسراوە

گەیشتە ئەو شوێنە و تا نیمەڕۆ لەوێ مایەوە بەڵام کەس نەڕۆشت و بەناچاری گەڕایەوە. شەوانە سەرکردەکانی خەڵکی کۆکردەوە. ئەو، خەمبار و خەمۆك بوو، وتی:

(( سپاس بۆ ئەو خوایەی ئەمەی کردۆتە چارەنووس ومنی گرفتاری ئێوە کردووە. ئەی ئەو خەڵکەی کاتێك فەرمانتان پێدەدەم، جێبەجێی ناکەن و کاتێك بانگێشتتان دەکەم، رازی نابن، نەیارەکانتان لەپرسەی باوکیانا دانیشن، بۆ لەخۆڕاگری و سەقامگیری و جیهاد لەرێگەی خواوەند، سستی لەخۆتان نیشان دەدەن تا لەم دنیا گرفتاری بەدبەختی و ریسوایی بن. سوێند بەخوا ئەگەر مەرگ بێت و بەدڵنیاییەوە دێت، و من لەئێوە جیا بکاتەوە، لەهاودەمی ئێوە بێزارم و لەدووریتان نیگەران نیم. چ خەڵکانێکن کاتێك دەبیستن دوژمن هێرش دەکاتە سەر سەرزەمینەکەتان، نەبۆ رزگاری کردنی دین کۆدەبنەوە و نەبۆ بەرگری کردن لەخاکەکەتان. سەرسوڕهێنەرە، معاویە ستەمکارە بێ ئاوزەکان بەبێ دانی مانگانە لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و ساڵانە دوو یا سێ جار بۆ هەر شوێنێك بخوازێت، دەیانبەن و من ئێوە لەکاتێدا چاکەکاران و باوەڕدارانن، لەگەڵ هاوکاری و پێدانی مانگانە، فەرمانتان پێ دەدەم و نافەرمانی من دەکەن و رێگەی هەڵە دەگرنەبەر.))

مالك کوڕی کەعبی هەمەدانی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، فەرمانی بەرێکەوتن بەخەڵکان بدە چوونکە دوای زەماوەند، بۆنی خۆش کەڵکی نییە، من خۆم بۆ رۆژێکی لەمشێوە داناوە، بێ کردەوە پاداش نادەن. لەخواوەند بترسن و وەڵامی بانگەوازی پێشەواکەتان بدەنەوە و لەگەڵ دوژمنانی بجەنگن. ئەی سەروەری باوەڕداران من بەرێدەکەوم.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمانیدا سەعد، جارچییەکەی، جاڕیدا تا هاورێ لەگەڵ کەعب کوڕی سور بەرەو میسر بەرێکەون. دوای ئەوە مالك بەرێکەوت. عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش هاورێیەتی دەکرد. هەموو ئەو کەسانەی هاتبوون، نزیکەی دوو هەزار کەس بوون.

وتی: بەرێکەوە، سوێند بەخوا گومان ناکەم لەکاتی خۆی بگەییت.

دەڵێت: مالك لەگەڵ ئەو دەستەیە بەرێکەوت و پێنج ڕۆژ ڕێگەی بڕی. لەوکاتەدا حەجاج کوڕی غەزیەی ئەنساری نەجاری، لەمیسرەوە هاتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. عەبدولرەحمان کوڕی شەبیبی فەزاریش هات. فەزاری، نوێنەری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەشام بوو. ئەنساری هاوڕێی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەمیسر بوو. لەپێشهاتەکان و کوژرانی محەممەد ئاگاداری کردەوە. وتی: پێش ئەوەی شام بەجێ بێلێت، کەسانی معاویە بەهەواڵی گرتنی میسر و کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەلایەن عەمرۆ کوڕی عاسەوە گەیشتنە شام و کوژرانی ئەویان لەسەر مینبەر ڕاگەیاند. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هیچ کات نەمبینیوە خەڵکان بەو ئەندازەیە شادمان بن کەخەڵکانی شام لەکوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر شادمان بوون.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خەمی ئێمە بۆ کوژرانی محەممەد هاوشێوەی ڕەزامەندی ئەوانە و بگرە زۆر زیاتر.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب عەبدولرەحمان کوڕی شورەیحی یامی بۆ لای مالك کوڕی کەعب نارد و ئەوی لەرێگە گەڕاندەوە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەرگی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بەڕادەیەك خەمبار بوو کەشوێنەوارەکەی لەروخساری دەرکەوت. لەناو خەڵکان وتارێکی خوێندەوە، سپاسی خوای کرد و سلاَواتی بۆ پێغەمبەر (د.خ) نارد:

((ئاگادار بن ستەمکارانی خراپەکار کە لەرێگەی خواوەند هەڵگەڕانەوە و ئیسلامیان بەلاڕێدا برد، دەستیان بەسەر میسردا گرت و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر شەهید کرا. خوا بیبەخشێت. تۆڵەی ئەو بۆ خوا بەجێدێڵین. سوێند بەخوا وەك دەزانم کەسێك بوو خۆی دایە دەستی چارەنووسی و بۆ ڕەزامەندی خواوەند تێدەکۆشا و لەخراپەکاران بێزار و کردەوەی باوەڕدارانی پەسەند دەکرد. خۆم لەم کارەدا بەکەمتەرخەم نازانم و لەکاروباری جەنگ شارەزام و ڕێگەی دوورئەندێشی دەگرمەبەر. بۆچوونی ڕاست نیشان دەدەم و بەئاشکرا هاوار دەکەم بەلاَم گوێ لەقسەکانم ناگرن و فەرمانەکانم جێبەجێ ناکەن تا کار دەگاتە شوێنە هەستیارەکان. لەگەڵ ئێوە ناتوانم تۆڵە بستێنمەوە و ناتوانم قەرەبوو

بکەمەوە. لەپەنجا و چەند رۆژ پێش، پێشنیار و داوام لێکردن براکەتان رزگار بکەن بەڵام هاوشێوەی وشتر کەوتنە بۆڵەبۆڵ و هاوشێوەی ئەو کەسانەی خوازیاری جیهاد نین، بەزەوییەوە لکان. دواتر سوپایەکی بچوك لەئێوە بەرێکەوت، پرژوبلاو و خەمۆك وەك بڵێی بەرەو مەرگیان دەبەن. چەندە خەڵکانێکی خراپن.))

لەمینبەر هاتەخوار.

نامەیەکی بۆ عەبدوالله کوڕی عەباس نووسی بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ بەندەی خوا، عەبدوالله کوڕی عەباس. سلاو لەتۆ. سپاسی خواوەند دەکەم چوونکە جگە لەو خوایەك بوونی نییە. بەلام دواتر، میسر دەستی بەسەردا گیرا و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر شەهید کرا، تۆڵەی ئەو بۆ خواوەند بەجێدێڵین. لەسەرەتاوە قسەم لەگەڵ خەڵکان کرد و داوام کرد لەو کارەساتە رزگاری بکەن، بەئاشکرا و نهێنی، بەردەوام پێشنیارم دەکرد، دەستەیەکی نابەدڵ هاتن، دەستەیەکیان بەدرۆ بیانوویان هێنایەوە و دەستەیەکیان لەشوێنی خۆیان نەجوولان. لەخواوەند دەخوازم لەدەستی ئەوان رزگارم بکات و هەرچی زووتر لەدەستی ئەوان ئاسوودەبم. سوێند بەخوا ئەگەر هیوای شەهید بوون لەسەرمدا نەدەبوو، نەمدەویست یەك رۆژ لەگەڵ ئەوان بمێنمەوە، هیوادرام خواوەند رێگەی رزگاری وشەهید بوون بکاتە چارەنووسمان چوونکە بۆ هەموو شتێك بەتوانایە. والسلام.))

کوڕی عەباس بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بۆ بەندەی خوا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەروەری باوەڕداران، لە عەبدوالله کوڕی عەباس، ئەی سەروەری باوەڕداران، سلاو و رەحمەتی خواوەند لەتۆ بێت، بەلام دواتر، نامەکەت بەدەستم گەیشت و لەهەواڵی گرتنی میسر و کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئاگادار بوومەوە، دەبێت داوای هاوکاری لەخوابکەین. خواوەند محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ببەخشێت و پاداشتی تۆ بداتەوە. داوا

لەخوا دەکەم تۆ لەدەست ئەو خەڵکە رزگار بکات و هەرچی زووتر بەهۆی فریشتەکانەوە هێزت پێ ببەخشێت، هیوادارم خواوەند دۆعاکەت بێنێتەدی و دوژمنەکانت لەناو ببات. ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵکان سستی لەخۆیان نیشان دەدەن بەڵام دواتر هەوڵ دەدەن. ئەی سەروەری باوەڕداران، رێگەی نەرمی لەگەڵ ئەوان بگرەبەر. هیواداریان بکە و لەخوا بپارێرەوە تا خواوەند رەنجی ئەوان لەسەر شانی تۆ هەڵگرێت.))

مالك کوڕی حور دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خواوەند، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ببەخشێت، گەنجێکی تازەکار بوو. سوێند بەخوا دەمویست مەرقال، هاشم کوڕی عوتەبە وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان بکەم. سوێند بەخوا ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایەتی میسری لەدەست دەگرت، گۆڕەپانی بۆ عەمرۆ کوڕی عاس و هاوەڵە خراپەکارانی ئەو چۆڵ نەدەکرد و ئەگەر دەکوژرا، شمشێری بەدەستەوە دەبوو و هاوشێوەی محەممەد بێ جەنگ نەدەکوژرا. خواوەند محەممەد ببەخشێت، هەوڵی خۆیدا و ئەرکەکانی خۆی بەئەنجام گەیاند.

لەم ساڵەدا، دوای کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر، معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزرەمی بۆ بەسرە نارد تا بۆ تەسلیم بوون بەداوەری عەمرۆ کوڕی عاس، خەڵکان هان بدات.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەعیەن کوڕی زەبیعەی موجاشعی کوژرا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی بۆ دەرکردنی کوڕی حەزرەمی لەبەسرە ناردبوو.

## بەسەرهاتی کوڕی حەزرەمی و زیاد و ئەعیەن و هۆکاری کوشتنی ئەو کەسانەی کوژران

باوکی نەعامە دەڵێت: کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەمیسر کوژرا، کوڕی عەباس لەبەسرە ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکوفە و زیادی وەکو جێگری خۆی لەبەسرە دانا. کوڕی حەزرەمی لەلایەن معاویەوە هات و لەناو منداڵەکانی تەمیم نیشتەجێ بوو. زیاد، حەسین کوڕی مونزەر و مالك کوڕی مەسمەعی بانگ کرد، وتی: ئەی دەستەی بەکر کوڕی وایل! ئێوە لەهاوەڵان و بڕواپێکراوانی سەرۆەری باوەڕدارانن، وەك دەزانن کوڕی حەزەرمی هاتووە و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەتەوە. پارێزگاریم لێ بکەن تا فەرمانی سەرۆەری باوەڕداران بگات.

حەسین وتی: زۆر باشە.

بەڵام مالك ئارەزوومەندی پەیوەست بوون بەمعاویە بوو. دوای جەنگی جەمەل مەروان پەنای بۆ بردبوو، وتی: دەبێت بۆ ئەم مەبەستە راوێژ بەچەند کەسێك بکەم.

کاتێك زیاد سستی مالکی بینی، لەدژایەتی هۆزی رەبیعە ترسا. نافعی بانگ کرد و راوێژی پێکرد.

نافع پێی وت داوای هاوکاری لەسەبرە کوڕی شەیمانی حەدانی بکات.

دەڵێت: زیاد سەبرەی بانگ کرد و وتی: من و بیت المالی موسوڵمانان پەنا بدە چوونکە تالآنی ئێوەیە و من ئەمانەتداری سەرۆەری باوەڕدارانم.

وتی: بەو مەرجەی بیت المال بێنیتە ماڵەکەی من.

زیاد وتی: دەیهێنم. بیت المالی هەڵگرت و بەرەو حەدان بەرێکەوت و لەماڵی سەبرە کوڕی شەیمان جێگیر بوو. بیت المال و مینبەری لەمزگەوتی حەدان دانا. پەنجا کەس لەگەڵ زیاد ڕۆشتن. باوکی ئەبی حازر لەناو ئەواندا دەبینرا. زیاد نوێژی هەینی لەمزگەوتی حەدان دەخوێند و خواردنی بەسەر خەڵکان دابەش دەکرد.

دەڵێت: زیاد بەجابر کوڕی وەهبی راسبی وت: ئەی باوکی محەممەد! کوڕی حەزرەمی دەست هەڵناگرێت و جەنگ دژی ئێوە دەست پێدەکات. نازانم بۆچوونی هاوەڵانی تۆ چییە. قسەیان لەگەڵ بکە و لەبۆچوون و مەبەستیان ئاگادار ببەرەوە.

دەڵێت: کاتێك زیاد نوێژی خوێند و لەمزگەوت دانیشت و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە، جابر وتی: ئەی ئەزدییەکان، تەمیمییەکان گومان دەکەن زۆر گرنگن و لەکاتی جەنگ لەئێوە بوێرترن. بیستوومە دەیانەوێت هێرش بکەنە سەرتان و پەنابەرەکەی ئێوە بگرن و لەشارەکە دەرییەرێنن. ئەگەر ئەو کارە بکەن چی دەکەن لەکاتێکدا پەناتان بەخۆی و بیت المال داوە؟

سەبرە کوڕی شەیمان بەدەنگێکی بەرز وتی: ئەگەر ئەحنەف بێت، منیش دێم. ئەگەر حەتات بێت، منیش دێم. ئەگەر شەبان بێت، ئێمەیش شەبانمان هەیە.

زیاد وتبووی: بزە کەوتە سەر لێوم و هەستام. هیچ کات بیرم لەرێگە چارەیەك نەکردبوویەوە هاوشێوەی ئەوڕۆژە بەریسوایی کۆتایی بێت. لەبەر ئەوە بزە کەوتە سەر لێوم.

دەڵێت: زیاد نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی: کوڕی حەزرەمی لەشامەوە هاتووە و لەناو منداڵەکانی تەمیم جێگیر بووە. سەبارەت بەکوژرانی عوسمان قسە دەکات و منداڵەکانی تەمیم و زۆرینەی خەڵکانی بەسرە بەیعەتیان لەگەڵ کردووە. کەس لەگەڵم نەماوەتەوە تا پارێزگاری لەخۆم بکەم. لەبەر ئەوە خۆم و بیت المال پەنامان بۆ سەبرە کوڕی شەیمان بردووە و هەنووکە لەناو ئەواندام. شوێنکەوتەکانی عوسمان بۆ لای کوڕی حەزرەمی هاتوچۆ دەکەن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئەعیەن کوڕی زەبیعەی موجاشعی ڕەوانە کرد تا خەڵکەکەی خۆی لەدەوری کوڕی حەزرەمی بلاوە پێ بکات. وتی: بزانە چی دەکات، ئەگەر بلاوەیان لێکرد، بەمەبەستەکەی خۆت گەشتوویت، ئەگەر پێداگرییان کرد، هێرشیان بکەسەر و شەڕ دەستپێبکە. ئەگەر شەڕکەرانی تۆ سستییان لەخۆیان نیشاندا و ترسایت بەمەبەستەکەی خۆت نەگەیت، ڕێگەی

نەرمی لەگەڵ ئەوان بگرە بەر. دواتر ببیستە و ببینە. ئەگەری هەیە سوپای خواوەند بۆ لەناو بردنی دوژمنەکانت هاوکاریت بکەن.

ئەعیەن ڕۆشتە لای زیاد. دواتر ڕۆشتە ناو خەڵکەکەی خۆی و دەستەیەکی کۆکردەوە. ڕۆشتە لای کوڕی حەزرەمی و پێشنیاری گەڕانەوەی پێکردن بەڵام جوێنیان پێدا و ڕووبەڕووی بوونەوە. ئەعیەن گەڕایەوە و خەڵکان هێرشیان کردە سەر شوێنەکەی و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: کاتێك ئەعیەن کوڕی زەبیعە کوژرا، زیاد مەبەستی جەنگ دژی ئەوانی کرد. تەمیمییەکان کەسیان بۆ لای ئەزدییەکان نارد و وتیان: ئێمە ڕێگەمان لەپەنابەرەکەی ئێوە و هیچ کام لەهاوەڵانی ئەو نەگرتووە، لەدەستدرێژی کردنە سەر پەنابەرەکەی ئێمە چ مەبەستێکتان هەیە؟

دەڵێت: خەڵکانی ئەزد حەزیان بەجەنگ نەدەکرد. وتیان: ئەگەر بوونە ئەرك بۆ پەنابەرەکەی ئێمە، بەرگری دەکەین و ئەگەر هیچ ئەرکێکیان بۆ دروست نەکرد، نابیتە ئەرك بۆ پەنابەرەکەیان. بەمشێوەیە ئارام بوونەوە.

زیاد نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی: ئەعیەن کوڕی زەبیعە هات و کەسانی شوێنکەوتەی خۆی لەهۆزەکەی کۆکردەوە و بەبڕشت، ڕۆشتە لای کوڕی حەزرەمی و پێشنیاری گەڕانەوەی پێکردن، وتی: دەست لەدژایەتی هەڵبگرن. زۆربەی خەڵك ڕێگەی سازگارییان گرتەبەر و ئەمە بووە هۆی ترسی نەیارەکان چوونکە زۆربەی ئەو کەسانەی پشتیان پێ بەستبوون، لێیان جیابوونەوە. جەنگ هاتە ئاراوە. ئەعیەن بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە بەڵام هێرشیان کردە سەرماڵەکەی و بەشێوەیەکی لەناکاو خوێنیان ڕشت. خواوەند ئەعیەن ببەخشێت، دەمویست جەنگ دژی ئەوان دەستپێبکەم بەڵام سوپایەکی زۆر لەدەورم کۆنەبوویەوە. نێردراوان لەنێوان هەردوو هۆزەکە هاتوچۆیان کرد و بەمشێوەیە دەستیان لەیەك هەڵگرت.

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەکەی زیادی خوێندەوە، جارییە کوڕی قودامەی سەعدی بانگ کرد و لەگەڵ پەنجا کەس لەمناڵەکانی تەمیم ڕەوانەی کرد. شەریك کوڕی ئەعوەری کردە هاوڕێی ئەو. بەوتەیەك جارییەی

لەگەڵ پێنسەد کەس نارد و نامەی بۆ زیاد نووسی و کارەکانی ئەوی پشتراست کردەوە و فەرمانی پێدا هاوکاری و راوێژ لەگەڵ جاریە بکات.

دەڵێت: جاریە ڕۆشتە ناو بەسرە. ڕۆشتە لای زیاد، پێی وت: ئاگادار بە، ناخوازم ئەو بەڵای بەسەر هاورێکەمدا هات، بەسەر تۆیشدا بێت، باوەڕ بەهیچ کەسێك لەم خەڵکە مەکە.

دەڵێت: جاریە ڕۆشتە لای خەڵکەکەی و نامەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بۆ خوێندنەوە. بەڵێنی چاکەی پێدان و زۆربەی خەڵکان بەبانگەوازەکەی رازی بوون. ڕۆشتە لای کوڕی حەزرەمی و لەماڵی سەنبیل گەمارۆی خستەسەر. دوای ئەوە گڕی لەماڵەکە بەردا و کوڕی حەزرەمی و هەموو هاوەڵانی سووتان. حەفتا کەس و بەوتەیەك چل کەس لەگەڵ ئەودا لەناو ماڵەکەدا بوون. دواتر خەڵکان بڵاوەیان لێکرد و زیاد بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایەتی گەڕایەوە و بەزەبیان کوڕی عەمار نامەیەکی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی:

جاریە هاتە لای ئێمە و ڕۆشتە لای کوڕی حەزرەمی و شەڕی لەگەڵ کرد. لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی لەیەکێك لەماڵەکانی مناڵەکانی تەمیم گەمارۆی خستە سەریان و هەڕەشەی لێکردن. سەرەتا پێشنیاری گەڕانەوەی پێکرد بەڵام رازی نەبوون. جارییە گڕی لەماڵەکە بەردا و ئەو دەستەی سووتاند. نەحلەتی خوا لەخەڵکانی سەرکێش و یاخی.

یەکێك لەرووداوەکانی ئەم ساڵە، یانی ساڵی سی و هەشتەم، ئەوە بوو خورەیت کوڕی راشد لەگەڵ مناڵەکانی ناجییە دەستی بەدژایەتی کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد و لێی جیابوویەوە.

## بەسەرهاتی خورەیت

عەبدوالله کوڕی فەقیم دەڵێت: خورەیت کوڕی راشد ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. سێسەد کەس لەمناڵەکانی ناجییە هاوڕێیەتیان دەکرد کە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکوفە نیشتەجێ بوون و دوای جەنگی جەمەل لەبەسرەوە لەگەڵ ئەو هاتبوون و بەشداری شەڕی نەهرەوان و سەفینیان کردبوو.

خورەیت لەگەڵ سی سوار لەهاوەڵانی خۆی ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، لەبەردەم ئەو وەستا و وتی: سوێند بەخوا ئەی عەلی، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ نابم و لەپشت سەری تۆ نوێژ ناخوێنم و سبەی لەتۆ جیا دەبمەوە.

دەڵێت: ئەم پێشهاتە دووای ئەوە بوو کەداوەرەکان کۆتاییان بەکارەکەی خۆیان هێنابوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، بەمشێوەیە نافەرمانی فەرمانەکانی پەروەدگار دەکەیت و پەیمانەکەت دەشکێنیت و تەنیا زیان لەخۆت دەدەیت، پێم بڵێ، بۆ ئەو کارە دەکەیت؟

وتی: لەبەر ئەوەی بەداوەری کردن رازی بوویت و لەکاتی پێویست، لاوازیت لەخۆت نیشاندا و باوەڕت بەستەمگەران کرد. من دژی تۆم و ڕقی ئەوانم لەدڵدایە و لەهەمووتان جیا دەبمەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ڕێگەبدە سبەی قورئانت بۆ بخوێنمەوە و سەبارەت بەسوونەت قسەت بۆ بکەم و لەراستییەکان ئاگادارت بکەمەوە. ئەگەری هەیە ئەو شتانەی ئێستا نایانزانیت، لێیان ئاگادار ببیتەوە.

وتی: سبەی دەگەڕێمەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: شەیتان فریوت نەدات و نەزانی گومڕات نەکات، سوێند بەخوا ئەگەر داوای ڕێگەی راست لەمن بکەیت، مۆجیاریت دەکەم و بۆ ڕێگەی راست ڕێنوێنیت دەکەم.

دەڵێت: خورەیت ڕۆشت و بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. بەخێرایی بەدوای ئەو ڕۆشتم. یەکێك لەکوڕە مامەکانی هاوڕێی من بوو، دەمویست کوڕە مامەکەی ببینم و بەسەرهاتەکەی بۆ باس بکەم و داوای لێ بکەم پێشنیاری گوێڕایەڵی فەرمانەکانی سەروەری باوەڕدارانی پێ بکات چوونکە بۆ ئەم دنیا و ئەو دنیای باشترە.

دەڵێت: ڕۆشتم تاگەیشتمە ماڵی خورەیت، ئەو زووتر لەمن گەیشتبوو. لەبەر دەرگای ماڵەکەی وەستام. کەسانێك لەهاوەڵانی کە لەکاتی ڕۆشتنی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێ نەبوون، لەوێ بوون.

دەڵێت: سوێند بەخوا گفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب گێڕایەوە، وتی: ئەی خەڵکینە، مەبەستی ئەوەم کردووە لەو پیاوە جیا ببمەوە. هاتووم تا سبەی دووبارە بۆ لای ئەو بگەڕێمەوە بەڵام دڵنیام سبەی لێی جیا دەبمەوە.

زۆربەی هاوەڵانی وتیان: ئەو کارە مەکە تا دەڕۆیتە لای، ئەگەر وتەکانی ڕاست بوو، ڕازی دەبیت و گەرنە جیابوونەوە لەو دژوار نییە.

وتی: بۆچوونی ڕاست ئەوەیە.

دەڵێت: داوای مۆڵەتم کرد و ڕۆشتمە لای، وتم: سوێندت دەدەم بەخوا لەسەروەری باوەڕداران و موسوڵمانان جیامەبەرەوە و مەترسی بۆ خۆت دروست مەکە و خەڵکی هۆزەکەت بەکوشتن مەدە چوونکە عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەر حەقە.

وتی: بەیانی دەڕۆم و گوێ لەبەڵگە و وتەکانی دەگرم بزانم چی دەڵێت. ئەگەر ڕاست بوو، ڕازی دەبم و ئەگەر ناڕاست بوو، لێی جیادەبمەوە.

دەڵێت: لەگەڵ کوڕە مامەکەی بەتەنیا دانیشتم. یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خوەریت بوو. ناوی مەدرەك کوڕی ڕییان بوو. پێم وت: بەهۆی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی ماف تۆ لەئەستۆی مندایە هاوشێوەی ماف موسوڵمانان لەسەر موسوڵمانان. کوڕە مامەکەت ئەو کارەی کرد کەلێی ئاگاداریت، هەوڵ بدە لەبۆچوونەکەی پاشگەزی بکەیتەوە و کارەکەی بەقێزەون لەقەڵەم بدە چوونکە

دەترسم ئەگەر لەسەروەری باوەڕداران جیاببێتەوە، خۆی و هۆزەکەی بەکوشتن بدات.

وتی: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە چوونکە هاورێیەکی راست کردار و چاکەخوازیت، ئەگەر خورەیت بخوازێت لەسەروەری باوەڕداران جیاببێتەوە، لێی جیادەبمەوە و دژایەتی دەکەم و پێشنیاری پێدەکەم گوێڕایەڵی فەرمانەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێت چوونکە جیاواز لەوشێوەیە بەخت هاورێیەتی ناکات.

دەڵێت: هەستام و مەبەستی گەڕانەوە بۆ لای سەروەری باوەرداراںم کرد تا بەسەرهاتەکەی بۆ بگێڕمەوە چوونکە لەوتە و بەڵێنی هاورێکەی خۆم دڵنیا بووم. بۆماڵەوە گەڕامەوە و شەوم بەسەر برد و رۆژی دواتر دوای تێپەڕینی ماوەیەکی کەم لەرۆژ، ڕۆشتمە لای سەروەری باوەڕداران. ماوەیەك لای ئەو دانیشتم. دەمویست بەتەنیا لەوتەکان ئاگاداری بکەمەوە. دانیشتنەکەم درێژەی کێشا و بەردەوام خەڵکێکی زیاتر دەهاتن. ڕۆشتمە پێش و لەپشت سەری دانیشتم. گوێی بۆ گرتم و لەوتەکانی خورەیت ئاگادارم کردەوە. هەروەها قسەکانی خۆم لەگەڵ کوڕە مامەکەی بۆ گێڕایەوە.

وتی: وازی لێ بێنە، ئەگەر تەسلیمی راستییەکان بوو، ڕێزی لێ دەگرین و ئەگەر لەسەر مەبەستەکەی پێداگری کرد، پشتگوێی ناخەین.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ هەنووکە نایگریت و پەیمانی لێ وەرناگریت.

وتی: ئەگەر بەوشێوەیە لەگەڵ هەموو گوماندااران مامڵە بکەین، زیندانەکان پڕ دەبن. بۆچوونی من ئەوەیە سزادان و زیندانی کردنی ئەوان کاتێك گونجاوە کەدژایەتی خۆیان لەگەڵ ئێمە ئاشکرا بکەن.

دەڵێت: بێدەنگ بووم و لای دانیشتم. ماوەیەك تێپەڕی، پێی وتم: نزیك بەرەوە.

دەڵێت: لێی نزیك بوومەوە، بەهێواشی پێی وتم: بڕۆ ماڵی ئەو پیاوە و بزانە چی دەکات چوونکە هەموو رۆژێك پێش ئێستا لێرە ئامادە بوو.

دەڵێت: بۆ لای ماڵی خورەیت بەرێکەوتم. کەس لەماڵەکەیدا نەبوو. تەقەم لەدەرگای ماڵەکانی دیکەدا بەڵام کەسی لێ نەبوو. گەڕامەوە و کاتێک عەلی کوڕی ئەبی تالیب منی بینی، وتی: ماونەتەوە و پارێزراون یا ترساون و هەڵاتوون؟

وتم: ڕۆشتوون و دژایەتی خۆیان ئاشکرا کردووە.

وتی: ئەو کارەیان کردووە! خواوەند بەنەحلەتیان بکات بەهەمان شێوە کەخەڵکانی سەموودی بەنەحلەت کرد. ئەگەر لەئاستی ئەوان ڕمەکان بەرز بکەمەوە و شمشێرەکان بەسەریاندا دابارێنم، پەشیمان دەبنەوە. هەنووکە شەیتان ئەوانی فریوداوە و گومڕایی کردوون. بەیانی لێیان بێزار دەبێت وپشتگوێیان دەخات.

دەڵێت: زیاد کوڕی خەسەفە هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر زیان تەنیا جیابوونەوەی ئەوان دەبوو، گرنگ نەبوو چوونکە ئەگەر لەگەڵ ئێمە دەمانەوە ژمارەی ئێمەیان فراوان نەدەکرد و بەڕۆشتنی ئەوان ژمارەی ئێمە کەم نابێتەوە بەڵام ترسی ئەوە لەئارادایە خەڵکانی شوێنکەوتەی تۆ بەلارێدا ببەن. مۆڵەتم پێ بدە شوێنیان کەوم و بەخواستی خواوەند دەیانگێڕمەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دەزانی بۆ کوێ ڕۆشتوون؟

وتی: نا، دەڕۆم و دەپرسم و شوێنیان دەکەوم.

وتی: خواوەند بتبەخشێت، بڕۆ و لەنزیک دێری باوکی موسا دابەزە، لەوێ مەڕۆ تافەرمانەکانی منت پێ بگات. ئەگەر ئەوان بەئاشکرا و بەدەستە ڕۆشتبێتن، کارگوزارەکانم ئاگادارم دەکەنەوە و ئەگەر بەشێوەیەکی بەربڵاو و نهێنی ڕۆشتبێتن، دۆزینەوەیان کارێکی سادە نییە. سەبارەت بەوان نامە بۆ کارگوزارەکانم دەنووسم. نامەیەکی نووسی وبۆ هەموو کارگوزارەکانی نارد:

((بەڵام دواتر، کەسانێک هەڵاتوون و گومان دەکەم روویان لەبەسرە کردبێت، لەخەڵکی سەرزەمینەکەی خۆتان سەبارەت بەوان بپرسە و لەهەموو شوێنەکانی سەرزەمینەکەتان سیخوڕکان دابنێ. هەرهەواڵێک لەوان بەتۆ گەیشت، منی لێ ئاگادار بکەرەوە.

دەڵێت: زیاد کوڕی خەسەفە گەڕایەوە بۆ ماڵ و هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە.

سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

((بەڵام دواتر، ئەی دەستەی بەکر کوڕی وایل، سەروەری باوەڕداران منی بۆ کارێك راسپاردووە کەبۆ ئەو گرنگە و فەرمانی جێبەجێ کردنی پێداوم، ئێوە شوێنکەوتەکان و هاوەڵانی ئەون چوونکە زیاتر لەهەموو هۆزەکان باوەڕی بەئێوە هەیە. هەرئێستاکە لەگەڵ من بەرێکەون، خێراکەن))

دەڵێت: زۆری نەخایاند سەد و بیست کەس یا سی کەس لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: بەسە، زیاتر لەمەمان ناوێت. ڕۆشتن و لەپردەکە پەڕینەوە و گەیشتنە دێری باوکی موسا. لەوێ دابەزی و پاشماوەی ڕۆژی لەوێ بەسەر برد. چاوەڕوانی فەرمانەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو.

عەبدوڵڵە کوڕی والی تیمی دەڵێت: لای سەروەری باوەڕداران بووم، نێردراو هات و نامەیەکی لەلای قورەزە کوڕی کەعبی ئەنساری بۆ هێنا، ناوەڕۆکەکەی بەمشێوە بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەڵام دواتر، سەروەری باوەڕداران ئاگادار دەکەمەوە دەستەیەك سوار لێرە گوزەریان کرد کە لەکوفەوە دەهاتن و روویان دەکردە نەفەر. یەکێك لەجووتیارانی خوارەوەی فورات بەناوی زازان فروغ لای خاڵۆکانی خۆی لەنەفەر دەگەڕایەوە و ڕێگەیان لێگرتووە و وتوویانە: موسوڵمانی یاکافر؟ وتوویەتی: موسوڵمانم.

وتوویانە: بۆچوونت سەبارەت بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب چییە؟

وتوویەتی: چاکەی دەڵێم چوونکە سەروەری باوەڕدارانە و سەروەری موسوڵمانان.

پێیان وتووە: ئەی دوژمنی خوا، کوفرت هێنایە سەرزمان. دواتر چەند کەسێك لەوان هێرشیان کردۆتەسەر و لەت و پەتیان کردووە. پیاوێکی دیکە لەئەهلی زەممەیان گرتووە و پرسیویانە: کێیت؟

وتوویەتی: یەکێك لەئەهلی زەممە.

وتوویانە: ناتوانین هیچ لەمە بکەین.

نووسیبووی: ئەم پیاوە هاتە لای ئێمە و ئاگاداری کردینەوە. سەبارەت بەو دەستە پرسیارم کرد و کەس هیچی پێ نەوتم. سەروەری باوەڕداران فەرمانی خۆی لەوبارەوە بنووسێت. والسلام.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وەڵامی دایەوە:

((بەڵام دواتر، لەوەی سەبارەت بەو دەستەیە ئاماژەت پێداوە، کە لەوێ تێپەڕیون و موسوڵمانێکیان کوشتووە و کافرەکەیان بەزیندووی هێشتۆتەوە، ئاگادار بوومەوە. ئەوانە دەستەیەکن شەیتان فریوی داون و گومڕا بوون و هاوشێوەی ئەو کەسانەن گومان دەکەن ئاژاوە رووناداتا و کوێر و کەڕ بوون. بینەر وبیسەری کردەوەکانیان بە و سەرقاڵی کۆکردنەوەی باج و خەراج بە چوونکە چاکەخواز و شوێنکەوتەی ئیسلامیت. والسلام.))

عەبدوالله کوڕی وال دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەمندا نامەیەکی بۆزیاد کوڕی خەسەفە نارد. ئەوسا گەنجێکی تازەپێگەیشتوو بووم. دەقی نامەکە بەمشێوە بوو:

((بەڵام دواتر، فەرمانم پێدابوویت لەدێری باوکی موسا دابەزی تا فەرمانەکانم بەتۆ بگات چوونکە نەمدەزانی ئەو دەستەیە روویان لەکوێ کردووە. بەڵام ئاگادار بوومەوە ئەوان روویان کردە گوندێك بەناوی نەفەر. شوێنیان کەوە و شوێن پێیان هەڵگرە چوونکە یەکێك لەموسوڵمانەکانی سوادیان کوشتووە. ئەگەر ئەوانت بینی بۆ لای من بیانگەڕێنەوە و ئەگەر رازی نەبوون، لەگەڵیان بجەنگە. دژی ئەوان داوای هاوکاری لەخواوەند بکە چوونکە لەرێگەی راست جیابوونەتەوە و خوێنێکی حەرامیان ڕشتووە و رێگەکانیان نائەمن کردووە. والسلام.))

دەڵێت: نامەکەم هەڵگرت و برێکی رێگەکەم بڕی. دواتر بەنامەکە گەڕامەوە و وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، کاتێك نامەکەم تەسلیم بەزیاد کرد، لەگەڵ ئەو بڕۆم یا نە؟

وتی: ئەی کوڕی برام، سوێند بەخوا هیوادارم بۆ زیندوو کردنەوەی راستی یەکێك لەهاوەرێکانی من بیت و دژی ستەمکاران هاوکاریم بکەیت.

وتم: سـوێند بـەخوا ئـەی سـەروەری بـاوەڕداران بەوشـێوەم کـەدەخوازیت و لەهاوەڵانی تۆم.

کوڕی واڵ دەڵێت: سوێند بەخوا ناخوازم لەجیاتی ئەو وشانەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ببمە خاوەنی وشترە سوور مووەکان.

دەڵێـت: دوای ئـەوە نامەکـەی سـەروەری بـاوەڕدارانم بـۆ زیـاد بـرد. سـوار ئەسپێکی ڕەسەن بووم، سیلاحم هـەڵگرتبوو. زیـاد پێـی وتم: ئـەی کـوڕی برام! سوێند بەخوا ناتوانم چاو لەتۆ بپۆشم، دەخوازم لەم سەفەرە هاوڕێیەتیم بکەیت.

وتم: بۆ ئەم کارە داوای مۆڵەتم لەسەروەری باوەڕداران کرد و مۆڵەتی پێدام.

دەڵێـت: بەرێکـەوتین وگەشـتینە نەفـەر و پرسـیاری ئـەو دەسـتەیەمان کـرد. پێیـان وتـین روویـان کردۆتـە جەرجـەڕایا. شـوێنیان کـەوتین، وتیـان: ڕێگـەی مەزاریان گرتۆتەبەر. لەمەزار پێیان گەشتینەوە. شەو و ڕۆژێك لـەوێ مابوونـەوە، حەسابوونەوە و ئالفیان دەرخواردی چوارپێکانیان دابوو. کاتێك پێیان گەشتین، شەکەت و ماندوو بووین. کاتێك ئێمەیان بینی، سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون. رووبەروویان بووینەوە و سەرکردەکەیان خورەیت کوڕی راشد هاواری کرد ئـەی دڵ کـوێر و گومڕاکـان، ئێـوە شـوێنکەوتەی کتـێبی خواوەنـد و سـوونەتی پێغەمبەرن یا شوێنکەوتەی ستەمگاران؟

زیاد کوڕی خەسەفە وتی: ئەی کوێر و کەڕ و گومڕاکان! ئێمە شوێنکەوتەی خواوەندین و لەدەستەی ئەو کەسانەین خواوەند و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی پێش هەموو جیهان و جیهانییان دەخەین.

خورەیت وتی: چیتان دەوێت.

زیـاد کـەپیاوێکی لەسـەر خـۆ بـوو، وتـی: دەبـینی شـەکەت و مانـدووین و سەبارەت بەمەبەستەکەمان ناتوانین بەشێوەیەکی ئاشکرا لـەنێو هاوەڵانمان قسە بکـەین. دابـەزن و ئێمـەیش دادەبـەزین و دادەنیـشن و لـەم نـاوەدا درێـژە بەگفتوگۆکانمان دەدەیـن. ئەگـەر بەمەبەسـتە و پێـشنیارەکانی ئێمـە رازی بـوون، رازی دەبیـت و ئەگـەر پێـشنیارەکانی تۆمـان پەسـەند کـرد، دەبینـە شـوێنکەوتەی تۆ.

وتی: دادەبەزین.

دەڵێت: زیاد هاتە لای ئێمە و وتی: لەسەر لێواری ئەم ئاوە دادەبەزین.

دەڵێت: ڕۆشتین و کاتێك گەشتینە لێواری ئاوەکە دابەزین و بلاوەمان لێکرد و بووینــە دەســتەی دەکەســی و هەشــت و حــەوت کەســی. ئــەوان خواردنیــان لەبەردەم خۆیـان دانابوو و دەیانخوارد و دواتر دەڕۆشتنە سەر ئاوەکە و لێیان دەخواردەوە.

زیاد پێی وتین: لەغاوی ئەسپەکانی خۆتان بکەن. ئەو کارەمان کرد. لەنێوان ئێمە و ئەوان وەستا. ئەوان ڕۆشتن و لەشوێنێکی دیکە دابەزین.

زیاد بۆ لای ئێمە گەڕایەوە و کاتێك پرژوبلاوی و دەستەکانی ئێمەی بینی، وتی: سبحان الله، بەئێوە دەڵێن شەڕکەر! سوێند بەخوا ئەگەر بەمشێوەیە هێرش بکەنە سەر ئێوە، هیچ شتێك باشتر لەمە لەبەرژەوەندی ئەواندا نییە. بەخێرایی سوار ئەسپەکانی خۆتان بن.

دەڵێت: بەپەلە هەستاین، دەستەیەك جلەکانی خۆیان تەکاند و دەستنوێژیان دەگرت، دەستەیەك ئاویان دەخواردەوە، دەستەیەك ئاویان بەئەسپەکانی خۆیان دەدا و کاتێك لەئەنجامدانی کارەکانمان تەواو بووین، زیاد هات. ئێسقانێکی بەدەستەوە و گازی لێدەگرت. دوو یا سێ گازی لێگرت، قومقومەیەکیان هێنا و ئاوی تیا خواردەوە، دواتر ئێسقانەکەی فڕێدا و وتی: ئەی خەڵکینە، ئێمە ڕووبەرووی ئەم دەستەیە دەبینەوە، سوێند بەخوا ژمارەی ئەوان بەئەندازەی ژمارەی ئێوەیە. هەردوو سوپاکەم بەراوەرد کرد، هیچ کام لەوی دیکە زیاتر یا بەهێزتر نییە. سوێند بەخوا جەنگ لەنێوان ئێمە ڕوودەدات. ئەگەر سەرئەنجامی کارەکەمان بەجەنگ کۆتایی هات، هەوڵ بدەن دەستە لاوازەکە نەبن.

دواتر پێی وتین: هەرکامتان جڵەوی ئەسپەکەی بگرێت تا لێیان نزیك دەکەومەوە. سەرکردەکەیان بانگ بکەن تا قسەی لەگەڵ بکەم و ئەگەر بەپێشنیارەکانم ڕازی بوو، باشتر و گەرنە کاتێك ئێوەم بانگ کرد، هەمووان سوار لەسەر ئەسپ وەرنە لای من بێ ئەوەی بلاوەی لێبکەن.

دەڵێت: زیاد پێش ئێمە بەرێکەوت. لەگەڵیدا بووم و بیستم یەکێك لەوان

دەیوت: ئەم دەستەیە کاتێك هاتنە لای ئێوە، شەکەت و ماندوو بوون و ئێوە حەساوە. رێگەتان پێدان دابەزن و بحەسێنەوە، خواردیان و خواردیانەوە و حەسانەوە. سوێند بەخوا ئەمە کارێکی راست نەبوو. سوێند بەخوا سەرئەنجامی کاری ئێمە بەجەنگ کۆتایی دێت.

بێدەنگ بوون وئێمە لایان نزیك کەوتینەوە. زیاد کوڕی خەسەفە، سەرکردەکەیانی بانگ کرد و وتی: با بڕۆین سووچێك و لێکۆڵینەوە لەدەر ئەنجامەکانی ئەم کارە بکەین. پێنج کەس لەوان هاتنە لای زیاد. بەزیادم وت: سییان لەهاورێیان بانگ دەکەین تا لەژمارەدا هاوتای ئەوان بین.

وتی: هەرکەس پێت خۆشە، بانگی بکە.

دەڵێت: سییان لەهاورێیانم بانگ کرد. ئێمەیش بووینە پێنج کەس لەبەرابەر پێنج کەس.

زیاد پێی وت: چ رەخنەیەك لەسەروەری باوەڕداران دەگریت و بەهۆیەوە لەئێمە جیابوویتەوە؟

وتی: خەلافەتی هاورێکەی ئێوە پەسندە ناکەم و کردەوەکانی بەشیاو نازانم. بەباشم زانی خۆم بەدوور بگرم و ببمە شوێنکەوتەی ئەو کەسەی پێشنیاری سپاردنی کاروبارەکان بەشورا دەسپێرێت. کاتێك هەمووان لەسەر یەك کەس وەك خەلیفە رێککەوتن، منیش پەیوەستیان دەبم.

زیاد وتی: هاوار لەتۆ، ئایا خەڵکان دەتوانن لەسەر کەسێك رێککەوتن کە بۆ ناسینی خواوەند و زانستی سوونەت و کتێبی خواوەند و خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ)، هاوتای ئەو کەسە بێت کەلێی جیابوویتەوە؟

وتی: ئەوە دوا قسەی منە.

زیاد وتی: بۆ ئەو پیاوە موسوڵمانەتان کوشت؟

وتی: من نەمکوشت، دەستەیەك لەهاوەڵانم ئەو کارەیان کرد.

وتی: ئەوان تەسلیمی ئێمە بکە.

وتی: تەسلیم کردنەوەی ئەوان ئەگەری نییە.

وتی: بەمشێوەیە دەخوازیت؟

وتی: بەوشێوەیە کەبیستت.

دەڵێت: ئێمە هاوەڵانی خۆمان بانگ کرد و ئەویش بەهەمان شێوە و ڕووبەڕوو بووینەوە. سوێند بەخوا لەو کاتەوەی خواوەند منی ئافراند، جەنگێکی بەو دژوارییەم نەبینیبوو.

دەڵێت: سەرەتا بەرمەکان جەنگاین تا ئەوجێگەی ڕم بەدەستمانەوە نەما. دواتر شمشێر وەشاندن دەستی پێکرد تا ئەوەی شمشێرەکان خوار بوون و زۆربەی ئەسپەکانی ئێمە و ئەوان لەپێ کەوتن و ژمارەیەکی زۆر لەهەر دوولا بریندار بوون. دوو کەسمان لێکوژرا. کۆیلەکەی زیاد کەئالآکەی بەدەستەوە گرتبوو بەناوی سوەید و یەکێك لەکوڕەکان بەناوی وافد کوڕی بەکر. پێنج کەسیش لەوان کوژران. شەو داهات و لەیەك جیابووینەوە، سوێند بەخوا لەئێمە بێزار بوون و ئێمەیش لێیان بێزار بووین. من و زیاد بریندار ببووین.

دەڵێت: ئەوان لەشوێنك ئارامیان گرت و ئێمەیش لەشوێنێکی دیکە. بەشێك لەشەو تێپەڕی. بەرێکەوتن و ئێمەیش شوێنیان کەوتین تا ئەوەی گەشتینە بەسرە. بیستمان ڕوویان لەئەهواز کردووە و لەیەکێك لەناوچەکانی ئەو سەرزەمینە دابەزیون. نزیکەی دووسەد کەس لەهاوەڵانیان لەکوفە مابوونەوە و نەیانتوانیبوو لەگەڵ ئەوان شارەکە بەجێبێڵن، پەیوەستیان بوون و هەموویان لەسەرزەمینی ئەهواز نیشتەجێ ببوون.

دەڵێت: زیاد کوڕی خەسەفە نامەیەکی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی:

((بەلآم دواتر، لەگەڵ دوژمنی خواوەند ڕووبەڕوو بووینەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ ڕێگەی ڕاستمان پێکردن، بەلآم تەسلیمی ڕاستییەکان نەبوون و گرفتاری گوناح و لەخۆبایی بوون بوون. شەیتان کردەوەکانی ئەوانی ڕازاندەوە و مەبەستی لەناوبردنی ئێمەیان کرد. ئێمەیش ڕووبەڕوویان بووینەوە و تا دەمەو ئێوارێ جەنگێکی قورسمان ئەزموون کرد. دوو پیاوی خۆپارێز لەئێمە کوژران و پێنج کەس لەوان و گۆڕەپانیان بەجێهێشت. ژمارەیەکی زۆر لەهەردوو لا بریندار بوو. کاتێك شەو داهات ڕوویان لەسەرزەمینی ئەهواز کرد و ئاگادار بووینەوە لەیەکێك لەناوچەکانی ئەو سەرزەمینە دابەزیون. ئێمە لەبەسرە

برینـدارەکانی خۆمـان تیمـار کـرد و چـاوەڕوانی فەرمانـەکانی تـۆیین. خـوا بتبەخشێت و سلاو لەتۆ بێت))

دەڵێـت: کاتێـك نامەکـەم بـردە لای عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب، نامەکـەی بـۆ خـەڵکان خوێنـدەوە، مەعقـەل کـوڕی قـەیس هەسـتا و وتـی: ئـەی سـەروەری بـاوەڕداران، هیـوادارم خواوەنـد لەچـاکییەکان نزیکـت بکاتـەوە، دەبێـت هـاوڕێ لەگەڵ ئەو کەسەی شوێن ئەم دەستەیە دەکەوێت، لەبەرابەر هەر کەسێك لـەوان، دەکـەس لەموسـوڵمانان جێگیر ببێـت بـۆ ئـەوەی کاتێـك ڕووبـەڕوویان دەبنـەوە، بەتەواوی لەناویان ببەن چوونکە ئەگەر دەستەیەکی بەرابەر لەگەڵیان ڕووبەڕوو ببێتەوە دەتوانن بەرگری بکەن لەبەر ئەوەی خـەڵکانێکی سارانشینن و خۆراگری دەکەنە پیشە و زیان لەموسوڵمانان دەدەن.))

وتـی: ئـەی مەعقـەل بـۆ بەرێکـەوتن ئامـادە بـە. دوو هـەزار کـەس لەخـەڵکانی کوفەی کردە هاوڕێی. یەزید کوڕی مەغفەل لەناویاندا دەبینـرا. نامـەی بۆ کـوڕی عەباس نووسی:

((بـەلام دواتـر، پیـاوێکی سەرسـەخت و بـوێر و نـاودار وخواپەرەسـت لەگـەڵ دوو هـەزار کـەس ڕەوانـە بکـە تـا شـوێن مەعقـەل بکـەوێت و کاتێـك لەویلایـەتی بەسرە تێدەپەڕێت، سەرکردەی هاورێکانی خـۆی بێـت تـا ئـەو کاتـەی پەیوەسـتی مەعقەل دەبێـت و کاتێك پەیوەسـتی بوو، مەعقەل سـەرکردەی هـەر دوو سوپاکە بێـت و نابێـت دژایـەتی مەعقـەل بکـات. فـەرمان بـەزیاد کـوڕی خەسـەفە بـدە بگەڕێتەوە. پیاوێکی خواپەرەستە و کوژراوەکەی یەکێکە لەچاکەکاران.))

باوکی سەعیدی عەقیلی دەڵێت: عەلی کوڕی ئـەبی تالیـب نامەیـەکی بۆ زیـاد کوڕی خەسەفە نووسی:

((بەلام دواتر، نامەکەی تۆم بەدەست گەیشت و ئەوەی سەبارەت بەو کەسە و هـاوەڵانی کەخواوەنـد دڵـی بەسـتوون و شـەیتان کردەوەکانیـان دەرازێنێتـەوە و گومان دەکەن کردەوەکانیان چاکەکارانەیە، ئاگادارم. لەجەنگی نێوانتان ئاگـادار بوومـەوە. هـەوڵی تـۆ و هاوەڵانـت لەرێگـەی خواوەنـد و پاداشـەکەتان لەئەسـتۆی خواوەندە. مژدەی پاداشتی خواییتان لێ بێت چوونکە لـەو جیهانـەی نەزانـەکان

خۆیانی بۆ بەکوشت دەدەن، باشترە. ئەوەی لەم جیهانەدا بێت، لەناو دەچێت و ئــەوەی لای خواوەنــد بێــت، هەمیــشەییە. خواوەنــد فەرموویــەتی:باشــترینی پاداشــەکان دەبەخــشین بــەخۆڕاگران بــۆ کردەوەکانیــان. بــەڵام ئــەو دوژمنــەی رووبەرووی بوونەتــەوە، ئەوەنــدەیان بەســە لەرزگارییــەوە ئامێزیــان بــۆ گــومڕایی کردۆتەوە و لەرێگەی راست دەرچوون و پێداگرانە سەرقاڵی فیتنەگێڕین. لەگەڵ درۆکانیان بەجێیان بێڵە تا لەیاخیگەری خۆیاندا ڕۆچن. تۆ بیسەر وبینەر بە. بەم زووانە دەبینی ئەسیر دەکرێن یا دەکوژرێن. خۆت و هاوەڵانت بۆ لای ئێمە بگەڕێنەوە. فەرمانەکانتان ئەنجام داوە و فەرمانبەر بوون. والسلام.))

دەڵێــت: نــاجی لەناوچــەیەك لەئــەهواز نیــشتەجێ بــوو. زۆربــەی خــەڵکانی ناباوەڕی ئەو ناوچە کەدەیانویست تەوقی خەراج لەمل فڕێبدەن لەگەڵ دزەکان و عەرەبەکانی هاوڕای خەواریج، پەیوەستیان بوون.

شــەعبی دەڵێــت: کاتێــك عــەلی کــوڕی ئــەبی تالیــب ســوپاکەی نــەهرەوانی کوشــتار کــرد، ژمارەیــەکی زۆر لەخــەڵکانی دژایــەتی خۆیــان دەســتپێکرد و کاروبــاری ویلایەتەکــە پەرێــشان بــوو. منداڵــەکانی ناجییــە ئــاڵای شۆڕشــیان بــەرز کردەوە. کوڕی حەزرەمی هاتە بەسرە. خەڵکانی ئەهواز شۆڕشیان کرد و خــەراج دەران مەبەســتی ئــەوەیان کــرد چــیتر خــەراج نــەدەن. ســەهل کــوڕی حــەنیف کارگوزارەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەفارس دەرکرد. کوڕی عەباس بە عەلی کــوڕی ئــەبی تــالیبی وت: کاروبــاری ســەرزەمینی فــارس بــەهۆی زیــادەوە سامان دەدەم. عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمانی پێدا تا زیاد بۆ ئەو ناوچەیە بنێرێت. کوڕی عەباس ڕۆشتە بەسرە و زیادی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان بۆ فارس ڕەوانە کرد کەخەڵکانی فارسی سەرکوت و بۆ خەراج دان ناچاری کردن.

عەبدوالله کوڕی فەقیمی ئــەزدی دەڵێت: من و براکــەم، کەعب، لەسوپاکەی مەعقەل کوڕی قەیسدا بووین. کاتێك دەیویست بەرێکەوێت، ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. ماڵئاوایی لێکرد و وتی: ئەی مەعقەل، تا دەتوانی لەخواوەند بترسە چوونکە بەمشێوەیە پێشنیاری بەباوەڕداران کردووە. دەستدرێژی مەکەرە سەر موسوڵمانان، ستەم لەئەهلی زەممە مەکە، یاخیگەری مەکەرە پیشە چوونکە

خواوەند ستەمکارانی خۆش ناوێت.))

مەعقەل وتی: دەبێت داوای هاوکاری لەخواوەند بکەین.

وتی: باشترین پشتیوانە.

دەڵێت: مەعقەل بەرێکەوت. ئێمەیش لەگەڵی بەرێکەوتین تا گەیشتینە ئەهواز. لەوێ چاوەڕوانی خەڵکانی بەسرەمان دەکرد.

دەڵێت: مەعقەل لەناوماندا وتارێکی خوێندەوە، وتی: ئەی خەڵکینە! ئێمە چاوەڕوانی هاتنی خەڵکانی بەسرەین بەڵام دوا کەوتوون. سپاس بۆ خوا ژمارەی سوپاکەی ئێمە کەم نییە و لەکەس ناترسین. هێرش دەکەینە سەر دوژمنان و لەناویان دەبەین. هیوادارم خواوەند سەرکەوتنمان پێ ببەخشێت و دوژمنان لەناو ببات.

دەڵێت: براکەم، کەعب کوڕی فەقیم، قسەی کرد و وتی: راستت وت، بۆچوونەکەی تۆ راستە، سوێند بەخوا هیوادارم خواوەند سەرکەوتنمان پێ ببەخشێت و جیاواز لەوشێوە، مەرگ لەرێگەی راستی هۆکاری ئاسوودە بوونە لەدنیا.

وتی: پشت بەخوا بەرێکەون.

دەڵێت: بەرێکەوتین. سوێند بەخوا مەعقەل رێزی لێ دەگرتم، هیچ کەس لەسوپاکەی بەهاوتای من نەدەزانی. بەردەوام دەیوت: چەندە خۆش بوو ئەو کاتەی وتت مەرگ لەرێگەی راستی هۆکاری ئاسوودە بوونە لەدنیا. سوێند بەخوا راستە.

دەڵێت: سوێند بەخوا هێشتا یەك مەنزڵ نەڕۆشتبووین، نێردراو هاتە لامان، بەخێرایی رێگەی دەبڕی. نامەیەکی عەبدوڵڵە کوڕی عەباسی پێ بوو. ئەمە دەقی نامەکەیە:

((بەڵام دواتر، ئەگەر نێردراوەکەی من لەو شوێنەی کەچاوەڕوانیت گەیشتە لای تۆ، یا کاتێك گەیشت کەبەرێکەوتبوویت، لەو شوێنەی نێردراوەکەم دەگاتە لای تۆ، زیاتر مەڕۆ پێش تا سوپاکەی بەسرە پەیوەستی تۆ ببێت. من، خالید کوڕی مەعدانیی تاییم ڕەوانە کردووە. پیاوێکی بوێر و خواپەرەستە. گوێ

لەوتەکانی بگرە و راوێژی پێ بکە. والسلام.))

دەڵێت: مەعقەل نامەکەی بۆ خەڵکان خوێندەوە. سوپاسی خواوەندی کرد چوونکە لەم سەفەرە دەترسان.

دەڵێت: ماینەوە تا خالید پەیوەستمان بوو. وەك ئەمیر سلاوی بۆ نارد. هەردووکیان لەیەك ئوردووگا کۆبوونەوە. بەرێکەوتین بۆ ئەوەی رووبەرووی ئەو دەستەیە ببینەوە. ئەوان بەرەو کوێستانەکانی رامهورموز، ملی رێگەیان گرتەبەر. دەیانویست خۆیان بەقەلا بەهێزەکەی ئەو ناوچەیە بگەیێنن. خەڵکانی ویلایەتەکە هاتن و ئێمەیان لێ ئاگادار کردەوە. ئێمە بەدوایاندا بەرێکەوتین. لەنزیك کێوەکە پێیان گەشتینەوە. ریزمان بەست و رووبەروویان بووینەوە.

دەڵێت: مەعقەل، یەزید کوڕی مەغفەلی وەك فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی دانا، مەنجاب کوڕی راشدی زەبیی لەخەڵکانی بەسرەی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دەستنیشان کرد. خورەیت کوڕی راشدی ناجی، عەرەبەکانی ژێر دەستی خۆی ریز کرد کەلای راستی ئەو جێگیر بوون. خەڵکانی ویلایەتەکە و ئەو کەسانەی دەیانویست خەراج نەدەن لەگەڵ کوردەکان، لەباڵی چەپی سوپاکەی خورەیت جێگیر بوون.

دەڵێت: مەعقەل بەناو ئێمەدا دەگەڕا، هانی دەداین و دەیوت: بەندەکانی خوا! چاو مەبڕنە ئەم خەڵکە، چاوتان ببەستن، کەمتر قسە بکەن و تەنیا بیر لەجەنگیان بکەنەوە. دڵخۆش بن چوونکە پاداشێکی گەورە چاوەڕوانتان دەکات. دژی کەسێك دەجەنگن لەرێگەی راست لایداوە، دژی کافرەکان و ئەو کەسانەی خەراجیان نەداوە، ((دژی کوردەکان[٦])) دەجەنگن، سەیری من بکەن، کاتێك هێرشم برد، هێرش بەرن.

دەڵێت: مەعقەل لای هەموو ریزەکان تێپەڕی و وتەکانی دووبارە دەکردەوە. کاتێك لای هەمووی خەڵکان تێپەڕی، هات ولەناو دڵی سوپاکەدا وەستا. سەیرمان دەکرد بۆ ئەوەی بزانین چی دەکات. ئالاکەی خۆی دووجار راوەشاند. سوێند بەخوا، خۆڕاگرییەکی کەمیان کرد. پشتیان کردە گۆڕەپان و حەفتا کەس

---

[٦] ئاشکرایە ئەم هەڵوێستە لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت، پێویست بەهیچ روون کردنەوەیەك ناکات (وەرگێڕ)

لەمناڵەکانی ناجییە و عەرەبەکانی دیکەی هاورێیان و سێسەد کەس لەکافرەکان و کوردەکانمان کوشت.

کەعب کوڕی فەقیم دەڵێت: بەناو کوژراوە عەرەبەکاندا گەڕایین. هاورێیکەم مەدرەك کوڕی ڕییانم بەکوژراو بینی. خورەیت کوڕی راشد هەڵات و خۆی گەیاندە کەنار دەریا. دەستەیەکی زۆر لەخەڵکی هۆزەکەی لەوێ بوون. بەردەوام لەناو ئەواندا دەگەڕا و بۆ دژایەتی کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هانی دەدان. دەیوت: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب جیابۆتەوە و رزگاری لەدژایەتی کردنی ئەودایە تا ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی پەیوەستی بوون.

مەعقەل لەسەرزەمینی ئەهواز مایەوە و بەمندا هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی. ڕۆشتمە لای. ئەمەی نووسی:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بۆ بەندەی خوا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سەروەری باوەڕداران، لەمەعقەل کوڕی قەیس. سلاو لەتۆ. سپاسی خوا دەکەم چوونکە جگە لەو خوایەك نییە. بەڵام دواتر، ڕووبەڕووی بێ دینەکان بووینەوە. لەڕیاکاران دژی ئێمە هاوکارییان وەرگرتبوو. هاوشێوەی نەتەوەی عاد و ئیرەم کوشتارمان کردن. بەڵام فەرمان و پێشنیارەکانی تۆمان پشت گوێ نەخست بەو واتایی سنوورەکانمان نەبەزاند، هەڵاتوو و ئەسیر و برینندارەکانمان نەکوشت. خواوەند سەرکەوتنی بەتۆ و موسوڵمانان بەخشی. سپاس بۆ پەروەردگاری جیهانییان.))

دەڵێت: نامەکەم بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب برد. نامەکەی بۆ هاوەڵانی خوێندەوە و راوێژی لەگەڵ کردن. بۆچوونی هەمووان یەکێك بوو. وتیان: فەرمان بەمەعقەل کوڕی قەیس بدە شوێن ئەو ریاکارە بکەوێت و بەردەوام بەدوایەوە بێت تا ئەو کاتەی دەیکوژێت یا لەو ویلایەتە دەردەپەڕێنێت چوونکە دەترسین خەڵکان دژی تۆ هان بدات.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب منی ڕەوانە کردەوە و بەمندا نامەیەکی نووسی. دەقی نامەکە بەمشێوە بوو:

((بەلام دواتر، سپاس بۆ خواوەند کەهاوکاری هاوەڵانی خۆی کرد و

دوژمنـانی لـەناو بـرد. خواوەنـد پاداشـتی تـۆ و موسـوڵمانان بداتـەوە چـوونکە هەوڵتاندا و ئەرکـەکانی خۆتـان ئەنجامـدا. شـوێن نـاجی بکـەووە و ئەگـەر ئاگـادار بوویتـەوە لـەکام سـەرزەمینە، بـڕۆ و خـوێنی بڕێـژە یـا لەویلایەتەکە دەرپـەڕێنە چوونکە تا ئەو کاتـەی زینـدوو بێـت دوژمنـی موسـوڵمانان و هـاوڕێی سـتەمکاران دەبێت.

دەڵێـت: مەعقـەل پرسـیاری شـوێنی نـاجی کـرد. پێیـان وت لەکەنارەکانـە و خەڵکەکـەی خـۆی بـۆ دژایـەتی-کردنـی-عـەلی-کـوڕی ئـەبی تالیـب فریـوداوە و خەڵکانی عەبدقەیس و عەرەبەکانی دیکەی دراوسێی خۆیان گومڕا کردووە.

خـەڵکی هۆزەکـەی نـاجی لەسـاڵی سـەفین زەکاتیـان نـەدابوو. لـەم ساڵەیـشدا زەکاتیان نەدا. مەعقەل کوڕی قەیس لەگەڵ سوپاکەی خەڵکانی کوفە و بەسـرە بەڕێکـەوت و ڕێگـەی فارسـی گرتەبـەر تـا گەشـتە کـەنارەکانی دەریـا. کاتێـك خورەیت کوڕی ڕاشد لـەهاتنی ئـەو ئاگـادار بوویـەوە، بەشێوەیەکی نهێنی بـەو دەسـتە لەعەرەبـەکانی وت کـەبیرواری خـەواریجیان هـەڵگرتبوو: بۆچـوونم هاوشـێوەی بۆچـوونی ئێوەیـە و نـەدەبوا عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب لـەکاروباری تایبـەت بەخواوەنـد بـەداوەریی کـردن ڕازی ببێـت. بـۆ ئـەوەی دەسـتەکەی دیکـە سەرسـەخت و پێداگر بکـات، پێـی وتـن: عـەلی داوەری دیـاریکرد و ڕازی بـوو. داوەرەکـەی لەسـەر کـار لایـبرد، منـیش بەفـەرمانی داوەرەکـەی ئـەو ڕازیـم و ڕەزامەنـد. بـەم بۆچـوونە لەکوفـە هاتـدەر. بەشـوێنکەوتەکانی عوسمـانی وت: سوێند بەخوا لایەنگری ئێوەم. سوێند بەخوا عوسمان بەستەم کوژرا.

دەڵێت: بەمشێوەیە هـەموو دەستەکانی ڕازی کـرد و وای نیشاندا بۆچوونی لەگەڵ ئەوان چوون یەکە. ئەو دەستەی زەکاتیـان نـەدەدا، پێـی وتـن: زەکاتـەکانی خۆتـان پاشـەکەوت بکـەن و بەوشـێوەیە هاوکـاری خزمـەکانتان بکـەن ئـا ئەگـەر دەخوازن لەناو هەژارەکاندا دابەشی بکەن.

دەڵێت: لەناو ئەم خەڵکە ژمارەیەکی زۆر لەمەسیحییەکان دەبینرا کەباوەڕیان بەئیـسلام هێنـابوو. کاتێك دوو بـەرەکی لـەناو موسـوڵمانان هاتـە ئـاراوە، وتیـان: سوێند بەخوا دینە کۆنەکەی خۆمان زۆر باشترە و لەرزگارییـەوە نـزیکتر چـوونکە

دینەکەی ئەوان ڕێگەی خوێنرێژی و تالاّن کردنی سامانی یەکتریان لیّ ناگرێت. و جارێکی دیکە باوەڕیان بەدینەکەی خۆیان هێنایەوە.

دەڵێت: خوەریت چاوی پێیان کەوت و وتی: هاوار لەئێوە، دەزانن فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەو مەسحییانە باوەڕیان بەئیسلام هێناوە و دواتر پەشیمان دەبنەوە، چییە؟ سوێند بەخوا گویّ لەوتەکانیان ناگرێت و بەهیچ پاساوێك رازی نابێت و گرنگی بەتۆبەکانیان نادات. فەرمانەکەی بەمشێوەیە: کاتێك بەسەر ئێوەدا سەرکەوێت، هەمووتان دەکوژێت. بەردەوام قسەی بۆ دەکردن تا ئەوەی ئەوانی کۆکردەوە و فریویدان. هەموو منالّەکانی ناجییە و کەسانی دیکەی ئەو سەرزەمینە هات و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە.

باوکی توفەیل دەڵێت: یەکێك بووم لەشەرکەرانی ئەو سوپایەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ هێرش کردنە سەر منالّەکانی ناجییە ڕەوانەی کرد.

دەڵێت: گەشتینە لای ئەوان و بینیمان سیّ دەستەن. سەرکردەکەی ئێمە بەدەستەیەك لەوانی وت: ئێوە کێن.

وتیان: ئێمە مەسیحین. دینەکەی ئێوەمان بەباشتر لەدینەکەی خۆمان نەزانی و لەسەر دینەکەی خۆمان ماوین.

پێی وتن: لەیەك شوێندا کۆببنەوە.

دواتر بەدەستەکەی دیکەی وت: ئێوە کێن؟

وتیان: ئێمە مەسیحی بووین، باوەڕمان بەئیسلام هێنا و لەسەر باوەڕەکەی خۆمان پێداگری دەکەین.

وتی: لەیەك شوێن کۆببنەوە.

دواتر بەدەستەکەی دیکەی وت: ئێوە کێن؟

وتیان: ئێمە مەسیحی بووین، باوەڕمان بەئیسلام هێنا، بەلاّم دینەکەتان باشتر لەدینەکەی خۆمان نییە.

پێشنیاری پێکردن تۆبە بکەن و باوەڕ بێنن بەلاّم رازی نەبوون.

بەهاوەلاّنی خۆی وت: کاتێك سیّ جار دەستم بەسەری خۆمدا هێنا،

هێرشیان بکەنەسەر. شەرکەرەکانیان بکوژن و ژن و منالەکانیان ئەسیر بکەن.

دەڵێت: ئەسیرەکانیان بردە لای عەلی کوری ئەبی تالیب. مەسقەلە کوری هەیبەرەی شەیبانی هات و ئەوانی بەدووسەد هەزار درەم کری. سەد هەزار درەمی بردە لای عەلی کوری ئەبی تالیب بەلام وەری نەگرت و رۆشت و ئەسیرەکانی ئازاد کرد و پەیوەستی معاویە بوو. بەعەلی کوری ئەب یتالبیان وت: ئەسیرەکان ناگریت؟

وتی: نە. کێشەی بۆ دروست نەکردن.

حارس کوری کەعب دەڵێت: کاتێك مەعقەل کوری قەیس هاتە لای ئێمە، نامەیەکی عەلی کوری ئەبی تالیبی بۆ خوێندینەوە بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا، عەلی کوری ئەبی تالیب، سەروەری باوەرداران، بۆ باوەرداران و موسولمانان و مەسیحییەکان و ئەو هەلگەراوانەی ئەم نامەیان بۆ دەخوێندرێتەوە. سلاو لەئێوە بێت، سلاو لەو کەسەی شوێنکەوتەی رزگارییە و باوەری بەخوا و کتێب و پێغەمبەر و ژیانی دوای مەرگ هەیە و بەلێنەکانی خۆی بردۆتە سەر و خیانەتکار نییە.

بەلام دواتر، پێشنیاری گەرانەوە بۆ رێگەی راست و شوێنکەوتنی کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەرتان پێ دەکەم. هەرکەس لەئێوە بۆ لای کەسەکانی خۆی بگەرێتەوە و بخوازێت لەو نفرین کراوەی دوژمنی خواوەند، خۆی بەدوور بگرێت، گیان و سامانی پارێزراوە و هەرکەس بۆ جەنگ هاوکاری بکات، پشت بەخوا دەبەستین و خواوەند دەکەینە داوەری نێوان خۆمان.

دەڵێت: مەعقەل ئالای ئەمانی هەلکرد و وتی: هەرکەس لەدەوری ئەو ئالایە کۆببێتەوە، پارێزراوە جگە لەخورەیت و هاوەلانی کەبۆ جەنگی ئێمە ریزیان بەستووە. زۆربەی ئەو کەسانەی لەگەڵ خورەیت بوون بەلام لەتایەفە و هۆزەکەی خۆی نەبوون، بلاوەیان لێکرد.

دەڵێت: مەعقەل سوپاکەی رازاندەوە. یەزید کوری مەغفەلی ئەزدی وەك فەرماندەی بالی راست دیاریکرد، مینجاب کوری راشدی زەببی لەبالی چەپ

داناو هێرشی کردە سەرخورەیت. خەڵکانی هۆزەکەی و ئەو کەسانەی باجیان نەدەدا، شان بەشانی خورەیت دەجەنگان.

باوکی سدیقی ناجی دەڵێت: ئەو رۆژە خورەیت بەخەڵکەکەی خۆی وت: بەرگری لەسنووری خۆتان بکەن و بۆ پاراستنی ژن و منداڵەکانی خۆتان بجەنگن. سوێند بەخوا ئەگەر سەرکەوتن دەتانکوژن و ژن و منداڵەکانتان ئەسیر دەکەن.

یەکێك لەپیاوانی هۆزەکەی پێی وت: سوێند بەخوا ئەم زیانە لەدەست و زمانی تۆوە سەرچاوەی گرتووە.

وتی: خوا بتبەخشێت، بجەنگن چوونکە کاتی ئەو قسانە نییە. سوێند بەخوا خەڵکەکەم ئاوزیان لەدەست داوە.

عەبدوالله کوڕی فەقیم دەڵێت: مەعقەل هاتە ناو ئێمە و لەچەپەوە بۆ راست، هانی شەڕکەرانی دەدا. دەیوت: ئەی موسوڵمانان! زیاتر لەو پاداشە گەورەی لەم جەنگە بەدەستی دێنن، چیتان دەوێت؟ خواوەند بۆ جەنگی کەسانێك ڕەوانەی کردوون لەرووی ستەمکاری و یاخیگەرییەوە باج و زەکات نادەن و لەئیسلام پاشگەز بوونەتەوە و بەیعەتیان شکاندووە. شایەتی دەدەم هەر کەس لەئێوە بکوژرێت، بەهەشتییە و هەر کەس زیندوو بمێنێتەوە خواوەند چاوی بەسەرکەوتن رووناك دەکاتەوە.

دەڵێت: بەمشێوەیە لای هەموو شەڕکەران تێپەڕی. دواتر ئاڵابەدەست هات و لەناوەڕاستی سوپاکەدا وەستا. کەسی بۆ لای یەزید کوڕی مەغفەلی ریباحی نارد و فەرمانی هێرش بردنی پێدا.

یەزید هێرشی برد. خۆڕاگرییان کرد و بوێرانە جەنگان. یەزید گەڕایەوە و لەباڵی راست لەشوێنەکەی خۆی جێگیر بوو. مەعقەل کەسی بۆ لای فەرماندەی باڵی راست و چەپ نارد و وتی: هەرکات هێرشم برد، هێرش بەرن. ئاڵاکەی خۆی شەکاندەوە و هێرشی برد. هاوەڵانی هێرشیان برد. ماوەیەك خۆڕاگرییان کرد. دوای ئەوە نەعمان کوڕی سەهبانی راسبی جورەمی، خورەیت کوڕی راشدی بینی و هێرشی کردەسەر و بەشمشێر لێیدا و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. خۆیشی لەچوارپێکەی هاتەخوار. خورەیت بریندار ببوو، بۆ چەند ساتێك بەشمشێر

لەیەکیاندا و سەرئەنجام نەعمان کوشتی. سەد و حەفتا کەسیش لەهاوەڵانی کوژران و کەسانی دیکە هەڵاتن.

دەڵێت: مەعقەل کوڕی قەیس سوارەکانی بۆ ئوردووگای ئەوان نارد و هەموو کەسانی ناو ئوردووگاکەی ئەسیر کرد. ژمارەی ئەسیرەکان لەپیاو و ژن و منداڵ فراوان بوو. سەیری ئەسیرەکانی کرد. هەرکەس باوەڕی هێنا، بەیعەتی لێوەرگرت و ئازادی کرد و ژن ومناڵەکەی بۆ گەڕاندەوە. ئەوانەی هەڵگەڕابوونەوە، پێشنیاری باوەڕهێنانی پێکردن. ئەوانیش باوەڕیان هێنا و ئازادی کردن. ژن و منداڵی ئەوانیشی ئازاد کرد. جگە لەپیرێکی مەسیحی بەناوی ڕەماجس کوڕی مەنسور کەوتی: سوێند بەخوا بەدرێژایی تەمەنی خۆم هیچ هەڵەیەکم نەکردووە مەگەر ئەوەی لەدینە پاکەکەی خۆم هەڵگەڕامەوە و باوەڕم بەدینەکەی ئێوە هێنا. نا سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی زیندوو بم دەستبەرداری دینەکەی خۆم نابم و لەئێوە نزیک نابمەوە. مەعقەل سەری بڕی.

دەڵێت: مەعقەل خەڵکانی کۆکردەوە و وتی: ئەو زەکاتەی لەم ساڵانەدا نەتانداوە، بیدەن. دوو زەکاتی لێ وەرگرتن. مەسیحی و ژن و منداڵەکانی لەگەڵ خۆی برد. موسوڵمانان بۆ پێشوازی ئەوان هاتبوون. مەعقەل فەرمانیدا وئەوانیان گەڕاندەوە. کاتێك دەیانویست بڕۆن، دەستیان بۆ یەك ڕاوەشاند و دەگریان: پیاوان لەگەڵ پیاوان و ژنان لەگەڵ ژنان دەگریان.

دەڵێت: بەرادەیەك بەزەییم بەواندا هاتەوە تا ئەو ڕۆژە هیچ کات بەو ئەندازەیە بەزەییم بەکەسدا نەهاتبوویەوە.

دەڵێت: مەعقەل نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی:

((بەڵام دواتر، سەروەری باوەڕداران لەبەسەرهاتی دوژمن و سوپاکەی ئاگادار دەکەمەوە: بۆ ڕووبەڕووی دوژمن لەکەنارەکان بەرێکەوتین. لەوێ لەگەڵ چەندین هۆزی بوێر ڕووبەڕوو بووینەوە کەبۆ جەنگ دژی ئێمە یەکیان گرتبوو. پێشنیاری پەیوەست بوون بەکۆمەڵانی خەڵك و گەڕانەوە بۆ ڕێگەی ڕاستم پێکردن و نامەی سەروەری باوەڕدارانم بۆ خوێندنەوە و ئاڵای ئەمانمان بۆ بەرز کردنەوە. دەستەیەك لەوان پەیوەستمان بوون و دەستەیەك لەسەر دوژمنایەتی خۆیان پێداگرییان کرد. لەگەڵ نەیارەکان جەنگاین و خواوەند ڕیسوا و سەرکوتی کردن و سەرکەوتنی

بەئێمە بەخشی. هەرکەس موسوڵمان بوو، ئازادمان کرد و بۆ سەروەری باوەڕداران بەیعەتمان لێوەرگرت و زەکاتمان لێ سەند. بەهەڵگەڕاوەکانمان وت هەرکەس بگەڕێتەوە سەر ئاینی ئیسلام دەیبەخشین و گەرنە دەیکوژین. هەمووان دووبارە باوەڕیان هێنا جگە لەیەك کەس و کوشتمان. مەسیحییەکانمان ئەسیر کرد و لەگەڵ خۆمان دەیهێنین تا ببنە وانەیەك بۆ ئەهلی زەممە و ئەم خەڵکە ریسوایە چیتر لەباجدان خۆیان نەدزنەوە و بوێری جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان نەکەن. ئەی سەروەری باوەڕداران خوا بتبەخشێت و سڵاو لەتۆ بێت.))

دەڵێت: ئەسیرەکانی لەگەڵ خۆی هێنا و لای مەسقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی گوزەری کرد. مەسقەلە کارگوزاری ئەردەشێر خەرە بوو. ئەسیرەکان پێنسەد کەس بوون. ژنان و منداڵەکان دەگریان و پیاوەکان هاواریان کرد: ئەی باوکی فەزڵ، ئەی پشتیوانی پیاوان و رزگارکەری رەنجدەران! منەتمان بخەسەر و بمانکڕەوە و ئازادمان بکە.

مەسقەل وتی: سوێند بەخوا ئەوان ئازاد دەکەم چوونکە خواوەند ئەو کارەی پێ پەسەندە.

ئەم وتەیە بەمەعقەل گەیشت و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی ئەم وتەی بۆ هاوخەمی لەگەڵ ئەوان هێناوەتە سەرزمان، دەمکوشت هەرچەند دەبووە هۆی لەناچوونی هۆزی تەمیم و بەکر کوڕی وایل.

مەسقەلە، زوهەل کوڕی حارسی زوهەلی بۆ لای مەعقەل کوڕی قەیس نارد و وتی: منداڵەکانی ناجییە بەمن بفرۆشە.

وتی: بەیەك هەزار بەتۆی دەفرۆشم. ئەسیرەکانی رادەستی ئەو کرد و وتی: هەرچی زووتر ئەو برە پارەیە بۆ سەروەری باوەڕداران بنێرە.

وتی: لەئێستادا بەشێکی دەنێرم و دواتر بەشەکەی دیکەی دەنێرم.

دەڵێت: مەعقەل کوڕی قەیس ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەسەرهاتی ئەسیرەکانی بۆ گێڕایەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کارەکەت پەسەندە. چاوەڕوان بوو تا مەسقەلە برە پارەکەی بۆ بنێرێت. دواتر ئاگادار بوویەو مەسقەلە ئەسیرەکانی ئازاد کردووە و داوای لێنەکردوون لەئازاد کردنی خۆیان هاوکاری بکەن. وتی: پێم وابێت

مەسقەلە بەڵێنێکی داوە بەڵام لەئەنجام دانی ناتەوانە.

دواتر نامەیەکی بۆ نووسی:

((بەڵام دواتر، گەورەترین خیانەت، خیانەت لەئۆمەتە و گەورەترین دەغەڵی لەگەڵ خەڵکانی شار، دەغەڵی لەگەڵ پێشەوایە. پێنسەد هەزاری سامانی موسوڵمانان لای تۆیە. کاتێك نێردراوی من گەیشتە لای تۆ، ڕەوانەی بکە و گەرنە ئەو کاتەی نامەکەی من بەدەستت دەگات بەرێکەوە چوونکە فەرمانم بەنێردراوەکەم داوە دوای ئەوەی دەگاتە لای تۆ، ڕێگە نەدا بمێنیتەوە مەگەر ئەوەی سامانی موسوڵمانان ڕەوانە بکەیت. سڵاو لەتۆ.

دەڵێت: نێردراو باوکی جوڕەی حەنەفی بوو. باوکی جوڕە بەمەسقەلەی وت سامانەکە ڕەوانە بکات و گەرنە دەبێتە بڕواتە لای سەروەری باوەڕداران. کاتێك مەسقەلە نامەکەی خوێندەوە بەرێکەوت و هاتە بەسرە و چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە. لەوێ کوڕی عەباس داوای سامانەکەی لێکرد. کارگوزارانی بەسرە سامانە کۆکراوەکانیان بۆ لای کوڕی عەباس دەنارد و ئەو ڕەوانەی لای سەروەری باوەڕدارانی دەکرد.

دەڵێت: مەسقەلە بەکوڕی عەباسی وت: زۆر باشە، چەند ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە. ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و چەند ڕۆژێك مۆڵەتی پێدا و دواتر داوای سامانەکەی کرد. مەسقەلە دووسەد هەزار درەمی پێدا بەڵام نەیتوانی بڕی ماوەی پارەکە کۆبکاتەوە.

باوکی سەڵت ئەعوەر لەزوهەل کوڕی حارس دەگێڕێتەوە: مەسقەلە منی بۆ شوێنەکەی خۆی بانگ کرد. نانی شەویان هێنا و خواردمان. وتی: سەروەری باوەڕداران ئەو بڕە پارەی دەوێت بەڵام ناتوانم ئەو بڕە ئامادە بکەم.

وتم: ئەگەر بخوازیت لەماوەی یەك حەفتە ئەو بڕە پارە کۆدەکەیتەوە.

وتی: سوێند بەخوا کەسێك نیم قورسایی ئەم کارە بخەمە سەرشانی خەڵکەکەم.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر کوڕی هیند داوای ئەم سامانەی دەکرد یا کوڕی عەفان، بەمنیان دەبەخشی مەگەر نازانی کوڕی عەفان ساڵانە لەخەراجی ئازەربایەجان سەد هەزار درەمی بەکوڕی ئەشعەس دەبەخشی؟

وتم: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەو کارە ناکات. سوێند بەخوا چاوپۆشی لەو

سامانە ناکات.

دەڵێت: ماوەیەك بێدەنگ بوو. منیش بێدەنگ بووم. سوێند بەخوا رۆژێك دوای ئەم گفتوگۆیە پەیوەستی معاویە بوو. کاتێك ئەم هەواڵە لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، وتی: خواوەند بەنەحلەتی بکات، بۆ هاوشێوەی گەورەکان کردەوەی نیشاندا و هاوشێوەی بەندەکان هەڵات و هاوشێوەی خراپەکار، خیانەتی کرد. سوێند بەخوا ئەگەر دەمایەوە و سامانەکەی نەدەگێڕایەوە، تەنیا زیندانیمان دەکرد. دەستمان بەسەر سامانەکەیدا دەگرت و دواتر ئازادمان دەکرد.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب رووی کردە ماڵەکەی مەسقەلە و لەدەرگایدا. برای مەسقەلە، نەعیم کوڕی هوبەیرە، چاکەخوازی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. مەسقەلە لەشامەوە بەیەکێك لەمەسیحییەکانی مناڵەکانی تەغلەب بەناوی حیلوان نامەیەکی بۆ نووسی بەم ناوەرۆکە:

بەڵام دواتر، سەبارەت بەتۆ قسەم لەگەڵ معاویە کردووە، بەڵێنی فەرمانڕەوایی پێداویت. کاتێك نێردراو گەیشتە لای تۆ، بەرێکەوە. والسلام.

دەڵێت: مالك کوڕی کەعبی ئەرحەبی نێردراوەکەی گرت و بردییە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب . نامەکەی گرت و خوێندییەوە و دەستی پیاوی مەسیحی بڕی. پیاوەکە مرد. نەعیم نامەیەکی بۆ مەسقەلەی برای نووسی. هۆنراوەیەکی درێژە و کاتێك مەسقەلە نامەکەی خوێندەوە زانی نێردراوەکەی مردووە. زۆری نەخایاند مناڵەکانی تەغلەب لەمەرگی حیلوان ئاگادار بوونەوە، ڕۆشتنە لای مەسقەلە و وتیان: تۆ هاوڕێکەی ئێمەت ناردووە و ئەوت بەکوشتندا. یا زیندووی بکەرەوە یا خوێنباییەکەی بدە.

وتی: ناتوانم زیندووی بکەمەوە بەڵام خوێنباییەکەی دەدەم.

عەبدولرەحمان کوڕی جوندەب لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك هەواڵی شکانی مناڵەکانی ناجییە و کوژرانی خورەیت بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، وتی: چەندە کەم ئاوز بوو و چەندە بۆ دژایەتی کردنی پەروەردگار بوێر. جارێك هاتە لای من و وتی: لەناو هاوەڵانی تۆ کەسانێك هەن دەترسم جیا ببنەوە؛ بۆچوونت سەبارەت بەوان چییە؟

وتم: تەنیا لەبەر تۆمەت سەرکۆنەیان ناکەم و بەهۆی گومانەوە سزایان نادەم.

تەنیا لەگەڵ ئەو کەسانە دەجەنگم دژایەتی و دوژمنایەتی ئێمە دەکەن بەڵام دوای ئەوەی پێشنیاری گەڕانەوەم پێکردن. ئەگەر تۆبەیان کرد و گەڕانەوە، رازی دەبین چوونکە دووبارە دەبنەوە بەبرای ئێمە و ئەگەر رازی نەبوون و بۆ جەنگ و دژایەتی کردنی ئێمە پێداگرییان کرد، پشت بەخواوەند دەبەستین و دژیان دەجەنگین.

جارێکی دیکە هاتە لام و وتی: دەترسم عەبدوالله کوڕی وەهبی راسبی و زەید کوڕی حەسین گومڕا بن. بیستوومە لەپشت سەری تۆ قسە دەکەن. ئەگەر ئەو قسانە ببیستیت، پشتگوێیان ناخەیت تا ئەو کاتەی دەیانکوژیت یا سزایان دەدەیت. رێگە مەدە لەدەرەوەی زیندان بن.

وتم: راوێژ بەتۆ دەکەم، دەبێت چی بکەم؟

وتی: پێم وایە بانگیان بکەیت و سەریان ببڕیت.

دەڵێت: زانیم نەخواپەرەستە نەبیرمەند. پێم وت: سوێند بەخوا نەخواپەرەستی نەبیرمەند. ئەگەر من مەبەستی کوشتنی ئەوانم دەکرد دەبوا بڵێی لەخوا بترسە، بۆ کوشتنی ئەوان بەپەروا دەزانیت لەکاتێکدا کەسیان نەکوشتووە و لەتۆ جیانەبوونەتەوە و هێشتا ملکەچی فەرمانەکانی تۆن.))

لەمساڵەدا قیسەم کوڕی عەباس بەنوێنەرایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرپەرەستی حەج و حاجییەکانی گرتە ئەستۆ. باوکی مەعشەر ئاماژەی بەم گێڕانەوەیە داوە. لەو کاتەدا قیسەم کارگوزاری مەککە بوو. کارگوزاری یەمەن عوبەیدالله کوڕی عەباس، کارگوزاری بەسرە عەبدوالله کوڕی عەباس بوو. سەبارەت بەکارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەخوراسان بۆچوونەکان جیاوازە. دەڵێن خولەیەد کوڕی قورەی یەربوعی و بەوتەیەك کوڕی ئەبزی بووە. شام و میسر لەژێر دەستی معاویە و کارگوزارەکانی ئەودا بوو.

ساڵی سی و نۆ دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سی و نۆیەم

یەکێك لەرووداوە گرنگەکانی ئەم ساڵە ئەمەیە: معاویە کوڕی ئەبوسوفیان سوپاکەی خۆی بۆ سنوورەکانی ژێر دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد. وەك لەعەوانە دەگێڕنەوە، نەعمان کوڕی بەشیری لەگەڵ دوو هەزار کەس بۆ عەین ئەلتەمر نارد. مالك کوڕی کەعب لەگەڵ هەزار کەس لەوێ لەپادگانەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا بوو و مۆڵەتیان پێدابوو بەرەو کوفە بڕوات. کاتێك نەعمان گەیشتە ئەو ناوچەیە زیاتر لەسەد کەسی لەگەڵ نەمایەوە. مالك بەسەرهاتی نەعمان و هاورێکانی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد و فەرمانی بەرێکەوتنی پێدان بەڵام سستییان لەخۆیان نیشاندا. مالك رووبەرووی سوپا دوو هەزار کەسییەکەی نەعمان بوویەوە. ئەو، سەد پیاوی شەڕکەری لەگەڵدا بوو. بەهاوەڵانی خۆی وت دیوارەکان لەپشت سەرتانەوە بێت و بجەنگن. نامەیەکی بۆ موخەنەف کوڕی سولەیم نووسی تا هاوکاری بکات.

دەڵێت: مالك و شەڕکەرەکانی بوێرانە جەنگان. موخەنەف کوڕەکەی خۆی عەبدولرەحمانی لەگەڵ پەنجا کەس بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتن مالك و هاورێکانی کالانی شمشێرەکانی خۆیان شکاندبوو و ئامێزیان بۆ مەرگ گرتبوویەوە. کاتێك خەڵکانی شام، عەبدولرەحمان و هاورێکانی ئەویان بینی، گومانیان کرد هێزی پشتیوان بۆ مالك هاتووە و شکستیان خوارد. مالك شوێنیان کەوت و سێ کەس لەوانی کوشت. ئەوانی دیکە خۆیان دەرباز کرد.

عومەر کوڕی حەسان لەیەکێك لەپیرەکانی منداڵەکانی فەزارە دەڵێت: معاویە نەعمان کوڕی بەشیری لەگەڵ دوو هەزار کەس ڕەوانە کرد. روویان کردە عەین ئەلتەمر و هێرشیان کردە سەر ئەو ناوچەیە. کارگوزارەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەناوی کوڕی فلانی ئەرحەبی لەگەڵ سێسەد کەس لەوێ بوو. نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمانی بەرێکەوتنی بەخەڵکاندا بەڵام سستییان لەخۆیان نیشاندا.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە سەر مینبەر. کاتێك گەیشتم، شایەتوومانی هێنابووە سەرزمان و وتبووی:

((ئەی خەڵکانی کوفە کاتێك دەبیستن دەستەیەك لەخەڵکانی شام لێتان نزیك بوونەتەوە دەڕۆنە ماڵەکانی خۆتان و دەرگاکان دادەخەن و هاوشێوەی مارمێلك دەخزێنە کونەکەی خۆتان. فریودراو کەسێکە ئێوە فریوتان دابێت))

هەرکەس پشت بەئێوە ببەستێت، تیرێکی شکاوی لەدەستایە. نە لەکاتی کارەسات، کەسە ئازادەکانن و نە لەکاتی هاوکاری برواپێکراوان. انا لله و انا الیه راجعون. چەندە بەلاّ و زیان لەئێوەوە دەبینم! کوێرن و نابینن، لاڵن و نادوێن، کەڕن و نابیستن. انا لله و انا الیه راجعون.))

عەوانە دەڵێت: لەم ساڵەدا معاویە سوفیان کوڕی عەوق لەگەڵ شەش هەزار کەس ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەرەو هیت بڕوات و هێرش بکاتە سەر ئەو سەرزەمینە. دواتر تا ئەنبار و مەداین پێشڕەوی بکات و لەگەڵ سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بجەنگێت. سوفیان تا هیت پێشڕەوی کرد و کەسی لەوێ نەبینی. دواتر رووی کردە ئەنبار. عەلی کوڕی ئەبی تالیب پادگانێکی پێنسەد کەسی لەو ناوچەیە دانابوو بەلاّم بلاّوەیان لێکرد و کەمتر لەسەد کەس لەوێ مابوویەوە. لەگەڵ ئەوان جەنگا. هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ماوەیەك خۆڕاگرییان کرد بەلاّم سوار و پیادەکان هێرشیان کردنە سەر و سەرکردەی پیادەکان، ئەشرەس کوڕی حەسانی بەکری و سی کەسی دیکەیان کوشت و سامانەکانی ئەنبار و خەڵکی ئەو ناوچەیان تالاّن کرد و بۆ لای معاویە گەڕانەوە. کاتێك هەواڵەکە بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، بەرێکەوت و تا نوخەیلە ڕۆشت. کەسان وتیان: ئەم کارە بەئێمە بسپێرە.

وتی: نەهیچ کارێك بۆ من ئەنجام دەدەن نە بۆ خۆتان.

دەڵێت: سەعید کوڕی قەیسی بەدوای ئەواندا نارد. ڕۆشت و لەهیت تێپەڕی بەلاّم بەوان نەگەشت و گەڕایەوە.

دەڵێت: لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوالله کوڕی مەسعەدەی فەزاری لەگەڵ هەزار و حەوتسەد کەس بۆ تیما ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەهەموو سارا نشینەکانی

سەر ڕێگەکەی زەکات وەربگرێت و هەرکەس رازی نەبوو، خوێنی بڕێژێت. دواتر بەرەو مەککە و مەدینە و حیجاز بڕوات و بەمشێوەیە بەردەوام بێت. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی عەبدوالله لەدەوری کۆبوونەوە.

دەڵێت: کاتێك ئەم هەواڵە بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، موسەییب کوڕی نەجبەی فەزاری ڕەوانە کرد. ڕۆشت و لەتیما ڕووبەڕووی کوڕی مەسعەدە بوویەوە و تا نیمەڕۆ جەنگێکی دژواریان ئەزموون کرد. موسەییب هێرشی کردە سەر کوڕی مەسعەدە و سێ جار بەشمشێر لێیدا بەلأم نەیدەویست بیکوژێت. بەردەوام دەیوت: هەلأتن! هەلأتن! کوڕی مەسعەدە و زۆربەی هاوەڵانی ڕۆشتنە ناو قەلأکە و ئەوانی دیکە بەرەو شام هەلأتن. سارانشینەکان وشترەکانی زەکات کەکوڕی مەسعەدە کۆی کردبوویەوە، تالأنیان کرد. موسەییب بۆ ماوەی سێ ڕۆژ گەمارۆی خستنەسەر. دواتر چیلکە و چیلی لەبن دیواری قەلأکە کۆکردەوە و ئاگریدا. کاتێك هەستیان بەمەترسی لەناوچوون کرد، لەسەرەوە دەرکەوتن و وتیان: ئەی موسەییب، ئێمە لەخەڵکی هۆزەکەی تۆین. موسەییب بەزەیی پیایاندا هاتەوە و کوشتنی ئەوانی پەسەند نەکرد. فەرمانی کوژاندنەوەی ئاگرەکەی دەرکرد و بەهاوەلأنی خۆی وت: سیخوڕەکان ئاگاداریان کردوومەتەوە سوپایەك لەشام بەرێدەکەوێت. هەموویان کۆبوونەوە. کوڕی مەسعەدە شەوانە لەگەڵ هاوەلأنی خۆی بەرێکەوت و ڕێگەی شامیان گرتەبەر. عەبدولرەحمانی شەبیب وتی: باشوێنیان بکەوین بەلأم موسەییب رازی نەبوو.

عەبدولرەحمان وتی: خیانەتت لەسەروەری باوەڕداران کرد و ریاکاریت لەخۆت نیشاندا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا معاویە، زوحاك کوڕی قەیسی ڕەوانە کرد و وتی: لەخوارەوەی واقیسەوە بڕۆ و هێرش بکاتە سەر سارانشینەکانی ژێر دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و سێ هەزار کەسی کردە هاوڕێی ئەو. زوحاك ڕۆشت و دەستی بەسەر سامانی خەڵکاندا گرت و هەرکەس لەسارانشینەکانی بینی، خوێنی ڕشتن. لەسەعلەبییە تێپەڕی و هێرشی کردە سەر پادگانەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت و بەرێکەوت تا

گەیشتە قەتقەتانە. عەمرۆ کوڕی عەمیس کوڕی مەسعود لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێوە گوزەری دەکرد و کەسانی خۆی لەگەڵدا بوو. دەیانویست بەرەو مەککە بڕۆن. زوحاك هێرشی کردە سەر هاوەڵانی ئەو و ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرتن و کاتێك ئەم هەواڵە بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، حوجر کوڕی عودەی کێندی لەگەڵ چوارهەزار کەس ڕەوانە کرد و بەهەرکام پەنجای بەخشی. حوجر لەتەدمور بەزوحاك گەیشتەوە و نۆزدە کەس لەهاوەڵانی ئەوی کوشت. دووان لەهاوەڵانی خۆی کوژران. سەرئەنجام شەو جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد و زوحاك و هاوڕێکانی هەڵاتن. حوجر لەگەڵ هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا معاویە خۆی بەرەو دیجلە بەڕێکەوت. گەشتە ئەو سەرزەمینە و گەڕایەوە. باوکی مەلیکە ئاماژەی بەم بابەتە داوە و دەڵێت: لەساڵی سی و نۆ، معاویە خۆی تا دیجلە ڕۆشتە پێش.

سەبارەت بەو کەسەی لەم ساڵەدا سەرپەرەستی حەجی گرتە ئەستۆ، بۆچوونەکان جیاوازە: دەستەیەك دەڵێن عوبەیدالله کوڕی عەباس بەنوێنەرایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرپەرەستی حەج بوو. دەستەیەکی دیکە ئاماژە بە عەبدوالله کوڕی عەباس دەدەن.

باوکی زەید، عومەر کوڕی شەبە دەڵێت: وەك دەڵێن: لەساڵی سی و نۆ، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کوڕی عەباسی نارد تا لەڕێ و ڕەسمی حەج ئامادە بێت و پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات. معاویەیش یەزید کوڕی شەجەرەی ڕەهاوی نارد.

دەڵێت: بەلام بەوتەی باوکی حەسەن ئەمە ڕاست نییە و کوڕی عەباس تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، لەڕێ و ڕەسمەکانی حەج هیچ ئەرکێکی پێ نەسپێردرا. بەوتەی ئەو، ئەو کەسەی یەزید کوڕی شەجەرە گفتوگۆی لەگەڵ کرد، قیسەم کوڕی عەباس بوو. سەرئەنجام ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی شەیبە کوڕی عوسمان پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات.

باوکی مەعشەریش گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە و دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەساڵی سی و نۆ عوبەیدالله کوڕی عەباسی وەك سەرپەرەستی

حاجییەکان ڕەوانە کرد. معاویەیش یەزید کوڕی شەجەرەی ڕەوانە کرد وکاتێك لەمەککە کۆبوونەوە، ئاژاوە سەریهەڵدا و هیچ کام لەوان تەسلیمی ئەوی دیکە نەبوو. سەرئەنجام لەسەر پێشنوێژی شەیبە کوڕی عوسمان کوڕی باوکی تەڵحە ڕێککەوتن.

لەم ساڵەدا کارگوزارەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەویلایەتەکان هەمان کەسانی ساڵی سی و هەشتەم بوون. جگە لەکوڕی عەباس کە لەم ساڵەدا لەبەسرە نەبوو و زیاد کەنازناوی زیاد کوڕی باوکیان پێ بەخشیبوو، وەك جێنشینی خۆی دانابوو. ئەوی وەك سەرپەرەستی کۆکردنەوەی خەراج و کاروباری دادی بەباوکی ئەسوەدی دوئەلی سپاردبوو.

لەم ساڵەدا کوڕی عەباس دوای ئەوەی لەکوفە بۆ بەسرە گەڕایەوە، بەفەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب زیادی بۆ فارس و کرمان نارد.

## هۆکاری ڕەوانە کردنی زیاد بۆ فارس

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك کوڕی حەزرەمی کوژرا و خەڵکان سەبارەت بەخەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بۆچوونەکانیان جیاواز بوو، خەڵکانی فارس و کرمان مەبەستی ئەوەیان کرد خەراج نەدەن. خەڵکانی ناجییە دژی کارگوزارەکەی خۆیان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەریانپەڕاند.

عەلی کوڕی کەسیر دەڵێت: کاتێك خەڵکانی فارس بەدانی خەراج ڕازی نەبوون، عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەو کەسەی فەرمانڕەوایەتی فارسی پێ بسپێرێت راوێژی بەخەڵکان کرد. جاریە کوڕی قودامە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! دەخوازیت پیاوێکی سەرسەخت و سیاستزان و شیاوت نیشان بدەم؟

وتی: کێ؟

وتی: زیاد.

وتی: ئەمە تەنیا کاری خۆیەتی. ئەوی وەك فەرمانداری فارس و کرمان دیاریکرد و لەگەڵ چوار هەزار کەس بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانەی کرد. زیاد

دەستی بەسەر ئەو ویلایەتەدا گرت.

شەعبی دەڵێت: کاتێك خەڵکی کوێستانەکان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و خەراج دەران ویستان چیتر خەراج نەدەن و سەهل کوڕی حەنیف، کارگوزارەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان دەرپەڕاند، کوڕی عەباس پێی وت: کاروباری ویلایەتی فارس سامان دەدەم. بەرەو بەسرە بەڕێکەوت و زیادی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان بۆ فارس نارد و بەهۆی ئەوانەوە دەستی بەسەر فارسدا گرت و خەراجیان لەخەڵکان وەرگرت.

پیرێك لەخەڵکانی ئیستەخر دەڵێت: باوکم دەیوت: زیادم بینی سەرکردەی پارس بوو، ویلایەتەکە سەراسەر ئاگر بوو. زیاد بەرادەیەك خۆڕاگری کرد تا وەك جاران ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. خەڵکانی فارس دەیانوت: هەڵس و کەوتی ئەم پیاوە هاوشێوەی خوسرەو ئەنەوشیروانە کەرێگەی نەرمی و سازانی دەگرتەبەر و دەیزانی چی بکات.

دەڵێت: کاتێك زیاد هاتە فارس، کەسی بۆ لای سەرکردەکانی ویلایەتەکە نارد و کەسانی بۆ هاوکاری کردنی هاتن. بەڵێنی پێدان و ئارەزوومەندی کردن و هەڕەشەی لەدەستەیەکی دیکە کرد. ئاژاوەی لەناو ئەواندا نایەوە. ئەوان شوێنە هەستیارەکانی یەکتریان باس کرد، دەستەیەك هەڵاتن و دەستەیەك مانەوە. دەستەیەکیان دەستەیەکی دیکەی کوشت و کاروباری فارس بەمشێوەیە سامانداندرا بەڵام خۆی ڕووبەڕووی هیچ دەستەیەك نەبوویەوە و نەجەنگا. لەکرمانیش ئەم شیوەی گرتەبەر. دواتر بۆ فارس گەڕایەوە و بەناو ویلایەتەکەدا گەڕا و بەڵێنی چاکەی بەخەڵکاندا تا ئەوەی خەڵکان هێور بوونەوە. دواتر ڕووی کردە ئیستەخر و لەوێ دابەزی و لەنێوان بەیزا و ئیستەخر، بناغەی قەڵایەکی تۆکمە و بەهێزی داڕشت کەبەناوی قەڵای زیاد ناوی دەرکرد و سامانەکانی بۆ ئەو قەڵایە گواستەوە. دواتر مەنسوری یەشکوری لەو قەڵایەدا نیشتەجێ بوو و هەنووکە بەقەڵای مەنسور بەناوبانگە.

ساڵی چلەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو معاویە، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتاتی لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ حیجاز ڕەوانە کرد.

عەوانە دەڵێت: معاویە کوڕی ئەبوسوفیان دوای بەسەرهاتی داوەری، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات، یەکێك لەمناڵەکانی عامر کوڕی لوئەی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد. ئەوان لەشامەوە بەرێکەوتن و تا مەدینە ڕۆشتنە پێش. لەو کاتەدا کارگوزاری مەدینە باوکی ئەیووبی ئەنساری بوو. باوکی ئەیووب هەڵات و ڕۆشتە کوفە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. بوسر ڕۆشتە ناو مەدینە.

دەڵێت: بوسر لەمەدینە ڕۆشتە سەر مینبەر. کەس لەوێ ڕووبەڕووی نەبوویەوە و دەنگی بەرز کردەوە: ئەی دینار، ئەی نەجار، ئەزەریق! پیرەکەم! دوێنێ بوو، ئەمڕۆ لەکوێیە؟ مەبەستی لەعوسمان کوڕی عەفان بوو.

دوای ئەوە وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، سوێند بەخوا ئەگەر فەرمانی معاویە نەدەبوو، هیچ پیاوێکی باڵغم لەمەدینە بەزیندووی نەدەهێشتەوە. دوای ئەوە لەگەڵ خەڵکانی مەدینە بەیعەتی کرد و کەسی بۆ لای مناڵەکانی سەلمە نارد و وتی: نە ئەمانتان لای من هەیە و نەبەیعەت مەگەر ئەوەی جابر کوڕی عەبدوالله تەسلیمی من بکەن.

دەڵێت: جابر ڕۆشتە لای دایکی سەلمە، هاوسەری پێغەمبەر (د.خ) و پێی وت: بۆچوونی تۆ چییە؟ دەترسم بکوژرێم چوونکە ئەمە بەیعەتی گومڕاییە.

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بەیعەت بکەیت، بەکوڕەکەم عومەر کوڕی باوکی سەلمەم وتووە بەیعەت بکات. بەزاواکەم، عەبدوالله کوڕی زەمووەم وتووە بەیعەت بکات. کچەکەی زێنەب، کچی باوکی سەلمە، ژنی عەبدوالله کوڕی زەمعە بوو. جابر ڕۆشتە لای بوسر و بەیعەتی لەگەڵ کرد. بوسر چەند ماڵێکی لەمەدینە وێران کرد و دواتر ڕێگەی مەککەی گرتەبەر. باوکی موسا ترسا بیکوژێت. بوسر پێی وت: کەسێك نیم هاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) بکوژم. ئازادی کرد.

باوکی موسا پێشتر نامەیەکی بۆ یەمەن نووسیبوو کەمعاویە سوپایەکی

ڕەوانە کردووە و خەڵکان دەکوژێت. هەروەها ئەوکەسانەی داوەری پشت ڕاست نەکەنەوە، دەکوژرێن.

بوسر ڕووی کردە یەمەن. عوبەیداللە کوڕی عەباس بەنوێنەرایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کارگوزاری ئەو سەرزەمینە بوو. کاتێك لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، هەڵات و لەکوفە پەیوەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. عەبدوڵڵە کوڕی عەبدولمەدانی حارسی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. کاتێك بوسر گەیشتە ئەو سەرزەمینە، خۆی و کوڕەکەی کوشت. هەروەها بوسر، کاروانی عەبدوڵڵە کوڕی عەباسی بینی. دوو کوڕی کەم تەمەن لەناویاندا دەبینران. بوسر هەردووکیانی سەربڕی. دەستەیەك وتوویانە دوو کوڕەکەی عوبەیداللە لای یەکێك لەمناڵەکانی کەنانە بوون. پیاوەکە سارانشین بوو. کاتێك دەیویست بیانکوژێت، پیاوی کەنانی وتی: بۆ ئەو بێ گوناحانە دەکوژیت؟ ئەگەر دەخوازی ئەوان بکوژی، منیش بکوژە.

وتی: ئەو کارە دەکەم. سەرەتا پیاوی کەنانی کوشت و دواتر دوو مناڵەکەی کوشت. دوای ئەم کارانە بوسر بۆ شام گەڕایەوە.

دەڵێن: پیاوی کەنانی بۆ ڕێگرتن لەکوشتنی دوو مناڵەکە جەنگا تا کوژرا. ناوی یەکێك لەو مناڵانە عەبدولرەحمان و ناوی ئەوی دیکەیان قیسەم بوو. بوسر لەسەر ڕێگەی خۆی لەیەمەن دەستەیەکی زۆر لەشوێنکەوتەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی کوشت. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەم کارانەی ئاگادار بوویەوە، جاریە کوڕی قودامەی لەگەڵ دوو هەزار کەس و وەهب کوڕی مەسعودی لەگەڵ دوو هەزار کەسی دیکە ڕەوانە کرد. جاریە تا نەجران ڕۆشتە پێش و ئاگری شەڕی خۆش کرد. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی عوسمانی گرت و کوشتی. بوسر و هاوڕێکانی هەڵاتن. جاریە تا مەککە شوێنیان کەوت و بەخەڵکانی وت: بەیعەت لەگەڵ ئێمە بکەن.

وتیان: سەروەری باوەڕداران کوژرا، بەیعەت لەگەڵ کێ بکەین؟

وتی: لەگەڵ هەر کەسێك هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان لەگەڵ کردبێت. سستییان لەخۆیان نیشاندا و دواتر بەیعەتیان کرد.

## هۆکاری ڕۆشتنی کوڕی عەباس بۆ مەککە و بەجێهێشتنی عێراق

باوکی ئەلکەنود، عەبدولرەحمان کوڕی عوبەید دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەباس لای ئەسوەدی دوئەلی گوزەری کرد، پێی وت: ئەگەر لەچوارپێکان دەبوویت، باربەر نەدەبووی، ئەگەر شوان دەبووی، نەدەگەشتیتە لەوەڕگە و لەوەڕاندنی مەڕومالاّتت نەدەزانی.

دەڵێت: باوکی ئەسوەد نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی:

((بەڵام دواتر، خواوەند تۆی وەك فەرمانڕەوایەکی ئەمین و شوانێکی دەسەڵاتدار هەڵبژارد. تۆمان تاقی کردۆتەوە، ئەمینی و چاکەخوازی مسکێنان، تالاّنی و بەشی خۆیان بێ کەم و کوڕی دەدەیت و خۆت لەدنیا بەدوور دەگریت. سامانی ئەوان ناخۆیت و لەداوەری کردن لەنێوان ئەوان، بەرتیل وەرناگریت، بەڵام کوڕە مامەکت بێ پرس کردن بەتۆ، ئەوەی لەژێر دەستیەتی خواردوویەتی و ناتوانم چاوی لێ بپۆشم. خوا بتبەخشێت، چاوێك بەکاروبارەکانی ئەم سەرزەمینەدا بخشێنەرەوە و بۆچوونی خۆت بۆ من بنووسە.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وەڵامی دایەوە:

((بەڵام دواتر، کەسێکی هاوشێوەی تۆ، چاکەخوازی خەلیفە و خەڵکانە و ئەمانتەداری سامانی گشتی. سەبارەت بەوەی ئاماژەت پێداوە، نامەم بۆ عەبدوڵڵە کوڕی عەباس نووسیوە بێ ئەوەی ناوی تۆ ببەم. لەوەی لەو سەرزەمینە ڕوودەدات و بەرژەوەندی خەڵکانی بەدواوە دێت، ئاگادارم بکەرەوە چوونکە شیاوی ئەم کارەیت و ئەمە ئەرکێکە لەسەر شانی تۆ. والسلام))

هەروەها عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ کوڕی عەباس نووسی. کوڕی عەباس وەڵامی دایەوە:

((بەڵام دواتر، ئەوەی بەگوێی تۆ گەیشتووە، دوورە لەراستی. ئەوەی لەژێر دەستی مندایە، تۆمارم کردووە و پارێزەری سامانی خەڵکانم. گومانەکان بەراست مەزانە. والسلام))

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وەڵامی دایەوە:

جاریە بەرەو مەدینە ڕۆشت. باوکی هورەیرە پێشنوێژی خەڵکان بوو. لەوێ هەلات. جاریە وتی: سوێند بەخوا ئەگەر باوکی پشیلە ببینم، سەری دەبڕم. دواتر بەخەڵکانی مەدینەی وت: بەیعەت لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی ببەستن. بەیعەتیان بەست و یەك ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر ڕێگەی کوفەی گرتەبەر. دوای ڕۆشتنی ئەو باوکی هورەیرە گەڕایەوە و جارێکی دیکە پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد.

لەم ساڵەدا وەك ئاماژەیان پێداوە، لەنێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و معاویە کوڕی ئەبی سوفیان، دوای گۆڕینەوەی چەندین نامە، ئاشتی سەقامگیر کرا بۆ ئەوەی جەنگ روونەدات. عێراق لەژێر دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێت و شام لەژێر دەستی معاویە و هیچ کام سوپا بۆ سنووری ئەوی دیکە نەنێرێت و هێرش نەکەنە سەریەك.

زیاد کوڕی عەبدوالله دەڵێت: کاتێك هیچ کام لەو دوو دەستەیە ملکەچی ئەوی دیکە نەبوو، معاویە نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی: ئەگەر ئارەزوومەند بیت عێراق بۆ تۆ بێت و شام بۆ من. شمشێر لەسەر ئەم ئۆمەتە هەڵگرە و خوێنی موسوڵمانان مەڕێژە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب رازی بوو و بەمشێوەیە ئاشتی سەقامگیر کرا. معاویە لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەشام مایەوە و خەراجی ئەو سەرزەمینەی وەردەگرت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەعێراق بوو و خەراجی ئەو سەرزەمینەی وەردەگرت و بەسەر سوپاکەی خۆیدا دابەشی دەکرد.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی عەباس لەبەسرە ڕۆشتەدەر و ڕێگەی کوفەی گرتەبەر. زۆربەی مێژوو نووسان بەمشێوەیە ئاماژەیان پێداوە. دەستەیەك حاشا لەوە دەکەن و گومان دەبەن کارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەسرە بوو تا ئەو کاتەی سەروەری باوەڕداران کوژرا. دوای کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کارگوزاری حەسەن کوڕی عەلی بوو تا ئەو کاتەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ معاویە مۆر کرد. ئەوکات ڕێگەی مەککەی گرتەبەر.

((بەلاّم دواتر، لەو برە جەزییەی وەرت گرتووە ئاگادارم بکەرەوە، لەکوێ وەرت گرتووە و بۆ چ مەبەستێك خەرجت کردووە؟))

کوڕی عەباس وەڵامی دایەوە:

((دەزانم باوەڕت بەگومان و قسانە کردووە کەخەڵکان سەبارەت بەمن دەیهێننە سەرزمان، هەرکەس دەخوازیت ڕەوانەی بکە چوونکە ئەم سەرزەمینە بەجێدێڵم. والسلام))

دەڵێت: کوڕی عەباس، خاڵۆکانی خۆی، مناڵەکانی هیلال کوڕی عامری بانگ کرد و زوحاك کوڕی عەباس و عەبدوالله کوڕی ڕەزین، هەردووکیان هیلالی هاتن. دواتر هەموو مناڵەکانی قەیس لەدەوری کۆبوونەوە و بەڕێکەوتن و سامانێکیان لەگەڵ خۆیان برد.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: هەموو داهاتەکان لای ئەو کۆببوونەوە و ئەوەی کۆکرابوویەوە، لەگەڵ خۆی بردی. پێنج ناوچەکەی بەسرە خەڵکیان ڕەوانە کرد و لەتف پێی گەیشتنەوە و سەنگەریان گرت. دەیانویست سامانەکە بگەڕێننەوە.

قەیس وتی: سوێند بەخوا تا یەك کەس لەئێمە زیندوو بێت، دەستتان پێی ناگات.

سەبرە کوڕی شەیمانی حەدانی وتی: ئەی ئەزدییەکان، سوێند بەخوا خەڵکانی قەیس، برا موسوڵمانەکانی ئێمەن، دراوسێن و لەبەرابەر دوژمن، پشتیوانەکانی ئێمەن. ئەگەر ئەم سامانە بگێڕنەوە، بەهەرکام بڕێکی کەم بەها دەگات، ئەوان لەداهاتوو لەم سامانە بۆ ئێوە باشتر دەبن.

وتیان: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بڕۆن و بەجێیان بڵێن.

دەڵێت: خەڵکان بەوتەکانی رازی بوون و ڕۆشتن. خەڵکانی بەکر و عەبدقەیس وتیان: بۆچوونی سەبرە، بۆچوونێکی پەسەندە و ئەوانیش خۆیان بەدوور گرت.

مناڵەکانی تەمیم وتیان: وازیان لێ ناهێنین و بۆ وەرگرتنەوەی سامانەکە دەجەنگین.

ئەحنەف وتی: ئەو کەسانەی پەیوەندی خزمایەتی ئەوان دوورتر بوو، خۆیان لەجەنگ دوور خستەوە.

وتیان: سوێند بەخوا دەجەنگین.

وتی: من هاورێیەتی ئێوە ناکەم. لەوان دوور کەوتەوە.

دەڵێت: تەمیمییەکان کوڕی موجاعەی تەمیمییان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد و جەنگیان هەڵبژارد. زوحاك هێرشی کردە سەر کوڕی موجاعە و زەربەیەکی لێدا. عەبدوڵڵە خۆی بەگەردنییەوە هەڵواسی و هەردووکیان لەسەر زەوی دەتلانەوەو. لەهەر دوو ژمارەیەکی زۆر بریندار بوو بەڵام کەس نەکوژرا.

نێردراوی پێنج ناوچەکە وتیان: کارێکمان نەکرد، خۆمان بەدوور گرت بۆ ئەوەی بجەنگن. ئەوانیان جیا کردەوە و بەمناڵەکانی تەمیمیان وت: ئێمە لەئێوە دەست ئاوەڵاترین. ئەم سامانەمان بەکوڕە مامەکانی ئێوە بەخشی و ئێوە بۆ ئەو سامانە دەجەنگن. ئەم خەڵکە دەستیان بەسەر ئەم سامانەدا گرتووە و پێویستیان پێیەتی. ئەگەر چاوی تەماحتان بڕیوەتە ئەم سامانە، لەبیری بکەن.

دەڵێت: تەمیمییەکان ڕۆشتن. کوڕی عەباس بەرێکەوت. نزیکەی بیست کەسی لەگەڵدا بوو و ڕووی کردە مەککە.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: کوڕی عەباس بەسرەی بەجێنەهێشت تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا و ڕۆشتە لای حەسەن کوڕی عەلی. لەکاتی پەیمانی ئاشتی نێوان معاویە و حەسەن کوڕی عەلی، بەشدار بوو. دواتر بۆ بەسرە گەڕایەوە. ماڵ و سامانەکانی لەو شارە بوو. بڕێك سامانی بیت المالی هەڵگرت و ڕێگەی مەککەی گرتەبەر.

بێژەر دەڵێت: ئەمەم بۆ باوکی حەسەن گێڕایەوە، حاشای لێکرد و وتی: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، کوڕی عەباس لەمەککە بوو. ئەو کەسەی لەکاتی پەیمانی ئاشتی نێوان حەسەن کوڕی عەلی و معاویە ئامادە بوو، عوبەیدالله کوڕی عەباس بوو.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا. سەبارەت بەکاتی کوژرانی ئەو بۆچوونەکان جیاوازە.

باوکی مەعشەر دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمانگی رەمەزان، لەرۆژی هەینی، حەفدەی مانگ لەساڵی چلەمی کۆچ، کوژرا. واقدیش بەمشێوەیە ئاماژەی پێداوە بەلأم عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکوفە لەرۆژی هەینی یانزەی مانگ و بەوتەیەك سیانزەی مانگی رەمەزانی ساڵی چلەم کوژرا.

## کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و هۆکارەکەی

ئیسماعیل کوڕی مولجەم دەڵێت: بەسەرهاتی کوڕی مولجەم و هاورێکانی بەمشێوە بوو: کوڕی مولجەم و بەرەك کوڕی عەبدوالله عەمرۆ کوڕی بەکری تەمیمی کۆبوونەوە و باسی چارەنووسی خەڵکانیان کرد و رەخنەیان لەدەسەلأتداران گرت. ئاماژەیان بەکوژراوەکانی نەهرەواندا و سلأویان بۆ ناردن و وتیان: دوای ئەوان ژیان چ سوودێکی هەیە، برامان بوون و خەڵکیان بۆ پەرەستنی خواوەند هاندەدا و لەرێگەی خواوەند لەسەرکۆنە کردنی سەرکۆنەکەران نەدەترسان. چی دەبێت ئەگەر گیانی خۆمان ببەخشین و هێرش بکەینە سەر پێشەواکانی گومڕایی و بۆ کوشتنی ئەوان هەوڵبدەین و ویلایەتەکان لەوان ئاسوودە بکەین و تۆڵەی خوێنی براکانی خۆمان وەربگرینەوە.

کوڕی مولجەم وتی: من عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکوژم. ئەو خەڵکی میسر بوو.

بەرەك کوڕی عەبدوالله وتی: من معاویە دەکوژم.

عەمرۆ کوڕی بەکر وتی: من عەمرۆ کوڕی عاس دەکوژم.

دەڵێت: پەیمانیان بەست و سوێندیان خوارد هیچ کامیان نەگەڕێنەوە تا کەسی دیاریکراو دەکوژن یا لەو رێگەدا دەکوژرێت. شمشێرەکانی خۆیان هەڵگرت و ژەهراوییان کرد. حەفدەی رەمەزانیان وەك رۆژی دیاریکراو بۆ مەبەستەکەی خۆیان دەستنیشان کرد و هەرکام روویان کردە شارەکانی جێی مەبەست.

کوڕی مولجەمی موورادی لەهۆزی کێندە بوو. رووی کردە کوفە و هاوەڵانی خۆی بینی بەڵام مەبەستەکەی خۆی ئاشکرا نەکرد لەترسی ئەوەی نەکا نهێنییەکەی ئاشکرا بکەن. رۆژێك چاوی بەتایەفەی تیم الرباب کەوت کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەنگی نەهرەوان دوانزە کەس لەوانی کوشتبوو. باسی کوژراوەکانی خۆیان کرد. هەمان رۆژ ژنێك لەتایەفەی تیم الربابی بینی بەناوی قەتام کچی شەجەنە کەباوکی و براکەی لەجەنگی نەهرەوان کوژرا بوون. ژنێکی زۆر جوان بوو و کاتێك کوڕی مولجەم ئەوی بینی، سەریسوڕما و مەبەستەکەی خۆی بیرچوویەوە و خوازبێنی لێکرد.

قەتام وتی: نابمە هاوسەری تۆ مەگەر ئەوەی ئارەزووەکانی من بەدیبێنیت.

وتی: ئارەزووەکانی تۆ چییە؟

وتی: سێ هەزار، کۆیلەیەك و کەنیزێك و کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

وتی: ئەوە دەکەمە مارەیی تۆ. بەڵام باسی کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیبت کرد، بەڵام گومان دەکەم مەبەستت من نەبێت.

وتی: بۆنا، دەبێت بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژیت. ئەگەر بیکوژیت، ئارەزووی خۆت و من دەهێنیتەدی و رابواردنی تۆ لەگەڵ من شیرین دەبێت. ئەگەر کوژراییت، ئەوەی لەو دنیا دەستت دەکەوێت باشتر لەهەموو زێر و زیوەکانی ئەم دنیا.

وتی: سوێند بەخوا بۆ کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتووم و مەبەستەکەم دەهێنمەدی.

وتی: کەسێك دەدۆزمەوە تا پشتیوانی تۆ بێت و لەم کارەدا هاوکاریت بکات.

کەسی بۆ لای یەکێك لەخەڵکەکەی خۆی، تیم الرباب، نارد بەناوی وەردان. قسەی لەگەڵ کرد و رازی بوو. یەکێك لەخەڵکی ئەشجەع بەناوی شەبیب کوڕی بوجرە هاتە لای کوڕی مولجەم و پێی وت: دەتەوێت بەشداری کارێك بکەیت، رێزی ئەم دنیا و ئەو دنیات پێ ببەخشێت؟

وتی: چ کارێك؟

وتی: کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت. باسی شتێکی مەترسیدار دەکەیت، چۆن دەتوانی رووبەرووی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ببیتەوە؟

وتی: لەمزگەوت خۆمان حەشار دەدەین و کاتێك بۆ نوێژی بەیانی هات، هێرشی دەکەینە سەر و خوێنی دەڕێژین. ئەگەر رزگارمان بوو بەمەبەستەکەی خۆمان گەشتووین و ئەگەر کوژراین، ئەو پاداشەی لای خواوەند دەستمان دەکەوێت باشتر لەهەموو زێر و زیوەکانی دنیایە.

وتی: هاوار لەتۆ، ئەگەر جگە لە عەلی کەسێکی دیکە دەبوو، کارێکی ئاسان دەهاتە بەرچاو چوونکە هەوڵ و تێکۆشینی ئەو لەرێگەی ئیسلام و خزمایەتی ئەو لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) دەزانیت و ناتوانم بەکوشتنی ئەو رازی ببم.

وتی: مەگەر نازانی ئەو شەڕکەرانی نەهرەوانی کوشت لەکاتێکدا بەندە چاکەکارەکانی خواوەند بوون؟

وتی: بۆ نا.

وتی: ئەو لەتۆڵەی برا کوژراوەکانمان دەکوژین.

شەبیب رازی بوو. ڕۆشتنە لای قەتام کە لەمزگەوتی گەورەدا بوو. پێیان وت: بۆ کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بڕیارمانداوە.

وتی: کاتێك بەتەواوی دڵنیا بوون، وەرنە لای من.

دەڵێت:" دوای ئەوە کوڕی مولجەم شەوی هەینی کەبەرەبەیانییەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، لەساڵی چلەم، ڕۆشتە لای قەتام و وتی: ئێستا ئەو شەوەیە لەگەڵ دوو هاورێکەم پەیمانمان داوە هەرکەس لەئێمە یەکێك لەو سێ کەسە بکوژێت. قەتام داوای حەریری کرد و سەری ئەوانی بەست. شمشێریان هەڵگرت و لەبەرابەر ئەو دەرگایەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لێی دەهاتەدەر، دانیشتن. کاتێك هاتەدەر، شەبیب شمشێری بەرز کردەوە بەو مەبەستەی لێی بدات بەلام بەر دەرگاکە کەوت. کوڕی مولجەم بەشمشێر لەناوچاویدا. وەردان هەڵات و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. یەکێك لەکوڕەکانی باوکی ڕۆشتە لای و بینی حەریری لەسینەی دەکردەوە. وتی: ئەم حەریر و شمشێرە چییە؟

وەردان بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد. ئەو پیاوە ڕۆشت و شمشێر بەدەست

گەڕایەوە و وەردانی کوشت.

شەبیب لەتاریکیدا رووی کردە کۆڵانەکانی کێندە. خەڵکان دەنگیان بەرز کردەوە و یەکێك لەخەڵکانی حەزەرمەوت بەناوی عوەیمێر پێی گەیشتەوە. شەبیب شمشێری لەدەستا بوو. شمشێرەکەی لێ سەند و لەسەر سینەی دانیشت. کاتێك بینی خەڵکان شوێنیان کەوتن و شمشێرەکەی بەدەستەوە بوو، بۆ گیانی خۆی ترسا و ئەوی بەرەلا کرد. شەبیب لەناو قەرەباڵغی خەڵکان کوژرا.

هێرشیان کردە سەر کوڕی مولجەم و گرتیان. یەکێك لەخەڵکانی هەمەدان بەناوی باوکی ئەدما، شمشێرەکەی لێ وەرگرت و لەقاچیدا و لەپێ کەوت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە دواوە و جەعدە کوڕی هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهبی نارد تا پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەو پیاوە بێننە لای من. کاتێك هێنایان، وتی: ئەی دوژمنی خواوەند، مەگەر چاکەم لەگەڵ نەکردبووی؟

وتی: بۆنا.

وتی: بۆ ئەو کارەت کرد؟

وتی: ماوەی چل ڕۆژە شمشێرەکەم تیژ دەکەم و داوام لەخوا دەکرد خراپترینی ئافرێنراوەکانی خۆی بەم شمشێرەی من بکوژێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خۆت بەو شمشێرە دەکوژرێیت چوونکە خراپترینی ئافرێنراوەکانی خواوەندیت.

دەڵێن: ڕۆژێك پێش ئەوە کوڕی مولجەم بەشمشێر لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بدات، لەگەڕەکی مناڵەکانی بەکر کوڕی وائیل دانیشتبوو کەجەنازەی ئەبجەر کوڕی جابری عیجلییان لەوێوە دەبرد. ئەبجەر مەسیحی و مەسیحییەکان دەوری جەنازەکەیان گرتبوو. کەسانێك لەموسوڵمانانیش هاوڕێیەتیان دەکرد چوونکە لای ئەوان کەسێکی ڕێزدار بوو. شەقیق کوڕی سور لەناویاندا دەبینرا. کوڕی مولجەم وتی: ئەمانە کێن؟ بەسەرهاتەکەیان بۆ باس کرد. کوڕی مولجەم هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر حەجار کوڕی ئەبجەر موسوڵمانە

دەبێت جەنازەی ئەبجەر لەو دوور بێت
و ئەگەر حەجار کوڕی ئەبجەر کافرە
کاری لەم شێوە لەکافرەکان چاوەڕوان دەکرێت
چۆن رازی دەبن قەشە و موسوڵمان
هەموویان لەدەوری یەك جەنازە بن
دیمەنێکی قێزەونە
ئەگەر لەبەر مەبەستەکەم نەدەبوو
بەشمشێر بلاوەم پێدەکردن
بەلاّم بە بەئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەی خۆم، لەخوا نزیك دەبمەوە))

محەممەد کوڕی حەنیفە دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو شەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب شمشێری بەرکەوت، لەمزگەوتی گەورە نوێژم دەخوێند. لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر لەدانیشتووانی شار کەسەرقاڵی نوێژ کردن بوون. لەسەرەتای شەو تا کۆتایی سوجدە و رکوعیان دەبرد و هیلاك نەدەبوون تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ نوێژی بەیانی هاتەدەر و دەیوت: ئەی خەڵکینە، نوێژ، نوێژ، نازانم لەدەرگاکە هاتبووە دەر و ئەم قسانەی دەکرد یا نە، بروسکەییکم بینی و بیستم کەسێك دەیوت: ئەی عەلی، داوەری تایبەتە بەخوا نەك تۆ و هاوەلاّنت. شمشێرێکم بینی، دواتر شمشێرێکی دیکە. بیستم عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیوت: ئەم پیاوە بگرن. خەڵکان لەهەموو شوێنەکانەوە هێرشیان برد.

دەڵێت: هێشتا لەشوێنەکەم نەجوولاّبووم کەکوڕی مولجەمیان گرت و بردیانە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. منیش لەگەڵ خەڵکان ڕۆشتمە ژوور. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیوت: کەسێك لەجیاتی کەسێك. ئەگەر مردم، بیکوژن بەهەمان شێوەی منی کوشت. ئەگەر زیندوو مامەوە، فەرمانی خۆم سەبارەت بەو دەردەکەم.

دەڵێت: خەڵکان ڕۆشتنە لای حەسەن کوڕی عەلی و لەو پێشهاتەی بۆ باوکی روویدا بوو، ئاگاداریان کردەوە. ئەو کاتەی لای ئەو بوون کوڕی مولجەم دەست بەستراو لەبەرابەر ئەودا بوو. دایکی کولسوم کچی دەگریا، وتی: ئەی دوژمنی

خواوەند! باوکم هیچی نییە و خواوەند تۆ ریسوا دەکات.

وتی: کەواتە بۆ کێ دەگریت؟ شمشێرەکەم بەهەزار درەم کڕیوە و بەهەزار درەم ژەهراویم کرد. ئەگەر ئەم شمشێرە بەرهەموو خەڵکی شارەکە دەکەوت، کەسیان بەزیندووی نەدەمایەوە.

دەڵێن: جوندەب کوڕی عەبدواللە ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر تۆمان لەدەستدا، بەیعەت لەگەڵ حەسەنی کوڕت بکەین؟

وتی: نە فەرمانی ئەو کارەتان پێ دەدەم نەرێگەتان لێ دەگرم. خۆتان باشتر دەزانن. دواتر حەسەن و حسەینی بانگ کرد و وتی:

((پێشنیارتان پێدەکەم لەخوا بترسن و باوەش بۆ ئەم دنیا مەگرنەوە، هەرچەندە بەرووی ئێوەدا پێ بکەنێت. بۆ ئەو شتەی لەدەست دەچێت مەگرین. تەنیا راستی بڵێنە سەرزمان. هاوکاری هەتیوەکان بکەن، هاریکاری هەژارەکان بن. لەگەڵ نەزانەکان ڕێگەی سازان بگرنەبەر. دوژمنی ستەمکاران بن و پشتیوانی ستەملێکراوان. فەرموودەکانی قورئان بەکار ببەن و لەرێگەی خواوەند، لەسەرکۆنەی ستەمکاران مەترسن.))

دواتر سەیری محەممەد کوڕی حەنیفەی کرد و وتی:

((ئەوەی بەبراکانتم پێشنیار کرد، لەبیرت دەمێنێت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: هەمان پێشنیاریش بەتۆ دەکەم و دەبێت ڕێز لەدوو برا گەورەکەی خۆت بگریت. گوێرایەڵی فەرمانەکانیان بە و بێ راوێژ کردن بەوان هیچ کارێك ئەنجام مەدە.

دواتر وتی: پێشنیارتان پێدەکەم ئاگاتان لێی بێت چوونکە براتانە و کوڕی باوکتان و دەزانن باوکتان چەندەی خۆش دەوێت.

بەحەسەنی کوڕی وت:

کوڕی خۆم، پێشنیارت پێدەکەم لەخوا بترسیت و لەکاتی خۆیدا نوێژەکانت بخوێنیت، لەکاتی خۆیدا زەکات بدە و بەباشترین و پاکترین شێوە دەستنوێژ

بگرە چوونکە نوێژ بێ دەستنوێژی پاك و خاوێن سوودی نییە و خواوەند بەنوێژی ئەو کەسەی زەکات نەدات، رازی نابێت. پێشنیارت پێدەکەم لەهەڵەکان چاوپۆشیت و بەسەر تورەیی خۆتا زاڵ بیت، رێز لەپەیوەندی خزمایەتی بگریت و لەگەڵ نەزانەکان رێگەیەکی نەرم و نیان بگریتەبەر. زانستخوازی زانستی فیقە و شەرعی ئیسلام بیت، بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر کارێك بکەیت، ئەنجامی نەدەیت، بەردەوام قورئان بخوێنیتەوە و کەسێکی چاکەکار بۆ جیرانەکانت بیت، بۆ چاکە خەڵکان هان بدەیت و رێگەی خراپەیان لێبگریت.

لەسەرەمەرگدا وەسیەتی کرد. ئەمە وەسیەتەکەیەتی:

((ئەمە وەسیەتی عەلی کوری ئەبی تالیبە: شایەتی دەدات خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و خواوەند ئەوی بەدینێکی راست رەوانەی بەندەکانی کرد و پێش هەموو دینەکانی خست هەرچەندە ناباوەران پەسەندی ناکەن. نوێژ و پارانەوە و ژیان و مردنی من بۆ پەروەردگاری جیهانییانە، بەمشێوەیە فەرمانیان پێداوم و من بەندەیەکی تەسلیمم. بەحەسەنی کورم و هەموو مناڵەکانم پێشنیار دەکەم لەخواوەند بترسن و هاوشێوەی کەسێکی موسوڵمان بمرن. بەردەوام پشت بەخوا ببەستن و بڵاوەی لێمەکەن چوونکە بیستوومە پێغەمبەر (د.خ) دەیفەرموو: چاکسازی لەنێوان خەڵکان لەنوێژ و رۆژو باشترە. رێز لەخزمەکانی خۆتان بگرن تا رۆژی هەستانەوە لێپرسینەوەتان ئاسان بێت. خواوەندا، خواوەندا، بەردەوام بیر لەهەتیوەکان بکەنەوە، رێگە مەدەن برسی بن و لای ئێوە گرفتاری رەنج نەبن. رێز لەجیرانەکانتان بگرن چوونکە پێغەمبەر (د.خ) پێشنیاری ئەو کارەی کردووە. بەردەوام پێشنیاری جیرانی پێدەکردین بەشێوەیەك گومانمان دەکرد کەسی جیران میراتی پێ دەبرێت. بەردەوام قورئان بخوێنن و رێگە مەدەن کەس لەو کارە پێش ئێوە بکەوێت. بەردەوام سەرقاڵی نوێژ خوێندن بن چوونکە کۆڵەکەی دینە.ماڵەکانتان بپارێزن و تا ئەو کاتەی زیندوون بەجێی مەهێڵن چوونکە ئەگەر چۆڵ بکرێت هیچ شتێك جێگەی ناگرێتەوە. لەجیهاد لەرێگەی خواوەند، خۆتان و سامانتان ببەخشن. لەکاتی خۆیدا زەکات بدەن چوونکە

دەبێتە هۆی نەمانی توڕەیی خواوەند. پێشنیارەکانی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەئەهلی زەممە بەکار ببەن چوونکە پێغەمبەر (د.خ) پێشنیاری ئەوانی کردووە. بیری هەژار و دەستکورتەکانتان بێت و لەرۆژییەکانی خۆتان بەشیان بدەن. بۆ سەرکۆنە کردنی ستەمکاران لەهیچ شتێك مەترسن تا خواوەند بەلای ئەو کەسانەی مەبەستی لەناو بردنی ئێوە دەکەن و کەسانێکی ستەمکارن، لەناو ببات. بەردەوام خەڵکان بۆ چاکە هان بدەن و رێگەی خراپەیان لێ بگرن بۆ ئەوەی خراپەکاران جڵەوی کاروبارەکان نەگرنەدەست چوونکە لەو شێوەدا دۆعا دەکەن و دۆعاکانتان گیرا نابێت. هاوڕێ بن و بەخشندە! لەجیاوازی و دووبەرەکی خۆتان بەدوور بگرن. بۆ چاکەکاری و خواپەرەستی هاودڵ و هاوخەمی یەك بن. بەشداری گوناح و ستەمکاری مەکەن. لەخواوەند بترسن چوونکە سزاکانی مەترسیدارە. خواوەند ئێوە و بنەماڵەکانتان بپارێزێت و پێغەمبەر (د.خ) لەناو ئێوەدا بەزیندووی بهێڵێتەوە. ئێوە بەخوا دەسپێرم. سلاو و رەحمەتی خواوەند لەئێوە.))

دوای ئەمە تەنیا لا الـه الا الله ی هێنایە سەرزمان و کۆچی دوایی کرد. مەرگی ئەو لەمانگی رەمەزانی ساڵی چلەمی کۆچی بوو. دوو کوڕەکەی حەسەن و حسەین و عەبدوڵلە کوڕی جەعفەر ئەویان شۆرد و لەسێ کفندا، کفنیان کرد بێ ئەوەی کراسەکەی خۆی بەکار ببەن. حەسەن نۆجار لەسەر جەنازەکەی تەکبیری خوێند.

دوای ئەو حەسەنی کوڕی بۆ ماوەی شەش مانگ خەلافەتی گرتەدەست.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب رێگەی بڕینەوەی ئەندامەکانی مرۆڤی لەموسوڵمانان دەگرت. وتبووی: ئەی منالەکانی عەبدولموتەلیب، نەتانبینم لەخوێنی موسوڵمانان مەلە بکەن و بڵێن: سەروەری باوەڕدارانیان کوشت. کەس جگە لەبکوژەکەی من نەکوژرێت. ئەی حەسەن، ئەگەر بەم شمشێرە مردم، تەنیا یەك جار شمشێر بوەشێنە، یەك جار لەبەرابەر یەك جار. ئەندامەکانی ئەو پیاوە مەبڕە چوونکە پێغەمبەر (د.خ) دەیفەرموو: لەبڕینەوەی ئەندامەکان خۆتان بەدوور بگرن تەنانەت ئەگەر سەگێکی هار بێت.

کاتێك مرد، حەسەن کوڕی مولەجەمی هێنا؟ پێی وت: کارێکم بۆ دەکەیت. سوێند بەخوا هیچ کات پەیمانم لەگەڵ خوا نەبەستووە و ئەمەکدار نەبم. پەیمانم بەخواوەند دابوو عەلی و معاویە بکوژم یا لەم ڕێگەدا بکوژرێم. ئەگەر دەخوازیت ئازادم بکە تا معاویە بکوژم و بەڵێن دەدەم ئەگەر نەمکوشت یا کوشتم و زیندوو مامەوە دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ و دەست دەخەمە ناو دەستی تۆ.

حەسەن وتی: نا، سوێند بەخوا دەتنێرم بۆ جەهەننەم. ئەوی کوشت و خەڵکان جەستەی ئەویان لەحەسیرەکانەوە پێچا و گڕیان تێ بەردا.

بەرەك کوڕی عەبدوالله لەو شەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب شمشێری بەرکەوت، بۆسەی بۆ معاویە دانا و کاتێك بۆ خوێندنی نوێژی بەیانی هات، بەشمشێر هێرشی کردەسەر. شمشێرەکە بەر ڕانی کەوت. بەرەك ئەسیر کرا و وتی: هەواڵێکم پێیە و تۆ ڕازی دەکات. ئەگەر پێتی بڵێم ئایا سوودی بۆ من دەبێت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: یەکێك لەهاوەڵانی من لەئێستادا عەلی کوڕی ئەبی تالیبی کوشتووە.

وتی: ئەگەری هەیە لەکارەکەیدا سەرکەوتوو نەبووبێت؟

وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك دێتەدەر، کەس پارێزگاری لێناکات.

معاویە فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد وکوشتیان. پزیشکێك بەناوی ساعدی بانگ کرد و کاتێك برینەکەی بینی، وتی: یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرە: یا ئاسنێك سوور دەکەمەوە و دەیخەمە سەر برینەکە یا گیراوەیەکت دەرخوارد دەدەم کەدەبێتە هۆی ئەوەی بۆ هەمیشە نەزۆك بیت چوونکە شمشێرەکە ژەهراوی بووە.

معاویە وتی: بەرگەی ئاگر ناگرم. منداڵ گرنگ نییە چوونکە چاوم بەیەزید و عەبدوالله ڕوون بۆتەوە.

پزیشك گیراوەکەی دەرخواردداو چیتر منداڵی نەهێنایە دنیا. معاویە فەرمانیدا تا لەمیحراب ژوورێکی پاسەوانی دروست بکەن و شەوانە چەند کەسێك کێشك بگرن و لەکاتی سوجدە بردن پاسەوانەکان بیپارێزن.

عـەمرۆ کـوڕی بـەکر ئـەو شـەوە بۆسـەی بـۆ عـەمرۆ کـوڕی عـاس دانـا بـەڵام نەهاتـەدەر چوونکە گرفتـاری ژانـە سك ببـوو. فەرمانی بەخاریجە کـوڕی حوزافـە لەمناڵـەکانی عـامر کـوڕی لوئـەی، سـەرکردەی پاسـەوانەکانیدا پێـشنوێژی بـۆ خەڵکان بکات. عەمرۆ هێرشی کردە سەر خاریجە چوونکە گومانی دەکرد عەمرۆ کوڕی عاسـە. خاریجـە کوژرا و خـەڵك عـەمرۆیان گـرت. ئـەویان بـردە لای عـەمرۆ کوڕی عاس کەوەك فەرمانڕەوای سڵاویان بۆ دەنارد.

وتی: ئەمە کێیە؟

وتیان: عەمرۆ کوڕی عاس.

وتی: کەواتە من کێم کوشتووە؟

وتیان: خاریجە کوڕی حوزافە.

وتی: ئەی ریاکار، سوێند بەخوا گومانم دەکرد تۆ بیت.

عەمرۆ وتی: مەبەستی کوشتنی منت بوو بەڵام خواوەند خاریجەی دەویست.

عـەمرۆ ئـەوی کوشـت و کاتێـك معاویـە ئاگـادار بوویـەوە، هۆنراوەیـەکی بـۆ عەمرۆ نووسی بەم ناوەرۆکە:

((هۆکاری مردن فراوانە

بەڵام هۆکاری مەرگی پیری لوئەی کوژران بوو

ئەی عەمرۆ ئارام بە چوونکە زیاتر لەهەموو پیاوەکانی دیکە

تۆ مام و هاوڕێی ئەو بوویت

رزگارت بوو بەڵام پیاوی مورادی شمشێرەکەی خۆی

لەخوێنی کوڕی پیرا بەتح تێر کرد

کەسێکی هاوشێوەی ئەو شمشێری وەشاند

و ئەمە بۆ ئێمە گران تەواو بوو

بەڵام تۆ شەو و رۆژ لەناو کۆشکەکەی خۆت

لەگەڵ ژنانی سپی جوان روخسار رادەبوێریت.))

دەڵێت: کاتێك عایشە لەهـەواڵی کـوژرانی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب ئاگـادار بوویەوە، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((داردەستەکەی خۆی فرێدا و گەیشتە شوێنی مەبەست

بەهەمان شێوە کەرێبوار لەکاتی گەڕانەوە ئارام دەگرێت))

دواتر پرسی: چ کەسێك ئەوی کوشت؟

وتیان: پیاوێك لەهۆزی موراد. و ئەو هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەگەر دوور کەوتوو بوو هەواڵی مەرگی ئەو

نەوجەوانێك هێنای کەخۆڵ لەدەمیدا نەبوو.))

زێنەب کچی باوکی سەلمە پێی وت: سەبارەت بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەمشێوەیە قسە دەکەیت؟

وتی: گرفتاری فەرامۆشیم، کاتێك شتێك بیرچوویەوە، بیرم بێننەوە.

دەڵێت: ئەو کەسەی هەواڵی مەرگی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی هێنا، سوفیان کوڕی عەبدشەمسی زوهری بوو.

دەڵێت: کوڕی عەباس سەبارەت بەکوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەو ئەو کەسەی چاکە دەبینی ئێمە بووین کە

حەیدەری باوکی حەسنمان

کاتێك پێشنوێژ بوو

شمشێر باران کرد و لەناو چوو

ئێمە بووین ئەو کاتە یاخیگەری و ستەمکاری کردە پیشە

بەیەك زەربەی شمشێر کۆتاییمان بەپاشایەتی ئەو هێنا

بەرەبەیانان ئەو کاتەی مەرگ جل و بەرگی مەرگی پۆشیبوو

ئێمە گەورە و بەهێزەکان بووین.))

هەروەها هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((هەرگیز مارەییەك کەبەخشەرێك

بەکەسێکی بەخشیبێت

هاوشێوەی مارەیی قەتام نییە

سێ هەزار و کۆیلەیەك و کەنیزێك

و کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب
هیچ مارەییەك هەرچەندە گران نەبێت
لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گرانتر نەبوو
و هەر کەسێکی شیاوی کوشتن لەو کەسەی کوڕی مولجەم کوشتی
کەم بەهاتر بوو.))

باوکی ئەسوەد دوئەلی سەبارەت بەکوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((بەمعاویە کوڕی حەرب بڵێن
(هەرگیز چاوی سەرکۆنەکەران روون نەبێت)
ئایا لەمانگی رەمەزان
ئێمەتان گرفتاری کارەساتی باشترینی خەڵکان کرد
باشتر لەهەموو ئەو کەسانەی سوار چوارپێ بوون
و باریان خستووە و سوار کەشتی بوون
باشتر لەو کەسانەی پێپۆشیان هەبووە
و سورئەکانی قورئانیان خوێندۆتەوە
خوێناویتان کرد
کاتێك روخساری باوکی حەسەنت دەبینی
مانگ تەواو بوو و چاوی هەر بینەرێکی زەق دەکرد
قورەیشییەکان لەهەر کوێ بن
دەزانن تۆ ئەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب
بۆ رێز و دین، لەهەموویان باشتر boویت.))

سەبارەت بەتەمەنی ئەو لەکاتی مەرگی بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە: کاتێك کوژرا پەنجا و نۆ ساڵ تەمەنی بوو. مەسعەب کوڕی عەبدوللە دەڵێت: حەسەن کوڕی عەلی دەیوت: باوکم کاتێك کوژرا، پەنجا و هەشت ساڵ بوو. لەجەعفەر کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکاتی کوژرانی شەست و سێ ساڵ بوو.

بێژەر دەڵێت: ئەم بۆچوونە لەهەموو بۆچوونەکان راستتر بەرچاو دەکەوێت.

هوشام دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، تەمەنی پەنجا و هەشت ساڵ و چەند مانگ بوو. بۆ ماوەی پێنج ساڵ چەند مانگ کەمتر خەلافەتی کرد. دواتر کوڕی مولجەم کەناوی عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ بوو لەحەفدەی رەمەزان ئەوی کوشت. خەلافەتی ئەو چوارساڵ و نۆ مانگ درێژەی کێشا. لەکاتی مەرگ تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی بەرەبەیانی هەینی، حەفدەی رەمەزانی ساڵی چلەمی کۆچ، کوژرا و لەنزیك مزگەوتی گەورە لەکۆشکی فەرمانڕەوایی بەخاك سپێردرا.

هەروەها لەمحەممەد کوڕی عومەر دەگێڕنەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەشەوی هەینی بریندار کرا و رۆژی هەینی و شەوی شەممە زیندوو بوو. شەوی یەکشەممە، یانزە رۆژ بۆ کۆتایی مانگی رەمەزانی ساڵی چلەمی کۆچ لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

عەبدوڵڵە کوڕی محەممەد کوڕی عەقیل دەڵێت: بیستم محەممەد کوڕی حەنیفە لەساڵی جەحاف دەیوت: ساڵی هەشتا و یەك دەستی پێکرد. تەمەنی من شەست و پێنج ساڵە، تەمەنم لەباوکم درێژترە.

پێیان وت: کاتێك باوکت کوژرا، تەمەنی چەندە بوو؟

وتی: کاتێك کوژرا، شەست و سێ ساڵ تەمەنی بوو.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: ئەم وتەیە لای ئێمە بڕواپێکراوە.

## ماوەی خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

باوکی مەعشەر دەڵێت: ماوەی خەلافەتی ئەو پێنج ساڵ سێ مانگ کەمتر درێژەی کێشا.

محەممەد کوڕی عومەر گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە.

باوکی زەید لەباوکی حەسەن دەگێڕێتەوە: خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چوار ساڵ و نۆ مانگ و یەك ڕۆژ یا چەند ڕۆژ درێژەی کێشا.

## تایبەتمەندییە جەستەییەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

ئیسحاق کوڕی عەبدوللە دەڵێت: لەباوکی جەعفەر محەممەد کوڕی عەلیم پرسی: تایبەتمەندییە جەستەییەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چۆن بوو؟

وتی: پیاوێك بوو ئەسمەر وتۆخ، چاوی گەورە و سکی دەرپەڕاو، سەری تاس، کورتە بالاً.

## ڕەچەڵەکی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالیبە. ئەبی تالیب، کوڕی عەبد مەناف کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی عەبد مەنافە.

دایکی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، فاتیمە کچی ئەسەد کچی هاشم کوڕی عەبد مەنافە.

## هاوسەر و منداڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

یەکەم هاوسەری عەلی کوڕی ئەبی تالیب، فاتیمە کچی پێغەمبەرە. تا کاتی کۆچی فاتیمە کەسی دیکەی نەکردە هاوسەری خۆی. لەفاتیمە حەسەن و حسەین چاویان بەدنیا هەڵهێنا. دەڵێن: منداڵێکی دیکەی لەفاتیمە بۆ هاتە دنیا بەناوی موحسین بەڵام لەتەمەنی منداڵیدا مرد. زەینەبی گەورە و دایکی کولسومی

گەورە منالی فاتیمەن.

دوای فاتیمـە، ام البـنین کـچی حـەزامی وەك هاوسـەر هەڵبـژارد و عـەباس و جەعفەر و عەبدوالله و عوسمانی بۆ هاتە دنیا کەهاوریٚ لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی لەکەربەلا کوژران. جگە لەعەباس ئەوانی دیکە منالیان نەبوو.

لـەیلی کـچی مەسعود کوڕی خالیدی وەك هاوسـەر هەڵبـژارد و عوبەیداللـە و ئەبوبەکر چاویان بەدنیا هـەڵهێنا. بەوتـەی هوشـام کوڕی محەممەد لـەتف هـاوریٚ لەگەڵ حسەین کوژران.

بـەلاٚم بەوتـەی محەممـەد کوڕی عومـەر، عوبەیداللـە کـوڕی عـەلی بەدەسـتی موختار کوڕی ئەبی عوبەید لەمەزار کوژرا و هـەروەها بەوتـەی ئـەو عوبەیداللـە و ئەبوبەکر، کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، منالیان نەبوو.

ئەسمای خەسعەمی کچی عەمیسی وەك هاوسەر هەڵبژارد کەبە وتەی هوشـام کـوڕی محەممـەد، یـەحیا و محەممـەدی بـچوك چـاویان بـەدنیا هـەڵهێنا. وەك ئامارژەی پێدەدات ئەوانیش منالیـان نـەبوو بـەلاٚم بەوتـەی واقدی ئـەسما یـەحیا و عـەونی هێنایە دنیـا. دەستەیەك وتوویانـە محەممـەدی بـچوك لەکـەنیزێك چـاوی بـەدنیا هـەڵهێنا. واقدیش بەمشێوەیە ئامـاژەی پێداوە. بەوتـەی ئـەو محەممـەدی بچوك لەگەڵ حسەین کوژرا.

هـەروەها عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب، لەسـەهبا، دایکـی حـەبیب کـچی رەبیعـە کوڕی بوجـەیر کـوڕی عەبـد کەیـەکێك لەئەسیرەکانی خالیـد کـوڕی وەلیـد لـەکاتی هێرش کردنە سەر عەین التمر بوو، عومەر و روقیەی هێنایە دنیا. تەمەنی عومـەر تا هەشتا و پێنج سالی درێژ بوویەوە و نیـوەی میراتـی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب بەر ئەو کەوت و لەیەنبەع کۆچی دوایی کرد.

عەلی کوڕی ئـەبی تالیب هـەروەها ئەمامـە کچی بـاوکی عـاس کوڕی رەبیعی وەك هاوسـەر هەڵبـژارد کـەدایکی یـانی زێنـەب هاوسەری پێغەمبـەر (د.خ) بـوو و محەممەدی نێوەندی هێنایە دنیا.

محەممـەدی گـەورە کـە بەمحەممـەدی حەنیفە بەناوبانگـە کوڕی عـەلی کـوڕی ئەبی تالیب لەخەولە کچی جەعفەر کوڕی قـەیس لەمنالـەکانی حەنیفە. محەممـەد

کوڕی حەنیفە لەتاییف مرد و کوڕی عەباس نوێژی لەسەر خوێند.

هەروەها دایکی سەعید کچی عوروە کوڕی مەسعودی سەقفی مارە کرد و دایکی جەسەن و رەملەی گەورەی هێنایە دنیا. ئەو لەژنانی دیکە چەندین کچی بۆ هاتە دنیا کەئاماژەیان بەناوی دایکیان نەداوە. وەك دایکی هانی و مەیموونە و زەینەبی بچووك و رەملەی بچوك و دایکی کولسومی بچوك و فاتیمە و ئەمامە و خەدیجە و دایکی کەرام و دایکی سەلمە و دایکی جەعفەر و جەمانە و نەفیسە کەهەموویان کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن.و دایکیان لەکەنیزە.جۆراوجۆرەکان.

هەروەها مەحیات کچی ئەمرۆقەیس کوڕی عودەی کوڕی ئەوسی کەلبی مارە کرد و کچێی بۆ هێنایە دنیا بەلأم لەتەمەنی منالێدا مرد.

واقدی دەڵێت: کچەکە دەهاتە مزگەوت، پێیان دەوت خالۆکانت کێن؟ دەیوت: وەع وەع یانی کەلب (سەگ)

هەموو منالەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چواردە کوڕ و حەفدە کچ بوون.

واقدی دەڵێت: پێنج لەمنالەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب منالیان هێنایە دنیا، حەسەن و حسەین و محەممەد کوڕی حەنیفە و عەباس کوڕی ژنی کەلابی و عومەر کوڕی ژنی تەغلەبی.

## کارگوزارەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵەدا کارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەسرە عەبدوللە کوڕی عەباس بوو کەپێشتر ئاماژەمان بەجیاوازی بۆچوونەکاندا. کوڕی عەباس لەماوەی فەرمانداری خۆی سەرپەرەستی کۆکردنەوەی باج و سوپا و هاوکارییەکان بوو. کاروباری دادی بەسرە لەئەستۆی باوکی ئەسوەدی دوئەلیدا بوو. پێشتر باسمان کرد زیادی وەك فەرمانداری بەسرە دانا. دواتر ئەوی بۆ فارس نارد و کاروباری جەنگ و کۆکردنەوەی خەراجی بەو سپارد. کاتێك کوژرا، زیاد لەناوچەکانی فارس ژیانی بەسەر دەبرد. کارگوزاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەحرەین و ناوچەکانی دەوروبەر، عوبەیداللە کوڕی عەباس بوو تا ئەو کاتەی بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات هێرشی کردەسەر. کارگوزاری ئەو لەتاییف و مەککە و ناوچەکانی دەوروبەر قیسەم کوڕی عەباس بوو.

کارگوزاری ئەو لەمەدینە باوکی ئەیووبی ئەنساری و بەوتەیەك سەهل کوڕی حەنیف بوو تا ئەو کاتەی بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات هێرشی کردە سەریان.

## بەشێك لەکردەوەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

باوکی رافیع خەزێنەداری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبیت المالْ دەڵێت: رۆژێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، کچەکەی زێروزیوی هەڵگرتبوو. مرواریدێکی بیت المالی بەکچەکەیەوە بینی. وتی: ئەمەت لەکوێ هێناوە؟ سوێند بەخوا دەبێت دەستت ببڕم.

دەڵێت: کاتێك پێداگری ئەوم بینی، وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران سوێند بەخوا من پێمداوە، ئەگەر من پێی نەدەم چوون دەیتوانی دەریبێنێت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ بوو.

یەزید کوڕی عودەی کوڕی عوسمان دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیبم بینی لەگەڕەکی تایەفەی هەمەدان دەهاتەدەر. بینی دوو دەستە سەرقاڵی شەڕن.

ئەوانی لەیەك جیا كردەوە و ڕۆشت. دواتر دەنگێكی بیست: خواوەندا، فریا كەوە، عەلی كوڕی ئەبی تالیب بەخێرایی هات بەشێوەیەك دەنگی پێپۆشەكانیم بیست و دەیوت: هاوكاری هات. كەسێكی بینی پەلاماری كەسێكی دیكەی دابوو و دەیوت: ئەی سەروەری باوەڕداران جلێكم بەنۆ درەم بەم پیاوە فرۆشتووە و مەرجمان كرد درەمی سووكم پێنەدات. هەنووكە درەمەكانم هێناوە تا بیانگۆڕێتەوە بەڵام ئەو كارە ناكات. یەخەییم گرت و شەقەزللەی لێدام.

عەلی كوڕی ئەبی تالیب وتی: درەمەكان بگۆڕە.

وتی: شایەتی شەقەزللەكە كوا؟

دەڵێت: شایەتی هێنا و عەلی كوڕی ئەبی تالیب ئەوكەسەی دانیشاند و وتی: تۆڵەی خۆت بستێنە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بەخشیم.

وتی: دەمویست بەتەواوی مافەكانت بۆ بگێڕمەوە. دواتر نۆ قامچی لەو كەسەدا و وتی: ئەمە مافی دەوڵەتە.

ناجییە لەباوكی دەگێڕێتەوە: لەدەرگای كۆشك دانیشتبووم عەلی كوڕی ئەبی تالیب هاتەدەر. لەشكۆ و مەزنی ئەو لەسەر ڕێگاكە خۆمان دوور خستەوە. كاتێك تێپەڕی بەدوایدا ڕۆشتین. لەو كاتەدا كەسێك هاواری كرد: فریام كەون. سوێند بەخوا دوو كەسمان بینی شەڕیان دەكرد. عەلی كوڕی ئەبی تالیب مشتەكۆڵەی لەسینەی هەردووكیاندا و وتی: دوور كەونەوە.

دەڵێت: یەكیان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بزنێكی لەمن كڕیوە و مەرجمان كرد درەمی كوڕت و بڕاوەم پێنەدات بەڵام درەمی كورتی پێداوم. هێناومە بیانگۆڕێتەوە بەڵام شەقەزللەی لێدام.

عەلی كوڕی ئەبی تالیب بەو كەسەی دیكەی وت: چی دەڵێیت؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ڕاست دەكات.

وتی: بەڵێنەكەت ببەسەر.

دواتر پێی وت: دانیشە. بەوەی دیكەی وت: تۆڵەی خۆت وەربگرە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بەخشیم.

وتی: ئەوە پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە.

دەڵێت: ئەو کەسە ڕۆشت و عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی موسوڵمانەکان بیگرن. ئەویان گرت. ئەویان لەسەر پشتی کەسێك بار کرد بەهەمان شێوە کەشاگردەکانی مەکتەب بار دەکەن. پانزە قامچی لێدا و وتی: ئەمە سزای تۆیە لەبەر ئەوەی ڕێزی ئەو پیاوەت شکاند.

باوکی خالید کوڕی جابر دەڵێت: بیستم حەسەن کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، قسەی بۆ خەڵکان کردبوو، وتبووی: ئەمشەو، شەوێکە قورئان هاتەخوار و عیسا کوڕی مریەم بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە و یوشەع کوڕی نون هاوڕێی موسا کوژرا. پیاوێکتان کوشت کەکەس لەپێشینان پێشی نەکەوت و کەس پێگەی ئەوی بەدەست نەهێنا. سوێند بەخوا پێغەمبەر (د.خ) ئەوی لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە دەکرد و جبرەئیل لای ڕاست و میکائیل لای چەپی ئەو جێگیر دەبوون. سوێند بەخوا زەردی و سپییەتی بەجێنەهێشت مەگەر حەوتسەد یا هەشتسەد درەم کە بۆ کڕینی خزمەتکارێك پاشەکەوتی کردبوو.

## بەیعەت لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵەدا یانی، ساڵی چلەمی کۆچی، وەك خەلیفە لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەست.

دەڵێن: یەکەم کەس کەبەیعەتی لەگەڵ بەست، قەیس کوڕی سەعد بوو کەوتی: ((دەستت بێنە تا لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) و جەنگ دژی نەیارانی تۆ، بەیعەتت لەگەڵ ببەسم)).

حەسەن پێی وت: بەپشت بەستن بەکتێبی خواوەند و سوونەتەکانی پێغەمبەر (د.خ) کەهەموو مەرجەکانی دیکە لەخۆ دەگرێت. قەیس بێدەنگی هەڵبژارد و بەیعەتی لەگەڵ بەست. خەڵکانیش بەیعەتیان بەست.

زوهری دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، قەیس کوڕی سەعدی وەك فەرماندەی سوپای عێراق دیاریکردبوو کەدەبوا بەرەو ئازەربایەجان و ناوچەکانی بڕوات و هەروەها وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی سوپا کەژمارەیان چل هەزار کەس و

عەرەبەکان دروستیان کردبوو بەمەبەستی مانەوەیان لەسەر بەڵێنەکەیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب. بەڵام قەیس بەردەوام لەڕۆشتن خۆی دوادەخست تا عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا و خەڵکی عێراق حەسەن کوڕی عەلی یان وەك خەلیفە هەڵبژارد.

حەسەن خوازیاری جەنگ نەبو، بەڵکو دەیویست تا ئەو جێگەی دەتوانێت ئیمتیازەکان لەمعاویە وەربگرێت و دواتر پەیوەستی خەڵکان بێت. حەسەن دەیزانی قەیس لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەودا نییە، لەبەر ئەمە ئەوی لەسەر کار لابرد و عەبدوڵڵە کوڕی عەباسی وەك سەرکردە دەستنیشان کرد. کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی عەباس لەمەبەستەکەی حەسەن کوڕی عەلی ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ معاویە نووسی و داوای ئەمان و بەڵێنی پاراستنی سامانەکەی کرد و معاویە ئەمانی پێدا.

ئیسماعیل کوڕی ڕاشد دەڵێت: خەڵکان لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی وەك خەلیفە بەیعەتیان بەست. دواتر لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت و لای مەداین جێگیر بوو و قەیس کوڕی سەعدی لەگەڵ دوانزە هەزار کەس لەپێشەوە ڕەوانە کرد. معاویەیش لەگەڵ سوپای شام هات و لەمەسکەن جێگیر بوو.

لەو کاتەی حەسەن لەمەداین نزیك بووبوو، یەکێك لەناو سوپا جاڕیدا: قەیس کوڕی سەعد کوژرا، بڵاوەی لێبکەن.

دەڵێن: خەڵکان بڵاوەیان لێکرد و خێوەتەکەی حەسەن کوڕی عەلییان تاڵان کرد تا ئەو جێگەی لەسەر ڕاخەرەکەی ژێری پەلاماریاندا. حەسەن بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو مەداین و لەکۆشکی بەیزا نیشتەجێ بوو. مامی موختار کوڕی باوکی عوبەید بەناوی سەعد کوڕی مەسعود، کارگوزاری مەداین بوو. موختار کەگەنجێکی کەم تەمەن بوو، پێی وت: دەخوازیت سامان و ڕێز بەدەست بێنیت؟

وتی: چۆن؟

وتی: حەسەن قۆڵبەست بکە و بەتەسلیم کردنەوەی بەمعاویە، ئەمان بۆ خۆت وەربگرە.

سەعد پێی وت: لەعنەتی خواوەندت لێ بێت. کوڕی کچی پێغەمبەری خواوەند بگرم و تەسلیمی بکەم. چەندە پیاوێکی خراپیت؟

دەڵێت: کاتێك حەسەن کوڕی عەلی بینی خەڵکانی دەوری بڵاوەیان لێکردووە،

کەسی بۆ لای معاویە نارد و خوازیاری ئاشتی بوو. معاویە عەبدوڵڵە کوڕی عامر و عەبدولڕەحمان کوڕی سەمرەی نارد. ئەم دووانە لەمەداین ڕۆشتنە لای حەسەن کوڕی عەلی و سەبارەت بەوەی دەیویست، بەڵێنیان پێدا و ڕێکەوتننامەی ئاشتییان نووسی کە لەبەیت ئەلمال پێنج هەزار وەربگرێت لەگەڵ ئەو شتانەی دیکەی داوای کردبوو. ئەوسا حەسەن لەناو خەڵکانی عێراق هەستایە سەر پێی و وتی: ئەی خەڵکی عێراق، سێ شت منی لەئێوە دوورخستەوە: ئەوەی باوکی منتان کوشت و زەربەتان لەخۆمدا و سامانەکەتان تالان کردم.

دوای ئەوە خەڵکان گوێڕایەڵی خۆیان بۆ معاویە نیشاندا. معاویە ڕۆشتە ناو کوفە و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

عوسمان کوڕی عەبدولڕەحمان گێڕانەوەیەکی لەمشێوەی هەیە بەم زیادە کەدەڵێت: حەسەن سەبارەت بەئاشتی نامەی بۆ معاویە نووسی و داوای ئەمانی کرد. ئەو بەحسەین کوڕی عەلی و عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەری وت: سەبارەت بەئاشتی نامەم بۆ معاویە نووسیوە.

حسەین وتی: سوێندت دەدەم بەخوا جەخت لەڕاستی معاویە نەکەیتەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەدرۆ نەخەیتەوە.

حەسەن پێی وت: بێدەنگ بە، باشتر لەتۆ دەزانم چی دەکەم و چیم دەوێت.

دەڵێت: کاتێك نامەی حەسەن کوڕی عەلی بەدەستی معاویە گەیشت، عەبدوڵڵە کوڕی عامر و عەبدولڕەحمان کوڕی سەمرەی ڕەوانەی مەداین کرد و بەڵێنی جێبەجێ کردنی داواکانیان بەحەسەن کوڕی عەلیدا. حەسەن نامەی بۆ قەیس کوڕی سەعد نووسی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی معاویە بێت. قەیس لەگەڵ دوانزە هەزار کەس پێشەنگی سوپاکەی بوو.

دەڵێت: قەیس کوڕی سەعد لەناو خەڵکان هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی خەڵکینە یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرن، یا گوێڕایەڵی بۆ پێشەوای تاریکی دەربڕن یا بێ ئیمان بجەنگن.

وتیان: گوێڕایەڵی پێشەوای تاریکی هەڵدەبژێرین و بەمشێوەیە بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست. قەیس کوڕی سەعد لێیان جیابوویەوە. حەسەن کوڕی عەلی بەو مەرجەی ئاشتی لەگەڵ معاویە کرد تا هەموو سامانی بەیت ئەلمال هەڵبگرێت و

باجی و ماڵیاتی دارابگەرد بۆ ئەو بێت، هەروەها بەو مەرجەی بەئامادەبوونی ئەو، جوێن بەباوکی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) نەدرێت. بەمشێوەیە هەموو سامانی بەیت ئەلمالی کوفە کەپێنج هەزار بوو، هەڵیگرت.

لەم ساڵەدا موغەیرە کوڕی شەعبە، ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

ئیسماعیل کوڕی راشد دەڵێت: لەو ساڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، کاتێك وەرزی حەج نزیك بوویەوە، موغەیرە کوڕی شەعبە، نامەیەکی درۆینەی لەزمانی معاویەوە نووسی و لەساڵی چلی کۆچی، ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. دەڵێن لەڕۆژی (ترویە) ڕۆشتە عەرەفە و لەڕۆژی عەرەفە قوربانی کرد چوونکە دەترسا لەوەی درۆکەی ئاشکرا ببێت. هەروەها دەڵێن: موغەیرە لەبەر ئەمە ئەو کارەی کرد چوونکە بیستی عوتەبە کوڕی ئەبی سوفیان وەك سالاری حەج دێت و لەبەر ئەمە لەئەنجامدانی ڕێوڕەسمی حەج پەلەی کرد.

لەم ساڵەدا خەڵکانی ئیلیا بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست. ئیسماعیل کوڕی ڕاشد ئەمەی گێڕاوەتەوە. پێشتر معاویە لەشام وەك فەرمانڕەوا ناسرا بوو.

سەعید کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەعێراق وەك سەروەری باوەڕداران بانگ دەکرا و معاویە لەشام وەك ئەمیر. کاتێك عەلی کوژرا، معاویەیان بەسەروەری باوەڕداران ناو دەبرد.

ساڵی چل و یەك دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و یەك

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو حەسەن کوڕی عەلی کاروبارەکانی بەمعاویە سپارد و معاویە ڕۆشتە ناو کوفە و خەڵك وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

زوهری دەڵێت: خەڵکی عێراق وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی کرد. حەسەن مەرجی لەگەڵ ئەوان دانا کە: لەگەڵ هەرکەس لەئاشتیدا بم، لەئاشتیدا بن و لەگەڵ هەرکەس جەنگام، بجەنگن. خەڵك لەم مەرجە گومانیان کرد و وتیان: ئەمە هاوڕێی ئێوە نییە و خوازیاری جەنگ نییە.

دوای بەیعەتەکە، زۆری نەخایاند کەگورزێکیان لەحەسەن کوڕی عەلی وەشاند و ئەوی ناتەوان کرد و بێزاری ئەوی لەعێراقییەکان زیاتر کرد. لەوان ترسا و لەبەر ئەمە نامەی بۆ معاویە نووسی و مەرجەکانی ئاشتی بۆ نارد و نووسی ئەگەر بەڵێنی جێبەجێ کردنی ئەم مەرجانە دەدەیت، من گوێرایەڵی تۆ دەبم بەڵام تۆیش دەبێت بەڵێنەکانت ببەیتە سەر.

کاتێك نامەکەی حەسەن بەدەستی معاویە گەیشت کەپێشتر نامەیەکی سپی بۆ حەسەن کوڕی عەلی ناردبوو و خوارەوەی نامەکەی واژۆ کردبوو، نووسیبووی: لەم نامەدا کەواژۆم کردووە، هەموو داواکارییەکانی خۆت بنووسە تا جێبەجێ بکرێن. کاتێك نامەکە بەدەستی حەسەن گەیشت، چەند بەرابەری ئەو شتانەی پێشتر داوای لەمعاویە کردبوو، نووسی و لای خۆی هێشتییەوە. معاویەیش نامەکەی حەسەنی لای خۆی هێشتەوە.

دەڵێت: کاتێك حەسەن و معاویە چاویان بەیەك کەوت، حەسەن داوای لێکرد بەڵێنەکەی خۆی بباتەسەر، بەڵام معاویە ڕازی نەبوو وتی، ئەو داواکارییانە ئەنجام دەدەم کە لەنامەکەی خۆت ئاماژەی پێدراوە. من بەڵێنی جێبەجێ کردنی ئەوانەم داوە.

حەسەن وتی: کاتێك نامەکەی تۆ بەدەستی من گەیشت، داواکارییەکانی خۆم تیا نووسی و تۆ بەڵێنی جێبەجێ کردنیتدا. لەمبارەوە کێشە دروست بوو و

معاویە هیچ کام لەبەڵێنەکانی خۆی نەبردە سەر.

دەڵێـت: کاتێـك لەکوفـە بـوون، عـەمرۆ کـوڕی عـاس بەمعاویـەی وت داوا لەحەسەن کوڕی عەلی بکات هەستێت و قسە لەگەڵ خەڵکان بکات، بەڵام معاویە بەمە ڕازی نەبوو و پرسی: مەبەستت لەم کارە چییە؟

عـەمرۆ کـوڕی عـاس وتـی: دەمـەوێت نـەزانی ئـەو بـۆ خـەڵکان ئاشـکرا ببێـت. بەردەوام پێداگری لەوە کرد تا ئەوە معاویە ڕازی بوو. ڕۆژێك معاویە هاتەدەر و قسەی بۆ کەسەکانی خۆی کرد، دواتر فەرمانی بەکەسێکدا تا حەسەن کوڕی عەلی بانگ بکات و معاویە وتـی: ئـەی حەسـەن، هەسـتە و قسە بـۆ کەسـەکانی خۆت بکە.

حەسەن کوڕی عەلی شایەتومانی هێنایە سەر زمان و دەستبەجێ وتی:

((ئەی خەڵکینە، خواوەند بەهۆی هۆکاری یەکەمی ئێمە، ڕێنوێنی ئێوەی کرد و بەهۆی دووایین کەسمانەوە خوێنی ئێوەی پاراست. ئەم کارە سەرئەنجامێکی هەیە و دنیا بەنۆرەیە، خواوەند بەپێغەمبەرەکەی خۆی فەرمووە: ئەگەری هەیە ئەمە تاقیکردنەوەی ئێوە بێت)).

کاتێك ئەمەی وت: معاویە وتی: دانیشتە. بەردەوام لەعەمرۆ کوڕی عاس تووڕە بوو و دەیوت: ئەمە لەئەنجامی ڕازی بوون بەداواکارییەکەی تۆوە بوو. حەسەن کوڕی عەلی بۆ مەدینە نارد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: حەسەن کوڕی عەلی کوفەی تەسلیم بەمعاویە کـرد. معاویـە پێـنج ڕۆژی کۆتـایی ڕەبیـع ئەلئـەوەل و بەوتەیـەك لـەجومادی ئەلئەوەلی ساڵی چل و یەکی کۆچی، ڕۆشتە ناو کوفە.

لەم ساڵەدا دوای ئەوەی قەیس کوڕی سەعد بەبەستنی بەیعەت لەگەڵ معاویە ڕازی نەبوو، ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر کرا.

## ئاشتی نێوان معاویە و قەیس

زوهری دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی عەباس ئاگادار بوویەوە کەحەسەن کوڕی عەلی دەیەوێت ئەمان لەمعاویە وەربگرێت، ئەویش نامەی بۆ معاویە نووسی و داوای ئەمانی کرد بەو مەرجەی سامانەکەی پارێزراو بێت. معاویە بەڵێنی پێدا و کوڕی عامری لەگەڵ سوپایەك بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. عەبدوڵڵە شەوانە ڕۆشتە لای سوپاکەی کوڕی عامر و سوپاکەی خۆی بەجێهێشت کەسەرکردەیان نەبوو بەڵام قەیس یەکێك بوو لەسوپاییەکان. حەسەن بەڵێنی لەمعاویە وەرگرت و بەیعەتی لەگەڵ بەست. پاسەوانەکانی سوپا، قەیس کوڕی سەعدیان کردە سەرکردەی خۆیان و پەیمانیان بەست دژی معاویە بجەنگن تا ئەو کاتەی ئەمان بۆ گیان و سامانی شیعەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کردەوەکانیان لەڕۆژگاری فیتنە و ئاژاوە وەردەگرن.

معاویە کە لەلایەن حەسەن کوڕی عەلی و عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دڵنیا بوو، بیری لەچارەسەری کێشەی کەسێك کردەوە کە بەبۆچوونی ئەو گرنگتر لەهەموو کەسانی دیکە بوو چوونکە چل هەزار کەس هاورێیەتی دەکرد.

معاویە لەگەڵ عەمرۆ و خەڵکی شام لەنزیك ئەوان دابەزی. دواتر معاویە کەسی بۆ لای قەیس نارد و خوای بیرهێنایەوە و وتی: بۆ کێ دەجەنگیت؟ ئەو کەسەی بۆ ئەو دەجەنگیت، بەیعەتی لەگەڵ من بەستووە.

بەڵام قەیس نەرمی نەنواند تا معاویە تۆمارێکی بۆ نارد کەخوارەوەی واژۆ کردبوو. نووسیبووی: هەرچی دەخوازی لەم تۆمارەدا بینووسە و جێبەجێی دەکەین.

عەمرۆ بەمعاویەی وت: ئەم کارە مەکە و دژی قەیس بجەنگە.

معاویە وتی: ئارام بە، سوێند بەخوا ناتوانین ئەم دەستەیە بکوژین مەگەر ئەوەی بەئەندازەی ژمارەی خۆیان لەخەڵکانی شام بکوژن، دوای ئەوە چیتر ژیان سوودی نییە، سوێند بەخوا هیچ کات دژی ئەو ناجەنگم مەگەر ئەوەی هیچ ڕێگەیەك لەبەردەمدا نەمێنێت.

دەڵێت: کاتێک معاویە تۆمارەکەی بۆ قەیس نارد، قەیس بۆ خۆی و شیعەکانی عەلی بۆ ئەو سامانانەی تالآنیان کردبوو، بۆ ئەو خوێنانەی ڕشتبوویان داوای ئەمانی کرد بەلآم هیچی بۆ خۆی داوا نەکرد. معاویە بەڵێنی جێبەجێ کردنی پێدان و قەیس و سوپاکەی گوێرایەڵی فەرمانەکانی معاویە بوون.

دەڵێت: بەمشێوە بوو کاتێک ئاژاوە سەریهەڵدا، سەرکردەکانی خەڵك پێنج کەس بوون کەدەیانوت دوورئەندێش و وردبینن: معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەمرۆ کوڕی عاس و موغەیرە کوڕی شەعبە و قەیس کوڕی سەعد و عەبدوڵڵە کوڕی بودەیلی خوازعی کە لەئەنسار بوو.

قەیس و کوڕی بودەیل لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون. موغەیرە کوڕی شەعبە و عەمرۆ کوڕی عاس خوازیاری خەلافەتی معاویە بوون. بەلآم موغەیرە خۆی بەدوور گرت و لەتائیف مایەوە تا ئەو کاتەی پرسی داوەری کردن هاتە ئاراوە و لەئەزرەح کۆبوونەوە.

دەڵێت: ئاشتی نێوان حەسەن و معاویە لەم ساڵەدا، لەمانگی رەبیع ئەلئەوەل ئەنجامدرا و معاویە لەجومادی ئەلئەوەلی ئەمساڵە ڕۆشتە ناو کوفە. واقدی دەڵێت لەمانگی رەبیع ئەلئاخەر ڕۆشتە ناو کوفە.

لەم ساڵەدا حەسەن و حسەین کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، لەکوفەوە ڕێگەی مەدینەیان گرتەبەر.

## ڕۆشتنی حەسەن و حسەین بۆ مەدینە

کاتێـك لەمەسـکەن ئاشـتی لـەنێوان حەسـەن و معاویـە سـەقامگیر کـرا، وەك عەوانە ئاماژەی پێدەدات، حەسەن ڕۆشتە ناو خەڵکان و وتی:

((ئەی خەڵکی عێراق، سێ شت بووە هـۆی بێـزاری مـن لـەئێوە: یەکـەم ئـەوەی باوکتان کوشتم و گورزتان لەخۆمدا و سامانەکانتان تالآن کردم.))

دەڵێـت: ئـەوکات حەسـەن و حـسەین و عەبدوڵڵـە کـوڕی جەعفـەر لەگـەڵ مـەڕومالآت و کەلوپەلـەکانیان بـەرەو کوفـە بەڕێکـەوتن. کاتێـك حەسـەن گەیـشتە کوفە و برینەکەی باشبوویەوە، ڕۆشتە مزگەوت و وتی:

((ئەی خـەڵکی کوفـە، سـەبارەت بەدراوسـێ و میوانـەکانی خۆتـان و بنەماڵـەی پێغەمبەرەکـەتان کەخواوەنـد ناپـاکی لەوانـدا نەهێـشتووە و لـەو پـەڕی پاقژیـدان، لەخوا بترسن)).

دەڵێت: خەڵکان گریان. دواتر حەسەن کوڕی عـەلی و هـاوەڵانی بـەرەو مـەدینـە بەڕێکەوتن.

دەڵێت: خەڵکی بەسرە ڕێگەیان نەدا حەسـەن کوڕی عـەلی ماڵیـاتی دارابگـەرد وەربگرێت و وتیان : ((تالآنی ئێمەیە)) کاتێك بەرەو مەدینە بەڕێکەوت، کەسانێك لەقادسیە هاتنە سەر ڕێگەکەی و پێیان وت: ئەی ڕیسواکەری عەرەب.

لـەم سـاڵەدا خـەواریج کـە لـەڕۆژگاری عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب گۆشـەگیر بووبوون، لەشارەزوور دژی معاویە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە.

## شۆڕشی خەواریج

عەوانـە دەڵێـت: پـێش ئـەوەی حەسـەن کوفـە بـەجێبێڵێت، معاویـە هـات و لەنوخەیلـە جێگیر بـوو. پێنـسەد کـەس لەحرووریـیەکان کـە لەگـەڵ فـەروە کـوڕی نەوفلی ئەشجەعی، خۆیان لەهەموو شتێك بەدوور گرتبـوو، وتیـان: پێشهاتەکان بەجۆرێکە کەگومانی تیا نییە، ڕووبەڕووی ببنەوە و جیهاد دەست پێبکەن.

دەڵێت: بەڕێکەوتن. سەرکردەکەیان فەروە کوڕی نـەوفل بـوو. کاتێك ڕۆشتنە

ناو کوفە، معاویە دەستەیەك لەسوارەکانی شامی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان نارد بەلأم شکستیان خوارد. معاویە بەخەڵکی کوفەی وت: سوێند بەخوا لای من ئەمانتان نییە مەگەر ئەوەی ئەم بەلأیە لەخۆتان دوور بکەنەوە.

دەڵێت: خەڵکی کوفە ڕووبەڕووی خەواریج بوونەوە و جەنگیان دەستپێکرد.

خەواریج وتیان: هاوار لەئێوە، چیتان لەئێمە دەوێت؟ مەگەر معاویە دوژمنی ئێمە وئێوە نییە؟ ڕێگەمان بدەن دژی ئەو بجەنگێن، ئەگەر ئەومان لەناو برد، دوژمنەکەی ئێوەمان لەناو بردووە، ئەگەر ئێمەی لەناو برد، ئێوە لەدەست ئێمە ئاسوودە دەبن.

وتیان: نا، سوێند بەخوا دژی ئێوە دەجەنگێن.

وتیان: خواوەند براکانی ئێمە ببەخشێت کە لەنەهرەوان کوژران. ئەی خەڵکی کوفە، ئەوان ئێوەیان باشتر دەناسی.

خەڵکی ئەشجەع، فەروە کوڕی نەوفلیان لەگەڵ خۆیان بردەوە کەگەورەیان بوو. خەواریج عەبدوڵڵە کوڕی باوکی حوڕیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد و جەنگان و کوژران.

دەڵێت: معاویە عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ عاسی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد. موغەیرە کوڕی شەعبە هات و بەمعاویەی وت: عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆت وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد و عەمرۆت کردۆتە کارگوزاری میسر، تۆ ئێستا لەناو دەمی شێردایت.

دەڵێت: معاویە عەبدوڵڵەی لەکارگوزاری کوفە دوورخستەوە و موغەیرە کوڕی شەعبەی کردە کارگوزاری ئەو شارە. عەمرۆ کوڕی عاس ئەم وتەی موغەیرەی بیست و هاتە لای معاویە و وتی: موغەیرەت وەك کارگوزاری کوفە دیاریکردووە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: موغەیرەت کردۆتە لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج، کەسامانەکان کۆبکاتەوە و بڕوات و نەتوانی هیچ شتێکی لێ وەربگریت. کەسێك بۆ ئەو کارە ڕاسپێرە کە لەتۆ بترسێت.

دەڵێت: معاویە ئەو کارەی لەموغەیرە وەرگرتەوە و ئەوی بۆ ئەنجامدانی

پێشنوێژی بۆ خەڵکان ڕاسپارد.

دواتر موغەیرە عەمرۆی بینی کەپێی وت: تۆ سەبارەت بەعەبدوڵڵە ئەو قسانەت لای سەروەری باوەڕداران باسکرد؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەمە لەبری ئەوە.

وەك بیستوومە عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس نەڕۆشتبووە کوفە.

لەم ساڵەدا حیمران کوڕی ئەبان دەستی بەسەر بەسرەدا گرت و معاویە، بۆسری بۆ لای ئەو نارد و پێی وت کەکوڕەکانی زیاد بکوژێت.

## کارەکانی بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك لەسەرەتای ساڵی چل و یەکەم حەسەن کوڕی عەلی لەگەڵ معاویە پەیمانی ئاشتی بەست، حیمران کوڕی ئەبان لەبەسرە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستی بەسەردا گرت. معاویە دەیویست یەکێك لەخەڵکانی منداڵەکانی قین بەرەو بەسرە بنێرێت بەڵام عەبدوڵڵە کوڕی عەباس قسەی لەگەڵ کرد و وتی ئەو کارە نەکات و کەسێکی دیکە بنێرێت. معاویە بوسر کوڕی ئەبی ئەرتاتی نارد کەدەیوت فەرمانی کوشتنی کوڕەکانی زیادی پێدراوە.

موسلیمە کوڕی موحاریب دەڵێت: بوسر یەکێك لەکوڕەکانی زیادی گرت و زیندانی کرد، لەو کاتەدا زیاد لەفارس بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی بۆ سەرکوت کردنی کوردە شۆڕشگێڕەکان ڕەوانە کردبوو. زیاد سەرکەوتنی بەدەستهێنا و لەئیستەخر نیشتەجێ بووبوو.

دەڵێت: ئەبوبەکرە بەرەو کوفە بۆ بینینی معاویە بەڕێکەوت و داوای مۆڵەتی لەبوسر کرد. بوسر حەفتەیەك مۆڵەتی پێدا تا بڕوات و بگەڕێتەوە. ئەو حەوت ڕۆژ ڕێگەی بڕی و دوو چوار پێ لەژێر پێیدا مردن تا ئەوەی معاویە فەرمانیدا دەست لەکوڕەکانی زیاد هەڵبگرێت.

دەڵێت: یەکێك لەشارەزایانی ئێمە دەڵێت: ئەبوبەکرە ڕۆژی حەوتەم و لەکاتی

ئاوابوونی هەتاو هات. بوسر کوڕەکانی زیادی هێنابوو، چاوەڕوانی ئاوابوونی خۆری دەکرد تا مۆڵەتەکە بەسەر بچێت و بیانکوژێت. خەڵك کۆبووبوونەوە و چاو لەڕێ بوون و چاوەڕوانی ئەبوبەکرەیان دەکرد کەهات. سوار لەسەر ئەسپ یا ئێسترێك بوو، بەدژواری ڕێگەی دەبڕی. کاتێك ئەسپەکەی وەستا، هاتەخوار، جلەکانی خۆی تەکاند، تەکبیری وت و خەڵکان تەکبیریان وت. بەخێرایی هات و پێش ئەوەی خوێنی کوڕەکانی زیاد بڕژێت، نامەکەی معاویەی دایەدەستی بوسر و ئازادی کردن.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: بوسر لەسەر مینبەری بەسرە، قسەی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب وت. دواتر وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا، هەرکەس دەزانێت من ڕاست دەکەم، بیڵێت و هەرکەس دەزانێت درۆ دەکەم، بیڵێت.

ئەبوبەکرە وتی: سوێند بەخوا ئێمە تۆ بەدرۆزن دەزانین.

دەڵێت: فەرمانیدا بیخنکێنن، بەڵام ئەبولۆلۆی زەببی هەستا و خۆی خستە سەر ئەبوبەکرە و پارێزگاری لێکرد. ئەبوبەکرە بۆ ئەو کارەی سەد جەریب زەوی پێبەخشی.

دەڵێت: بەئەبوبەکرەیان وت: (مەبەستت لەو کارە چی بووۀ)

وتی: سوێندمان بدات بەخوا و ڕاستی پێ نەڵێین؟

دەڵێت: بوسر شەش مانگ لەبەسرە مایەوە، دواتر ڕۆشت و نازانین کەسی وەك کارگوزاری ئەو شارە دیاریکرد یا نە.؟

جارود کوڕی ئەبی سەبرە دەڵێت: حەسەن کوڕی عەلی ئاشتی لەگەڵ معاویە کرد وڕێگەی مەدینەی گرتەبەر. معاویە لەڕەجەبی ساڵی چل و یەکی کۆچ، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتاتی بۆ بەسرە نارد. لەو کاتەدا زیاد لەفارس بوو. معاویە نامەی بۆ زیاد نووسی: سامانێك لەسامانەکانی خواوەند لای تۆیە، من وەك خەلیفە هەڵبژێردراوم، هەرچی لای تۆیە بیگەڕێنەرەوە.

زیاد وەڵامی دایەوە کەهیچ لەو سامانە لای من نەماوەتەوە، ئەوەی لای من بووە، خەرجم کردووە و بڕێکیم بۆ پێشهاتە ناسازگارەکان لای کەسانێك وەك ئەمانەت داناوە و پاشماوەکەیم بۆ سەروەری باوەڕداران ناردووە.

معاویە نووسی: وەرە بۆ لای من، تا لێکۆڵینەوە لەتۆ و کارەکانت بکەین. ئەگەر ئەم کێشەیە چارەسەر کرا باشتر، جیاواز لەوە دەتوانی بۆ شوێنەکەی خۆت بگەڕێیتەوە.

دەڵێت: بەڵام زیاد نەهات و بوسر، کوڕە گەورەکانی زیاد یانی عەبدولڕەحمان و عەبدوللّە و عیبادی گرت و زیندانی کردن. دواتر نامەی بۆ زیاد نووسی: بڕۆ بۆ لای سەروەری باوەڕداران، جیاواز لەوە کوڕەکانت دەکوژم.

زیاد وەڵامی دایەوە: شوێنەکەی خۆم بەجێناهێڵم تا خواوەند لەنێوان من و تۆ و گەورەی تۆ، داوەری دەکات، ئەگەر منالّە ئەسیرەکانی من بکوژیت، سەرئەنجام هەمووان بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە و ڕۆژی پسلاّن چاوەڕوانمانە و بەزوویی ستەمگەران دەزانن، بەرەو کوێ دەڕۆن.

دەڵێت: بوسر مەبەستی کوشتنی ئەوانی کرد. بەڵام ئەبوبەکرە ڕۆشتە لای و وتی: کوڕەکەی من و کوڕەکانی براکەمت گرتووە کەهیچ گوناحێکیان نییە، حەسەن کوڕی عەلی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ معاویە بەست بەو مەرجەی هاوەڵانی عەلی لەهەر شوێنێك بن لەئەماندا بن، هیچ مافێکت لەسەر ئەوان و باوکیان نییە.

وتی: براکەت دەستی بەسەر سامانێکدا گرتووە و لەگەڕاندنەوەی خۆی بەدوور دەگرێت.

وتی: هیچی لا نییە، دەست لەکوڕەکانی براکەم هەڵگرە تا نامەی ئازادی ئەوان لای معاویە بێنم.

دەڵێت: بوسر چەند ڕۆژێك مۆڵەتی پێدا و وتی: ئەگەر نامەی معاویەت بۆ ئازادی ئەوان هێنا کەهیچ، جیاواز لەوە یا دەیانکوژم یا دەبێت زیاد بڕواتە لای سەروەری باوەڕداران.

دەڵێت: ئەبوبەکرە ڕۆشتە لای معاویە و سەبارەت بەزیاد قسەی لەگەڵ کرد. معاویە نامەی بۆ بوسر نووسی تا دەستیان لیّ هەڵگرت. بوسر ئازادی کردن.

بوسرەت کوڕی عوبەیداللّە دەڵێت: ئەبوبەکرە لەکوفە ڕۆشتە لای معاویە کەپێی وت: ئەبوبەکرە، بۆ سەردان هاتوویت، یا نیازێك تۆی هێناوەتە ئێرە؟

وتی: درۆ ناکەم، نیازێك منی هێناوەتە ئێرە.

وتی: ئەبوبەکرە نیازەکەت جێبەجێ دەکرێت چوونکە شیاویت، پێویستیت بەچییە؟

وتی: ئەوەی ئەمان بەزیادی برام ببەخشیت و نامە بۆ بوسر بنوسی تا کوڕەکانی ئازاد بکات و نەبێتە ئەرك بۆیان.

وتی: سەبارەت بەکوڕەکانی زیاد، داواکەت جێبەجێ دەکەم، بەڵام زیاد بڕێك لەسامانی موسوڵمانانی لایە کەئەگەر بیگەڕێنێتەوە، کارمان پێی نییە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر شتێکی لابێت، بەخواستی خوا لەتۆی ناشارێتەوە.

دەڵێت: معاویە لەبەر ئەبوبەکرە نامەی بۆ بوسر نووسی ڕێگە لەهیچکام لەکوڕەکانی زیاد نەگرێت. دواتر بەئەبوبەکرەی وت: هیچ پێنشیارێکت بۆ ئێمە نییە؟

وتی: بۆنا ئەی سەروەری باوەڕداران، پێشنیار دەکەم ئاگات لەخۆت و خەڵکی ژێر دەستی خۆت بێت و کارە چاکەکان ئەنجام بدەیت چوونکە بوویتە جێگری خواوەند لەسەر زەوی. لەخوا بترسە چوونکە تەمەنت دیاریکراوە، بەدوای تۆ کەسێك بەخێرایی دێت و بەم زووانە ئەجەل دەگات و دەگەڕێیتەوە بۆ لای کەسێك کە لێکۆڵینەوە لەکارەکانی تۆ دەکات و لەتۆ زیاتر و باشتر دەزانێت، کەواتە هیچ کارێك ئەنجام مەدە کەرەزامەندی خواوەندی لەگەڵدا نەبێت.

سەلمەت کوڕی عوسمان دەڵێت: بوسر نامەی بۆ زیاد نووسی کەئەگەر نەڕۆیتە لای سەروەری باوەڕداران، کوڕەکانت هەڵدەواسم.

زیاد وەڵامی دایەوە: ئەگەر ئەو کارە بکەیت، شیاویت چوونکە کوڕی جەرگخۆر تۆی ناردووە.

ئەبوبەکرە ڕۆشتە لای معاویە و وتی: ئەی معاویە، خەڵك بۆ کوشتنی منداڵەکان بەیعەتیان لەگەڵ تۆ نەکردووە.

وتی: چی ڕوویداوە ئەی ئەبوبەکرە؟

وتی: بوسر دەیەوێت کوڕەکانی زیاد بکوژێت.

معاویە نامەی بۆ بوسر نووسی وفەرمانی پێدا کوڕەکانی زیاد ئازاد بکات.

معاویه دوای کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ زیاد نارد و هەڕەشەی لێکرد.

شەعبی دەڵێت: کاتێك عەلی کوژرا، معاویە نامەی بۆ زیاد نووسی و هەڕەشەی لێکرد. زیاد لەناو خەڵکان قسەی کرد و وتی: سەیرە کوڕی جەرگخۆر و پەناگای دووڕوویی نامەی بۆ نووسیوم و هەڕەشەم لێدەکات، لەکاتێکدا دوو کوڕە مامی پێغەمبەری خواوەند -یانی کوڕی عەباس و حەسەن کوڕی عەلی- لەنێوان ئێمەدان لەگەڵ نەوەد هەزار کەس کەشمشێریان لەسەر شانە و ئەگەر ڕووبەڕووی مەترسی ببمەوە، چاوەڕێ ناکەن من لەو دۆخەدا ببینن.

دەڵێت: زیاد وەك فەرمانڕەوای فارس مایەوە تا ئەو کاتەی حەسەن کوڕی عەلی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ معاویە بەست و معاویە ڕۆشتە کوفە و زیاد لەقەڵایەك کە بەقەڵای زیاد ناسراوە، سەنگەری گرت.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی عامری وەك فەرمانڕەوای بەسرە و جەنگی سیستان و خوراسان دەستنیشان کرد.

## فەرمانڕەوایەتی کوڕی عامرو بەشێك لەڕووداوەکانی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەو

عەلی دەڵێت: معاویە دەیویست عەتەبە کوڕی ئەبی سوفیان بۆ بەسرە ڕەوانە بکات بەڵام کوڕی عامر قسەی لەگەڵ کرد و وتی: من لەوێ سامان و ئەمانەتی زۆرم بەجێهێشتووە، ئەگەر من بۆ بەسرە نەنێریت، لەناو دەچێت. معاویە ئەوی وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کرد و کوڕی عامر لەکۆتاییەکانی ساڵی چل و یەك ڕۆشتە ئەو شارە. فەرمانڕەوایەتی سیستان و خوراسانیش لەدەستی ئەودابوو. دەیویست زەید کوڕی جەبەلە وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی خۆی دەستنیشان بکات بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. کوڕی عامر ئەم ئەرکەی بە حەبیب کوڕی شەهابی شامی و بەوتەیەك بەقەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی سپارد. کاری داوەری کردنی بەسرەی بە عومەیرە کوڕی یەسربی زەببی برای عەمرۆ کوڕی یەسربی زەببیدا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: لەو ڕۆژگارەی کوڕی عامر کارگوزاری معاویە بوو، یەزید کوڕی مالکی باهلی ناسراو بە خەتیم – ئەم نازناوەی لەوێوە پێدا کە بەهۆی گورزی شمشێرەوە، برینێك لەسەر ڕوخساریدا بوو– لەگەڵ سەهم کوڕی غالیبی هوجەیمی ڕۆشتنە لای پردەکە و عیبادە کوڕی قورسی لەیسی کە لەتایەفەی منالەکانی بوجەیریان لەوێ بینی (عیبادە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) کردبوو) و کوشتیان. دوای ئەوە داوای ئەمانیان لەکوڕی عامر کرد و پێی بەخشین. معاویە نامەی بۆ نووسی ئەگەر ئەم بەڵێنە بشکێنێت کەس لێپرسینەوەت لەگەڵ ناکات بەلاًم ئەوان لەئەماندا بوون تا ئەو کاتەی کوڕی عامر لەسەر کار لابرا.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بەوتەیەك ئەو لەساڵی چلی کۆچی پێش ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکوژرێت، لەدایك بوو. ئەمە گێڕانەوەی واقدییە.

لەم ساڵەدا بەپێی وتەی باوکی مەعشەر، عەتەبە کوڕی ئەبی سوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا بەلاًم واقدی لەباوکی مەعشەر دەگێڕێتەوە کە لەم ساڵەدا یانی ساڵی چل و یەك، عەنبەسە کوڕی ئەبی سوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و دووی کۆچی

لەم ساڵەدا موسوڵمانان غەزای (ئالان) و (ڕۆم)یان ئەنجامدا. وەك دەڵێن زۆر بەقورسی ڕۆمییەکانیان تێکشاند و دەستەیەك لەبەتریقەکانیان کوشت.

دەڵێن: حەجاج کوڕی یوسف لەم ساڵەدا چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا معاویە، مەروان کوڕی حەکەمی وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشان کرد و کاری دادی مەدینەی بە مەروان کوڕی حارس سپارد. هەروەها معاویە، خالید کوڕی عاس کوڕی هوشامی وەك فەرمانڕەوای مەککە دیاریکرد. فەرمانڕەوای کوفە بەنوێنەرایەتی معاویە، موغەیرە کوڕی شەعبە بوو. کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیحدا بوو. فەرمانڕەوای بەسرە عەبدوللەی کوڕی عامر و کاروباری داد لەئەستۆی عەمرۆ کوڕی یەسربیدا بوو. قەیس کوڕی هەیسەم بەنوێنەرایەتی عەبدوللە کوڕی عامر کارگوزاری خوراسان بوو.

محەممەد کوڕی فەزلی عەبەسی دەڵێت: کاتێك معاویە، عەبدوللە کوڕی عامری وەك کارگوزاری بەسرە و خوراسان دەستنیشان کرد، عەبدوللە، قەیس کوڕی هەیسەمی بۆ خوراسان نارد کەماوەی دوو ساڵ لەخوراسان مایەوە.

سەبارەت بەکارگوزاری قەیس، حەمزە کوڕی ساڵحیش گێڕانەوەیەکی هەیە کەدەڵێت: کاتێك معاویە جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست، قەیس کوڕی هەیسەمی بۆ خوراسان نارد. دواتر خوراسانی بەکوڕی عامردا و کوڕی عامر قەیسی وەك کارگوزاری خوراسان هێشتەوە.

لەم ساڵەدا ئەو خەواریجەی لەجەنگی نەهرەوان مابوونەوە و بریندارەکان کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوانی بەخشیبوو و باش بووبوونەوە، کەوتنە جموجۆڵ.

## کاروکردەوەکانی خەواریج لەساڵی چل و دووەم

ئەبی کوڕی عەمارە دەڵێت: حەییان کوڕی زەبیانی سەلەمی، هەڵگری بیروباوەڕی خەواریج بوو. یەکێك بوو لەو کەسانەی لەجەنگی نەهرەوان بریندار بووبوو کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ چوارسەد کەسی دیکە، ئەوانی بەخشی.

ئەو لەناو کەسان و عەشیرەکەی خۆی مایەوە و ماوەی مانگێك یا دوو مانگ لەگەڵ ئەواندا ژیا. دواتر لەگەڵ چەند کەس لەهاوەڵانی خۆی ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و لەوێ مایەوە تا ئەوەی هەواڵی کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان پێگەیشت.

لەم کاتەدا حەییان هاوەڵانی خۆی کەدە و چەند کەسێك دەبوون و یەکیان سالیم کوڕی ڕەبیعەی عەبەسی بوو، بانگ کرد. کاتێك کۆبوونەوە، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: برا موسوڵمانەکانم، ئاگادار بوومەوە کەبراکەتان کوڕی مولجەم، لەبەردەم مزگەوتی گەورە، بۆ کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆسەی ناوەتەوە و چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی ئەوی کردووە. کاتێك بۆ نوێژی بەیانی هاتۆتەدەر، هێرشی کردۆتەسەر و بەشمشێری لەسەریداوە و دوای دوو ڕۆژ مردووە.

سالیم کوڕی ڕەبیعەی عەبەسی وتی: خوا ئەو دەستە نەبڕێتەوە کەشمشێری لەسەری عەلیدا.

دواتر ئەو دەستەیە بۆ کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سپاسی خوایان کرد.

نەزر کورشی سالح دەڵێت: دوای ئەو لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی مەسعەب کوڕی زوبەیر لەسالیم کوڕی ڕەبیعە سەبارەت بەو قسەی کەکردبووی، پرسیارم کرد کەپشتڕاستی کردەوە و وتی: لەو کاتەدا هەڵگری بۆچوونی خەواریج بووم، بەڵام چیتر وازم لێ هێناوە.

دەڵێت: ئێمەیش باوەڕمان کرد کەچیتر هەڵگری بیروباوەڕی خەواریج نییە.

دەڵێت: کاتێك ئەم بەسەرهاتەیان بیر دەخستەوە، تووڕە دەبوو.

دەڵێت: ئەوسا حەییان کوڕی زەبییان بەهاوەڵانی خۆی وت: سوێند بەخوا کەس بۆ هەمیشە نامێنێتەوە و ڕۆژ و شەو و ساڵ و مانگ، مەرگ پێشکەش بەمناڵەکانی ئادەم دەکات و لەهاوەڵە خۆپارێزەکان جیایان دەکاتەوە و لەدنیایەك دەڕوات کەتەنیا خەڵکی ناتەوان بۆی دەگرین و بەردەوام زیانیان لێدەدات، خوا بتانبەخشێت، ئێمە بەرەو شاری خۆمان ڕێنوێنی بکەن تا بڕۆینە لای براکانمان و بۆ فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە و جیهاد هانیان بدەین چوونکە هیچ بیانوویەکمان بۆ خۆدزینەوە نییە لەکاتێکدا فەرمانڕەواکانمان ستەمکارن و شێوازی ڕێنوێنی کردنی ڕاستەقینە و دروست پشتگوێ خراوە و ئەو کەسانەی براکانی ئێمەیان کوشت، لەئەماندا ژیان بەسەر دەبەن. ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، دڵی موسوڵمانان ئارام و ئاسودە دەبێت و دواتر سەرقاڵی کارێك دەبین کەڕەزامەندی زیاتری خواوەندی بەدواوە بێت و ئەگەر کوژراین، جیابوونەوە لەستەمکاران هۆکاری ئارامی وئاسایشە و بەڵێنەکەمان بۆ کەسانی پێش خۆمان بردۆتەسەر.

وتیان: هەمووان قسەکانی تۆ پشتڕاست دەکەینەوە و بۆچوونمان بۆچوونی تۆیە، بەرەو شاری خۆمان بڕۆین و ئێمەش لەگەڵ تۆداین و بەرێنوێنی کردنی تۆ شادومانین.

دەڵێت: ئەو بەڕێکەوت و خەواریجیش لەگەڵ ئەو ڕێگەی کوفەیان گرتەبەر.

دەڵێت: کاتێك گەیشتە کوفە، لەوێ مایەوە تا معاویە هات و موغەیرە کوڕی شەعبەی وەك فەرمانڕەوای کوفە دەستنیشان کرد. ئەو کەخوازیاری ئاشتی و ئارامی بوو، بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەگەڵ خەڵکان هەڵسوکەوتی دەکرد و گرنگی بەشوێنکەوتەی بیروبۆچوونە جیاوازەکان نەدەدا. دەڕۆشتنە لای موغەیرە و دەیانوت: فلانەکەس هەڵگری باوەڕی شیعەیە، فیسارەکەس شوێنکەوتەی خەواریجە.

دەیوت: فەرمانی خواوەندە کەبەردەوام جیاواز بن و خواوەند خۆی لێکۆڵینەوە و داوەری لەجیاوازی بەندەکانی خۆی دەکات.

دەڵێت: بەمشێوەیە خەڵك لەدەستی ئەو پارێزراو بوون و خەواریج چاویان بەیەك دەكەوت و سەبارەت بەكوژرانی براكانی خۆیان لەنەهرەوان دەدوان و دەیانوت، بەجێمان نەنگە و ریسوایی و جیهاد یانی دینداری و بەدەستهێنانی پاداش.

كوڕی عەمارە دەڵێت: لەڕۆژگاری موغەیرە خەواریج لەدەوری سێ كەس كۆبوونەوە كەمەستورد كوڕی عەلفە یەكێك لەوان بوو كە لەگەڵ سێسەد كەس بەرەو جەرجەرایا لەكەنارەكانی دیجلە ڕۆشت.

موحەل كوڕی خەلیفە دەڵێت: لەڕۆژگاری موغەیرە خەواریج لەدەوری سێ كەس كۆبوونەوە: مەستورد كوڕی عەلەفەی تیمی، لەتیم ئەلرەباب، حەییان كوڕی زەبیانی سەلەمی و مەعاز كوڕی جوەین كوڕی حەسینی تائی سەنبەسی كوڕە مامی زەید كوڕی حەسین كە لەجەنگی نەهرەوان لەبەرابەر سوپاكەی عەلی كوڕی ئەبی تالیب كوژرابوو. مەعاز یەكێك بوو لەچوارسەد بریندارەكەی نەهرەوان كەعەلی كوڕی ئەبی تالیب ئەوانی بەخشی.

دەڵێت: خەواریج لەماڵی حەییان كوڕی زەبییانی سەلەمی كۆبوونەوە و ڕاوێژیان كرد تا سەركردەیەك لەناو خۆیاندا هەڵبژێرن.

دەڵێت: مەستورد پێی وتن: ئەی موسوڵمانان و باوەڕداران، خواوەند بەدڵی خۆتان لەگەڵ بكات، كەسێك وەك سەركردەی هەڵبژێرن كەرەزامەندی هەموانی لەسەر بێت. سوێند بەو خوایەی ئاگای لەپێڵونانە سەر یەكی چاوەكانە، ترسم نییە لەوەی لەناو ئێوەدا چ كەسێك سەركردەی من بێت. ئێمە بەدوای پێگە و سامانی ئەم دنیایەوە نین چوونكە كەس بۆ هەمیشە لەم جیهانەدا نامێنێتەوە و ئێمە تەنیا مانەوەمان لەجیهانی كۆتایی دەوێت.

حەییان كوڕی زەبیان وتی: من پێویستم بەسەركردایەتی نییە و بەسەركردایەتی تۆ یا هەركام لەبراكانم ڕازیم، یەكێك لەناو خۆتان وەك سەركردە هەڵبژێرن و من پێش هەمووان بەیعەتی لەگەڵ دەبەستەم.

مەعاز كوڕی جوەین وتی: ئەگەر ئێوە كەسەروەری موسوڵمانان و گەورەی خەڵكان و تایەفەكانن بەمشێوەیە قسە دەكەن، كەواتە كێ ببێتە سەركردەی

موسـوڵمانان چوونکه هـەموو کەسێك شیاو نییە؟ موسـوڵمانان لەچاکەکاریدا بەرابەرن بـەڵام دەبێـت کەسـێك جڵـەوی کاروبـاری ئـەوان بگرێتەدەست کەباشـتر لەهـەموان لەهونـەری جـەنگ و دیـن و دەسـەڵات شارەزا بێـت و ئێـوە سپاس بـۆ خواوەند شیاوی ئەم کارەن، یەکێکتان ئەرکی سەرکردایەتی بگرێتە ئەستۆ.

وتیان: تۆ ئەم ئەرکە بگرە ئەستۆ و ئێمە بەتۆ ڕازی دەبین چوونکە سپاس بـۆ خوا دین و بڕیارەکانی تۆ گونجاوە.

وتی: تەمنی ئێوە لەمن زیاترە، یەك لەئێوە ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

لـەم کاتـەدا دەسـتەیەك لەخـەواریج کـە لـەوێ ئامـادە بـوون، وتیـان: ئێمـە بەسەرکردایەتی ئێوە سێ کەس ڕازین، یەکێکتان ئەم ئەرکە بگرێتە دەست.

بەڵام هەرکام لەو سێ کەسە بەوی دیکەی دەوت: تۆ ئەم ئەرکە بگـرە ئەسـتۆ و من بەتۆ ڕازیم.

کاتێك ئەم گفتوگۆیە درێژەی کێشا، حەییان کوڕی زەبیـان بەمەسـتوردی وت: مـەعاز کـوڕی جـوەین دەڵێـت: مـن سـەرکردایەتی ئێـوە ناکـەم کەتەمـەنتان لـەمن زیـاترە، منـیش بـەتۆ دەڵـێم سـەرکردایەتی تـۆ ناکـەم کەتەمـەنت لـەمن زیـاترە، دەستت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستم.

مەستورد دەستی بردە پـێش و حـەییان بەیعـەتی لەگـەڵ بەسـت. دواتـر مـەعاز کـوڕی جـوەین بەیعـەتی لەگـەڵ بەسـت و دوای ئـەو، کەسـانی دیکـە. ئـەم ڕووداوە لەمانگی جومادی ئەلئاخەر ڕوویدا.

دواتر بەڵێنیاندا کەرەستە و ئامادەکاری پێویست ئـەنجام بدەن و لەسـەرەتای شەعبانی ساڵی چل و سێیەم بەڕێکەون.

دەڵێن: لەم ساڵەدا بوسر کوڕی ئەبی ئەرتاتی عامری بەرەو مەدینە و مەککە و یەمەن ڕۆشت و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانانی کوشت. ئەم گێڕانەوەی واقدییـە. ئاماژەم بەگێڕانەوەی پێچەوانەی ئەمەداوە.

واقدی لەعـەتا کـوڕی بـاوکی مـەروان دەگێڕێتـەوە: بوسـر کـوڕی ئـەبی ئـەرتات یـەك مـانگ لەمەدینـە مایـەوە و لێکۆڵینـەوەی لەگـەڵ خـەڵکان دەکـرد و هەرکـەس دەیانوت دژی عوسمان شۆڕشی کردووە، دەیکوشت.

حەنزەلە کوڕی عەلی ئەسلەمی دەڵێت: بوسر چەند کەسێك لەمناڵەکانی کەعب و گەنجەکانی ئەوانی لەسەر چاڵاوەکەیان گرت و ئەوانی خستە ناو چاڵەکەوە.

لەم ساڵەدا وەك سلێمان کوڕی ئەبی ئەرقەم دەڵێت: زیاد لەفارسەوە هاتە لای معاویە و ئاشتی لەگەڵ کرد وبڕیاریدا سامانی بۆ بنێرێت. هۆکاری هاتنی ئەو دوای ئەوەی لەیەکێك لەقەلاّکانی فارس سەنگەری گرتبووە، وەك مەسلیمە کوڕی موحاریب دەڵێت ئەوە بوو کەسامانێکی زۆری لەبەسرە لەدەستی عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکرەدا بوو. معاویە لەمە ئاگادار بوویەوە و زیاد لەمە ترسا و نامەی بۆ عەبدولڕەحمان نووسی بەجوانی بیانپارێزێت. معاویە کەسی بۆ لای موغەیرە کوڕی شەعبە نارد تا لێکۆڵینەوە لەسامانی زیاد بکات. موغەیرە هات و عەبدولڕەحمانی گرت و پێی وت: ئەگەر باوکت خراپەی لەگەڵ من کردووە، زیاد چاکەی کردووە.

دواتر نامەی بۆ معاویە نووسی: هیچ شتێکی ئەوتۆ کەشیاوی گرتن و لێسەندن بێت، لای عەبدولڕەحمان نییە. معاویە نووسی: ئەشکەنجەی بکە.

دەڵێت: یەکێك لەپیرەکانی خەڵك دەیوت: کاتێك معاویە فەرمانی بەموغەیرەدا عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکرە ئەشکەنجە بکات، ئەوی ئەشکەنجە کرد و دەویست پاساوێك بێنێتەوە و معاویە لەکارەکەی ئاگادار ببێتەوە. لەبەر ئەمە بەعەبدولڕەحمانی وت: ئەوەی مامت فەرمانی پێداوی، بیپارێزە. حەریرێکی دەخستە سەر ڕوخساری و ئاوی بەسەردا دەکرد و لەهۆش خۆی دەچوو. سێ جار ئەو کارەی کرد و دواتر ئازادی کرد و نامەی بۆ معاویە نووسی: ئەشکەنجەم کرد بەڵام هیچی لا نەبوو. بەمشێوەیە چاکەکاری زیادی قەرەبوو کردەوە.

عەبدولمەلیك کوڕی عەبدوللە سەقەفی دەڵێت: موغەیرە کوڕی شەعبە ڕۆشتە لای معاویە. کاتێك معاویە ئەوی بینی، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((پیاو دەبێت نهێنی خۆی

بەبرادەری چاکەخوازی خۆی بڵێت

کاتێك نهێنی خۆت ئاشکرا دەکەیت

یا بەچاکەخوازێکی بڵێ یا هیچ کات مەیڵێ.))

موغەیرە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر نهێنی خۆت لای من باس بکەیت، لای کەسێکی چاکەخواز و باوەڕدار باست کردووە. نهێنی تۆ چییە؟

وتی: کەوتمە بیری زیاد کە لەسەرزەمینی فارس ماوەتەوە و لەوێ بەرگری دەکات. ئەمە ڕێگە نادات شەوانە خەوم لێبکەوێت.

موغەیرە ویستی لەگرنگی زیاد کەم بکاتەوە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران زیاد کە لەوێیە، چ گرنگییەکی هەیە؟

معاویە وتی: ناتەوانی خراپترین ڕێگەچارەیە، بەڕێوبەر و کارزانی عەرەب لەیەکێك لەقەڵاکانی فارس جێگیرە کەبیر لەفێڵ و ڕێگە چارە دەکاتەوە. چۆن دڵنیابم کە لەگەڵ یەکێك لەبنەماڵەکەی من بەیعەت نەبەستێت؟ و ئەگەر ئەو کارەی کرد جەنگ دژی من دەستپێدەکات.

موغەیرە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕێگە دەدەیت بڕۆمە لای.

وتی: بەڵێ بڕۆ و بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەگەڵی بدوێ.

موغەیرە بەڕێکەوت و کاتێك زیاد لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، وتی: بۆ کارێکی گرنگ هاتووە. ڕێگەیدا بڕواتە لای. لەکاتێکدا ڕووبەڕووی هەتاو دانیشتبوو، بەموغەیرەی وت: هیوادارم هەواڵی خۆشت هێنابێت.

وتی: ئەی باوکی موغەیرە، هەواڵەکە تایبەتە بەتۆ، معاویە دەترسێت و منی بۆ لای تۆ ناردووە. جگە لەحەسەن گومانی نەدەکرد کەس بانگەشەی خەلافەت بکات، ئەویش بەیعەتی لەگەڵ بەست و پێش ئەوەی دەسەڵاتی معاویە سەقامگیر و بەهێز ببێت و چیتر پێویستی بەتۆ نەبێت، جێگەیەك بۆ خۆت بگرە.

زیاد وتی: بۆچوونی خۆت بڵێ، ڕاستەوخۆ لەمەبەستی خۆت ئاگادارم بکەرەوە بێ ئەوەی پێچ و پەنای تێ بخەیت چوونکە ئەوەی ڕاوێژی پێدەکرێت دەبێت کەسێکی ئەمانەتدار بێت.

وتی: بۆچوونی ڕاشکاو، ڕەقە و تانە و تەشەر شیاو نییە. پەتی خۆت بەپەتی معاویە گرێ بدە وبڕۆرە لای.

وتی: با بزانم خواوەند چی دەوێت.

مەسلیمە کوڕی موحاریب دەڵێت: زیاد زیاتر لەساڵێك لەقەڵاکە نەمایەوە. دواتر معاویە نامەی بۆ نووسی: بۆ بەدەستی خۆت، خۆت لەناو دەبەیت، وەرە لای من و پێم بڵێ، ئەوسامانەی کۆت کردۆتەوە، چەندەی خەرج کراوە و چەندەی لای تۆ ماوە؟ دڵنیابە لەئەماندا دەبیت. ئەگەر ویستت لای من دەمێنیتەوە و ئەگەر ویستت بۆ شوێنەکەی خۆت دەگەڕێیتەوە.

دەڵێت: زیاد لەفارس هاتەدەر. موغەیرە کوڕی شەعبە ئاگادار بوویەوە کەزیاد دەیەوێت سەردانی معاویە بکات. پێش هاتنی زیاد ڕۆشتە لای معاویە. زیاد لەئیستەخرەوە ڕێگەی ئەرگانی گرتەبەر و ڕوویکردە ویلایەتی بەهرئەزان. دواتر لەڕێگەی حیلوانەوە خۆی گەیاندە مەداین. عەبدولڕەحمان ڕۆشتە لای معاویە و لەهاتنی زیاد ئاگاداری کردەوە. دوای ئەوە زیاد گەیشتە شام. موغەیرە یەك مانگ دوای زیاد گەیشت. معاویە پێی وت: ئەی موغەیرە، ڕێگەی زیاد، یەك مانگ لەڕێگەی تۆ زیاترە، تۆ پێش ئەو بەڕێکەوتیت، بەڵام ئەو پێش تۆ گەیشت.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کاتێك زانا لەگەڵ زانا قسە بکات، بەسەر ئەودا زاڵ دەبێت.

وتی: ئاگات لەخۆت بێت و خۆت لەمن بەدوور بگرە.

وتی: زیاد بەهیوای بەخشین و بەدەست هێنان دەهات و من بەترسی کەموکوڕی. ڕێگەبڕینی ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە بوو.

دەڵێت: معاویە سەبارەت بەسامانی فارس پرسیاری لەزیاد کرد. زیاد ئاماژەی بەوەدا کەبۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ناردبوو و هەروەها ئەو بڕەی خەرجی کردبوو، دەستنیشانی کرد. معاویە بەوتەکانی ڕازی بوو، پاشماوەی سامانەکەی لێوەرگرت و وتی: کەسێکی دەستپاك بۆ خەلیفەکانی ئێمە بویت.

سەلمە کوڕی عوسمان دەڵێت: معاویە نامەی بۆ زیاد لەفارس نووسی تا بڕواتە لای. زیاد لەگەڵ مینجاب کوڕی ڕاشدی زەببی و حاریسە کوڕی بەدری غەدانی لەفارسەوە بەڕێکەوت. معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی هازم و دەستەیەکی دیکەی بۆ فارس نارد و وتی: ئەگەری هەیە لەڕێگەدا زیاد ببینیت و بیگریت.

دەڵێت: کوڕی خازم بەرەو فارس بەڕێکەوت. دەستەیەك وتوویانە لەبازاری ئەهواز ڕووبەڕووی زیاد بوویەوە. دەستەیەك دەڵێن لەئەرگان چاوی بەزیاد کەوت وهەوساری ئەسپەکەی گرت و وتی: دابەزە. بەڵام مینجاب کوڕی ڕاشید دەنگی بەرز کردەوە و وتی: ئەی بەدبەخت، دوورکەوەرەوە، جیاواز لەوە دەستت بەهەوسارەکەوە دەدوورم.

دەڵێت: بەوتەیەك کوڕی خازم کاتێك گەیشتە لای ئەوان کەزیاد دانیشتبوو. کوڕی خازم بەشێوەیەکی توند قسەی لەگەڵ زیاد و مینجاب کرد و جوێنی پێدا.

زیاد وتی: کوڕی خازم چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت بەرەو بەسرە بەڕێکەویت.

وتی: بەرەو بەسرە دێم.

کوڕی خازم شەرم دایگرت و گەڕایەوە.

دەڵێت: دەستەیەك وتوویانە کەزیاد لەئەرگان چاوی بەکوڕی خازم کەوت و دەمەبۆڵە لەنێوان ئەواندا ڕوویدا. زیاد بەکوڕی خازمی وت: معاویە ئەمانی پێبەخشیوم و هەنووکە بۆ لای ئەو دەڕۆم. ئەوە نامەکەی ئەوە.

کوڕی خازم وتی: ئەگەر بۆ لای ئەو دەڕۆی، کارم پێت نییە. دواتر کوڕی خازم ڕێگەی شاپوری گرتەبەر و زیاد بەرەو بەهرئەزان بەڕێکەوت. کاتێك زیاد گەیشتە لای معاویە، سەبارەت بەسامانی فارس پرسیاری لێکرد کەوتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بڕێکی ئەو پارەیەم بۆ کاروبارەکانی فەرمانڕەوایەتی خەرج کردووە و ئەوەی ماوەتەوە، لای کەسانێك بەئەمانەت دامناوە. ماوەیەك گفتوگۆی لەگەڵدا کرد.

دەڵێت: زیاد نامەی بۆ کەسانێك وەك شوعبە کوڕی قەلعەم نووسی: دەزانن کەئەمانەتێك لای ئێوە هەیە، بیری قورئان بکەونەوە کەدەفەرمێت: ((ئەمانەتمان بەئاسمان و زەوی و کێوەکان سپارد بەڵام مرۆڤ پاراستنی ئەمانەتی گرتە ئەستۆ))[٧] ئەوەی لای ئێوەیە بیپارێزن. ئەو بڕەی بەمعاویەی وتبوو لەنامەکاندا نووسی و نامەکانی بەشێوەیەکی نهێنی بەکەسێکی خۆی ڕەوانە کرد و وتی

---

[٧] – احزاب، ئایەی ٨٢

چاویان بەو کەسانە بکەوێت کەمعاویە لەهەواڵەکان ئاگادار دەکەنەوە. نێردراو ئەو کارەی کرد و بابەتەکە ئاشکرا بوو. نامەکانیان گرت و بردیانە لای معاویە.

معاویە بەزیادی وت: ئەگەر فێڵت لەمن نەکردووە، ئەم نامانە وەك بەڵگەیە بۆ من. کاتێك نامەکانی خوێندەوە، لەگەڵ وتەکانی زیاد یەکیان دەگرتەوە و وتی: دەترسم فێڵت لەمن کردبێت، لەسەر هەرچی دەخوازیت ئاشتیم لەگەڵ بکە. زیاد لەسەر ئەو بڕەی لای ئەو مابوویەوە، ئاشتی کرد. بڕە پارەکەی هێنا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران پێش فەرمانڕەوایەتی سامانێکم هەبوو، چەندە خۆش بوو ئەگەر سامانەکەم وەك خۆی دەما و ئەوەی لەفەرمانڕەوایەتی بەدەستم هێناوە، لەدەستم دەچوو.

دواتر زیاد داوای مۆڵەتی لەمعاویە کرد تا لەکوفە نیشتەجێ ببێت. معاویە مۆڵەتی پێدا و زیاد ڕێگەی کوفەی گرتەبەر. موغەیرە ڕێزی گرت. معاویە بۆ موغەیرەی نووسی: ((زیاد و سلێمان کوڕی سەرد و حوجر کوڕی عودەی و شیبس کوڕی ڕیبعی و کوڕی کەوا و عەمرۆ کوڕی حەمەق بۆ نوێژی جەماعەت ببە)). ئەوان لەدوای موغەیرەوە بۆ نوێژ ڕیزیان دەبەست.

سلێمان کوڕی ئەرقەم دەڵێت: بیستم کاتێك زیاد هاتە کوفە، لەنوێژی جەماعەتدا بەشداری دەکرد. موغەیرە پێی وت: بڕۆ و پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکە. وتی: لەسنورەکەی تۆ، پێشنوێژی ماف تۆیە.

دەڵێت: جارێك زیاد ڕۆشتە لای موغەیرە، دایکی ئەیوب کچی عەمارە کوڕی عەقبە کوڕی ئەبی موعیت لای ئەو بوو. ئەوی لای زیاد دانیشاند و وتی: ((ڕوخسارت لەباوکی موغەیرە دامەپۆشە)) کاتێك موغەیرە مرد، زیاد ئەوی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە گەنج و جوان بوو و وەك زیاد دەڵێت، ئەو فیلەی لای ئەو بوو، لای ئەو هێشتیانەوە تا دایکی ئەیوب لێی بڕوانێت و ئەو شوێنەیان بەباب ئەلفیل(دەروازەی فیل) ناو برد.

لەم ساڵەدا عەنبەسە کوڕی ئەبوسوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. باوکی مەعشەر ئەمەی گێڕاوەتەوە.

ساڵی چل و سێیەمی کۆچی دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانیساڵی چل و سێیەمی کۆچ

یەکێك لەغەزاکانی ڕۆم بەفەرماندەیی بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات ئەنجامدرا کەزستانی لەو سەرزەمینە بەسەر برد و بەهەمان شێوە کەواقدی دەڵێت تا قوستەنتەنییە پێشڕەوی کرد. بەلاّم دەستەیەك لەشارەزیان بەم گێرانەوەیە ڕازی نابن و وتوویانە بوسر هیچکات زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر نەبردووە.

لەمساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاس، لەڕۆژی جەژنی قوربان لەمیسر مرد. پێشتر چوارساڵ بەنوێنەرایەتی عومەر کوڕی خەتاب فەرمانڕەوای میسر بوو و چوار ساڵ دوومانگ کەمتر بەنوێنەرایەتی عوسمان و دوو ساڵ یەك مانگ کەمتر بەنوێنەرایەتی معاویە فەرمانڕەوایەتی ئەوسەرزەمینەی دەکرد.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاسی دوای مەرگی باوکی، وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان کرد و وەك واقدی ئاماژەی پێدەدات، دوو ساڵ فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە بوو.

لەمساڵەدا موحەممەد کوڕی موسلیمە لەمانگی سەفەر لەمەدینە مرد و مەروان کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند.

لەم ساڵەدا بەوتەی هوشام کوڕی محەممەد، مەستورد کوڕی عەلەفە، سەرکردەی خەواریج کوژرا. دەستەیەك وتوویانە مەستورد لەساڵی چل و دووی کۆچ کوژرا.

## کوژرانی مەستورد کوڕی عەلەفە

پێشتر وتمان خەواریجی بریندار و توڕەی جەنگی نەهرەوان کۆبوونەوە و دەستەیەك لەوان ڕێگەی ڕەی یان گرتەبەر و خوازیاری سەرکردایەتی سێ کەس بوون کەیەکیان مەستورد کوڕی عەلەفە بوو. لەگەڵ مەستورد بەیعەتیان بەست و کۆك بوون لەسەر ئەوەی لەسەرەتای شەعبانی ساڵی چل و دووەم ئاڵای شۆڕش بەرز بکەنەوە.

موحەل کوڕی خەلیفە دەڵێت: قەبیسە کوڕی دەمون کەسەرکردەی پاسەوانەکانی موغەیرە بوو، هاتە لای و وتی شیمر کوڕی جەعونەی کەلابی هاتۆتە لام و وتوویەتی خەواریج لەماڵی حەییان کوڕی زەبیانی سولەمی کۆبوونەتەوە و بەڵێنیان داوە لەسەرەتای مانگی شەعبان دژی تۆ شۆڕش بکەن.

دەڵێت: قەبیسە هاوپەیمانی هۆزی سەقیف و خۆی یەکێك لەپیاوەکانی حەزرەموتە لەتایەفەی سەدەف. موغەیرە پێی وت: لەگەڵ پاسەوانەکان بڕۆ و دەوری ماڵی حەییان بگرە و بیهێنە لای من. چوونکە ئەویان بەسەرکردەی خەواریج دەزانی.

قەبیسە لەگەڵ پاسەوانەکان و دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان ڕۆشت و لەناکاو لەکاتی نیوەڕۆ، حەییان کوڕی زەبیان ئەوانی لەماڵەکەی خۆیدا بینی. موعاز کوڕی جوەین و بیست لەهاوەڵانی لەماڵەکەی ئەودا بوون. ژنەکەی حەییان هەستا و شمشێری خەواریجی لەژێر دۆشەکەکان شاردەوە. خەواریج کەویستیان شمشێرەکانیان هەڵگرن نەیانتوانی بیدۆزنەوە و تەسلیم بوون. ئەوانیان بردە لای موغەیرە کەپێی وتن: بۆ دەتانەوێت دووبەرەکی لەنێوان موسوڵمانان دروست بکەن؟

وتیان: مەبەستی ئەو کارەمان نەبووە.

وتی: هەواڵەکەم بیستووە و کۆبوونەوەی ئێوەیش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە.

وتیان: کۆبوونەوەمان لەو ڕۆژەدا لەبەر ئەوە بوو کەحەییان کوڕی زەبیان

باشتر لەهەمووومان قورئان دەخوێنێت و ئێمە لای ئەو کۆدەبینەوە و قورئان دەخوێنینەوە.

وتیان: بیانبەن بۆ زیندان.

دەڵێت: ئەوان نزیکەی ساڵێك لەزینداندا بوون و کاتێك هاوەڵانیان لەگیران و زیندانی کردنی ئەوان ئاگادار بوونەوە، وشیاربوونەوە. مەستورد کوڕی عەلەفە ڕێگەی حیرەی گرتەبەر و لەماڵێکی تەنیشت کۆشکی عەدەسییەکانی کەلب نیشتەجێ بوو. کەسێکی بۆ لای هاوەڵانی خۆی نارد کەهاتن و لای ئەو کۆدەبوونەوە. کاتێك هاتوچۆی هاوەڵانی مەستورد زیادی کرد، مەستورد پێی وتن: دەبێت لێرە بڕۆین چوونکە دەترسم لەمەبەستەکەمان ئاگادار ببنەوە.

سەبارەت بەمە گفتوگۆیان دەکرد و یەکیان بەوی دیکەی دەوت: دەڕۆینە فلانە و فیسارە شوێن، ئەوی دیکە دەیوت: دەڕۆینە فلانە و فیسارە شوێن، کەحەججار کوڕی ئەبجەر لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەماڵەکەی خۆیەوە ئەوانی بینی. لەهەمان کات دوو سوار هاتن و ڕۆشتنە ناو ماڵەکە. دواتر دوو کەسی دیکە ڕۆشتنە ناو ماڵەکە، دوای ئەوە کەسێکیتر... ئەمە سەرنجی ئەوی ڕاکێشا ودڵنیا بوو کەشۆڕشی خەواریج نزیکە.

دەڵێت: حەججار بەخانەخوێکەی خۆی وت کەژنێك بوو و شیری بەمناڵەکەی دەدا: هاوار لەتۆ، ئەو سوارانە کێن کەدێنە ناو ئەم ماڵە؟

وتی: سوێند بەخوا نازانم کێن، بەردەوام سوار و پیادەکان هاتوچۆی ئەم ماڵە دەکەن، ماوەیەك بەر لەئێستا ئەوانمان بینیوە بەڵام نازانین کێن.

دەڵێت: حەججار سوار ئەسپەکەی بوو، لەگەڵ کۆیلەکەی ڕۆشت و لەبەردەم دەرگای ماڵەکە وەستا کەیەکێك لەخەواریج لە بەردەرگاکەدا وەستابوو. کاتێك یەکێکیان دەهات، ئەو کەسە دەڕۆشتە ناو ماڵەکە و هاتنی ئەوی ڕادەگەیاند و مۆڵەتی بۆ وەردەگرت. کاتێك یەکێك لەکەسە ناودارەکانی خەواریج دەهات، بێ وەرگرتنی مۆڵەت دەڕۆشتە ژوور. کاتێك حەججار گەیشتە بەردەم ماڵەکە، ئەو پیاوە ئەوی نەناسییەوە و وتی: خوا بتبەخشێت، تۆ کێیت و چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت هاوڕێکەم ببینم.

وتی: ناوت چییه؟

وتی: حەجچار کوڕی ئەبجەر.

وتی: لێرەدابە تا ئاگاداریان بکەمەوە و بگەڕێمەوە.

حەجچار وتی: بڕۆ.

دەڵێت: پیاوەکە ڕۆشتە ناو ماڵەکە، حەجچاریش بەدوایدا ڕۆشت و گەشتە شوێنێك کەدەستەیەك لەوێ کۆبووبوونەوە. ئەو پیاوە ڕۆشتە ناویان و وتی: پیاوێك هاتووە و داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە دەکات، ئەوم نەناسی و پرسیم: تۆ کێیت؟ وتی: حەجچار کوڕی ئەبجەر.

حەجچار بیستی کەترسابوون و دەیانوت: حەجچار کوڕی ئەبجەر! سوێند بەخوا بەمەبەستێکی خێر نەهاتووە؟

کاتێك حەجچار ئەمەی بیست، ویستی بڕوات و تەنیا بەم ترساندە بەسەندە بکات، بەڵام دەیویست بمێنێتەوە و لەهەموو مەبەستەکانیان ئاگادار ببێتەوە. ڕۆشتە پێش و لەناو دەرگاکە وەستا و وتی: سڵاو وتان لێ بێت. دەستەیەکی بینی کەهەموویان سیلاح و قەڵغانیان پێبوو.

دواتر حەجچار وتی: خوایە بۆ کاری خێر کۆیان بکەرەوە، خوا بتانبەخشێت، ئێوە کێن؟

دەڵێت: عەلی کوڕی باوکی شیمر کوڕی حەسین، لەتایەفەی تیم ئەلڕەباب، ئەوی ناسییەوە. عەلی یەکێك لەو هەشت کەسە بوو کە لەجەنگی نەهرەوان هەڵاتبوو. یەکێك لەسوارەکارە بەناوبانگەکان و پیاوچاکەکانی عەرەب بوو.

عەلی وتی: ئەی حەجچاری کوڕی ئەبجەر، ئەگەر بەمەبەستی بەدەستهێنانی هەواڵ هاتوویت، هەواڵەکانت دەستکەوت. ئەگەر بەمەبەستێکی دیکە هاتوویت، پێمان بڵێ بۆ چی هاتوویت؟

وتی: پێویستم پێی نییە و ڕۆشتەدەر.

یەکێك لەخەواریج بەوانی دیکەی وت: ئەم پیاوە بگرن و ڕێگە مەدەن کەسانی دیکە لەمەبەستی ئێوە ئاگادار بکاتەوە.

دەڵێت: دستەیەك لەوان بەدوای حەجچاردا ڕۆشتنەدەر، دەمەو ئێوارێ بوو،

کاتێك پێی گەیشتنەوە کەسوار ئەسپەکەی دەبوو، پێیان وت: پێمان بڵێ بەچ مەبەستێك هاتبوویت؟

وتی: بۆ شتێك نەهاتبووم کەببێتە هۆی نیگەرانی ئێوە.

وتیان: چاوەرێ بە تا نزیك ببینەوە و قسە بکەین، یا تۆ وەرە و گفتوگۆمان لەگەڵ بکە، ئێمەیش تۆ لەهۆکاری کۆبوونەوەی خۆمان ئاگادار دەکەینەوە.

وتی: من لەئێوە نزیك نابمەوە و ناخوازم کەس لەئێوە نزیکم ببێتەوە.

عەلی کوڕی باوکی شیمر پێی وت: بەڵێن دەدەیت ئەمشەو کەس لەکاری ئێمە ئاگادار نەکەیتەوە و چاکەمان لەگەڵدا بکەیت، چوونکە مافی خزمایەتیمان لەسەر شانی تۆیە؟

وتی: بەڵێ، لەلایەن منەوە دڵنیا بن، ئەمشەو و هەموو شەوەکانی دیکە.

دەڵێت: حەججار ڕۆشتە ناو کوفە، کەسەکانی خۆیشی بردبوو. دەستەیەکی دیکە لەخەواریج وتیان: دڵنیا نین لەوەی ئەو کەسانی دیکە ئاگادار نەکاتەوە، دەبێت ئێستا لێرە بڕۆین.

دەڵێت: نوێژی ئێوارێیان خوێند و بەشێوەیەکی بەربڵاو لەحیرە هاتنەدەر. مەستورد وتی: دەڕۆینە ماڵی سەلیم کوڕی مەحدوجی عەبدی لەتایەفەی مناڵەکانی سەلمە. لەحیرە هاتەدەر و ڕێگەی هۆزی عەبدولقەیسی گرتەبەر و گەیشتە شوێنی تایەفەی مناڵەکانی سەلمە. کەسی بۆ لای سەلیم کوڕی مەحدوج نارد کەخزمی بوو. سەلیم هات و پێنج یا شەش کەسی لەهاوەڵانی ئەوی بردەوە بۆ ماڵ. حەججار کوڕی ئەبجەریش ڕۆشتبووە ماڵی خۆی، بەڵام ئەوان چاوەڕێیان دەکرد بڕواتە ماڵی فەرمانڕەوا و لەهەموو شتێك ئاگاداریان بکاتەوە یا لای خەڵکان باسیان بکات، بەڵام لای کەس باسی نەکرد و هیچی ناخۆشیان لەحەججار نەبینی.

دەڵێت: لەم کاتەدا موغەیرە کوڕی شەعبە ئاگادار بوویەوە کەخەواریج لەو ڕۆژانەدا دژی ئەو شۆڕش دەکەن. لەناو خەڵکان قسەی کرد، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

((ئەی خەڵکینە دەزانن بەردەوام خوازیاری تەندروستی ئێوەم و ئەوەی

ئازارتان نەدەم، بەڵام دەترسم ئەم هەڵسوکەوتەی من، بۆ نەزانەکانتان گونجاو نەبێت، بەپێچەوانەی بیرمەندە خۆپارێزەکان. سوێند بەخوا دەترسم بیرمەندی خۆپارێز بەگوناحی نەزانی بێ ئاوز گرفتار ببێت. ئەی خەڵکینە، پێش ئەوەی زیان هەمووتان بگرێتەوە، رێگە لەنەزانەکانتان بگرن. ئاگاداریان کردوومەتەوە کەدەستەیەك لەئێوە دەخوازن جیاوازی و دووبەرەکی لەناو خەڵکدا بنێنەوە. سوێند بەخوا لەهەر گەڕەکێك لەگەڕەکانی ئەم شارەوە دەرکەون، لەناویان دەبەم و دەیانکەمە وانەیەك بۆ کەسانی داهاتوو. هەر دەستەیەك پێش ئەوەی پەشیمان ببێتەوە، باشترە بەکارەکانی خۆیدا بچێتەوە. ئەم قسانە بۆ ئەوە دەکەم کەچیتر بیـــــانوو و پاســـــاو بـــــۆ کـــــەس نەمێنێتـــــەوە)).

دەڵێت: مەعقەل کوڕی قەیسی ڕیاحی هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی ئەمیر، ئایا ناوی کەسیان لەم دەستەیە پێ وتوویت؟ ئەگەر پێیان وتوویت، پێمان بڵێ تا ئێمەیش بزانین، ئەگەر لەئێمە بن ڕێگەیان لێدەگرین و ئەگەر لەئێمە نەبن، بەگوێرایەڵانی هەر تایەفەیەك بڵێ، نەزانەکانی خۆیان بێننە لای تۆ.

وتی: ناوی کەسیان نەبردووە، بەڵام پێیان وتووم دەستەیەك دەیانەوێت ئاژاوە لەشارەکەدا دروست بکەن.

مەعقەل وتی: خوا تەندروستت بکات، من دەگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆم و نەزانەکان هێور دەکەمەوە. هەرکام لەسەرکردەکانی دیکە دەبێت، نەزانەکانی خۆیان هێور و ئارام بکاتەوە.

دەڵێت: موغەیرە کوڕی شەعبە هاتەخوار و کەسی بۆ لای سەرکردەی خەڵکان نارد و پێی وتن: بارودۆخ بەو شێوەیە کەدەزانن و ئەو قسانەی کردم، بیستتان، هەرکام لەسەرکردەکان خەڵکەکەی خۆی هێور بکاتەوە، جیاواز لەوە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، واز لەهەڵسوکەوتی ئێستام دەهێنم و ڕێگەیەك دەگرمەبەر، نەپێتان خۆش دەبێت، نەپەسەندی دەکەن. کەس لەخۆی زیاتر کەسی دیکە سەرکۆنە نەکات و هەرکەس لەمەترسی ئاگاداری کردنەوە، جێگەی بۆ بەڵگە و پاساو نەهێشتۆتەوە.

دەڵێت: سەرکردەکان بۆ لای هۆزەکانی خۆیان گەڕانەوە و بەخودا و ئیسلام

سوێندیاندان تا ئەو کەسانە دەستنیشان بکەن کەدەخوازن ئاژاوە بنێنەوە یا لەخەڵکان جیاببنەوە. سەعسەعە کوڕی سوحان هات و لەناو تایەفەی عەبدولقەیس نیشتەجێ بوو.

مورە کوڕی نەعمان دەڵێت: سەعسەعە کوڕی سوحان لەناو ئێمەدا قسەی کرد. لەمانەوەی تیمی و هاوەڵانی لەماڵی سەلیم کوڕی مەحدوج ئاگادار بووبوویەوە بەلاّم لەگەڵ ئەوەی لەوان جیا و لەبۆچوونەکەیان بێزار بوو، نەیدەویست لەناو خەڵکەکەی ئەو دەستگیر بکرێن چوونکە ئازاردانی یەکێك لەکەسەکانی خۆی پێ خۆش نەبوو. سەعسەعە زۆر بەباشی و جوانی قسەی کرد. لەو کاتەدا ژمارەی گەورەکانی ئێمە فراوان و پیاوەکانمان زۆر بوون.

دەڵێت: سەعسەعە دوای ئەوەی نوێژی خەوتنی کرد، قسەی بۆ ئێمە کرد و وتی:

((ئەی بەندەکانی خوا، سپاسی فراوان بۆ خواوەند، کاتێك چاکەکاری لەناو موسوڵماناندا دابەش کرد و باشترینی بەئێوە بەخشی. بەدینی خوا ڕازی بوون کەخواوەند بۆ خۆی و فریشتەکان و پێغەمبەرەکانی پەسەندی کردبوو و لەسەر دینی خوا مانەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر (د.خ) مرد و جیاوازی لەناو خەڵکان هاتە ئاراوە. دەستەیەك مانەوە و دەستەیەك هەڵگەڕانەوە و دەستەیەك دووبەرەکییان کردە پیشە و دەستەیەك چاوەڕوان بوون. بەلاّم ئێوە بەهۆی باوەڕ بەخواوەند و پێغەمبەرەکەی لەسەر دین مانەوە و جەنگی هەڵگەڕاوەکانتان کرد تا دین سەقامگیر و خواوەند ستەمکارانی لەناو برد. لەبەر ئەمە خواوەند بەردەوام بەخشینەکانی خۆی بەئێوە بەخشی تا ئەو کاتەی دووبەرەکی لەناو خەڵکان هاتە ئاراوە و دەستەیەك وتیان: خوازیاری تەڵحە و زوبەیر و عایشەین. دەستەیەك وتیان: خوازیاری پیاوەکانی ڕۆژئاواین. دەستەیەك وتیان: عەبدوڵلە کوڕی وەهبی ڕاسبی ئەزدیمان دەوێت. بەلاّم ئێوە بۆ ڕەزامەندی خواوەند وتتان: جگە لەکەسانی ئەم بنەماڵەیە کەخواوەند بەهۆی ئەوانەوە، ڕێزداری کردووین، کەسمان ناوێت و بەردەوام شوێنکەوتەی ڕاستی بوون و پشتتان پێبەست تا ئەوەی خواوەند بەهۆی ئێوە و کەسانی هاو باوەڕی ئێوە لەجەنگی (جەمەل)

پەیمانشکێنەکان و لەجەنگی نەهرەوان، بێدینەکانی لەناو برد (باسی کەسانی شامی نەکرد چوونکە لەو کاتەدا فەرمانڕەوا بوون). هیچ دەستەیەك بۆ خواوەند و ئێوە و بنەماڵەی پێغەمبەرەکەتان و موسوڵمانان لەم بێ دینانە مەترسیدارتر نییە کە لەپێشەواکەی ئێمە جیابوونەوە و خوێنی ئێمەیان بەحەلاڵ لەقەڵەمدا و ئێمەیان بەکافر ناساند، ئەوان لەماڵەکانی خۆتان حەشار مەدەن چوونکە هیچ کامە لەهۆزەکانی عەرەب نابێت زیاتر لەئێوە دوژمنایەتی ئەم دەستەیە بکەن. سوێند بەخوا ئاگادار بوومەتەوە کەدەستەیەك لەوان لەسووچێکی ئەم هۆزەدا خۆیان حەشارداوە، من لێکۆڵینەوە لەڕاستی ئەم بابەتە دەکەم و ئەگەر ئەوەی بەمنیان وتووە، ڕاست بێت بەکوشتنی ئەوان، خۆم لەخواوەند نزیك دەکەمەوە چوونکە خوێنیان حەلاڵە)).

دواتر وتی:

((ئەی خەڵکی عەبدولقەیس، فەرمانڕەواکانی ئێوە، ئێوە و بۆچوونەکانی ئێوە باشتر لەهەمووان دەناسن، بیانویان بەدەستەوە مەدەن چوونکە بەخێرایی هێرش دەکەنە سەر ئێوە و کەسانی وەك ئێوە)).

دەڵێت: دواتر هاتە سووچێکەوە دانیشت و خەڵکانی هۆز دەوریان گرت و وتیان: خوا بەلەعنەتیان بکات، خواوەند لەوان بێزارمان بکات، سوێند بەخوا پەنایان نادەین و ئەگەر لەشوێنی ئەوان ئاگادار ببینەوە، ئاگادارت دەکەینەوە. جگە لەسەلیم کوڕی مەحدوج کەهیچی نەوت و خەمبار و بێزار، بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. حەزی نەدەکرد ئەوان لەماڵەکەی خۆی دەربکات و بیێتە ئەوەی خەڵکان تانەی لێ بدەن چوونکە پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان ئەواندا بوو و کەسانێکی بڕواپێکراو بوون. هەروەها دەترسا لەوەی ئەوان لەماڵەکەی ئەودا بدۆزنەوە و بیانکوژن و ئەویش بکوژرێت.

دەڵێت: سەلیم گەیشتە شوێنەکەی خۆی. هاوەڵانی مەستورد ڕۆشتنە لای. هەموویان لەوتەکانی موغەیرە کوڕی شەعبە و سەرکردەکانی خەڵك ئاگادار بوون و هەموویان وتیان: ئێمە لێرە ببە چوونکە سوێند بەخوا دەترسین لەناو عەشیرەکانی خۆمان بمانگرن.

مەستورد بەوانی وت: مەگەر نازانن سەرکردەی عەبدولقەیس وەك سەرکردەی عەشیرەکانی دیکە کە لەناو خەڵکی خۆیان قسەیان کردووە، لەگەڵ ئەوان قسەی کردووە.

وتیان: سوێند بەخوا دەزانین.

وتی: بەڵام خاوەن ماڵەکەی من هیچی پێ نەوتووم.

وتیان: سوێند بەخوا شەرمت لێ دەکات.

دەڵێت: مەستورد، سەلیمی بانگ کرد کەهات و وتی: ئەی کوڕی مەحدوج، بیستوومە سەرکردەی عەشیرەکان لەناو خەڵکاندا قسەیان کردووە و ئاماژەیان بەمن و هاوەڵانم داوە. کەسێك لەناو ئێوەدا قسەی کردووە و لەمبارەوە بدوێت؟

وتی: بەڵێ، سەعسەعە کوڕی سوحان لەناو ئێمەدا قسەی کرد و وتی: پەنا بەکەس لەوان نەدەین و قسەی زۆریان کرد بەڵام من نەمویست باسی هیچ بکەم نەکا گومان بکەن مانەوەی ئێوە دەبێتە هۆی بێزاری من.

مەستورد وتی: ڕێزی ئێمەت گرت و چاکەت لەگەڵ کردین. بەخواستی خواوەند لای تۆ دەڕۆین.

سەلیم وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ لەماڵەکەی مندا بدۆزنەوە، تا من زیندوو بم، دەستیان بەتۆ و هاوەڵانی تۆ ناگات.

وتی: هیوادارم خوا لەوە بتپارێزێت.

دەڵێت: مەستورد کەسی بۆ لای هاوەڵانی خۆی نارد و وتی: لەم هۆزە دەڕۆین نەکا موسوڵمانێك نەخوازراو بەهۆی ئێمەوە گرفتار ببێت. کەسانی دیکەیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کرد. قەڵایەکیان کردە شوێنی کۆبوونەوەی خۆیان و دەستە پێنج کەسی و دە کەسییەکان بەرەو قەڵاکە ڕۆشتن و نزیکەی سێسەد کەس لەقەڵاکەدا کۆبوونەوە. دواتر ڕێگەی (سرات)یان گرتەبەر و شەوێك لەوێ مانەوە.

دەڵێت: ئەو کەسانەی لەزیندانی موغەیرەدا بوون، ئاگادار بوونەوە کەخەڵکی شار بڕیاریانداوە هەموو خەواریجی ناو خۆیان بگرن یا لەشارەکە دووریان بخەنەوە. موعاز کوڕی جوەین کوڕی حەسین لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە

بەم ناوەرۆکە:

((ئەی گیانبەخشەکان، کاتی ئەوە هاتووە
کەهەرکەس گیانی خۆی بەخشیوە، بەرێکەوێت
بەهۆی نەزانییەوە
لەدیاری هەڵەکاراندا ماونەتەوە
تا بۆ کوشتن ڕاوتان بکەن
هێرش بکەنە سەر ئەم خەڵکە دوژمنە
کەمانەوەتان بۆ کوژران
کارێکی نەزانانەیە
ئەی خەڵکینە بەرەو مەبەستێك بڕۆن
کەکاتێك باسی دەکەن
باشتر بێت و دادپەروەرانەتر
خۆزگە لەناو ئێوەدا دەبووم
سوار لەسەر ئەسپێکی بەهێز
بەقەڵغانێکەوە و سیلاح بەدەست
خۆزگە لەناو ئێوەدا دەبووم
و شەڕی دوژمنەکانتانم دەکرد
تا جامی مەرگ زووتر لەهەموان دەرخواردی من بدەن
بۆ من دژوارە کەئێوە
ترساو بن و هەڵاتوو
و من بۆ ئەم لەڕێدەرچووانە
شمشێرم دەرنەکێشا بێت
و ئەو جوامێرەی کەکاتێك وتمان، ڕۆشت و پشتی تێکردین
بگەڕێتەوە
و بڵاوەی بەدوژمنەکان نەکردبێت
بۆ من دژوارە کەئێوە

ستەم ببینن و کەمتەرخەمی بکەن

و من غەمبار ئەسیر و گرفتار بم

ئەگەر لەناو ئێوەدا دەبووم و مەبەستی کوشتنی ئێوەیان دەکرد

لەناو ئەم دوو دەستەدا وەك شێرێك دەبووم

و بلاوەم بەدوژمنان دەکرد

بەردەوام هێرشم دەکردە سەر دوژمنان

و ئازایەتی و بوێری لەخۆم بەیادگاری جێدەهێشت)).

دەڵێت: موغەیرە کوڕی شەعبە لەمەبەستەکەیان ئاگادار بوویەوە و سەرکردەکانی خەڵکی بانگ کرد و وتی: بەبۆچوونی ئێوە کێ بۆ لای ئەوان بنێرم؟

دەڵێت: عودەی کوڕی حاتەم هەستا و وتی: ئێمە هەموومان دوژمنی ئەوانین و لەبۆچوونی ئەوان بێزارین و گوێڕایەڵی تۆین، هەرکام لەئێمە دەخوازی بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکە.

مەعقەل کوڕی قەیس هەستا و وتی: ئەگەر هەرکام لەگەورەکانی شار کە لەدەروی تۆدا کۆبوونەتەوە، بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکەیت، گوێڕایەڵ و ملکەچی تۆ دەبن و دوژمنی ئەوان و خوازیاری لەناوچوونی دوژمنەکان، خوا تەندروستیت پێ ببەخشێت، گومان ناکەم کەس بۆ لای ئەوان بنێرێت کەزیاتر لەمن دوژمنتر و بێزارتر لەوان بێت. من بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکە، بەخواستی خوا، لەشەڕ و بەڵای ئەوان ڕزگارت دەکەم.

موغەیرە وتی: بەناوی خواوەند بەڕێکەوە. سێ هەزار کەس بۆ هاوڕێیەتی ئەو ئامادە کرد و بەقەبیسە کوڕی دەمونی وت: شیعەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کۆبکەرەوە و لەگەڵ قەیس ڕەوانەیان بکە چوونکە ئەو لەسەرکردەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بووە و ئەگەر شیعە ناودارەکان ڕەوانە بکەیتەوە و پێکەوە کۆببنەوە، زیاتر لەیەك نزیك دەبنەوە چوونکە ئەوان زیاتر لەهەمووان خوێنی ئەم بێ دینانە بەحەڵاڵ دەزانن و زیاتر لەکەسانی دیکە دوژمنی ئەوانن و چەندینجار دژی ئەوان جەنگاون.

مورە کوڕی مەنقەد کوڕی نەعمان دەڵێت: من یەکێك بووم لەو کەسانەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ مەعقەل بەڕێکەوتم.

دەڵێت: سەعسەعە کوڕی سوحان دوای مەعقەل کوڕی قەیس هەستا و وتی: ئەی ئەمیر، من بۆ جەنگی ئەوان بنێرە چوونکە سوێند بەخوا خوێنیان بەحەڵاڵ دەزانم و دەتوانم لەئەستۆی ئەم کارە بەربێم.

وتی: دانیشە، تۆ تەنیا بۆ وتاردان باشیت.

دەڵێت: سەعسەعە لەم وتەیە ڕەنجا. موغەیرە ئەم قسەی لەبەر ئەوە کرد چوونکە بیستبووی کەسەعسەعە ڕەخنە لەعوسمان کوڕی عەفان دەگرێت و زیاتر وەسفی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکات. مەغەیرە ئەوی بانگ کردبوو و پێی وتبوو: چیتر نامەوێت ببیستم لای کەس ڕەخنە لەعوسمان کوڕی عەفان دەگریت و نەبیستم بەئاشکرا وەسفی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکەیت چوونکە تۆ هیچ وەسفێکی عەلی ناکەیت کە من لێی بێ ئاگا بم و باشتر لەتۆ ئەوە دەزانم، بەڵام ئەم حکومەتە زاڵ بووە و ئێمە ناچارین کەڕەخنە لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بگرین. زۆربەی ئەو شتانە پشتگوێ دەخەین کەئێمەیان بۆ وتنی ڕاسپاردووە و تەنیا بەڕواڵەت، هەندێ قسە دەکەین تا لەخۆمان لەدەستی ئەم خەڵکە بپارێزین. ئەگەر وەسفی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکەیت، لەناو هاوەڵانی خۆتان ئەو کارە بکە و لەناو ماڵەکانتان، بەڵام ئەگەر ئاشکرا قسە بکەیت و لەناو مزگەوت باسی بکەیت، خەلیفە بەمە ڕازی نابێت و ئێمە لەسەر کار لادەبات.

سەعسەعە دەیوت: بەڵێ، ئەو کارە دەکەم. دواتر موغەیرە دەیبیست کەدووبارە کارێکی کردووە، کەپێشتر ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتووە.

دەڵێت: و کاتێك ئەو ڕۆژە هەستا و وتی: من بۆ جەنگی ئەوان بنێرە، موغەیرە کە لەدژایەتییەکانی ئەو ناڕازی بوو، وتی: دانیشتە تەنیا بۆ قسە کردن باشیت، ئەوی ڕەنجاند کەوتی: مەگەر جگە لەوتاردان هیچی دیکە نازانم، سوێند بەخوا وتاردەرێکی سەرسەخت و سەروەرم، سوێند بەخوا ئەگەر لەجەنگی جەمەل منت لەژێر ئالای عەبدولقەیسدا دەبینی کەرمەکان لەیەك گیر بووبوون و سەرەکان دەشکان، دەتزانی شێرێکی چەندە سەرسەختم.

موغەیرە وتی: بەسە، سوێند بەگیانی خۆم، زمانێکی پاراوت هەیە.

دەڵێت: زۆری نەخایاند قەبیسە کوڕی دەمون، سوپایەکی لەگەڵ مەعقەلدا ڕەوانە کرد کە لەسێ هەزار کەس لەسەرکردەکان و شیعەکان پێکهاتبوو.

سالیم کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: لای موغەیرە دانیشتبووم کەمەعقەل کوڕی قەیس هات و سلاو و ماڵئاوایی لێکرد. موغەیرە پێی وت: ئەی مەعقەل، سوارەکارە بەئەزمونەکانی شارم لەگەڵ تۆ ناردووە، فەرمانمداوە ئەوان گوڵبژێر بکەن، هێرش بکە سەر ئەم دەستە بێ دینە کە لەئێمە جیابوونەتەوە و بەکافرمان دەزانن، سەرەتا پێشنیاری تەوبەیان پێبکەن و ئەگەر گەڕانەوە بۆ ناو خەڵك، لێیان خۆشبە و ئەگەر ڕازی نەبوون، بجەنگە و دژی ئەوان پشت بەخوا ببەستە.

مەعقەل کوڕی قەیس وتی: پێشنیاری گەڕانەوەیان پێدەکەم و هیچ بەڵگە و پاساوێك ناهێڵمەوە، بەلام سوێند بەخوا گومان ناکەم ڕازی ببن، ئەگەر بەڕاستییەکان ڕازی نەبوون، بەناڕاستی ئەوان ڕازی نابم. خوا تەندروستیت پێ ببەخشێت، لەشوێنی ئەوان ئاگاداریت؟

وتی: بەڵێ، سەماك کوڕی عوبەیدی عەبەسی (بەنوێنەرایەتی موغەیرە کارگوزاری مەداین بوو) نامەی بۆ نووسیوم و ئاگاداری کردوومەتەوە کە لەڕێگەی سەراتەوە ڕۆشتوون و لەبەهرسیر جێگیر بوون و ویستوویانە بەرەو شاری کۆنە بڕۆن کەماڵەکانی کەسرا و مەداین لەوێیە بەلام سەماك ڕێگەی لێگرتوون و لەبەر ئەمە لەبەهرسیر ماونەتەوە. بڕۆ و بۆ گەیشتن بەوان پەلە بکە. ڕێگە مەدە لەهیچ شوێنێك زیاتر لەو کاتەی پێیان پێشنیار دەکەیت، بمێننەوە. ئەگەر ڕازی نەبوون، دژی ئەوان بجەنگە چوونکە ئەگەر دوو ڕۆژ لەهەر ویلایەتێك بمێننەوە، بۆچوونی و باوەڕی ئەو کەسانە دەگۆڕن کەتێکەڵیان دەبن.

دەڵێت: مەعقەل هەمان ڕۆژ بەڕێکەوت و شەوی لەسورا بەسەر برد. موغەیرە بەوەرداندا (کۆیلەکەی) کە لەمزگەوت ڕۆشتە لای خەڵك و وتی: ئەی خەڵکینە، مەعقەل کوڕی قەیس بۆ جەنگی بێ دینەکان بەڕێکەوتووە و شەو لەسوڕا دەمێنێتەوە و کەس لەهاوەلانی لەجێ نەماوە، دڵنیابن ئەمیر دەڕواتە ماڵی هەموو موسوڵمانان و جەخت لەوە دەکاتەوە شەو لەکوفەدا نەمێننەوە چوونکە

هەرکەس لەم دەستەیە ڕۆژی دواتر لەکوفەدا بێت، گرفتار دەبێت.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی دەڵێت: من یەکێك بووم لەو کەسانەی لەگەڵ مەستورد کوڕی عەلەفە بەڕێکەوتبوون و لەهەموو هاوەڵانی ئەو گەنجتر بووم.

دەڵێت: بەڕێکەوتین تا گەشتینە بەهرسیر و ڕۆشتینە ناو شارەکە. سەماك کوڕی عوبەیدی سەقەفی کە لەشاری کۆندا بوو، ئاگاداری کردینەوە و کاتێك ویستمان لەپردەکە بپەڕینەوە و ڕووبەڕوویان ببینەوە، لەسەر پردەکە ڕووبەڕوومان بوویەوە. دواتر پردەکەی وێران کرد و ئێمە لەبەهرسیر ماینەوە.

دەڵێت: مەستورد کوڕی عەلەفە منی بانگکرد و وتی: ئەی برازاکەم، بۆ من دەنووسیت؟

وتم: بەڵێ.

کاغەز و مرەکەبی بۆ من داوا کرد و وتی: بنووسە:

((لەبەندەی خوا مەستورد، سەروەری باوەڕداران بۆ سەماك کوڕی عوبەید، بەڵام دواتر، ئێمە دژایەتی خەڵکەکەی خۆمان کرد بەهۆی ستەمکاری و پشتگوێ خستنی سنورەکان و جیاوازییەکان لەکار و تالانییەکاندا و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند و سوونەتەکانی پێغەمبەر (د.خ) و خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر و بێزاری لەخەلافەتی عوسمان و عەلیت پێدەکەین چوونکە دیاردەی نوێیان هێنایە ناو دینەوە و فەرمانەکانی قورئانیان پشتگوێ خست، ئەگەر ڕازی ببیت، بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی کراویت و ئەگەر ڕازی نەبیت، پاساومان بۆ تۆ نەهێشتۆتەوە و جەنگ دژی تۆ ڕادەگەیەنین و دادپەروەرانە بەتۆ دەڵێین کەخواوەند خیانەتکارانی خۆش ناوێت)).

دەڵێت: مەستورد وتی: ئەمە نامە بۆ سەماك ببە و وەڵامەکەی بێنەرەوە بۆ من.

دەڵێت: گەنجێکی کەم تەمەن بووم و ئەزموونێکی ئەوتۆم نەبوو، زۆر شتەم نەدەزانی، وتم: ئەگەر فەرمان بدەیت خۆم هەڵدەمە ناو دیجلە نافەرمانی تۆ ناکەم، بەڵام چۆن دڵنیایی لەوەی سەماك نامگرێت و زیندانیم ناکات، بەمشێوەیە

جیهاد دژی ستەمکاران لەدەست دەدەم.

دەڵێت: مەستورد بزەیەکی گرت و وتی: ئەی برازا، تۆ نێردراویت و نێردراوەکان زیندانی ناکەن، ئەگەر دەترسیت، کەسێکی دیکە دەنێرم، تۆ زیاتر لەمن نیگەرانی خۆت نیت.

دەڵێت: بەڕێکەوتم و ڕۆشتمە لای سەماك کوڕی عوبەید کەخەڵکی زۆر دەوریان گرتبوو.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتمە لایان، چاویان تێبڕیم و کاتێك لێیان نزیك بوومەوە، دە کەسیان بەرەو ڕووم هاتن، گومانم کرد دەیانەوێت بمگرن و پێشبینی هاورێکەم هەڵە بووە. شمشێرەکەم دەرکێشا و وتم: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، دەستتان بەمن ناگات تا ئەو کاتەی سەبارەت بەئێوە لای خواوەند هیچ بەڵگەیەکەم پێ نەبێت.

وتیان: تۆ کێیت؟

وتم: نێردراوی سەروەری باوەڕداران، مەستورد کوڕی عەلەفە.

وتیان: بۆ شمشێرت دەرکێشاوە؟

وتم: چوونکە بەڕاکردن بەرەوڕووی من هاتن و ترسام ئەسیرم بکەن یا نامەردانە بمکوژن.

وتیان: تۆ لەئەماندایت، هاتین لای تۆ بێستین و دەسکی شمشێرەکەت بگرین و بزانین بۆ چی هاتووین و چیت دەوێت؟

وتم: مەگەر ئەمانم نییە بۆ لای هاورێکانم بگەڕێمەوە.

وتیان: ئەمانت هەیە.

دەڵێت: شمشێرەکەم کردە کالأن و ڕۆشتم تا لای عوبەید کوڕی سەماك وەستام. هاوەڵانی ئەو دەرویان گرتبووم، یەکیان دەسکی شمشێرەکەم و یەکیتریان بازووی گرتبووم. نامەکەی مەستوردم تەسلیم کرد و کاتێك خوێندییەوە، سەری بەرز کردەوە و وتی: بەبۆچوونی من مەستورد بەهۆی نەبوونی ناوبانگ و نەشیاو و نەگونجاوی، شیاوی ئەوە نەبوو شمشێر بەدەست دژی موسوڵمانان بجەنگێت و بەمن بڵێت بێزاری لەعوسمان کوڕی عەفان و عەلی

کوڕی ئەبی تالیب دەربڕم و پێشنیاری خەلافەتی خۆیم پێبکات، سوێند بەخوا پیرێکی خراپەکارە.

دەڵێت: دواتر سەیری منی کرد و وتی: کوڕی خۆم، بڕۆ بۆلای مەستورد و پێی بڵێ، لەخوا بترسێت و لەباوەڕەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ ناو موسوڵمانان، ئەگەر دەخوازێت نامە بۆ موغەیرە دەنووسم و ئەمانی بۆ وەردەگرم چوونکە کەسێکی ئاشتیخوازە و لەجەنگ بێزارە.

دەڵێت: چوونکە لەسووربوونی خەواریج دڵنیابووم، وتم: هەرگیز! ئێمە لەم کارەدا ئەمان و ڕەزامەندی خوامان دەوێت کەدەبێت بەهۆیەوە لەم دنیا لەئێوە بترسین.

وتی: بەدبەخت و چارەڕەش بیت، چۆن بەزەییم بەتۆدا بێتەوە؟

دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت: بەرەڵای بکەن. دواتر لای ئەو دەستیان بەقورئان خوێندن کرد و سوجدەیان دەبرد و دەگریان. بەم کارەیان گومانیان دەکرد لەسەر ڕێگەی ڕاستن لەکاتێکدا هەموویان چوارپێ بوون بگرە نەزانتر لەچوارپێیش. سوێند بەخوا کەسم نەبینیوە لەوان نەزانتر و شوومتر.

وتم: ئەی فلانەکەس، نەهاتووم شەڕە قسە لەگەڵ تۆ بکەم یا وتەی خۆت و هاوەڵانت ببیستم، پێم بڵێ ئایا بەوەی لەنامەکەدا هاتووە، ڕازی دەبیت یا نە؟ چوونکە دەمەوێت بۆ لای هاورێکەی خۆم بگەڕێمەوە.

دەڵێت:سەیری منی کرد و بەهاوەڵانی خۆی وت: سەرتان لەکاری ئەم کوڕە سوڕنامێنێت؟ سوێند بەخوا لەباوکی بەتەمەنترم و بەمن دەڵێت: ئایا بەداواکاری ناو نامەکە ڕازی دەبیت؟ کوڕم، بگەڕێرەوە بۆ لای مەستورد، کاتێك سوپا دەوری ئێوەی گرت و ڕمەکان بەرز کرانەوە و سینەی ئێوەی کردە ئامانج، پەشیمان دەبیتەوە و ئارەزوو دەکەیت، لەماڵی دایکتا بیت.

دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای هاوەڵانم و کاتێك گەیشتمە لای مەستورد، وتی: وەڵامەکەی چی بوو؟

وتم: وەڵامی خێری نەدایەوە، ئەمە و ئەوەم پێوت و ئەوەی وەڵام دامەوە. ڕووداوەکەم بەتەواوی بۆ گێڕایەوە.

دەڵێت: مەستورد ئەم ئایەی خوێندەوە: ((ان الذين كفروا سواء عليهم انذرتهم ام لم تنذره لا يؤمنون. ختم الله على قلوبهم و علة سمعهم و علة ابصارهم غشاوه و لهم عذاب عظيم)).

واتاکەی:ئەوانەی کافرن بۆیان یەکسانە بیانترسێنیت یا نەیانترسێنیت ئیمان ناهێنن، خواوەند دڵی ئەوانی داخستووە و گوێچکە و چاویان پەردەیەکی لەسەرە و ڕووبەڕووی ئازابێکی گەورە دەبنەوە)).

دەڵێت: دوو یا سێ ڕۆژ لەشوێنی خۆمان ماینەوە، دواتر ئاگادار بووینەوە مەعقەل کوڕی قەیس بۆ جەنگی ئێمە بەڕێکەوتووە. مەستورد ئێمەی کۆکردەوە، سپاسی خواوەندی کرد و دواتر وتی: ئەم نەزانە، مەعقەل کوڕی قەیس کە لەسەبائییە درۆزنە درۆکەرەکانە، بۆ جەنگی ئێوە بەڕێکەوتووە کەدوژمنی خوایە و دوژمنی ئێوە، لەبۆچوونی خۆتان ئاگادارم بکەنەوە.

یەك لەئێمە وتی: کاتێك ئاڵای شۆڕشمان بەرز کردەوە، جگە لەڕەزامەندی خوا و جیهاد دژی دوژمنانی خوا، هیچ مەبەستێکی دیکەمان نەبوو، هەنووکە کە بۆ جەنگی ئێمە دێن، بۆکوێ بڕۆین. دەمێنینەوە تا خواوەند لەنێوان ئێمە و ئەوان داوەری بکات چوونکە باشترینی داوەرەکانە.

دەستەیەکی دیکە وتیان: دەڕۆینە شوێنێکی دیکە و دوور دەکەوینەوە، پێشنیار بەخەڵکان دەکەین و پاساو بۆ کەس ناهێڵینەوە.

مەستورد وتی: ئەی موسوڵمانان، سوێند بەخوا مەبەستی سامانی دنیاو بەدەست هێنانی ناوبانگ و مانەوە، شۆڕشم دەستپێنەکردووە، حەز ناکەم تەواوی دنیا و چەند بەرابەری شتەکانی دنیا، لەبەرابەر پێپۆشەکانم ببێتە هی من، بەمەبەستی شەهادەت شۆڕشم دەستپێکردووە تا گومڕاکان ریسوا بکەم و خواوەند بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیان بکات. لەم کارەدا ڕاوێژم بەئێوە کرد و بەباشی دەزانم لێرە نەمێنینەوە تا بەسوپاکەی خۆیان بۆ جەنگی ئێمە بێن. بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆین و دوور بکەوینەوە و کاتێك ئاگادار بوونەوە و بەدوای ئێمەدا هاتن، شەکەت و بەربڵاو بن، بەوشێوەیە جەنگ دژی ئەوان ئاسانترە. بەناوی خوا بەڕێدەکەوین.))

دەڵێت: بەڕێکەوتین و لەکەنارەکانی دیجلەوە ڕێگەمان بڕی تا گەشتینە جەرجەرایا، لەدیجلە پەڕینەوە و لەسەرزەمینی جوخی ڕۆشتینە پێش تا گەشتینە مەزار و لەوێ ماینەوە. عەبدوڵڵە کوڕی عامر لەشوێنی مانەوەی ئێمە ئاگادار بوویەوە و سەبارەت بەکاری موغەیرە کوڕی شەعبە پرسیاری کرد کەئەو سوپایەی بۆ جەنگی خەواریجی ناردووە، چی بەسەرهات و ژمارەیان چەندە؟

دەڵێت: لەژمارەی سوپاکە ئاگاداریان کردەوە و وتیان کەموغەیرە پیاوێکی سەروەری کە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب دژی خەواریج جەنگاوە و لەهاوەڵانی ئەو بووە، بۆ جەنگی خەواریج ناردووە و هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیشی لەگەڵ ناردووە کەسەرسەختترین دوژمنی خەواریجن.

وتی: کارێکی باشی کرد.

دواتر کوڕی عامر کەسی بۆ لای شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی نارد کەشوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو،، وتی: بۆ جەنگی ئەم بێ دینانە بڕۆ، سێ هەزار کەس هەڵبژێرە و شوێنیان کەوە تا لەسەرزەمینی بەسرە دووریان دەخەیتەوە یا دەیانکوژیت. کاتێك تەنیا بوون، پێی وت: کەسانێك لەخەڵکی بەسرە هەڵبژێرە کەجەنگ دژی ئەوان بەڕەوا دەزانن.

شەریك زانی کەمەبەستی لەشیعەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە بەڵام نایەوێت ناوی ئەوان ببات.

دەڵێت: شەریك کەسانێکی هەڵبژارد کەزیاتریان لەسوارەکانی ڕەبیعە بوو. گەورەکانی خەڵك بەپێشنیارەکەی ڕازی بوون و لەگەڵ ئەوان بۆ جەنگی مەستورد کوڕی عەلەفە بەڕێکەوت کە لەمەزار بوو.

عەبدوڵڵە کوڕی حارس دەڵێت: یەکێك بووم لەو کەسانەی لەگەڵ مەعقەل کوڕی قەیس بەڕێکەوتین، لەگەڵ ئەو ڕۆشتم و لەو کاتەوەی بەڕێکەوتین، یەك ساتیش لێی جیانەبوومەوە. یەکەم مەنزڵی ئێمە سوڕا بوو.

دەڵێت: ڕۆژێك لەسوڕا ماینەوە تا هەموو هاوەڵانی مەعقەل کۆبوونەوە. دواتر بەخێرایی ملی ڕێگەمان بڕی تا دوژمن دوور نەکەوێتەوە. دەستەیەکمان وەك پێشەنگ نارد و بەڕێکەوتین و لەکوسی دابەزین. ڕۆژێك لەوێ ماینەوە تا

کەسانی دیکە پەیوەستمان بن. شەوانە لەکوسییەوە بەڕێکەوتین، چەند کاتژمێرێك لەشەو تێپەڕی کردبوو. ڕۆشتین تا لەمەداین نزیك بووینەوە. پیاوەکانی ئێمە هاتن و ئاگاداریان کردینەوە کەئەوان ڕۆشتوون. سوێند بەخوا ئەو هەواڵەمان پێ خۆش نەبوو، زانیمان ڕووبەڕووی دژواری دەبینەوە و گەڕان بەدوای ئەواندا درێژە دەکێشێت.

دەڵێت: مەعقەل کوڕی قەیس هات تا لەشاری بەهرسیر دابەزی. نەڕۆشتە ناو شارەکە. سەماك کوڕی عوبەید هاتە لا و سلاوی لێکرد، فەرمانی بەکۆیلەکانی خۆیدا مەڕ و ئالیکی بۆ بێنن. بەئەندازەی نیازی خۆی و سوپاکەیان بۆ هێنا.

مەعقەل کوڕی قەیس دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لەمەداین مابوویەوە، هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و وتی: ئەم بێ دینە گومڕایانە ڕۆشتن و درێژەیان بەڕێگەی خۆیاندا تا بەخێرایی شوێنیان کەون و شەکەت و بەربلاو بن و کاتێك بەوان دەگەنەوە، بەتەواوی هیلاك و ماندوو بووبێتن، بەلام ئێوە هەرچەندە هیلاك بن، ئەوانیش بەهەمان ئەندازە هیلاك دەبن.

دەڵێت: ئێمەی لەمەداینەوە بەڕێکرد. باوکی رواغی شاکری لەگەڵ سێسەد سوار لەپێشەوە نارد کەشوێن ئەوان کەوت. مەعقەل بەدوای ئەو ملی ڕێگەی گرتەبەر. باوکی رواغ سەبارەت بەخەواریج پرسیاری دەکرد و تا جەرجەرایا شوێنیان کەوت. دواتر درێژەی بەڕێگەی ئەواندا و گەیشتە مەزار کەخەواریج لەوێ مابوونەوە. کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە، ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانی خۆی کرد بۆ ئەوەی بزانێت ئایا پێش گەیشتنی مەعقەل ڕووبەڕووی ئەوان ببێتەوە و جەنگ دەستپێبکات یا نە؟

دەستەیەکیان دەیانوت: پێشڕەوی دەکەین و لەگەڵیان دەجەنگین. دەستەیەکی دیکە دەیانوت: سوێند بەخوا نابێت بۆ جەنگ دژی ئەوان پەلە بکەیت تا سەرکردەکەمان بێت و لەگەڵ تەواوی سوپاکە ڕووبەڕوویان ببینەوە.

زەید کوڕی ڕاشدی فائیشی دەڵێت: ئەو ڕۆژە لەگەڵ باوکی رواغدا بووم، بەئێمەی وت: کاتێك مەعقەل کوڕی قەیس منی وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد، وتی: شوێنپێی خەواریج هەڵگرە و ئەگەر لێیان نزیك بوویتەوە، بۆ جەنگ دژی ئەوان

پەلە مەکە تا خۆم بگەم.

دەڵێت: هەموو هاوەڵان وتیان: ئێستا هەموو شتێك ئاشکرایە. ئێمە بۆ شوێنێك ببە کەلێیان نزیك ببین تا سەرکردەکەمان بێت. ڕۆشتێنە شوێنێك. شەو بوو.

دەڵێت: تەواوی شەو تا بەیانی کێشکمان گرت تا بەیانی بوویەوە و هەتاو سەری دەرهێنا و ئەوان بۆ لای ئێمە هاتن. ئێمەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان ڕۆشتین. سێسەد کەس بوون. ئێمەیش سێسەد کەس بووین و کاتێك نزیکمان بوونەوە و هێرشیان هێنا، سوێند بەخوا یەك کەس لەئێمە نەیتوانی لەبەرابەر ئەواندا بمێنێتەوە.

دەڵێت: بەهەلاَتن ماوەیەکمان بەسەر برد. دواتر باوکی رواغ هاواری کرد و وتی: ئەی سوارە خراپکارەکان، خوا ڕووڕەشتان بکات، بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە.

دەڵێت: باوکی رواغ هێرشی برد، ئێمەیش هێرشمان برد و کاتێك لێیان نزیکبووینەوە، ئەوان هاتنە پێش و ئێمە پاشەکشێمان کرد. ئەوان پێشڕەوییان دەکرد و ئێمەیان ڕاو دەنا. کەس لەئێمە بریندار نەبوو، چەند کەسێك بەسووکی بریندار بوون. باوکی رواغ پێی وتین: دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، تا نزیك ئەوان پێشڕەوی دەکەین و پاشەکشێ ناکەین تا سەرکردەکەمان دێت چوونکە قێزەونە ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە و خۆڕاگری نەکەین و جەنگە قورس و ژمارەی کوژراوەکانمان فراوان نەبێت.

دەڵێت: یەکێك لەئێمە لەوەڵامدا وتی: خوا شەرمی لەڕاستی نییە، ئێمەیان تێکشکاند.

باوکی رواغ وتی: خوا کەسانی وەك تۆ زیاد نەکات، تا ئەو کاتەی گۆڕەپانی جەنگ بەجێنەهێڵین، شکستمان نەخواردووە. کاتێك لێیان نزیك ببینەوە، لەبارودۆخێکی باشتردا دەبین تا سوپاکەمان دێت. سوێند بەخوا ئەگەر دەیانوت: باوکی حیمران حەمیر کوڕی بەحتەر شکستی خواردووە، گرنگیم پێنەدەدا، بەلاَم دەڵێت کەباوکی رواغ شکستی خواردووە. لەنزیك ئەوان بمێننەوە، ئەگەر هاتنە پێش و نەتانتوانی خۆڕاگری بکەن، بڕۆنە سووچێکی

دیکە. ئەگەر هێرشیان کرد و نەتانتوانی بجەنگن، پاشەکشێ بکەن و پەنا بۆ دەستەیەکی دیکە ببەن و ئەگەر گەڕانەوە، بگەڕێنەوە و لەنزیکیانەوە جێگیر بن، تا کەمێکی دیکە سوپاکەمان دەگات.

دەڵێت: بەهەمان شێوە بوو کەکاتێك خەواریج هێرشیان دەبرد، پاشەکشێیان دەکرد و لەشوێنێکدا کۆدەبوونەوە و کاتێك هێرشیان دەکرایەسەر و بڵاوە بەدەستەکانیان دەکرا، باوکی رواغ و سوارکارەکان لێیان نزیك دەبوونەوە.

دەڵێت: کاتێك بینیان نەیانتوانی بڵاوە بەدەستەکەی ئێمە بکەن و لەهەڵاتنی هەتاو تا نوێژی نیمەڕۆ سەرقاڵی جەنگ و هەڵاتن بوون، و وەختی نوێژی نیوەڕۆ گەیشت، مەستورد بۆ نوێژ دابەزی و باوکی رواغ و هاوەڵانی بەئەندازەی میلێك یا دوو میل لێیان دوورکەوتنەوە. هاوەڵانی باوکی رواغیش دابەزین و نوێژی نیوەڕۆیان خوێند. دوو کەسیان وەك دیدەوان دانا و لەشوێنی خۆیان مانەوە تا نوێژی ئێوارێیان خوێند.

دەڵێت: ئەوسا گەنجێك نامەیەکی مەعقەل کوڕی قەیسی هێنا کەبۆ باوکی رواغی نووسیبوو. خەڵکی گوندەکان و ڕێبوارەکان ئەوانیان دەبینی کەسەرقاڵی جەنگن و ئەو کەسانەی لەڕێگە مەعقەلیان دەبینی، ئاگاداریان دەکردەوە کەهاوەڵانی ڕووبەڕووی خەواریج بوونەتەوە.

مەعقەل دەیوت: بارودۆخ چۆن بوو؟

دەیانوت: بینیمان خەواریج پاشەکشێیان بەسوپاکەی تۆ کرد.

دەیوت: نەتانبینی سوپاکەی من هێرشیان بکەنەسەر و جەنگ دەستپێبکەن.

دەیانوت: بۆنا، هێرشیان دەکردە سەر خەواریج بەڵام شکستیان دەخوارد و پاشەکشێیان دەکرد.

دەیوت: ئەگەر باوکی رواغ ئەو کەسە بێت کەمن دەیناسم، تێکشکاو بۆ لای ئێوە ناگەڕێتەوە.

دەڵێت: مەعقەل، موحریز کوڕی شەهابی تیمی بانگ کرد و وتی: لەگەڵ کەسە لاوازەکانی سوپاکەدا بمێنەرەوە و بەهێواشی ڕێگە ببڕە تا پەیوەستی ئێمە دەبیت. دواتر پیاوە بەهێزەکانی کۆکردەوە و وتی: هەرکەس دەتوانێت

لەگەڵ مندا بێت. بۆ لای براکانی خۆتان بەرێکەون کەڕووبەڕووی دوژمن بوونەتەوە. هیوادرام پێش ئەوەی ئێوە بگەن، خواوەند ئەوانی لەناو بردبێت.

دەڵێت: مەعقەل پیاوە بەهێزەکانی کۆکردەوە کەهەموویان ئەسپی ڕەسەنیان پێبوو. ژمارەیان نزیکەی حەوتسەد کەس دەبوو. بەڕێکەوتن و کاتێك لەباوکی رواغ نزیك بوونەوە، باوکی رواغ وتی: ئەمە تەپوتۆزی سوپایە، لەدوژمن نزیك ببینەوە تا کاتێك سوپاکە دەگات گومان نەکەن لەوان دوور بووینەتەوە و لێیان دەترسین.

دەڵێت: باوکی رواغ پێشڕەوی کرد و لەبەرابەر مەستورد و هاوەڵانی وەستا. مەعقەل و سوپاکەی گەیشتن و کاتێك نزیك بوویەوە، هەتاو ئاوا بوو. مەعقەل دابەزی و لەگەڵ هاوەڵانی نوێژی خوێند. باوکی رواغیش دابەزی و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەسوچێکدا نوێژی خوێند. خەواریجیش بۆ نوێژ ڕیزیان بەست.

دوای ئەوەی مەعقەل کوڕی قەیس لەگەڵ سوپاکەی هات و لەباوکی رواغ نزیك کەوتەوە، ئەوی بانگ کرد و پێی وت: ئەی باوکی رواغ، کارێکی باشت کرد، چاوەڕوانی ئەوەم لەتۆ هەبوو کەخۆڕاگری بکەیت و پێگەکەت بپارێزیت.،

وتی: خوا تەندروستیت پێببەخشێت، هێرشەکانی ئەوان قورسە، خۆت لەپێشەوە هێرش نەبەیت، کەسانێك لەپێشەوە بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە بکە و خۆت لەپشتەوە بە و چاودێری سوپاکەت بکە.

وتی: بۆچوونەکەت شیاوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا لەم قسانەدا بوون کەهێرشیان کرایەسەر و کاتێك لێی نزیك بوونەوە، زۆربەی سوپاکەی پاشەکشێیان کرد بەڵام ئەو مایەوە و لەئەسپەکەی هاتەخوار و هاواری کرد: ئەی موسوڵمانان، زەوی، زەوی.

دەڵێت: باوکی رواغی شاکری و دەستەیەکی فراوان لەسوارە بەئەزموونەکان و پاسەوانەکانی، نزیکەی دووسەد کەس لەگەڵ ئەو لەئەسپەکانیان هاتنەخوار. کاتێك مەستورد و سوپاکەی گەیشتن، بەڕم و شمشێر ڕووبەڕوویان بوونەوە. سوپاکەی مەعقەل کەمێك لێی دوور بوون. دواتر مسکین کوڕی عامر کوڕی عەنیف کەپیاوێکی چاونەترس و بوێر بوو، هاواری کرد: ئەی موسوڵمانان بۆ

کویێ ڕادەکەن، سەرکردەکەتان دابەزیوە، شەرم ناکەن. هەڵاتن هۆکاری ڕیسوایی و نەنگە. دواتر بەخێرایی ئەسپی بۆ پێشەوە غاردا و ژمارەیەکی زۆر شوێنی کەوتن و هێرشیان کردە سەر خەواریج و لەکاتێکدا مەعقەل کوڕی قەیس لەژێر ئالاّکەی خۆی لەگەڵ کەسانی دەوروبەری ڕووبەڕووی دوژمن بووبوویەوە، پەلاماریاندان و پاشەکشێیان پێکردن.

زۆری نەخایاند موحریز کوڕی شەهاب لەگەڵ دەستەیەك کەدوا کەوتبوون، هاتن. مەعقەل ئەوان و سوپاکەی ڕیز کرد و باڵی چەپ و ڕاستی دەستنیشان کرد، باوکی رواغی وەك فەرماندەی باڵی ڕاست و موحریز کوڕی بوجەیری وەك فەرماندەی باڵی چەپ دیاریکرد. مسکین کوڕی عامری وەك فەرماندەی سوارەکان دانا. وتی: شوێنەکانی خۆتان بەجێمەهێڵن تا بەیانی دەبێتەوە و لەبەیانیدا، هێرش دەکەینە سەر دوژمن و دەجەنگین. جەنگاوەرەکان لەشوێنەکانی خۆیان مانەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقبەی غەنەوی دەڵێت: کاتێك مەعقەل کوڕی قەیس گەیشتە لای ئێمە، مەستورد وتی: ڕێگە مەدەن مەعقەل سوار و پیادەکان دژی ئێوە ئامادە بکات، هێرشێکی لەناکاویان بکەنەسەر، بەڵکو خواوەند ئەو ودوژمنەکانمان لەناو ببات.

دەڵێت: هێرشێکی قورسمان دەستپێکرد کەپاشەکشێیان کرد و هەڵاتن. مەعقەل کاتێك هەڵاتنی سوپاکەی بینی، لەئەسپەکەی دابەزی و ئالاّکەی بەرز کردەوە. کەسانێك لەسوپاکەی لەگەڵ ئەو لەئەسپ هاتنەخوار، ماوەیەکی زۆر جەنگان و خۆڕاگرییان کرد. دواتر سوپاکەی بۆ جەنگی ئێمە گەڕاندەوە و لەهەموو قۆڵەکانەوە پێشڕەوییان کرد و ئێمە پاشەکشێمان کرد تا ئەو جێگەیماڵەکانمان بەجێهێشت. ماوەیەکی زۆر لەجەنگدا بووین، چەند کەسێکمان بریندار و کوژران.

حەسیرەت کوڕی عەبدوڵڵە لەباوکی دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆژە عومەیر کوڕی باوکی ئەشائەتی ئەزدی کوژرا، یەکێك بوو لەو کەسانەی لەگەڵ مەعقەل کوڕی قەیس دابەزیبوو. هەروەها یەکێك بوو لەسەرکردەکانی خەڵك.

دەڵێت: منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی لەگەڵ ئەو لەئەسپ دابەزیم، سوێند بەخوا ئەگەر هەموو شتێك لەبیر بکەم، عەمیر لەبیر ناکەم کەهۆنراوەی دەخوێندەوە و شمشێری دەوەشاند. شەڕێکی قورسی کرد کەهاوتاییم نەبینیبوو، ژمارەیەکی بریندار کرد و کوژرا. ئاگادارنیم ئەگەر زیاتر لەکەسێکی کوشتبێت، وەك لەبیرمە پەلاماریدا و ڕۆشتە سەر سنگی و سەری بڕی، هێشتا سەری جیانەکردبوویەوە کەیەکێك لەخەواریج پەلاماریدا و بەڕم گورزێکی لەقوڕگیدا کە لەسەر سینەی دوژمنەکەی کەوتەخوار و بێجووڵە کەوت. ئێمە هێرشمان کردە سەر خەواریج و بۆ لای گوندەکە پاشەکشێمان پێکردن، دواتر گەڕاینەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ، من ڕۆشتمەی لای عومەیر، هیوادارم بوو هەناوی تیا مابێت بەڵام مردبوو. منیش گەڕامەوە بۆ لای هاوەڵانم و لای ئەوان وەستام.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی دەڵێت: سەرەتای شەو ڕووبەڕووی دوژمن وەستابووین کەنێردراوەکەمان گەڕایەوە. یەکێك لەڕێبواران ئاگاداری کردبووینەوە کەسوپایەك لەبەسرەوە بەرەو لای ئێمە دێت بەڵام گرنگیمان پێنەدا. پارەمان بەیەکێك لەدانیشتووانی ناوچەکەدا و پێمان وت: بڕۆ و بزانە لەبەسرەوە سوپا دێت؟

کاتێك لەبەرابەر خەڵکی کوفە دەجەنگاین، گەڕایەوە و وتی: بەڵێ، شەریك کوڕی ئەعوەر بەرەو لای ئێوە دێت، لای نیوەڕۆ دەستەیەکم بینی کە لەیەك فەرسەخی ئێوەدان و بەبۆچوونی من ئەمشەو تا بەیانی دەگەنە لای ئێوە.

دەڵێت: بەتەواوی حەپەساین، مەستورد بەهاوەڵانی خۆی وت: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: بۆچوونمان بۆچوونی تۆیە.

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە لەبەرابەر ئەم سوپا گەورەیە نەمێنینەوە و بەرەو ئەو شوێنە بگەڕێینەوە کەلێوەی هاتووین چوونکە خەڵکی کوفە و بەسرە شوێنمان ناکەون و لەم شێوەدا تەنیا خەڵکی شارەکەمان شوێنپێی ئێمە هەڵدەگرن.

وتیان: بۆ دەبێت ئەو کارە بکەین؟

وتی: جەنگ لەگەڵ خەڵکی شارێك بۆ ئێمە ئاسانترە لەجەنگ دژی خەڵکی دوو شار.

وتیان: بۆ هەر شوێنێك دەخوازیت ئێمە، ببە.

وتی: لەئەسپەکانی خۆتان وەرنەخوار و کەمێك بحەسێنەوە و ئالیك بەچوارپێکانتان بدەن، دواتر چاوەڕوانی فەرمانم بن.

دەڵێت: لەچوارپێکان هاتینەخوار.

دەڵێت: ئەوکاتە مەودایەك دووری لەنێوان ئێمە و ئەواندا بوو چوونکە لەترسی هێرشی لەناکاوی شەوانە، لەگوندەکە دوورکەوتبوونەوە.

دەڵێت: کاتێك چوارپێکانمان حەسانەوە و ئالیکمان پێدان، سواربووین، مەستورد پێی وتین: بڕۆنە ناو گوندەکە و لەپشتی گوندەکە وەرنەدەر. یەکێك لەدانیشتووانی گوندەکە بگرن تا ئێوە بۆ پشتی گوندەکە ببات و بتانباتە ئەو ڕێگەی لێوەی هاتووین. گرنگی بەدوژمنەکانتان مەدەن با لەشوینی خۆیان بن چوونکە شەو و بگرە تا بەیانی لەڕوشتنی ئێوە ئاگادار نابنەوە.

دەڵێت: ڕۆشتینە ناو گوندەکە و یەکێك لەدانیشتووانەکەمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت و پێمان وت: ئێمە لەپشت ئەم ڕیزەوە ببە تا بگەینە ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین. ئەو کارەی کرد و ئێمەی برد تا گەشتینە ڕێگەیەك کەلێوەی هاتبووین و ملی ڕێگەمان گرتەبەر تا گەشتینە جەرجەرایا.

عەبدوللە کوڕی حارس دەڵێت: من یەکەم کەس بووم هەستم بەڕۆشتنی ئەوان کرد.

دەڵێت: بەمەعقەلم وت: خوا تەندروستیت پێببەخشێت، ماوەیەك سەرم لەکارەکانی ئەم دوژمنەمان سوڕماوە، ئەوان لەبەرابەر ئێمەدا بوون و شەڕکەرەکانم دەبینی، بەڵام ماوەیەك ڕەشایی ئەوان بەرچاو ناکەوێت، دەترسم لەشوێنەکەی خۆیان ڕۆشتبێتن و فریومان بدەن.

وتی: لەچ فریوێکی ئەوان دەترسیت؟

وتم: دەترسم بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشمان بکەنەسەر.

وتی: سوێند بەخوا منیش لەم مەترسیە لەئەماندا نیم.

وتم: کەواتە بۆ ئەم کارە خۆت ئامادە بکە.

وتی: لێرەبە بزانم چی دەبێت.

دواتر وتی: ئەی عیتاب لەگەڵ هەرکەس دەخوازیت بڕۆ و لەگوندەکە نزیک ببەرەوە، بزانە کەس لەوان دەبینیت، یا دەنگیان دەبیستیت، ئەگەر توانیت لەخەڵکی گوندەکە سەبارەت بەوان بپرسە.

دەڵێت: عیتاب لەگەڵ یەك لەسەر پێنجی جەنگاوەران ڕۆشت و سەیری گوندەکەی کرد و کەسی نەبینی بتوانێت قسەی لەگەڵ بکات. بانگی خەڵکی گوندەکەی کرد، چەند کەسێکیان هاتن و سەبارەت بەخەواریج لەوانی پرسی.

وتیان: ڕۆشتوون و نازانین بۆ کوێ ڕۆشتوون.

دەڵێت: عیتاب گەڕایەوە بۆ لای مەعقەل و لەهەموو شتێك ئاگاداری کردەوە.

مەعقەل وتی: مەترسی هێرشی لەناکاومان لەسەرە، خەڵکانی موزێر لەکوێن؟ خەڵکانی موزێر هاتن. وتی: لێرەدا بێستن. دواتر وتی: خەڵکانی ڕەبیعە لەکوێن؟

دەڵێت: خەڵکی ڕەبیعەی لەسوچێکی دیکەدا ڕیز کرد و خەڵکی تەمیمی لەسوچێکی دیکە و خەڵکی هەمەدانی لەسوچێکی دیکە و پاشماوەی خەڵکانی یەمەنی لەسوچێکی دیکەدا ڕیز کرد. هەرکام لەم چوار دەستەیە لەپێش و لەپشتەوە لەبەرابەر ئەوی دیکەدا بوو. مەعقل بەناویاندا گەڕا و لای هەردەستەیەك وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە ئەگەر هێرشیان کردە سەرتان و لەدەستەیەکی دیکەوە دەستیان پێکرد، ڕووبەڕوویان ببنەوە، هەرگیز شوێنەکانی خۆتان بەجێمەهێڵن تا فەرمانی منتان بەدەست دەگات، هەرکام لەئێوە پارێزگاری لەشوێنەکەی خۆی بکات تا بەیانی بێت و لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خۆمان بکەین.

دەڵێت: بەدرێژایی شەو کێشکیان گرت و لەهێرشی لەناکاوی خەواریج دەترسان تا بەیانی بوویەوە.

دەڵێت: لەکاتی نوێژی بەیانی، لەچوارپێکان هاتنەخوار و نوێژی بەیانییان خوێند. کەسانێك هاتن و ئاگاداریان کردینەوە کەخەواریج لەو ڕێگەوەی هاتوون، گەڕاونەتەوە.

دەڵێت: ئەوسا شەریك كوڕی ئەعور لەگەڵ سوپای بەسرە هات و لەنزیك مەعقەل كوڕی قەیس دابەزی. چاوی بەمەعقەل كەوت و ماوەیەك گفتوگۆیان كرد. دواتر مەعقەل بەشەریكی وت: من بەدوایاندا دەڕۆم تا پێیان بگەمەوە، ئەگەری هەیە خوا لەناویان ببات چوونكە دەترسم ئەگەر لەشوێنكەوتنیان كەمتەرخەمی بكەم، ژمارەیان زیاد بكات.

دەڵێت: شەریك هەستا و كەسانێك لەسەركردەكانی سوپاكەی وەك خالید كوڕی مەعدانی تایی و بەیهەس كوڕی سوهەیب جەرەمی كۆكردەوە و پێی وتن: ئایا دەتانەوێت كارێكی خێر ئەنجام بدەن، دەتانەوێت لەگەڵ براكانتان لەكوفە شوێنپێی ئەم دوژمنە بڕۆین كەدوژمنی هەردوو لامانە، بەو هیوای خواوەند لەناویان ببات و بگەڕێینەوە.

خالید كوڕی مەعدان و بەیهەسی جەرەمی وتیان: نا، سوێند بەخوا ئەو كارە ناكەین، ئێمە هاتووین لەسەرزەمینی خۆمان دووریان بكەینەوە و ڕێگە نەدەین بێنە ناو سەرزەمینەكەمان، ئێستا كەخواوەند گرفتاری ئەوانی لابردووە، بۆ شارەكەی خۆمان دەگەڕێینەوە. خەڵكی كوفە دەتوانن ویلایەتەكەی خۆیان لەدەستی ئەم سەگانە بپارێزن.

وتی: هاوار لەئێوە، گوێرایەڵی فەرمانەكانی من بن چوونكە بەهۆی جەنگ دژی ئەوان، لەلای حكومەت پاداشت و ڕێزتان پێدەبڕێت.

بەیهەسی جەرەمی وتی: سوێند بەخوا بەو شێوەین كەشاعیری منداڵەكانی كەنانە دەڵێت:

(( وەك دایەنێك
كەشیر بەمناڵەكانی دیكە دەدات
و مناڵەكانی خۆی پشتگوێ دەخات
بەلام بەم كارەی سواڵكەری خۆی پینە ناكات))

مەگەر نەتبیستووە لەكوێستانەكانی فارس، كوردەكان كافر بوون؟

وتی: بیستوومە.

وتی: پێمان دەڵێیت بڕۆین و ویلایەتی كوفە بپارێزین و دژی دوژمنەكەی

ئەوان بجەنگین و ویلایەتەکەی خۆمان پشتگوێ بخەین؟

وتی: کوردەکان چ گرنگییەکیان هەیە، دەستەیەك لەئێوە بۆ لەناو بردنی ئەوان بەسە.

وتی: ئەم دوژمنە کەپێشنیاری جەنگ دژی ئەومان پێدەکەیت، تەنیا دەستەیەك لەخەڵکی کوفەی بەسە. سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر پێویستیان بەهاوکاری ئێمە بێت، هاوکاری کردنی ئەوان ئەرکی سەرشانی ئێمە بوو، بەلاّم پێویستیان بەئێمە نییە. کێشەیەك لەویلایەتی ئێمەدا هەیە هاوشێوەی کێشەی ویلایەتەکەی ئەوان. ئەوان سەرقاڵی چارەسەر کردنی کێشەکانی ویلایەتەکەی خۆیان بن، ئێمەیش سەرقاڵی چارەسەر کردنی کێشەکانی ویلایەتەکەی خۆمان دەبین. سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر بۆ شوێنکەوتنی خەواریج گوێرایەڵی فەرمانەکانی تۆ بین و شوێنپێی ئەوان هەڵگریت، بەپێچەوانەی فەرمانی ئەمیرەکەی خۆتە و پێش ئەوەی شوێنپێی ئەوان هەڵگریت دەبێت فەرمان لەئەمیری خۆت وەربگریت.

دەڵێت: کاتێك ئەمەی بینی، بەهاوەلاّنی خۆی وت: بەڕێکەون و بەڕێکەوتن. ئەوسا شەریك هات و چاوی بەمەعقەل کەوت چوونکە هەردووکیان پیر و شوێنکەوتەی شیعەبوون، پێی وت: سوێند بەخوا هەوڵمدا سوپاکەم گوێرایەڵی فەرمانەکانم بن و لەگەڵ ئێوەدا شوێنپێی دوژمن هەڵبگرین، بەلاّم ئەوان ڕازی نەبوون.

مەعقەل وتی: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە چوونکە برایەکی چاکەخوازیت، ئێمە پێویستمان بەوە نییە. سوێند بەخوا هیوادارم ئەگەر سوپاکەی من چاکەکار بن، کەس لەوان گیان بەدەر نابات.

عەبدوڵڵە کوڕی جونادە دەڵێت: شەریك کوڕی ئەعوەر ئەم حەدەیسەی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە و کاتێك گەیشتە ئێرە کەسوێند بەخوا ئەگەر سوپاکەم بەتەواوی هەوڵ بدەن، کەس لەوان گیان دەرباز ناکات، قسەکەیم پەسەند نەکرد و گومانم کرد هاوشێوەی وتەی کەسێکی ستەمکارە.

دەڵێت: لەکاتێکدا سوێند بەخوا لای ئێمە ئەو کەسێکی ستەمکار نەبوو.

عەبدوڵە کوڕی حارسی ئەزدی دەڵێت: کاتێك ئاگادار بووینەوە کەمەستورد کوڕی عەلەفە و سوپاکەی لەڕێگەی خۆیانەوە گەڕاونەتەوە، شادومان بووین و وتمان شوێنیان دەکەوین و لەمەداین ڕووبەڕوویان دەبینەوە، ئەگەر لەکوفەوە نزیك بوون، مەترسی زیاتریان لەسەرە.

دەڵێت: مەعقەل کوڕی قەیس، باوکی رواغی بانگکرد و پێی وت: لەگەڵ سوپاکەی خۆت شوێن مەستورد و هاوەڵانی بکەوە تا من دەگەم.

وتی: ژمارەی سوپاکەی من زیاد بکە تا ئەگەر ویستیان پێش گەیشتنی تۆ ڕووبەڕوومان ببنەوە، بەهێزتر بین چوونکە جارەکەی پێشوو، گرفتاری دژواری زۆر بووین.

دەڵێت: مەعقەل سێسەد کەسی دیکەی پەیوەستی ئەو کرد و باوکی رواغی لەگەڵ شەشسەد کەس شوێنپێی خەواریجی هەڵگرت. خەواریج بەپەلە ڕۆشتن تا گەیشتنە جەرجەرایا. باوکی رواغیش بەخێرایی شوێنیان کەوت و لەجەرجەرایا پێیان گەیشتەوە. خەواریج دابەزیبوون. باوکی رواغ و سوپاکەی لەکاتی هەڵاتنی خۆر لەنزیك ئەوان دابەزین. خەواریج لەناکاو باوکی رواغ و سوپاکەیان لەنزیکی خۆیانەوە بینی و بەیەکیان وت: جەنگ لەگەڵ ئەمان ئاسانترە لەجەنگ دژی ئەو کەسانەی دوای ئەمانە دێن.

دەلێت: بەرەوڕووی ئێمە هاتن، دە یا بیست کەس لەسوارەکانی خۆیان دەنارد و ئێمەیش بەهەمان ئەندازە سوارمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان دەنارد. شەڕ و پێکدادان دەستی پێکرد و بەرابەر بوون. خەواریج کاتێك ئەم بارودۆخەیان بینی، پێکەوە هێرشیان برد، هێرشێکی سەراسەری.

دەڵێت: پاشەکشێیان بەئێمە کرد و گۆڕەپانمان بۆ ئەوان بەجێهێشت. دواتر باوکی رواغ هاواری کرد و وتی: ئەی سوارە خراپەکارەکان! ئەی نەزانەکان، لەگەڵ ئەوان بەشێوەیەکی شیاو نەجەنگان، لەدەوری من کۆببنەوە، لەدەوری من کۆببنەوە. نزیکەی سەد سوار لەدەوری کۆبوویەوە و بەدەم هۆنراوە خوێندنەوە، بەرەو لای خەواریج پێشڕەوی کرد و ماوەیەك دژی ئەوان جەنگا. دواتر پاشماوەی سوپاکەی باوکی رواغ پەیوەستی بوون و پاشەکشێیان بەخەواریج

کرد.

دەڵێت: کاتێک مەستورد و هاوەڵانی بارودۆخیان بەوشێوەیە بینی، زانیان ئەگەر مەعقەل لەو کاتەدا بگات، بیّ هیچ لەمپەرێك هەموویان دەکوژێت. لەبەر ئەمە خۆی و هاوەڵانی ڕۆشتن و لەدیجلە پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە سەرزەمینی بەهرسیر.

دەڵێت: باوکی رواغ بەدوای ئەوانەوە بوو، مەعقەلیش بەدوای باوکی رواغەوە و لەدوای ئەو، لەدیجلە پەڕییەوە. مەستورد بەرەو شاری کۆن ڕۆشت.

دەڵێت: سەماك کوڕی عوبەید لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە و لەدیجلەوە بەرەو شاری کۆن بەڕێکەوت، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی و خەڵکی مەداین لەبەردەم دەروازەی شار ڕیزی بەست و دەستەیەك تیرهاوێژی لەسەر دیواری شارەکەدا جێگیر کرد. کاتێک خەواریج لەم پێشهاتە ئاگادار بوونەوە، لەڕۆشتن بۆ ئەو شوێنە چاوپۆشییان کرد و ڕێگەی ساباتیان گرتەبەر و لەویّ دابەزین.

دەڵێت: باوکی رواغ بەدوای خەواریج هات و لەمەداین چاوی بەسەماك کوڕی عوبەید کەوت. سەماك لەشوێنی تازەی خەواریج ئاگاداری کردەوە. باوکی رواغ شوێنیان کەوت و لەسابات لەنزیك ئەوان دابەزی.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی دەڵێت: کاتێک باوکی رواغ لەنزیك ئێمە دابەزی، مەستورد هاوەڵانی خۆی بانگکرد و وتی: ئەم دەستەیە کە لەگەڵ باوکی رواغ لەنزیك ئێوە دابەزیون، سوارە بەئەزمونەکانی سوپاکەی مەعقلەن کەهەموو بوێر و چاونەترسەکانی بۆ جەنگی ئێوە ڕەوانە کردووە. سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی پێش ئەوەی ئەوان لێی نزیك ببنەوە، هاوەڵانی خۆم بۆ جەنگی ئەو دەبرد. یەکێك لەئێوە بڕوات و بپرسێت و بزانێت مەعقەل لەکوێیە و گەشتۆتە کویّ.

دەڵێت: من ڕۆشتم و چەند کەس لەدانیشتووانی مەداینم بینی و پرسیم: چ هەواڵێکتان لەمەعقەل کوڕی قەیس پێیە؟

وتیان: نێردراوی سەماك کوڕی عوبەید کەناردبووی بزانێت مەعقەل گەشتۆتە کوێی و دەیەوێت بۆ کویّ بڕوات و هاتۆتەوە و وتی کە لەدیلمایە دابەزیوە.

دیلمایـە گونـدێك لەگونـدەكانی پارێزگـای بەهرسـیرە لەسـەر كـەناری دیجلـە كەخاوەنەكەی قودامە كوڕی عەجلانی ئەزدی بوو.

دەڵێت: وتم: دووری ئێرە تا ئەوێ چەندە؟

وتی: سێ فەرسەنگ یا شتێكی زیاتر.

دەڵێت: بۆ لای هاورێكەی خۆم گەڕامەوە و ئاگادارم كردەوە.

مەستورد بەهاوەڵانی خۆی وت: سواربن، سواربوون و لەگەڵ ئەوان هات تا لـەپردی سـابات نزیكبوونـەوە كـەپردی ڕووبـاری شـا بوو. مەسـتورد لای ڕاسـتی كوفە جێگیر و باوكی ڕواغ و سوپاكەی لەكەنارەكانی مەداین جێگیر بوون.

دەڵێت: ڕۆشتین و لەسەر پردەكە وەستاین.

دەڵێت: مەستورد پێی وتین: دەستەیەك لەئێوە دابەزن.

دەڵێـت: نزیكـەی پـەنجا كـەس لەئێمـە دابـەزین. مەسـتورد وتـی: ئـەم پـردە ببڕنەوە. ئێمە هاتینەخوار و پردەكەمان وێران كرد.

دەڵێت: كاتێك دوژمنـەكانمان بینیـان ئێمـە لای پردەكە وەستاوین، گومانیـان كـرد دەمانـەوێت بـەرەو لای ئـەوان بـڕۆین، لەبـەر ئەمـە ڕیزیـان بەسـت و خۆیـان كۆكردەوە و بەم كارەیان لەئێمە بێ ئاگابوون كەسـەرقاڵی وێران كردنی پردەكە بووین.

دەڵێـت: دوای ئـەوە ڕێنیـشاندەرێكمان لەخـەڵكی سـابات گـرت و وتمـان: لەپێشی ئێمەوە بڕۆ تا دەگەینە دیلمایە.

دەڵێت: ڕێنیشاندەر لەبەردەم ئێمەوە بەڕاكردن دەڕۆشت و ئێمە بەدوای ئەودا ڕێگەمان دەبڕی. ئەسپەكانمان بروسكەئاسا غاریان دەدا، دەستەیەكیان توندتر ودەسـتەیەكیان هێواشـتر. ماوەیـەك تێپـەڕی و لەمەعقـەل و سـوپاكەی نزیـك بووینـەوە كەسـەرقاڵی كۆكردنـەوەی خۆیـان بـوون. لـەناكاو ئێمـەیان بـینی، سوپاكەی بڵاو بووبوونەوە. پێشەنگی سوپاكەی لای ئەو نەبوو. ئەو دەستەی دواكەوتبوون، ناكاوگیر و پەرێشان بوون. كاتێك مەعقەل ئێمەی بینی، ئاڵاكەی خۆی بەرز كردەوە و دابەزی و هاواری كرد: ئەی بەندەكانی خوا، زەوی، زەوی. نزیكەی دووسەد كەس لەگەڵ ئەو دابەزین.

دەڵێت: هێرشمان کرد. ئەوان کەکەوتبوونە سەر چۆك، ڕمەکانیان بەڕووی ئێمەدا بەرز کردبوویەوە و نەماندەتوانی دەستمان پێیان بگات. مەستورد وتی: واز لەوانە بێنن کەدابەزیون، هێرش بکەنە سەر ئەسپەکانیان و لەنێوان ئەوان و ئەسپەکان دیوارێك دروست بکەن چوونکە ئەگەر دەست بەسەر ئەسپەکانیاندا بگرن، ئەمان لەماوەیەکی کەمدا لەناو دەچن.

دەڵێت: هێرشمان کردە سەر ئەسپەکان و دیوارێکمان لەنێوان ئەواندا دروست کرد. جڵەوی ئەسپەکانیان پێکەوە بەستبوویەوە، بڕیمان و ئەسپەکان ڕەمیان کرد.

دەڵێت: دواتر بەرەو لای ئەو دەستەیە ڕۆشتین کەدواکەوتبوون و هێرشمان کردە سەریان و ئەوانمان لەیەك جیا کردەوە. دواتر هێرشمان کردە سەر مەعقەل و هاوەڵانی کە بەهەمان شێوە لەسەر چۆك بوون. هێرشمان کردە سەریان بەڵام لەشوێنی خۆیان نەجووڵان. جارێکی دیکە هێرشمان کردە سەریان بەڵام خۆڕاگرییان کرد.

مەستوردە پێی وتین: نیوەتان دابەزن. نیوەی ئێمە دابەزین و نیوەی دیکەمان لەسەر ئەسپەکانمان مانەوە. من یەکێك بووم لەئەسپ سوارەکان.

دەڵێت: پیادەکان هێرشیان کردە سەریان و ئێمەیش بەسواری ئەسپ. سوێند بەخوا هیوادار بووین بتوانین لەناویان ببەین.

دەڵێت: سوێند بەخوا لەو کاتەی سەرقاڵی جەنگ بووین و لەسەرکەوتن نزیك بووبووینەوە، پێشەنگی سوپاکەی باوکی رواغ کەسوارە بەئەزموونەکان و بوێرەکانی سوپا بوون، دەرکەوتن وکاتێك لێمان نزیك بوونەوە، هێرشیان کردە سەرمان. لەم کاتەدا هەموومان دابەزین و جەنگمان دژی ئەوان دەستپێکرد تا سەرکردەی ئێمە و سەرکردەی ئەوان کوژرا.

دەڵێت: گومان ناکەم ئەو ڕۆژە جگە لەمن کەس لەوان گیانی بەدەر بردبێت و گومان دەکەم لەهەموویان گەنجتر بووم.

عەبدولڕەحمان کوڕی حەبیب دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی دووجار ئەم حەدیسەی بۆ گێڕامەوە، جارێك لەکاتی فەرمانڕەوایەتی مەسعەب

کوڕی زوبەیر لە یاجەمیرا و جارێکیان کاتێک لەگەڵ عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لەدێری ئەلجەماجم بووین.

دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە لەدێری ئەلجەماجم کوژرا کەڕۆژی تێکشکان بوو. هێرشی کردە سەر دوژمن و شمشێری دەوەشاند ومن، سەیرم دەکرد.

دەڵێت: لەدێر ئەلجەماجم پێم وت: ئەم حەدیسەت لەیاجەمیرا، ئەو کاتەی لەگەڵ مەسعەب کوڕی زوبەیردا بووین، بۆ گێڕامەوە بەلاّم نەتوت چون لەناو هاوەلاّنت تەنیا تۆ ڕزگارت بوو؟

وتی: سوێند بەخوا ئێستا بۆت باس دەکەم. کاتێک سەرکردەکەمان کوژرا، سوپاکەی جگە لەپێنج یا شەش کەس هەموویان کوژران، ئێمە هێرشمان کردە سەر دەستەیەك لەسوپاکەی مەعقەل کەنزیکەی بیست کەس بوون و پاشەکشێیان کرد. گەیشتمە لای ئەسپێك کەزینی لەسەر بوو. نەمزانی خاوەنەکەی چی بەسەر هاتووە، کوژراوە یا ئەوەی دابەزیوە و دەجەنگێت و ئەسپەکەی بەرەلاّ کردووە.

دەڵێت: ڕۆشتمە پێش و جڵەوی ئەسپەکەم گرت و سواری بووم.

دەڵێت: هاوەلاّنی مەعقەل هێرشیان کردە سەرم و لێم نزیك بوونەوە. نەقیزەم لەئەسپەکەدا. سوێند بەخوا یەکێك بوو لەباشترین ئەسپەکان. چەند کەس لەوان بەسواری شوێنم کەوتن بەلاّم نەیانتوانی پێم بگەنەوە. ئەسپەکەم غاریدەدا، شەو بوو. کاتێك زانیم ئەوانم بەجێهێشتووە و لەئەماندام، ئەسپەکەم هێواش کردەوە. ڕۆشتم تا گەیشتمە لای یەکێك لەدانیشتووانی ناوچەکە و پێم وت: لەپێشەوە بڕۆ تا دەمبەیتە سەر ڕێگەی گەورە یانی ڕێگەی کوفە. ئەوکارەی کرد. سوێند بەخوا زۆری پێنەچوو گەیشتمە کوسی. ڕۆیشتم تا گەیشتمە شوێنێك کەڕووبارێکی پان و گەورە بوو، سوار لەسەر ئەسپ لەڕووبارەکە پەڕیمەوە. دواتر درێژەم بەڕێگەدا تا گەیشتمە دێری کەعب. دابەزیم و ئەسپەکەم بەستەوە تا بحەوێتەوە. دواتر سەرخەوێکم شکاند و زۆر زوو لەخەو هەستام و سوار ئەسپەکەم بووم و لەتاریکی شەو ڕێگەم بڕی. نیوەی شەو وشترێکم گرت و نوێژی بەیانیم لەموزاحمییە لەدوو فەرسەخی قەبین خوێند. دواتر ملی ڕێگەم

گرتەبەر و لەکاتی هەڵاتنی هەتاو گەیشتمە ناو کوفە. هەمانکات شەریك کوڕی نەملەی موحاربی هاتە لام. لەبەسەرهاتی خۆم و هاوەڵانم ئاگادارم کردەوە و داوام لێکرد سەردانی موغەیرە کوڕی شەعبە بکات و ئەمانم بۆ وەربگرێت.

وتی: بەخواستی خوا ئەمانت پێ دەبەخشرێت چوونکە مژدەی خۆشت بۆ هێناوین. سوێند بەخوا بەدرێژایی شەو بیرم لەبەسەرهاتی ئەو خەڵکە دەکردەوە.

دەڵێت: شەریکی موحاریبی هاتەدەر و بەخێرایی ڕۆشتە لای موغەیرە کوڕی شەعبە و داوای مۆڵەتی بینینی کرد و وتی: مژدەیەکەم هێناوە و نیازێکم هەیە، نیازەکەم بەراوەردە بکە تا مژدەکەت پێ بڵێم.

وتی: نیازەکەی بەراوەردە بکرێت با مژدەکەی بڵێت.

وتم: ئەمان بەعەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی بدە کە لەگەڵ خەواریج بووە.

وتی: سوێند بەخوا حەزم دەکرد هەموویان بهێنیتە لای من تا ئەمانیان پێ ببەخشم.

وتم: مژدە ئەوەی کەخەواریج هەموویان کوژران، هاورێکەی من لەگەڵ ئەوان بووە وەك باسی دەکات جگە لەخۆی کەس گیانی بەدەر نەبردووە.

وتی: مەعقەل کوڕی قەیس چی بەسەر هاتووە؟

وتم: خوا بتبەخشێت ئەو لەبەسەرهاتی سوپاکەی ئێمە ئاگادار نییە.

دەڵێت: هێشتا کۆتایی بەوتەکانی نەهێنابوو کەباوکی رواغ و مسکین کوڕی عامر لەگەڵ مژدەی سەرکەوتن هاتن و هەواڵیان هێنا کەمەعقەل کوڕی قەیس و مەستورد کوڕی عەلەفە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، مەستورد ڕمی بەدەستەوە بوو و مەعقەل شمشێر، پەلاماری یەکیاندا. مەستورد ڕمەکەی لەسینەی مەعقەل چەقاند بەشێوەیەك سەری ڕمەکە لەپشتیەوە هاتەدەر و مەعقەلیش بەشمشێر لەسەریدا و شمشێرەکە لەمێشکی چەقی و هەردووکیان بێ گیان کەوتن.

حەسیرە کوڕی عەبدوڵڵە لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك مەستورد کوڕی عەلەفەمان بینی کە بەرەو پردەکە دەهات و بڕی، گومانمان کرد دەخوازێت هێرشبکاتە سەرمان.

دەڵێت: لەسیاچاڵەکانی سابات بەرەو سارای مەداین و سابات هاتین و

ڕێزمان بەست و ئامادەبووین. بەلاَم زۆری خایاند و هێرشیان نەکردە سەرمان.

دەڵێت: باوکی ڕواغ وتی: ئەوان مەبەستێکیان بووە، کەسێك بڕوات و لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادارم بکاتەوە.

دەڵێت: من و وەهیب کوڕی باوکی ئەشائەتی ئەزدی دەڕۆین و هەواڵت بۆ دەهێنین و ئاگادارت دەکەینەوە.

دەڵێت: سوار لەسەر ئەسپ لەپردەکە نزیك بووینەوە و بینیمان پردەکەیان وێران کردووە. گومانمان کرد ئەوان لەترسی ئێمە پردەکەیان وێران کردووە. بەخێرایی گەڕاینەوە بۆ لای باوکی ڕواغ و لەوەی بینیبوومان، ئاگادارمان کردەوە.

وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتمان: لەترسا پردەکەیان وێران کردووە چوونکە خوا ترسی خستۆتە دڵیانەوە.

وتی: سوێند بەگیانی خۆم ئەم دەستەیە بەمەبەستی هەلاَتن شۆڕشیان نەکردووە، بەڵکو ئێوەیان فریودا، سوێند بەخوا ئەوان وتوویانە مەعقەل سوار بەئەزمون و بوێرەکانی خۆی وەك پێشەنگ ڕەوانە کردووە، ئەگەر توانیتان ئەوان لەشوێنەکانی خۆیان بەجێبێڵن وبەپەلە هێرش بکەنە سەر مەعقەل و هاوەلاَنی تا ناکاوگیریان بکەن. پردەکەیان وێران کرد تا ئێوە سەرقاڵ بکەن و هێرشیان نەکەنەسەر بۆ ئەوەی سەرکردەکەتان ناکاوگیر بکەن. خێراکەن، خێراکەن.

دەڵێت: بەدڵ دەمانزانی باوکی ڕواغ ڕاست دەکات. خەڵکی گوندەکەمان بانگکرد و پێمان وتن: بەخێرایی پردەکە هەڵبەستنەوە و بۆ ئەو کارە هانماندان. زۆری نەخایاند پردەکەیان هەڵبەستەوە، لەپردەکە پەڕینەوە و بەخێرایی شوێنیان کەوتین، بێ ئەوەی سەرقاڵی هیچ شتێك ببین، شوێنیان دەکەوتین و بەردەوام پرسیارمان دەکرد.

دەیانوت: لەپێشی ئێوەوەن، نزیکن، پێیان دەگەنەوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا بەدوایانەوە بووین و دەمانویست بەمەعقەل و هاوەلاَنی بگەینەوە. یەکەم کەسان کەپێیان گەیشتن، ئەو کەسانە بوون کە لەسوپاکەی

مەعقەل هەڵاتبوون. کەس سەر کەس نەدەپرژا. باوکی رواغ ڕێگەی لێگرتن و وتی: لەدەوری من کۆببنەوە، لەدەوری من کۆببنەوە.

خەڵکان لەدەوری ئەو کۆبوونەوە و پەنایان گرت.

وتی: هاوار لەئێوە، دەنگ و باس چییە؟

وتیان: نازانین لەناکاو خەواریجمان لەناو ئوردووگاکەی خۆماندا بینی، ئێمە بڵاو بووبووینەوە، هێرشیان کردە سەرمان و لەیەکیان جیاکردینەوە.

وتی: سەرکردە چی کرد؟

یەکیان وتی: دابەزی و دەجەنگی.

یەکی دیکە وتی: پێم وابێت کوژراوە.

وتی: ئەی خەڵکینە، لەگەڵ من بگەڕێنەوە ئەگەر سەرکردەکەمان زیندووبوو، شان بەشانی ئەو دەجەنگین و ئەگەر بینیمان کوژراوە، دژی خەواریج دەجەنگین چوونکە ئێمە شاسوارەکانی ئەم شارەین و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن هەڵبژێردراوین، دڵی فەرمانڕەوای شارەکە لەخۆتان گوماناوی مەکەن. باسی خەڵکی شار ناکەم، سوێند بەخوا ئەگەر بینیتان مەعقەلیان کوشتووە، نابێت دەستبەردار بن تا تۆڵە دەستێننەوە یا دەکوژرێن. بەڕێکەون.

دەڵێت: ئەوان بەڕێکەوتن، ئێمەیش بەهەمان شێوە. باوکی رواغ هەرکام لەهەڵاتووانی دەبینی، بانگی دەکرد و دەیگەڕاندەوە. بەکەسە نزیکەکانی خۆت وت: شەقەزللە لەڕوخساری ئەو کەسانە بدەن وبیانگەڕێننەوە.

دەڵێت: دەڕۆشتینە پێش و هەڵاتووانمانە دەگەڕاندەوە تا گەشتینە ئوردووگا و ئاڵاکەی مەعقەل کوڕی قەیسمان بینی کەهەڵکرابوو. دووسەد کەسی لەگەڵدابوو، هەمووان شاسوار وبەئەزمون لەجەنگ، دابەزیبوون و بوێرانە دەجەنگان. کاتێک لێیان نزیک بووینەوە، بینمان سەرکەوتنی خەواریج بەسەر هاوەڵانی ئێمە نزیکە، هاوەڵانی ئێمە خۆڕاگرییان دەکرد و دەجەنگان. کاتێک ئێمەیان بینی، پێشڕەوییان کرد و هێرشیان کردە سەر خەواریج. ئەوان کەمێک پاشەکشێیان کرد و ئێمە پێیان گەشتینەوە. باوکی رواغ مەعقەلی بینی کەپێشڕەوی دەکرد و تانەی لەهاوەڵانی خۆی دەدا و هانی دەدان. پێی وت: تۆ

زیندوویت، خاڵ و مامەکانم بەقوربانت بن.

وتی: بەڵێ و هێرشی کردە سەر خەواریج.

باوکی رواغ فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا: مەگەر نابینن سەرکردەکەتان زیندووە، هێرشیان بکەنەسەر.

دەڵێت: هێرشی برد و ئێمەیش پێکەوە هێرشمان کردە سەر خەواریج.

دەڵێت: سوارەکانی ئەوانمان لەناو برد. مەعقەل و هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر پیادەکیان. مەستورد دابەزی و بانگی سوپاکەی خۆی کرد: ئەی گیانبەخشەکان، بکەونە سەرزەوی، بکەونە سەرزەوی. سوێند بەخوا بەهەشتە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، بەهەشت تایبەتە بەو کەسەی بەنییەتی پاك لەبەرابەر ئەم خراپەکارانە بکوژرێت.

دەڵێت: هەموویان دابەزین، ئێمەیش دابەزین و بەشمشێری دەرکێشراو، رووبەرووی یەکبوونەوە. ماوەیەکی ڕۆژمان بەجەنگ بەسەر برد. دواتر مەستورد بانگی مەعقەلی کرد و وتی: ئەی مەعقەل، لەگەڵ مندا بجەنگە.

دەڵێت: مەعقەل بەرەورووی ڕۆشت، پێمان وت: سوێندت دەدەین بەخوا بۆ جەنگی ئەو سەگە مەڕۆ کەخواوەند هیوای ژیانی لێسەندۆتەوە.

وتی: نا، سوێند بەخوا، هەرگیز کەسێك داوای رووبەڕووبوونەوەی لێنەکردووم و پێی ڕازی نەبم. بەشمشێر بۆ جەنگی مەستورد ڕۆشت. ئەویش بەڕمەوە هات. بانگمان کرد: بەڕم هاوشێوەی ڕمەکەی خۆی ڕووبەڕووی ببەرەوە. بەلاّم ڕازی نەبوو.

دەڵێت: مەستورد هاتەپێش و ڕمی لەسینەی چەقاند کە لەپشتیەوە هاتەدەر. مەعقەل شمشێرەکەی لەسەری چەقاند و بێ گیان کەوت. مەعقەلیش کوژرا. کاتێك بۆ جەنگی ئەو دەڕۆشت، پێی وتین: ئەگەر کوژرام، سەرکردەی ئێوە عەمرۆ کوڕی موحریزی سەعدی مینقەرییە.

دەڵێت: کاتێك مەعقەل کوژرا، عەمرۆ کوڕی موحریز ئالاّکەی بەدەستەوە گرت. عەمرۆ وتی: ئەگەر کوژرام، باوکی رواغ بکەنە سەرکردەی خۆتان. ئەگەر باوکی رواغیش کوژرا، مسکین کوڕی عامر سەرکردەی ئێوەیە. ئەو، لەو کاتەدا

گەنجێکی تازەپێگەشتوو بوو. دواتر ئالاّ بەدەست هێرشی برد و فەرمانی بەجەنگاوەران دەدا هێرش بەرن و زۆری نەخایاند خەواریجیان بەتەواوی لەناو برد.

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە یەکێك ئەوە بوو کەعەبدوللە کوڕی عامر، عەبدوللە کوڕی خازم کوڕی زەببیانی وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان کرد و قەیس کوڕی هەیسەم لەوێ گەڕایەوە. وەك لەگێڕانەوەکەی موقاتیل کوڕی حەییاندا هاتووە، هۆکارەکەی ئەوە بوو کەقەیس کوڕی هەیسەم ماڵیاتی دڕەنگ دەنارد و کوڕی عامر مەبەستی لابردنی ئەوی کرد.

دەڵێت: کوڕی خازم بەکوڕی عامری وت: من وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان بکە تا کاروبارەکانی ئەو ناوچەیە سامان بدەم و قەیس لاببەم.

کوڕی عامر فەرمانی نووسی یا دەیویست کەبینووسێت. قەیس ئاگادار بوویەوە کەکوڕی عامر لەو ڕەنجاوە کەڕێزی ئەوی نەگرتووە و لەناردنی پێشکەشی دەست وشك بووە و کوڕی خازمی کردۆتە کارگوزار. لەبەر ئەمە لەکوڕی خازم ترسا نیگەران بوو لەوەی ڕووبەڕووی لێپێچینەوە ببێت. خوراسانی بەجێهێشت و هات و ئەمە بووە هۆی تووڕەبوونی زیاتری کوڕی عامر و وتی: سنورەکانت بەجێهێشت؟ لێیدا و زیندانی کرد و یەکێك لەمناڵەکانی یەشکری بۆ خوراسان نارد.

باوکی موخەنەف دەڵێت: کاتێك کوڕی عامر، قەیس کوڕی هەیسەمی لەسەر کار لابرد، ئەسلەم کوڕی زەرعەی کەلابی نارد.

باوکی عەبدولڕەحمانی سەقەفی دەڵێت: کوڕی عامر لەڕۆژگاری معاویە، قەیس کوڕی هەیسەمی وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان کرد. کوڕی خازم پێی وت: پیاوێکی ناتەوانت بۆ خوراسان ناردووە، دەترسم ئەگەر جەنگێك ڕووبدات، ببێتە هۆی تێکشکانی خەڵکان و خوراسان لەدەستمان بڕوات و خاڵەکانی تۆ ڕیسوا بین.

کوڕی عامر وتی: دەبێت چی بکەین؟

وتی: فەرمانێك بۆ من بنووسە تا ئەگەر لەبەرابەر دوژمن پاشەکشێی کرد، من

لەجێگەی ئەودا بم.

دەڵێت: کوڕی عامر ئەو فەرمانەی نووسی. دوای ماوەیەك دەستەیەك لەخەڵکانی تەخارستان شۆڕشیان کرد و قەیس کوڕی هەیسەم ڕاوێژی کرد. کوڕی خازم پێی وت، بگەڕێتەوە تا هەموو ئامادەکارییەکان ئەنجام بدات.

قەیس بەڕێکەوت و کاتێك مەنزڵێك یا دوو مەنزڵ لەشوێنەکەی خۆی دوورکەوتەوە، کوڕی خازم فەرمانەکەی خۆی دەرهێنا و خەڵکانی کۆکردەوە و ڕووبەڕووی شۆڕشییەکان بوویەوە و تێکیشکاندن.

دەڵێت: کاتێك ئەم هەواڵە بەقەیسییەکان گەیشت، توڕە بوون و وتیان فێڵی لەقەیس و کوڕی عامر کرد و بۆ چارەسەر کردنی ئەم گرفتە هەوڵەکانی خۆیان خستەگەڕ تا ئەو جێگەی لای معاویە سکالایان کرد. معاویە کەسی نارد و ئەوی بانگ کرد کەهات و سەبارەت بەکارەکانی داوای بەخشینی کرد.

معاویە وتی: بەیانی لەناو خەڵکان داوای لێبوردن بکە.

دەڵێت: کوڕی خازم ڕۆشتە لای هاوەڵانی خۆی و وتی: پێیان وتووم کەقسە بکەم بەڵام قسەکەرێکی بەتوانا نیم، لای مینبەرەکە دانیشن و کاتێك قسەم کرد، وتەکانم پشتڕاست بکەنەوە.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر لەناو خەڵکان هەستایە سەرپێ، سپاسی خواوەندی کرد، وتی: زەحمەتی قسەکردن پێشەوایەك پێی رازی دەبێت کەناچار بێت یا ئەحمەقێك کەسەری پەرێشان و ترسی نەبێت لەوەی چی دەڵێت، من هیچ کام لەم دووانە نیم، هەرکەس من بناسێت دەزانێت کەهەڵەکان باش دەقۆزمەوە و ڕووبەڕووی مەترسییەکان دەبمەوە. دەستەکان ڕێکدەخەم و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش دەکەم. سوێندتان دەدەم بەخوا هەرکەس ئەمە دەزانێت، وتەکانم پشتڕاست بکاتەوە.

هاوەڵانی لەدەوری مینبەرەکە وتیان: ڕاستە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆیش لەو کەسانەیت کەسوێندم دایت، بۆچوونی خۆت بڵێ.

معاویە وتی: ڕاستت وت.

یەکێك لەشێخەکانی منالەکانی تەمیم بەناوی مەعمەر دەڵێت: قەیس کوڕی هەیسەم لەتاو کوڕی خازم، خوراسانی بەجێهێشت.

دەڵێت: کوڕی عامر سەد قامچی لێدا و ڕیشی هەڵکەند و زیندانی کرد.

دەڵێت: دواتر دایکی داوای لەکوڕی عامر کرد ئازادی بکات و ئازادی کرد.

لەم ساڵەدا وەك وتوویانە: مەروان کوڕی حەکەم ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا، ئەو کارگوزاری مەدینە بوو. کارگوزاری مەککە خالید کوڕی عاس کوڕی هوشام بوو. کارگوزاری کوفە-موغەیرە کوڕی شەعبە بوو، کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیحدا بوو، کارگوزاری بەسرە و فارس و سیستان و خوراسان، عەبدوڵڵە کوڕی عامر بوو. کاروباری دادی بەسرە لەئەستۆی عومەیر کوڕی یەسربیدا بوو.

ساڵی چل و چواری کۆچ دەستپێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و چواری کۆچ

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو کەموسوڵمانان لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی وەلید بەرەو سەرزەمینی ڕۆم بەڕێکەوتن و زستانیان لەو سەرزەمینە بەسەر برد. هەروەها یەکێکی دیکە لەڕووداوەکان غەزای بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات بوو لەدەریا.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوڵلە کوڕی عامری لەفەرمانڕەوایەتی بەسرە دوورخستەوە.

## هۆکاری لابردنی کوڕی عامر

هۆکاری لابردنەکەی ئەوە بوو کەکوڕی عامر پیاوێکی نەرم و نیان و بەخشندە بوو، ڕێگەی لەنەزانەکان نەدەگرت و لەڕۆژگاری ئەو کەکارگوزاری معاویە بوو، کاروباری بەسرە شێوا و شڵەژا.

یەزیدی باهلی دەڵێت: کوڕی عامر لای زیاد لەخراپەکاری کەسان و دەرکەوتنی سەرەتاکانی خراپەکاری گازندەی دەکرد.

زیاد وتی: شمشێر بخەرە ناویان.

وتی: حەز ناکەم ئەوان بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنمەوە و خۆم بەرەو خراپەکاری بڕۆم.

باوکی حەسەن دەڵێت: کوڕی عامر نەرم و نیان بوو و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ویلایەتەکەی کەمتەرخەم. لەحکومەتەکەی ئەو سزادان نەبوو و دەستی دزیان نەدەبڕییەوە. لەمبارەوە قسەیان لەگەڵ کرد، وتی: من تێکەڵ بەخەڵکانم، چۆن سەیری کەسێك بکەم کەدەستی باوك و براکەیم بڕیبێتەوە؟

موسلیمە کوڕی موحاریب دەڵێت: کوڕی کەوا ڕۆشتە لای معاویە. ناوی کوڕی کەوا عەبدوڵلە کوڕی ئەوف بوو. معاویە سەبارەت بەکەسەکان پرسیاری لێکرد. کوڕی کەوا وتی: لەبەسرە نەزانەکان فەرمانڕەوایەتی دەکەن و کارگوزارەکەی کەسێکی ناتەوانە.

دەڵێت: ئەم وتەی کوڕی کەوا بەکوڕی عامر گەیشتەوە و توفەیل کوڕی عەوف یەشکری کردە کارگوزاری خوراسان کە لەگەڵ کوڕی کەوا دوژمن بوو.

کوڕی کەوا وتی: ئەو بێچووە مریشکە باش من ناناسێت. مەگەر گومان دەکات فەرمانڕەوایەتی توفەیەل لەخوراسان من نیگەران دەکات. حەزم دەکرد هەموو یەشکرییەکانی سەرزەوی دوژمنی من بن تا بیانکاتە کارگوزار. دواتر معاویە کوڕی عامری لابرد و حارس کوڕی عەبدوڵڵەی ئەزدی لەجێگەی ئەو دانا.

قەحزەمی دەڵێت: کوڕی عامر وتی: کام یەك لەخەڵکان زیاتر لەهەمووان دوژمنی کوڕی کەوایە؟

وتیان: عەبدوڵڵەن کوڕی ئەبی شێخ.؟

دەڵێت: کوڕی عامر ئەوی کردە کارگوزاری خوراسان و کوڕی کەوا ئەو وتەی هێنایە سەرزمان.

باوکی عەبدولڕەحمانی ئیسفەهانی دەڵێت: کوڕی عامر کەسانێکی بۆ لای مغاویە نارد کە لەگەڵ نێردراوانی کوفە لەیەك کاتدا گەیشتنە لای معاویە. کوڕی کەوای یەشکری لەگەڵ ئەواندا بوو. معاویە سەبارەت بەعێراق و بەتایبەت خەڵکی عێراق پرسیاری لێکردن.

کوڕی کەوا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵکی بەسرە بەهۆی نەزانەکانەوە تۆقاون و کارگوزارەکەی کەسێکی ناتەوانە. کوڕی عامری بەناتەوان لەقەڵەمدا و ڕیسوایی کرد.

معاویە وتی: سەبارەت بەخەڵکی بەسرە قسە دەکەیت کەخۆیان لێرە ئامادەن.؟

دەڵێت: کاتێك نێردراوەکان بۆ بەسرە گەڕانەوە، ئەم وتانەیان بۆ کوڕی عامر گێڕایەوە کەتوڕە بوو و وتی: کام یەك لەخەڵکی عێراق زیاتر لەهەمووان دوژمنی کوڕی کەوایە؟

پێیان وت: عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی شێخی یەشکری. ئەوی کردە کارگوزاری خوراسان و ئەم وتەیە بەکوڕی کەوا گەیشتەوە و ئەو وتانەی هێنایە سەرزمان.

عەلی دەڵێت: کاتێك کوڕی عامر سەبارەت بەکاری حکومەت ناتەوانی لەخۆی

نیشاندا و کاروباری بەسرە پەرێشان بوو، معاویە نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بڕواتە لای.

باوکی حەسەن دەڵێت: ئەم لەساڵی چل و چوارەم ڕوویدا و کوڕی عامر، قەیس کوڕی هەیسەمی وەك جێگری خۆی لەبەسرە دانا و ڕۆشتە لای معاویە. معاویە ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە و لەکاتی ماڵئاوایی معاویە وتی: سێ شتم لەتۆ دەوێت و بڵێ هی تۆیە.

وتی: هی تۆیە، من بەکوڕی دایکی حەکیم ناو دەبەن.

وتی: کاروباری حکومەت تەسلیم بکەیتەوە بێ ئەوەی توڕە ببیت.

وتی: ئەو کارە دەکەم.

وتی: مڵکی عەرەفە بەمن ببەخشیت؟

وتی: بەخشیم.

وتی: ماڵەکەی مەککەت بەمن ببەخشیت.

وتی: بەخشیم.

وتی: ڕێز لەخزمەکەی خۆت دەبینیت.

دەڵێت: کوڕی عامر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، منیش داوای سێ شت دەکەم بڵێ هی تۆیە.

وتی: هی تۆیە، من بەکوڕی هیند ناو دەبەن.

وتی: مڵکی عەرەفە بۆ من بگەڕێنیتەوە.

وتی: گەڕاندمەوە.

وتی: لێپێچینەوە لەهیچ کام لەکارگوزارەکانی من نەکەیت و بۆ هیچ شتێك لێپرسینەوە لەگەڵ خۆم نەکەیت.

وتی: ڕازیم.

وتی: کچەکەی خۆت، هیند بکەیتە هاوسەری من.

وتی: کردم.

دەڵێت: بەوتەیەك معاویە پێی وت: یەکیان هەڵبژێرە یا ئەوەی لێپرسینەوەت لەگەڵ بکەم و سەبارەت بەوەی بەدەستت هێناوە، لێت بپرسمەوە و دووبارە بۆ

شوێنی فەرمانڕەوایی خۆت بگەڕێنیتەوە، یا ئەوەی وەرتگرتووە، هی خۆت بێت بەو مەرجەی لەدەسەڵات دوور بکەویتەوە. کوڕی عامر رازی بوو دەست لەکارەکەی هەڵگرێت بەو مەرجەی معاویە لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکات.

لەم ساڵەدا وەك وتوویانە معاویە ڕەچەڵەکی زیاد کوڕی سومەییەی بۆ باوکی خۆی ئەبوسوفیان گەڕاندەوە.

عەمرۆ کوڕی شەببە دەڵێت: دەڵێن کاتێك زیاد هاتە لای معاویە، یەکێك لەمناڵەکانی عەبدولقەیسی لەگەڵدا بوو کە بەزیادی وت: من قەرزارباری کوڕی عامرم، ئەگەر ڕێگەم بدەیت دەڕۆمە لای ئەو.

زیاد وتی: بەو مەرجەی لەهەموو شتێکی نێوان خۆتان ئاگادارم بکەیتەوە.

وتی: ڕازیم.

زیاد مۆڵەتی ڕۆشتنی پێدا و ڕۆشت. کوڕی عامر پێی وت: کوڕی سومەییە کارەکانی من بەسوك لەقەڵەم دەدات و خراپەی کارگوزارەکانی من دێنێتە سەرزمان. دەمەوێت سوێندخۆرەکان لەقوڕەیش بێنم تا سوێند بخۆن ئەبوسوفیان نزیکی لەگەڵ سومەییە نەکردبوو.

دەڵێت: کاتێك ئەو پیاوە گەڕایەوە، زیاد پرسیاری لێکرد بەڵام نەیویست وەڵامی بداتەوە، بەڵام زیاد دەستی هەڵنەگرت تا ئەوەی لەوتەکانی کوڕی عامر ئاگاداری کردەوە و زیاد ئەم بابەتەی لای معاویە باسکرد. معاویە بەپەردەدارەکەی خۆی وت: کاتێك کوڕی عامر هات، لەبەردەرگا سەرەتا لەڕوخساری چوارپێکەی بدە.

دەڵێت: پەردەدار ئەو کارەی کرد. کوڕی عامر سکاڵای بردە لای یەزید کەپێی وت: ئایا سەبارەت بەزیاد هیچت وتووە؟.

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: یەزید لەگەڵی سەرکەوت و ئەوی بردە لای معاویە. کاتێك معاویە کوڕی عامری بینی، هەستا و ڕۆشتە ژوورەکەی خۆی. یەزید پێی وت: دانیشە، مەگەر چەندە دەتوانێت لەو ژوورەدا بمێنێتەوە و ئەم دانیشتنە پشتگوێ بخات؟

دەڵێت: کاتێك چاوەڕوان بوون، معاویە هاتەدەر، دارێکی بەدەستەوە بوو،

دەیکێشا بەدەرگاکاندا و ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە:

(( ئێمە شێوازێکمان هەیە

ئێوەیش شێوازی خۆتان

و هاورێکان ئەمە دەزانن))

دواتر دانیشت و وتی: ئەی کوڕی عامر، تۆ سەبارەت بەزیاد بەوشێوەیە قسەت کردووە، سوێند بەخوا عەرەبەکان دەزانن لەڕۆژگاری نەزانی لەهەموویان بەهێزتر بووم و ئیسلام هێزی زیاتری پێبەخشیم، من بەهۆی زیادەوە دەسەلأتم زیادی نەکردووە و بەهێز نەبووم، بەلأم مافێکی لای من بوو کەبۆم گەڕاندەوە.

کوڕی عامر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران کارێك دەکەم زیاد پەسەندی بکات.

وتی: منیش کارێك دەکەم تۆ پەسەندی بکەیت.

باوکی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك زیاد هاتە کوفە، وتی: بۆ کارێك هاتووم کە بۆ ئێوەمە.

وتیان: هەرچیت دەوێت، باسی بکە.

وتی: ڕەچەڵەکی من بۆ معاویە بگەڕێننەوە.

وتیان: شایەتی ناڕاست نادەین.

دەڵێت: زیاد ڕۆشتە بەسرە و کەسێك شایەتی بۆدا.

لەم ساڵەدا معاویە ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ موسوڵمانان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا مەروان لەسەر میحراب ژوورێکی دروستکرد. معاویە وەك دەڵێن لەشام ئەو کارەی کرد.

کارگوزاری ویلایەتەکان هەمان کارگوزارانی ساڵی پێشوو بوون.

ساڵی چل و پێنجەم دەستی پێکرد.

## ئەو ڕووداوانەی لەساڵی چی و پێنجی کۆچ ڕوویاندا

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە یەکیان ئەوە بوو کەمعاویە، حارس کوڕی عەبدوڵڵەی ئەزد وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کرد. ئەم ڕووداوە لەسەرەتای ساڵدا بوو. حارس چوار مانگ لەبەسرە مایەوە و دواتر لەسەر کار لابرا.

دەڵێت: بەوتەیەك حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی عەبد و لەخەڵکی شام بوو. معاویە، کوڕی عامری لابرد تا زیاد لەجێگەی ئەو دابنێت و حارسی وەك ئامێرێك بەکار برد.

دەڵێت: حارس، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆی سەقەفی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دیاریکرد. دواتر معاویە ئەوی لابرد و کارگوزاری بەسرەی بەزیاد بەخشی.

## فەرمانڕەوایەتی زیاد لەبەسرە

عەلی دەڵێت: کاتێك زیاد هاتە کوفە، موغەیرە گومانی کرد وەك فەرمانڕەوای کوفە هاتووە. زیاد لەماڵی سلێمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی نیشتەجێ بوو. موغەیرە، وائیل کوڕی حوجری حەزرەمی بۆ لای ئەو نارد و وتی: لەمەبەستی هاتنی بۆ ئەم شارە ئاگادار ببەرەوە.

دەڵێت: وائیل ڕۆشتە لای و نەیتوانی لەمەبەستی ئەو ئاگادار ببێتەوە. لای ئەو هاتەدەر و ویستی بۆ لای موغەیرە بگەڕێتەوە. ئەو کەسێکی فاڵگر بوو، قەلەڕەشێکی بینی کەدەیقیڕاند. بۆ لای زیاد گەڕایەوە و وتی: ئەی باوکی موغەیرە، ئەم قەلەڕەشە، بۆ سەفەر کردن لەکوفە ناچارت دەکات.

دەڵێت: ئەوسا گەڕایەوە بۆ لای کوڕی موغەیرە. هەمانڕۆژ نێردراوی معاویە هاتە لای زیاد و فەرمانی پێدا: بەرەو بەسرە بەڕێکەوە.

مەعبەد کوڕی خالیدی جەدەلی دەڵێت: زیاد کەئەویان بەکوڕی ئەبوسوفیان ناو دەبرد، لای معاویەوە هاتە لای ئێمە و لەماڵی سلێمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی

نیشتەجێ بوو، چاوەڕوانی فەرمانی معاویەی دەکرد.

دەڵێت: موغەیرە کوڕی شەعبە ئاگادار بوویەوە - ئەو ئەمیری کوفە بوو- کەزیاد چاوەڕوانە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوفەی بەدەست بگات، لەبەر ئەمە قەتن کوڕی عەبدوڵڵەی حارسی بانگکرد و پێی وت: دەتوانی چاکەیەك بکەیت؟ کاروباری کوفە بەڕێوە ببە تا دەڕۆمە لای سەروەری باوەڕداران.

وتی: توانای ئەو کارەم نییە.

دەڵێت: موغەیرە، عۆیەیینە کوڕی نەحاسی عیجلی بانگکرد و پێشنیاری بەڕێوەبردنی کاروباری کوفەی پێکرد کەڕازی بوو. موغەیرە بۆ لای معاویە بەڕێکەوت و کاتێك معاویە ئەمەی بیست، لەفریوی ئەو ترسا و وتی: ئەی باوکی عەبدوڵڵە بۆ سەر کارەکەی خۆت بگەڕێرەوە.

بەڵام موغەیرە ڕازی نەبوو و معاویە زیاتر گومانی پەیا کرد و ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە.

دەڵێت: موغەیرە شەوانە هات، من لەسەرەوەی کۆشکەکە کێشکم دەگرت، کاتێك لەدەرگایدا، ئەوم نەناسییەوە و چوونکە ترسا بەردێکی بۆ بهاوم، ناوی خۆی وت و من هاتمەخوار و بەخێرهاتنم کرد.

دەڵێت: بەمنی وت: بڕۆ لای کوڕی سومەییە و فەرمانی پێبدە بەیانی لەو بەری پردەکە بێت.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای زیاد و دەرم کرد و پێش بەرەبەیان بۆ ئەو بەری پردەکە دوورمان خستەوە.

هوزەلی دەڵێت: معاویە، زیادی وەك کارگوزاری خوراسان و سیستان و بەسرە دەستنیشان کرد و دوای ئەوە هیند و بەحرەین و عەممانیشی خستە ژێر دەستی ئەو. زیاد لەکۆتایی مانگی ڕەبیع ئەلئاخەر یا سەرەتای جومادی ئەلئەوەلی ساڵی چل و پێنج گەیشتە بەسرە کەخراپەکاری بەتەواوی لەشارەکەدا بڵاو بووبوویەوە.

دەڵێت: وتارێکی کەمی خوێندەوە کەتیایدا سپاسی خواوەندی نەکرد. بەوتەیەك سپاسی خوای کرد و وتی:

((سپاس بۆ خواوەند بۆ نیعمەت و بەخششەکانی، خوازیارین نیعمەتمان بۆ فراوان بکات، خواوەندا بەهەمان شێوە کەنیعمەتەکانت کردۆتە ڕۆژی ئێمە، سپاسی کردنی نیعمەتەکانیش بەئێمە ئیلهام بکە. بەلاّم دواتر، نەزانی تەواو و گومڕایی کوێر و دەستەچیلەی ئاگرگرە کەبلێسەکەی بەردەوام بێت، ئەو کار و کردەوانەیە نەزانەکانی ئێوە ئەنجامی دەدەن و بیرمەندەکانتان پێی ڕازی دەبن، ئەو کارە کەم بایەخانەی بچووکەکانی دەیکەن و گەورەکان ترسیان لێی نییە. دەڵێ ئایەتەکانی خواوەندتان نەبیستووە و کتێبی خواوەندتان نەخوێندۆتەوە کە لەجیهانی کۆتایی، چاکەکاران پاداشتیان پێدەبڕیت و خراپەکاران ئازابێکی هەمیشەیی. مەگەر ئێوە هاوشێوەی ئەو کەسانەن کەدنیا چاوی بەستوون و هەوەسەکان گوێچکەکانتانی ئاخنیوە و ئەم دنیاتان پێش ئەو دنیا خستووە، مەگەر نازانن دیاردەی تازەتان لەئیسلامدا هێناوەتە ئاراوە، کەگرنگی بەخراپەکاری خراپەکاران لەڕۆژی ڕۆشندا نادەن. مەگەر کەس نەبووە ڕێگەی خراپەکاری لەو کەسانە بگرێت، گرنگی بەخزمایەتی و پەیوەندییەکان دەدەن و دینتان پشتگوێ خستووە، پاساوی نابەجێ دەهێننەوە و پشتیوانی لەدزەکان دەکەن، هەرکام لەئێوە بەرگری لەنەزانەکانی تایەفەکەی خۆتان دەکەن، شوێن نەزانەکان کەوتوون و ئەولن بەهۆی پشتیوانی کردنی ئێوەوە، بوێر بوون، نە لەئازاب دەترسن نەچاوەڕوانی پاداشتن. سنورەکانی ئیسلامتان بەزاندووە و ئەوان لەگوناحدا نوقم بوون بەشێوەیەك خواردن و خەوتن لەمن حەرامە تا لەناویان ببەم و تۆویان لەسەر زەوی نەهێڵم. گومان دەکەم ناتوانم ئەو کارە ئەنجام بدەم مەگەر هاوشێوەی یەکەمجار کەئەم کارە خراپانە لەناو بران، یانی نەرمی بێ توند و تیژی و جێبەجێ کردن بێ ستەمکاری و زۆر. سوێند بەخوا هاوڕێ لەجیاتی هاوڕێ دەگرم، نیشتەجێ لەجیاتی ئەو کەسەی ڕۆشتووە و حازر لەجیاتی ئەوەی لێرە نییە، تەندروست لەجیاتی نەخۆش تا یەکێکتان براکەی خۆی ببینێت و بڵێت: سەعد، ڕابکە چوونکە سەعید کوژرا یا ئەوەی ڕێگەی چاکە دەگرنەبەر. درۆ مینبەری ناوبانگە، ئەگەر درۆتان لەمن بینی، نافەرمانی من بکەن، هەکەرس شەوانە هێرشی کرایەسەر، من زیانەکانی بۆ

قەرەبوو دەکەمەوە. گەڕانی شەوانە قەدەغە چوونکە هەرکەس بێننە لای من کەشەوانە بەکۆلان و بازارەکاندا دەگەڕێت، خوێنی دەڕێژم. سەبارەت بەمە تا ئەو کاتە مۆڵەتتان هەیە تا ئەم هەواڵە بگاتە کوفە و بگەڕێتەوە. بانگەشەکردن بۆ گەڕانەوە بۆ سەردەمی جاهلییەت قەدەغەیە چوونکە هەرکەس بەو کارەوە بگرم، زمانی دەبڕم، ئەو دیاردە تازانەی دروستتان کردووە کەپێشتر بوونیان نەبووە، ئێمە بۆ هەر گوناحێك سزایەك دیاری دەکەین، هەرکەس، کەسێك نغرۆ بکات، نوقمی دەکەم، هەرکەس، کەسێك بسوتێنێت، دەیسووتێنم، هەرکەس تونێل بۆ ماڵێك دروست بکات، لەدڵیدا تونێلێك دروست دەکەم، هەرکەس گۆڕێك هەڵبداتەوە، زیندە بەچاڵی دەکەم، دەست و زمانی خۆتان لەمن بپارێزن تا لەدەست و ئازاری من بەدوور بن. هەرکەس لەئێوە کردەوەیەك بەپێچەوانەی خەڵکان ئەنجام بدات، دەیکوژم. لەنێوان من و دەستەیەك لەئێوە دوژمنایەتی بووە، ئەو دوژمنایەتییە پشتگوێ دەخەم، هەرکەس لەئێوە چاکەکار بووە، چاکاکاری زیاتر بکات و هەرکەس خراپەکار بووە، دەستی لێهەڵگرێت. ئەگەر بزانم یەك لەئێوە خوازیاری دوژمنایەتی کردنی منە، هیچ شتێك ناکەم تا کارەکەی ئەنجام دەدات، بەلاّم کاتێك دوژمنایەتی خۆی ئاشکرا کرد، ئەمانی پێنادەم. بارودۆخی خۆتان بگۆڕن و هاوکاری یەکتر بن. زۆرن ئەو کەسانەی لەهاتنی ئێمە ناڕازین بەلاّم دواتر شادومان دەبن و زۆرن ئەو کەسانەی لەهاتنی ئێمە شادومانن بەلاّم دڵگیر دەبن))

(( ئەی خەڵکینە، ئێمە بووینەتە ڕێبەری ئێوە و پشتیوانتان، بەو هێزەی کەخواوەند ئیمانی پێبەخشیوین، ڕێنوێنیتان دەکەین و بەهۆی ئەو تالاّنییانەی خواوەند پێمان دەبەخشێت، پشتیوانتان دەبین. ئێمە مافێکمان لەملی ئێوەدایە کەدەبێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئێمە بن و مافی ئێوە لەسەر ئێمە دادپەروەرییە لەو کاروبارانەی لەئەستۆی ئێمەدایە. بەهۆی چاکەکاری خۆتانەوە ببنە کەسێکی شیاو بۆ وەرگرتنی تالاّنی و کەڵك وەرگرتن لەدادپەروەری ئێمە. دڵنیابن لەهەر شتێکدا کەمتەرخەمی بکەم، لەسێ شتدا نایکەم: دەست بەڕووی نیازمەنداندا نانێم تەنانەت ئەگەر لەشەویشدا بێت. ڕۆژی و مانگانە دوا ناخەم. ناهێڵم

ئەوانــەی بەشــداری جەنگــەکان دەکــەن، زۆر بمێننــەوە. داوا لــەخوا بکــەن تەندروستی بەپێشەواکانتان ببەخشێت چوونکە ڕێبەرە ڕێنوێنیکەرەکانی ئێوەن و پــەناگا دڵنیــا و ئەمنــەکان. ئەگــەر ئێــوە چــاك بــن، ئــەوانیش چــاك دەبــن. دوژمنایەتی ئەوان لەدڵ مەگرن چوونکە دەبێتە هۆی توڕەبوونی زیاتری ئەوان و قورس بوونی خـەم و دژوارییـەکانی سـەر شـانی ئێـوە و نیازەکانتـان بـەراوەردە ناکرێت و ئەگەر نیازەکانتان بەراوەردە نـەکرێت، دەبێتـە هۆکاری شـەڕ و بـەڵا بۆ گیانی ئێوە. داوا لـەخوا دەکەم هاوکاری هـەمووان بکـات. کاتێك بینیتـان کارێك ئــەنجام دەدەم، ئــەنجامی بــدەن تەنانــەت ئەگــەر ببێتــە هــۆی ڕیــسوایی ئێــوە. کـوژراوی زۆر لـەناو ئێـوەدا دەبیـنم، خۆتـان بـەدوور بگـرن بـا یـەکێك نـەبن لـەو کەسانەی بەدەستی من دەکوژرێت)).

دەڵێـت: عەبدوڵڵـە کوڕی ئەهتـەم هەسـتا و وتـی: ئـەی ئـەمیر، شـایەتی دەدەم کەزمانێکی پاراو و وتاردەرێکی بەتوانایت.

وتی: درۆ دەکەیت، ئەو کەسەی تۆ دەیڵێی، پێغەمبەری (د.خ) خوایە.

ئەحنـەف وتـی: ئـەی ئـەمیر وتـارێکی جوانـت پێشکەش کـرد، سـپاس دوای تاقیکردنەوەیــە و وەســفکردن دوای بەخــشش. ئێمــە ســپاس ناکــەین تــا تــاقی نەکەینەوە.

زیاد وتی: ڕاستە.

باوکی بیلالی مێرداس کوڕی ئەدیە هەستا و بەهێواشی وتـی: فـەرموودەکانی خواوەنـد جیـاوازە لەوتـەکانی تـۆ، خواوەنـد دەفـەرمێت: و ابـراهیم الـذی و فـی، الا ترزوازرة وزرا خری ;ِ ان لیس لللنسان الا ماسعی.[٨]

واتاکـەی: و (سـەحیفەکانی) ئیـبراهیم بەڵێنەکـەی بردەسـەر (بەئـەو)یـان نـەوت کـەهیچ بارهـەڵگرێت بـاری گونـاحی کەسـێکی دیکـە هەڵـدەگرێت و مـرۆڤ جگـە لەبەرهـەمی کۆشـش و هـەوڵی خـۆی هیـچی دیکـەی نییـە. و خواوەنـد بـەڵێنی باشتری لەبەڵێنەکانی تۆ بەئێمەداوە.

زیـاد وتـی: بـۆ ئـەوەی تـۆ و هاوەڵانـت داوای دەکـەین، هـیچ ڕێگـەیـەکمان نییـە

---

[٨] – سورەی نەجم ٥٣، ئایەکانی ٢٩،٢٨،٢٧

مەگەر ئەوەی لەخوێندا مەله بکەین.

شـەعبی دەڵێـت: هـەرگیز نەمبیـستووە کەکەسـێك قسە بکـات و چاکە بڵێـت مەگەر لەوەی دەمویست بێدەنگ بێت نەکا خراپە بێنێتە سەرزمان جگە لەزیاد کەتا زیاتر قسەی دەکرد، وتەکانی جوانتر و پاراوتر دەبوو.

مەسـلیمە دەڵێـت: زیـاد، عەبدوڵڵـە کـوڕی حەسـنی وەك سـەرکردەی پاسـەوانەکانی دیـاریکرد و مۆڵـەتی بەخەڵکـدا تـا هەواڵەکـە دەگاتـە کوفـە و لەگەیشتنی هەواڵەکە ئاگادار دەبێتەوە. نوێژی خەوتنانی دوادەخست تا دووایـن کـەس بێـت کەنوێـژ دەخوێنێـت. دواتـر نوێـژی دەخوێنـد و بەکەسـێکی دەوت کەسورەی بەقەرە و سورەیەکی دیکە بخوێنێت و بەهێواشی بیخوێنێت و کاتێك کۆتـایی دەهـات، مۆڵـەتێکی کـەم بەخـەڵکان دەدا. ئەوسـا فـەرمانی بەسـەرکردەی پاسەوانەکانی دەدا بڕوات و هەرکەس دەبینێت بیکوژێت.

دەڵێت: شەوێك کابرایـەکی سارانـشینی گـرت و بردییـە لای زیـاد کـەپێی وت: گوێت لەدەنگی بانگ بوو.

وتـی: سـوێند بـەخوا نـا، شـیردەرێکم هێنـا، تـاریکی شـەو داهـات، ناچـار لەسوورچێکدا مامەوە تا خۆر هەڵبێت و لەفەرمانەکانی ئەمیر بێ ئاگام.

وتـی: دڵنیـام کەڕاسـت دەکـەیت، بـەڵام کوشـتنی تـۆ لەبەرژەوەنـدی ئـەم خەڵکەدایە. فەرمانیدا سەری بپەڕێنن.

دەڵێـت: زیـاد یەکـەم کـەس بـوو، کاروبـاری حکومـەتی بـەهێز و پاشـایەتی معاویـەی سـەقامگیر و خـەڵکی بۆ ملکەچبوون و گوێڕایـەڵی کردنـی فەرمانـەکان ناچـار کـرد، سـزای خەڵکانیـدا، شمـشێری دەرکێـشا و بـەپێی گۆمـان، تانـەی لەکەسـەکان دا و بـەپێی گومـان، سـزای بەسـەردا سـەپاندن. لـەڕۆژگاری فەرمانڕەوایـەتی ئـەو، خـەڵکان لێـی دەترسـان بـەڵام لەیـەکتر ئـەمین بـوون تـا ئـەو جێگەی ئەگـەر شـتێك لـەژنێك یـا پیاوێـك دەکـەوت، کـەس دەسـتی بۆ نـەدەبرد تـا خاوەنەکەی بێت و هەڵیبگرێتـەوە. ژن شـەو لەماڵـەوە دەخـەوت بـێ ئـەوەی دەرگـا دابخات. بەجۆرێك ڕێنوێنی خەڵکانی کرد کەهاوتایان نەبینیبوو و بەجۆرێك لێـی دەترسان کەپێشتر بەئەندازەی ئەو لەکەس نەترسابوون. مانگانـەی بـەرێکوپێکی

بەخەڵکان دەدا و بناغەی (مەدینە ئەلرزقی) دارشت.

دەڵێت: زیاد دەنگی زەنگی لەماڵی عومەیر بیست و پرسی: ئەوە چییە؟

وتیان: پاسەوانە.

وتی: دەست لەم کارەی هەڵبگرێت، ئەوەی من بەدەستی دێنم لەگرێوی ئەو شتەدایە کەلەوی دەبەن.

دەڵێت: زیاد ژمارەی پاسەوانەکانی بۆ چوار هەزارکەس زیادکرد و عەبدوڵڵە کوڕی حەسن یەکێك لەمناڵەکانی عوبەید کوڕی سەعلەبەی خاوەن گۆڕستان کوڕی حەسن و جەعد کوڕی قەیسی تەمیمی، خاوەنی تاق ئەلجەعدی وەك سەرکردەی پاسەوانەکان دیاریکرد. هەردووکیان کاروباری تایبەت بەپاسەوانەکانیان ئەنجام دەدا. ڕۆژێك کەزیاد لەڕێگەدا بوو و ئەوان لەپێشەوە دەڕۆشتن و هەرکام ڕمێکی کورتیان بەدەستەوە بوو، لەبەردەم زیاد دەمەبۆڵەیان کرد. زیاد وتی: ئەی جەعد، ڕمەکەت فڕێبدە. ڕمەکەی فڕێدا و تا ئەو کاتەی زیاد مرد، کوڕی حەسن سەرکردەی پاسەوانەکانی بوو.

دەڵێت: کاروباری دووڕوو و خراپەکارانی بەجەعد سپارد کەشوێنپێی ئەوانی هەڵدەگرت.

دەڵێت: بەزیادیان وت: ڕێگەکان نا ئەمنە.

وتی: لەئێستادا سەرقاڵی کاروباری شار دەبم تا بتوانم بەتەواوی کۆنترۆڵی بکەم و کارەکانی ڕێکبخەم، ئەگەر شارەکە لەژێر دەسەڵاتی مندا نەبێت، ناتوانم دەسەڵات بەسەر ناوچەکانی دیکەدا بسەپێنم.

دەڵێت: کاتێك کاروباری شارەکەی ڕێکخست، خۆی بەساماندانی کاروباری ناوچەکانی دیکەوە سەرقاڵ کرد. دەیوت: ئەگەر لێرەوە تا خوراسان پەتێك کەم ببێتەوە، دەزانم کاری کێیە.

دەڵێت: پێنسەد کەس لەشێخەکانی بەسرەی وەك هاوەڵانی خۆی نووسی و مانگانەی سێسەد تا پێنسەد بۆ دیاری کردن.

حارسە کوڕی بەدری غەدانی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

((کێ لای منەوە هەواڵ بۆ زیاد دەبات؟

کەئەمیرێکی چاکەکار و باشترین
برایە بۆ خەلیفە
کاتیّ کارەکان دەگەنە بەردەم تۆ
پێشوای دادپەروەری و هەولّ و ئاوزیت
براکەت، کوڕی حەرب، خەلیفەی خوایە
و تۆ وەزیری ئەویت و باشترینی وەزیرەکانیت
پاداش بەشوێنکەوتەکانی ئەو دەدەیت
و شوێنکەوتەی تۆ دەگاتە لووتکەی ئارەزووەکانی
بەفەرمانی خواوەندی سەرکەوتوو و مەنسور
کاتێك مسکێن ستەم دەکات، ستەم ناکەیت
و لەدنیا هەرچی بخوازن
بەدەستی تۆ بەفراوانی تۆ لەبەردەستایە
دادپەروەرانە دابەش دەکەیت
کەنە بەتوانا لەستەمی تۆ گازندە دەکات
نە هەژار
بارانێك بوویت خۆشبەختیت باراند
و لەڕۆژگارێك هاتیت
کەخراپەکاری بلاّو بووبوویەوە
هەوەس یەخەی خەڵکانی گرتبوو
ڕقیان لەدڵدا حەشاردابوو
شاری و سارانشین و نیشتەجیّ و ڕێبوار
دەترسان
و کاتێك زیاد، شمشێری خوا
لەناو ئەوان هەستا
ڕووناکی باڵەکانی بلاّو کردەوە
بەتوانایەك کەبەهۆی ڕووداوەکانەوە ناکاوگیر ناکرێت

و ناناڵێنێت و پیرێکی پەککەوتە نییە.))

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: زیاد لەچەند کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) هاوکاری وەرگرت وەك عیمران کوڕی حەسینی خوزاعی کەکاروباری دادی بەسرەی بەو سپارد و حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری کەئەوی کردە کارگوزاری خوراسان و سەمورە کوڕی جوندەب و ئەنس کوڕی مالیك و عەبدولڕەحمان کوڕی سەمورە. عیمران داوای لێکرد لەکاروباری دادی بەسرە دووری بخاتەوە و زیاد ئەوی لەکار بەخشی و عەبدوڵلە کوڕی فەزاڵەی لەیسی و دوای ئەو براکەی، عاسم کوڕی فەزاڵەی و دواتریش زەرارە کوڕی ئەوفی جورەشی وەك لێپرسراوی کاروباری دادی بەسرە دەستنیشان کرد.

خوشکی زەرارە، هاوسەری زیاد بوو.

دەڵێن: زیاد یەکەم کەس بوو خەڵکانی لەپێش خۆیەوە دەنارد کەڕمی بچووکیان بەدەستەوە بوو. ئەم کەسانە گورز بەدەست لەبەردەم ئەودا ڕێگەیان دەبڕی. پێنسەد کێشکگری بوو. شەیبانی سەعدی خاوەنی گۆڕستانی شەیبانی وەك سەرکردەی ئەوان دەستنیشان کرد کەهیچ کات مزگەوتیان بەجێنەدەهێشت.

عەلی دەڵێت: زیاد خوراسانی کردە چوار بەش: ئەمیر کوڕی ئەحمەری یەشکری وەك کارگوزاری مەرو دەستنیشان کرد.

خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی وەك کارگوزاری ئەبەرشەهر دەستنیشان کرد.

قەیس کوڕی هەیسەمی وەك کارگوزاری مەروروود و فاریاب و تاڵەقان دەستنیشان کرد.

نافیع کوڕی خالیدی تاحی وەك کارگوزاری هەرات و بادغەیس و قادس و پوشەنگ دەستنیشان کرد.

کوڕی ئەبی عومەر، یەکێك لەپیرەکانی ئەزد دەڵێت: زیاد لەنافیع کوڕی خالید ڕەنجا و ئەوی زیندانی کرد و سەد هەزاری خستە ئەستۆی کەتەسلیم بەزیادی بکات و بەوتەیەك هەشتسەد هەزار. هۆکاری ڕەنجانەکە ئەوە بوو کەمێزێکی

پازەهرییان بۆ نافیع هێنا کەقاچەکانیشی لەپازەهر دروستکرابوو. نافیع یەکێك لەقاچەکانی لێکردەوە و قاچێکی ئاڵتونی لەجێگەی دانا و بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بۆ زیادی نارد کەئۆدەداری کارەکانی بوو. زەید (کۆیلە) خراپەی نافیعی هێنایە سەرزمان و بەزیادی وت: خیانەتی لەتۆ کرد و یەکێك لەقاچەکانی مێزەکەی بۆ خۆی هەڵگرت و قاچێکی زێڕینی بۆ دانا.

دەڵێت: چەند کەسێك لەسەرکردەکانی ئەزد وەك سەیف کوڕی وەهب مەعولی کەپیاوێکی بڕواپێکراو بوو، ڕۆشتنە لای زیاد. زیاد ددانی دەشۆرد.کەئەوانی بینی. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((جیٚ پیٚکانی ئەسپەکەی ئێمە بیر بێنەرەوە

ئەو کاتەی نیازت بەئێمە بوو.))

دەڵێت: ئەزدییەکان دەڵێت سەیف کوڕی وەهب ئەم هۆنراوەی لای زیاد خوێندەوە کەوتی: بەڵیٚ.

دەڵێت: ڕۆژگارێك بیری زیاد دێنێتەوە کەسەبرە پەنای پێدابوو. دواتر زیاد داوای نووسراوەکەی کرد و بەسیواك نووسراوەکەی پاککردەوە و نافیعی لەزیندان هێنایەدەر.

مەسلیمە دەڵێت: زیاد، نافیع کوڕی خالیدی تاحی و خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی و ئەمیر کوڕی ئەحمەدی یەکشری لەسەر کار لابرد. حەکەم کوڕی عەمرۆی وەك کارگوزاری خۆی دەستنیشان کرد کەڕەچەڵەکی بۆ نوعەیلە کوڕی مالیك دەگەڕایەوە. نوعەیلە برای غەفار کوڕی مەلیك بوو و لەبەر ئەوەی باو وباپیرانی کەم بوون، پەیوەستی تایەفەی غەفار بوون.

پەردەدار ڕۆشت و حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری بینی و ئەوی بردە لای زیاد. ئەو پیاوێکی بڕواپێکراو بوو. پێشتر قسەی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) کردبوو. زیاد ئەوی کردە کاگوزاری خوراسان و پێی وت: تۆم نەدەویست بەڵام خواوەند تۆی هەڵبژارد.

باوکی عەبدولڕەحمانی سەقەفی دەڵێت: کاتێك زیاد وەك فەرمانڕەوای عێراق دەستنیشان کرا، حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری وەك کارگوزاری خوراسان

دەستنیشان کرد و چەند کەسێکی لەگەڵ ئەودا بۆ ویلایەتەکانی خوراسان ڕەوانە کرد تا سەرپەرەستی کاروباری کۆکردنەوەی باج بکەن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی حەکەم بن: ئەسلەم کوڕی زەرعە، خولەید کوڕی عەبدوڵڵە حەنەفی، نافیع کوڕی خالیدی تاحی و ڕەبیعە کوڕی عەسەلی یەربوعی و ئەمیر کوڕی ئەحمەدی یەشکری و حاتەم کوڕی نەعمانی باهلی.

دەڵێت: حەکەم مرد. ئەو بۆ جەنگی تەخارستان ڕۆشتبوو، تالآنی زۆری کۆکردبوویەوە. حەکەم، ئەنس کوڕی ئەبی ئەیاسی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبوو. نامەی بۆ زیاد نووسی کەئەوم بۆ خواوەند و موسوڵمانان و تۆ پەسەند کرد بەلآم زیاد وتی: خواوەندا، ئەو بۆ تۆ و موسوڵمانان و خۆم پەسەند ناکەم. خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان کرد.

دەڵێت: دوای ئەوە ڕەبیع کوڕی زیادی حارسی لەگەڵ پەنجا هەزار کەس بۆ خوراسان نارد و پێنج هەزار کەس لەخەڵکانی بەسرە و پێنج هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە. سەرکردەی خەڵکانی بەسرە ڕەبیع و سەرکردەی خەڵکانی کوفە عەبدوڵڵە کوڕی باوکی عوقەیل و سەرکردەی هەموویان، ڕەبیع کوڕی زیاد بوو.

دەڵێن: مەروان کوڕی حەکەم لەم ساڵەدا ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو کارگوزاری مەدینە بوو.

کارگوزاران و فەرمانڕەوای ویلایەتەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون: موغەیرە کوڕی شەعبە، فەرمانڕەوای کوفە و شورەیح کاروباری دادی کوفەی لەدەستا بوو، زیاد کارگوزاری بەسە و کارگوزارەکانی دیکە هەمان کەسانی ساڵەکانی ڕابردوو بوون.

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید لەزستاندا بۆ جەنگ لەسەرزەمینی ڕۆم بەڕێکەوت.

ساڵی چل و شەشەمی کۆچ دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و شەشی کۆچ

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو کەمالیك کوڕی عوبەیدالله بەمەبەستی جەنگی زستانە بەرەو سەرزەمینی ڕۆم بەڕێکەوت. بەوتەیەك ئەو کەسەی بۆ جەنگ ڕۆشت عەبدولڕەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید بوو و بەوتەیەك مالیك کوڕی هوبەیرەی سەکونی.

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید لەسەرزەمینی ڕۆم بۆ حیمس گەڕایەوە و وەك ئاماژەیان پێداوە، کوڕی ئاسالی نەسرانی شەربەتێکی ژەهراوی دەرخواردا و کوشتی.

## گێڕانەوەی چۆنیەتی کوشتنی عەبدولڕەحمان

هۆکارەکەی وەك لەگێڕانەوەی مەسلیمە کوڕی موحاریب ئاماژەی پێدراوە ئەوە بوو کەعەبدولڕەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید بەهۆی کارەکانی باوکی یانی خالید کوڕی وەلید و هەروەها جەنگ و بوێرییەکانی خۆی لەسەرزەمینی ڕۆم، لەشام پێگەیەکی بەرزی بەدەستهێنابوو. خەڵك خوازیاربوون لەدەوری کۆببنەوە تا ئەو جێگەی معاویە لێی ترسا. معاویە بەکوڕی ئاسالی وت بۆ کوشتنی ئەو بیر لەڕێگە چارەیەك بکاتەوە و بەڵێنیدا ئەگەر ئەو کارە بکات تا زیندووە خەراجی لێوەرنەگرێت و کۆکردنەوەیماڵیاتی حیمسی پێبسپێرێت.

دەڵێت: کاتێك عەبدولڕەحمان لەسەرزەمینی ڕۆمەوە بەرەو حیمس گەڕایەوە، کوڕی ئاسال بەهۆی یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی شەربەتێکی ژەهراوی دەرخوارددا و لەحیمس مرد. معاویە بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر و کۆکردنەوەی ماڵیاتی حیمسی بەو سپارد و خەراجی خۆیشی بەخشی.

دەڵێت: خالید کوڕی عەبدولڕەحمان ڕۆشتە مەدینە. ڕۆژێك ڕۆشتە لای عوروە

کوڕی زوبەیر و سڵاوی لێی کرد. عوروە وتی: تۆ کێیت؟

وتی: خالید کوڕی عەبدولڕەحمان.

عوروە وتی: کوڕی ئاسال چی بەسەرهات؟

دەڵێت: خالید هەستا و ڕێگەی حیمسی گرتەبەر و کوڕی ئاسالی خستە ژێر چاودێرییەوە و بەشمشێرەکەی خۆی ئەوی کوشت. معاویەیان ئاگادار کردەوە کەچەند ڕۆژێك ئەوی زیندانی کرد و خوێنبایی لێسەند بەڵام تۆڵەی لێنەکردەوە.

دەڵێت: دواتر خالید بۆ مەدینە گەڕایەوە و کاتێك گەیشتە لای عوروە، سڵاوی لێکرد.

عوروە پرسی: کوڕی ئاسال چی بەسەرهات؟

وتی: کوڕی ئاسالم لەناو برد بەڵام کوڕی جەرموز چی بەسەرهات؟ عوروە بێدەنگ بوو.

خالید کوڕی عەبدولڕەحمان کاتێك بەشمشێر لەکوڕی ئاسالیدا، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((من کوڕی شمشێری خوام

بمناسنەوە

جگە لەپێگە و دینەکەم هیچم بۆ نەماوەتەوە

لەگەڵ ئەو شمشێرەی گورزی کاریگەر دەوەشێنێت))

لەم ساڵەدا خەتیم و سەهم کوڕی غالیبی هوجەیمی شۆڕشیان کرد و دروشمی (داوەری تایبەتە بەخوا)یان بەرز کردەوە. شۆڕشەکەی ئەوان وەك لەگێڕانەوەی عەلی ئاماژەی پێدراوە بەو شێوە بوو کاتێك زیاد جڵەوی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، سەهم کوڕی عالیبی هوجەیمی و خەتیم کەناوی زەید بوو، کوڕی مالکی باهیلی، ترسی ئەویان کەوتە دڵەوە. سەهم ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر و چەند ڕووداوی دروستکرد و دروشمی (داوەری تایبەتە بەخوا)ی بەرز کردەوە. دواتر گەڕایەوە و خۆی حەشاردا و داوای ئەمانی کرد بەڵام زیاد ئەمانی پێنەدا و بەدوایدا گەڕا تا دۆزییەوە و دواتر کوشتی و لەبەردەرگەیماڵەکەی خۆی هەڵیواسی.

زیاد، خەتیمی بۆ بەحرەین دوورخستەوە. دواتر مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدا، گەڕایەوە و وتی: لەشارەکەی خۆت مەڕۆدەر. بەموسلیم کوڕی عەمرۆی وت: ببە دەستەبەری ئەو. بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و وتی: ئەگەر شەو لەدەرەوەی ماڵەکەی بێت، ئاگادارت دەکەمەوە.

دەڵێت: موسلیم ڕۆشتە لای زیاد و وتی: دوێشەو خەتیم لەماڵەکەی خۆیدا نەبوو. زیاد فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. کوشتیان و لەگەڕەکی باهیلە فڕیاندا.

لەم ساڵەدا عەتەبە کوڕی ئەبی سوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

کارگوزار و فەرمانڕەواکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ساڵی چل و حەوت دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و حەوت

جەنگی زستانە بەسەرکردایەتی مالیك کوڕی هوبەیرە لەسەرزەمینی ڕۆم و جەنگی زستانەی باوکی عەبدولڕەحمانی قینی لەئەنتاکیە لەم ساڵەدا ڕوویاندا.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ عاس لەفەرمانڕەوایەتی میسر دوورخرایەوە و معاویە کوڕی خودەیج جێگەری گرتەوە. ئەو لەشوێنکەوتەکانی عوسمان کوڕی عەفان بوو.

دەڵێت: کاتێك معاویە کوڕی خودەیج لەئەسکەندەرییەوە هاتبوو، عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکر لای ئەو گوزەری کرد و وتی: ئەی معاویە، پاداشتی خۆتت لەمعاویە وەرگرت، محەممەد کوری ئەبی بەکرت کوشت تا ببیتە فەرمانڕەوای میسر و ئێستا فەرمانڕەوای میسریت.

وتی: محەممەد کوڕی ئەبی بەکرم بۆیە کوشت چوونکە بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان هەڵسوکەوتی کرد.

عەبدولڕەحمان وتی: ئەگەر تەنیا مەبەستت تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان دەبوو، بەشداریت لەکارەکانی معاویەدا نەدەکرد و کاتێك عەمرۆعاس فێڵی لەئەشعەری کرد، پێش هەمووان هەڵنەدەستایت و بەیعەتت لەگەڵ نەدەبەست.

دەستەیەك لەمێژوونووسان دەڵێن: لەم ساڵەدا زیاد، حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری وەك کارگوزاری خوراسان ڕەوانە کرد کە لەکوێستانی غور و فەراوەندە جەنگی کرد و بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر ئەو ناوچانەدا گرت و تالآنی و ئەسیر و تالآنییەکی زۆری دەستکەوت (دواتر ئاماژە بەگێڕانەوەی پێچەوانەی ئەم گێڕانەوە دەدەین)

بێژەری ئەم گێڕانەوە دەڵێت کەحەکەم کوڕی عەمرۆ لەم جەنگە گەڕایەوە و لەمەرودرود مرد.

سەبارەت بەکەسێك کە لەم ساڵەدا ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا، بۆچوونەکان جیاوازە. واقدی دەڵێت: عەتبە کوڕی ئەبی سوفیان

ڕێورەسمی حەجی ئەنجامدا. یەکیتر دەڵێت: عەنبەسە کوڕی ئەبی سوفیان. فەرمانڕەوا و کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشووبوون کەئاماژەمان پێدان.

ساڵی چل و هەشتەمی کۆچ دەستپێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و هەشتی کۆچ

جەنگی زستانە بەسەرکردایەتی عەبدولڕەحمانی قینی و جەنگی هاوینە بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵە کوڕی قەیسی فەزاری لەئەنتاکییە، لەم ساڵەدا ڕوویاندا. مالیك کوڕی هوبەیرەی سەکونی، لەدەریادا جەنگی کرد. عەقبە کوڕی عامری جوهەنی لەگەڵ خەڵکانی میسر و مەدینە لەدەریادا جەنگی کرد. سەرکردەی خەڵکانی مەدینە مونزەر کوڕی زوهەیر بوو و سەرکردەی هەموان، خالید کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید.

بەوتەی زۆربەی شارەزایان لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم ڕێورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو چاوەڕوانی بەخششی معاویەی دەکرد و دەیویست فەدەك وەربگرێتەوە کەپێشتر معاویە پێی بەخشیبوو و لێی سەندبوویەوە.

فەرمانڕەوا و کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون کەئاماژەمان پێدان.

ساڵی چل و نۆیەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چل و نۆیەمی کۆچ

جەنگی زستانە بەسەرکردایەتی مالیك کوڕی هوبەیرە لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدرا.

هەروەها فەزالە کوڕی عوبەید لەجەربە لەم ساڵەدا جەنگی کرد. زستانی لەو سەرزەمینە بەسەر برد و سەرئەنجام دەستی بەسەردا گرت و ژمارەیەکی زۆری خەڵکانی ئەسیر کرد.

عەبدوڵڵە کوڕی کورزی بوجلی لەم ساڵەدا جەنگی هاوینەی ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی شەجەری ڕەهاوی لەگەڵ خەڵکانی شام، جەنگی زستانەی لەدەریا ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەقەبە کوڕی نافیع لەگەڵ خەڵکانی میسر جەنگی زستانەی لەدەریا ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە، لەسەرزەمینی ڕۆم جەنگی بەرپا کرد و تا قوستەنتەنییە پێشڕەوی کرد. کوڕی عەباس و کوڕی عومەر و کوڕی زوبەیر و باوکی ئەیوبی ئەنساری هاوڕێیەتییان دەکرد.

لەم ساڵەدا، لەمانگی ڕەبیع ئەلئەوەل، معاویە، مەروان کوڕی حەکەمی لەکارگوزاری مەدینە لابرد و لەمانگی ڕەبیع ئەلئاخر و بەوتەیەك ڕەبیع ئەلئەوەل، سەعید کوڕی عاسی وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشان کرد.

ماوەی کارگوزاری مەروان لەمەدینە هەشت ساڵ و دوو مانگ درێژەی کێشا. بەوتەی واقیدی لەکاتی لابردنی مەروان، کاروباری دادی مەدینە لەئەستۆی عەبدوڵڵە کوڕی حارس کوڕی نەوفلدا بوو و کاتێك سەعید کوڕی عاس جڵەوی کاروباری گرتەدەست، ئەوی لەکارەکەی دوورخستەوە و باوکی سەلمە کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف بۆ ئەو کارە ڕاسپارد.

دەڵێن لەم ساڵەدا لەکوفە تاعون بڵاو بوویەوە. موغەیرە کوڕی شەعبە لەتاعونەکە هەڵات. کاتێك شوێنەواری تاعون نەما، بەموغەیرەیان وت: باشترە بۆ کوفە بگەڕێیتەوە. ئەو ڕێگەی کوفەی گرتەبەر بەڵام تاعونی گرت و مرد.

دەڵێن: موغەیرە لەساڵی پەنجای کۆچیدا مرد و معاویە کوفەی پەیوەستی سنوری دەسەڵاتی زیاد کرد. زیاد یەکەم کەس بوو فەرمانڕەوایەتی بەسرە و کوفەی دەکرد.

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاس ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانڕەوا و کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون جگە لەکوفە کە لەساڵی مردنی موغەیرەدا جیاوازی هەیە چوونکە دەستەیەك دەڵێت لەم ساڵەدا و دەستەیەك دەڵێن لەساڵی پەنجای کۆچیدا مردووە.

ساڵی پەنجای کۆچ دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پە نجای کۆچ

بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات و سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی لەم ساڵەدا جەنگیان لەسەرزەمینی ڕۆم بەرپا کرد.

بەوتەیەك جەنگی فەزالە کوڕی عوبەیدی ئەنساری لەدەریا لەم ساڵەدا ڕوویدا.

بەوتەی واقیدی و مەداینی، موغەیرە کوڕی شەعبە لەم ساڵەدا مرد.

موسا سەقەفی دەڵێت: موغەیرە پیاوێکی باڵابەرز، یەك چاو بوو. چاوێکی لەیەرموك بریندار بووبوو. لەمانگی شەعبانی ساڵی پەنجا مرد. لەو کاتەدا حەفتا ساڵی تەمەن بوو.

بەلام عەوانە وەك لەگێڕانەوەی هوشام کوڕی عوبەید ئاماژەی پێدراوە، دەڵێت: موغەیرە لەساڵی پەنجا و یەك مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی چل و نۆی کۆچ مرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: زیاد کارگوزاری بەسرە و ناوچەکانی دەوروبەری بوو. دوای ئەوەی موغەیرە کوڕی شەعبە فەرمانڕەوای کوفە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری مرد، معاویە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوفە و بەسرەی بۆ زیاد نووسی. ئەو یەکەم کەس بوو لەیەك کاتدا فەرمانڕەوایەتی بەسرە و کوفەی دەکرد.

دەڵێت: زیاد، سەمورە کوڕی جوندەبی وەك جێگری خۆی لەکوفە

دەستنیشان کرد. سەمورە هاتە کوفە. زیاد خۆی شەش مانگ لەبەسرە دەمایەوە و شەش مانگ لەکوفە.

مەسلیمە کوڕی موحاریب دەڵێت: کاتێك موغەیرە مرد، زیاد فەرمانڕەوایەتی عێراقی گرتەدەست. دواتر هاتە کوفە، ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: لەبەسرە بووم کەفەرمانڕەوایەتی ئەم شارەیان بەمن سپارد. ویستم لەگەڵ دوو هەزار پاسەوان لەبەسرەوە بێمە ئەم شارە. دواتر بیرم کەوتەوە کەئێوە شوێنکەوتەی ڕاستین و ماوەیەکی دوور و درێژە، ڕاستییەکان، ئێوەیان لەخراپەکان دوورخستۆتەوە و لەبەر ئەمە تەنیا لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆم هاتم.

دەڵێت: کاتێك کۆتایی بەوتەکانی هێنا، بەهەمان شێوە کە لەسەر مینبەر بوو، زیخبارانیان کرد. زیاد لەشوێنەکەی خۆی نەجووڵا تا کۆتاییان بەو کارە هێنا. دواتر وتی: دواتر دەستەیەك لەکەسە تایبەتەکانی خۆی بانگکرد و فەرمانی پێدان دەرگاکانی مزگەوتەکە دابخەن. وتی: هەرکام لەئێوە کەسی تەنیشتی خۆی بگرێت و نەڵێت نازانم کێ لەتەنیشتمە. دواتر فەرمانیدا کورسییەکیان هێنا. چوار چوار بانگی دەکردن تا سوێند بخۆن کەهیچ کام لەئێمە تۆی زیخباران نەکردووە. هەرکەس سوێندی خوارد، ئازادی کرد و ئەوانەی سوێندیان نەخوارد، گیران. دەڵێن ژمارەیان سی کەس و بەوتەیەك هەشتا کەس بوو. زیاد لەوێ دەستی هەموویانی بڕییەوە.

شەعبی دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ کات درۆم لێ نەبیستووە، هەر بەڵێنێکی پێدان چ چاك چ خراپ، ئەنجامیدا.،

هەروەها شەعبی دەڵێت: یەکەم کەس کە بەدەستی زیاد لەکوفە کوژرا، ئەوفی کوڕی حەسن بوو. زیاد شتێکی سەبارەت بەو بیست و ویستی بیگرێت بەڵام هەڵات. جارێك کەسەردانی خەڵکانی کرد، لای ئەوفی گوزەری کرد و پرسی: ئەمە کێیە؟

وتیان: ئەوفی کوڕی حەسنی تائی

زیاد وتی: ئەجەل هات، بەپێی خۆی هاتە بەردەم تۆ. دواتر لێی پرسی: بۆچوونت سەبارەت بەعوسمان چییە؟

بچووکی بۆ خۆی دروستکرد.

دەڵێت: کاتێک زیاد لەبەسرەوە هاتە کوفە، سەمورە کوڕی جوندەبی وەك کارگوزار دەستنیشان کرد.

محەممەد کوڕی سەلیم دەڵێت: لەئەنس کوڕی سیرینیم پرسی: ئایا سەمورە کەسی کوشت؟ وتی: مەگەر دەتوانین ئەو کەسانە بژمێرین کەبەدەستی سەمورە کوژران. زیاد ئەوی کردە جێگری خۆی لەبەسرە و هاتە کوفە و کاتێک گەڕایەوە، هەشت هەزار کەسی کوشتبوو. پێیان وت: ناترسی لەوەی کەست کوشتبێت؟ وتی: ئەگەر دووبەرابەری ئەوەم کوشتبێت، ترسم نییە. یان وتەیەکی هاوشێوەی ئەمەی هێنایە سەرزمان.

باوکی سواری عەدەوی دەڵێت: سەمورە لەبەرەبەیانێك حەفتا و چوارکەس لەخەڵکی عەشیرەکەی منی کوشت کەهەموویان حافیزی قورئان بوون.

عەوف دەڵێت: سەمورە لەمەدینەوە دەهات و کاتێک گەیشتەماڵەکانی مناڵەکانی ئەسەد، کەسێك لەکۆڵانێکەوە هات و بەرێکەوت بەر پێشەکی سوپاکە کەوت. یەکێك لەوان هێرشی کردەسەر و ڕمێکی کورتی لەسنگی چەقاند.

دەڵێت: سوپا ڕۆشت و سەمورە کوڕی جوندەب گەیشتە لای کەسەکە کە لەخوێنی خۆیدا دەگەوزا. وتی: ئەمە چییە؟

وتیان: پێشەنگی سوپاکەی ئەمیر وایان لێکردووە.

وتی: کاتێك بیستتان ئێمە سوار بووین، لەڕم و تیرەکانی ئێمە خۆتان بەدوور بگرن.

سەعید کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك قەریب و زوحاف شۆڕشیان کرد، زیاد لەکوفە بوو و سەمورە لەبەسرە. شەوانە هاتنەدەر و لەگەڕەکی مناڵەکانی یەشکر کۆبوونەوە. نزیکەی حەفتا کەس دەبوون. ئەم شۆڕشە لەمانگی ڕەمەزان ڕوویدا. دواتر ڕۆشتنە لای مناڵەکانی زەبیعە کەحەفتا کەس بوون. لای یەکێك لەپیرەکان گوزەریان کرد بەناوی حەکاك. کاتێك ئەوانی بینی، وتی: ئەی باوکی شەعسا، بەخێر بێت.

دەڵێت: کوڕی حەسن ئەوی بینی و خوێنی ڕشت و لەمزگەوتەکانی تایەفەی

وتی: زاوای پێغەمبەر (د.خ) بوو کەدوو کچی ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

وتی: سەبارەت بەمعاویە دەڵێی چی؟

وتی: کەسێکی بەخشندەیە و خۆڕاگر.

وتی: سەبارەت بەمن چی دەڵێیت؟

وتی: بیستوومە لەبەسرە وتووتە سوێند بەخوا نەخۆش لەجیاتی تەندروست و حازر لەجیاتی کەسێك دەگرم کەلێرە نەبێت؟

وتی: وتوومە.

وتی: راستت نەوت.

وتی: ئەوەی فوو دەکات، خراپتر لەوانی دیکە نییە. ئەوی کوشت.

دەڵێت: کاتێك زیاد هاتە کوفە، عەمارە کوڕی عەقەبە کوڕی ئەبی موعیت پۆشتە لای و وتی: شیعەکانی عەلی، باوکی توراب، لەدەوری عەمرۆ کوڕی حەمەق کۆدەبنەوە.

عەمرۆ کوڕی حورەیس وتی: بۆ شتێك دەڵێیت کەدڵنیا نیت و نازانیت دەرئەنجامەکەی چی دەبێت؟

زیاد وتی: هەردووکتان بێدەنگ بن، تۆ کە بەڕاشکاوی سەبارەت بەوان قسەت کرد و عەمرۆ کەبەرپرچی وتەکانی تۆی دایەوە. بڕۆنە لای عەمرۆ کوڕی حەمەق و پێی بڵێن: ئەم کەسانە کێن لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە، هەرکەس دەیەوێت تۆ ببینێت و لەگەڵ تۆدا بدوێت، لەمزگەوت ئەو کارە بکات.

دەڵێت: بەوتەیەك ئەو کەسەی دژی عەمرۆ کوڕی حەمەق قسەی کرد و بەزیادی وت کەئاژاوەی لەدوو شاردا ناوەتەوە، یەزید کوڕی رویەم بوو.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حورەیس وتی: هەرگیز هاوشێوەی ئەمڕۆ گرنگی بەبابەتێك نەداوە کەسوودی پێ ببەخشێت.

زیاد بەرویەمی وت: تۆ گیانی ئەوت خستە مەترسییەوە، بەڵام عەمرۆ گیانی ئەوی پاراست. سوێند بەخوا ئەگەر بزانم لەناخەوە دوژمنی منە، تا ئەو رۆژەی شۆڕش نەکات و دژی من نەجووڵێتەوە، کارم پێی نابێت.

دەڵێت: کاتێك خەڵکی کوفە زیادیان زیخباران کرد، لەسەر مینبەر ژوورێکی

بچووکی بۆ خۆی دروستکرد.

دەڵێت: کاتێک زیاد لەبەسرەوە هاتە کوفە، سەمورە کوڕی جوندەبی وەک کارگوزار دەستنیشان کرد.

محەممەد کوڕی سەلیم دەڵێت: لەئەنس کوڕی سیرینیم پرسی: ئایا سەمورە کەسی کوشت؟ وتی: مەگەر دەتوانین ئەو کەسانە بژمێرین کەبەدەستی سەمورە کوژران. زیاد ئەوی کردە جێگری خۆی لەبەسرە و هاتە کوفە و کاتێک گەڕایەوە، هەشت هەزار کەسی کوشتبوو. پێیان وت: ناترسی لەوەی کەست کوشتبێت؟ وتی: ئەگەر دووبەرابەری ئەوەم کوشتبێت، ترسم نییە. یان وتەیەکی هاوشێوەی ئەمەی هێنایە سەرزمان.

باوکی سواری عەدەوی دەڵێت: سەمورە لەبەرەبەیانێک حەفتا و چوارکەس لەخەڵکی عەشیرەکەی منی کوشت کەهەموویان حافیزی قورئان بوون.

عەوف دەڵێت: سەمورە لەمەدینەوە دەهات و کاتێک گەیشتە ماڵەکانی مناڵەکانی ئەسەد، کەسێک لەکۆڵانێکەوە هات و بەرێکەوت بەر پێشەکی سوپاکە کەوت. یەکێک لەوان هێرشی کردەسەر و ڕمێکی کورتی لەسنگی چەقاند.

دەڵێت: سوپا ڕۆشت و سەمورە کوڕی جوندەب گەیشتە لای کەسەکە کە لەخوێنی خۆیدا دەگەوزا. وتی: ئەمە چییە؟

وتیان: پێشەنگی سوپاکەی ئەمیر وایان لێکردووە.

وتی: کاتێک بیستتان ئێمە سوار بووین، لەڕم و تیرەکانی ئێمە خۆتان بەدوور بگرن.

سەعید کوڕی زەید دەڵێت: کاتێک قەریب و زوحاف شۆڕشیان کرد، زیاد لەکوفە بوو و سەمورە لەبەسرە. شەوانە هاتنەدەر و لەگەڕەکی مناڵەکانی یەشکر کۆبوونەوە. نزیکەی حەفتا کەس دەبوون. ئەم شۆڕشە لەمانگی ڕەمەزان ڕوویدا. دواتر ڕۆشتنە لای مناڵەکانی زەبیعە کەحەفتا کەس بوون. لای یەکێک لەپیرەکان گوزەریان کرد بەناوی حەکاک. کاتێک ئەوانی بینی، وتی: ئەی باوکی شەعسا، بەخێر بێت.

دەڵێت: کوڕی حەسن ئەوی بینی و خوێنی ڕشت و لەمزگەوتەکانی تایەفەی

ئەزد بڵاو بوونەوە. دەستەیەك لەوان ڕێگەی سەرزەمینی مناڵەكانی عەلییان گرتەبەر و دەستەیەكی دیكە بەرەو مزگەوتی موعادل ڕۆشتن. سەیف كوڕی وەهب لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی دژی ئەوان شۆڕشی كرد و ئەو كەسانەی كوشت كەڕۆشتبوونە ناوچەكەی ئەو. دەستەیەك لەگەنجەكانی مناڵەكانی عەلی و دەستەیەك لەمناڵەكانی راسب هێرشیان كردە سەر قەریب و زوحاق و تیربارانیان كردن. قەریب وتی: ئایا عەبدوڵلە كوڕی ئەوسی تاحی لەناو ئێوەدایە؟ پێشتر ڕووبەڕووی ئەو بووبوویەوە.

وتیان: بەڵێ.

وتی: كەواتە بۆ جەنگی من وەرە.

دەڵێت: عەبدوڵلە ئەوی كوشت و سەری براوی ئەوی لەگەڵ خۆی هێنا. زیاد كە لەكوفەوە دەهات، سەركۆنەی كرد و وتی: ئەی خەڵكی تاحیە، ئەگەر ژمارەیەك لەو كەسانەتان نەدەكوشت، زیندانیم دەكردن.

دەڵێت: قەریب لەتایەفەی ئەیاد بوو و زوحاف لەتایەفەی تەی. كوڕە پووری یەكتر بوون و یەكەم كەسانێك بوون دوای خەواریجی نەهرەوان ئالآی شۆڕشیان بەرز كردەوە.

سەعید دەڵێت: باوكی بیلال دەیوت: هیوادارم خواوەند قەریب لەخۆی نزیك نەكاتەوە، سوێند بەخوا ئەگەر لەئاسمانەوە بكەوم، باشتر لەوەم دەوێت كەكارێك بكەم كەئەو ئەنجامی دابوو. مەبەستی شۆڕش بوو.

وەهب دەڵێت: دوای قەریب و زوحاف حەرورییەكان ڕووبەڕووی گرفتاری بوونەوە و سەمورە ئەوانی دەكوشت و فەرمانی كوشتنی دەردەكردن. كاتێك زیاد دەڕۆشتە كوفە، سەمورە جێگری ئەو بوو و ژمارەیەكی زۆری لەخەواریج دەكوشت.

باوكی عوبەیدە دەڵێت: ڕۆژێك زیاد لەسەر مینبەر وتی: ئەی خەڵكی بەسرە، سوێند بەخوا دەبێت ئەوانە لەناو ببەن، جیاواز لەوە لەئێوەوە دەست پێدەكەم، سوێند بەخوا ئەگەر یەكیان ڕزگاری بێت، داهاتی یەكساڵتان دەبڕم.

دەڵێت: خەڵكان دژی ئەوان ڕاپەڕین و هەموویان كوشتن.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: لەم ساڵەدا معاویە فەرمانیدابوو مینبەری پێغەمبەر (د.خ) بۆ شام ببەن بەڵام کاتێك مینبەرەکەیان لەشوێنەکەی جووڵاند، خۆر گیرا بەشێوەیەك ئەستێرەکان دەبینران و خەڵکان ترسان. معاویە وتی: نەمدەویست مینبەرەکە ببەم، بەڵکو دەترسام مۆریانە خواردبێتی. دواتر مینبەرەکەی داپۆشی.

سەعید کوڕی دینار لەباوکی دەگێڕێتەوە: معاویە وتی: بۆچوونی من ئەوەیە مینبەری پێغەمبەر (د.خ) لەمەدینە نەمێنێتەوە چوونکە ئەوان دوژمنان و بکوژەکانی خەلیفەی موسوڵمانان عوسمان کوڕی عەفان بوون. کاتێك هاتە مەدینە داوای گۆچانەکەی پێغەمبەری کرد کەلای سەعد ئەلقورەز بوو.

دەڵێت: باوکی هورەیرە و جابیر کوڕی عەبدوڵڵە ڕۆشتنە لای معاویە و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێندت دەدەین بەخوا ئەو کارە نەکەیت، دەتەوێت مینبەر پێغەمبەر (د.خ) و گۆچانەکەی بۆ شام ببەیت؟ مزگەوتەکە ببە.

دەڵێت: معاویە لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە و شەش پلیکانەی بۆ مینبەرەکە زیاد کرد و لەئێستادا هەشت پلیکانەی هەیە. بۆ ئەو کارەی داوای لێبوردنی لەخەڵکان کرد.

قەبیسە کوڕی زوەیب دەڵێت: عەبدولمەلیك مەبەستی بردنی مینبەرەکەی کرد، پێم وت: سوێندت دەدەم بەخوا ئەو کارە مەکە و مینبەرەکە لەشوێنی خۆی مەجووڵێنە چوونکە کاتێك سەروەری باوەڕداران معاویە، ویستی ئەو کارە بکات، خۆر گیرا. پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: هەرکەس خراپە لەگەڵ مینبەرەکەی من بکات، شوێنەکەی پڕ دەبێت لەئاگر. بۆ دەتەوێت ئەو مینبەرە لەمەدینە ببەیت لەکاتێکدا لەمەدینە شوێنی چارەسەر کردنی کێشەی خەڵکانە.

دەڵێت: عەبدولمەلیك لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە و چیتر باسی مینبەرەکەی نەکرد و کاتێك وەلید خەلافەتی گرتەدەست و بەمەبەستی حەج ڕووی لەمەککە کرد، مەبەستی بردنی مینبەرەکەی کرد و وتی: لەپێشهاتەکان ئاگادارم بکەنەوە چوونکە دەمەوێت ئەو کارە بکەم.

دەڵێت: سەعید کوڕی موسەییب کەسی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز

نارد و وتی: بەوەلید بڵێ لەخواوەند بترسێت و خۆی نەخاتە بەردەم هەڕەشەی تورەیی خواوەند. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ وەلید قسەی کرد و ئەوی لەمەبەستەکەی پەشیمان کردەوە.

دەڵێت: کاتێک سلێمان کوڕی عەبدولمەلیک حەجی کرد، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەمەبەستەکەی وەلید ئاگاداری کردەوە و ئەوەی کەسەعید کوڕی موسەییب داوای لێکردبوو لەمەبەستەکەی پەشیمانی بکاتەوە.

سلێمان وتی: حەزم دەکرد ئەم شتانە سەبارەت بەسەروەری باوەڕداران عەبدولمەلیک و سەبارەت بەوەلید نەدەوترا. ئەمە ڕووداوخوازییە، ئێمە کارمان بەمە چییە؟ دنیامان دەویست کە لەدەستماندایە. دەمانەوێت یەکێک لەیادگارییەکانی ئیسلام ببەینە لای خۆمان، ئەمە کارێکی ڕاست نییە.

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی حودەیج لەفەرمانڕەوایەتی میسر دوورخرایەوە و مەسلیمە کوڕی مەخلەد وەك فەرمانڕەوای میسر و ئەفریقییە دەستنیشانکرا. معاویە کوڕی ئەبوسوفیان پێش ئەوەی مەسلیمە وەك فەرمانڕەوای میسر و ئەفریقییە دەستنیشان بکات، عەقەبە کوڕی نافیعی فیهری بۆ ئەفریقییە نارد. عەقەبە دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و هێڵی بەدەوری قیرواندا کێشا چوونکە ئەو سەرزەمینە وەك محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت زۆنکاو بوو و لەبەر زۆری دڕەندە و خزۆکەکان کەس هاتوچۆی ئەو ناوچەی نەدەکرد. عەقەبە لەخوا پاڕایەوە و ئەو سەرزەمینە لەو دڕندانە پاك بوویەوە بەشێوەیەك کەدڕندەکان بێچووەکانی خۆیان دەخوارد.

موسا کوڕی عەلی لەباوکی دەگێڕێتەوە: عەقەبە کوڕی نافیع هاواری کرد: ئێمە لێرە نیشتەجێ دەبین، ئێرە چۆڵ بکەن. خزۆکەکان لەکونەکانیان هاتنەدەر و هەڵاتن.

زەید کوڕی باوکی جوندەب لەیەکێك لەسوپاییەکانی میسر دەگێڕێتەوە: لەگەڵ عەقەبە کوڕی نافیع هاتین. ئەو یەکەم کەس بوو هێڵی بەدەوری قیرواندا کێشا و ماڵ و شوێنی بۆ کەسەکان دیاریکرد و مزگەوتەکەی دروستکرد. لەگەڵ ئەو ماینەوە تا ئەو کاتەی لەسەر کار لابرا. باشترین فەرمانڕەوا و باشترین

سەرکردە بوو.

دەڵێت: دوای ئەوە، لەم ساڵەدا، یانی ساڵی پەنجای کۆچ، معاویە، معاویە کوڕی حودەیجی لەمیسر و عەقەبە کوڕی نافیعی لەئەفریقییە دوورخستەوە و مەسلەمە کوڕی مەخلەدی وەك فەرمانڕەوای میسر و ئەفریقییە دەستنیشان کرد. ئەو یەکەم کەس بوو فەرمانڕەوایەتی مەغریب و میسر و بەرقە و ئەفریقییە و تەرابلوسی لەیەك کاتدا لەدەستا بوو.

دەڵێت: مەسلەمە کوڕی مەخلەد یەکێك لەخزمەکانی خۆی بەناوی باوکی موهاجیر وەك کارگوزاری ئەفریقییە دەستنیشان کرد و عەقەبە کوڕی نافیعی لابرد و سەبارەت بەهەندێ پرس و سامان لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد. مەسلمە وەك فەرمانڕەوای میسر و مەغریب و باوکی موهاجیر وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە مایەوە تا ئەو کاتەی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان مرد.

لەم ساڵەدا باوکی موسای ئەشعەری مرد. بەوتەیەك ئەو لەساڵی پەنجا و دووی کۆچ مرد.

سەبارەت بەو کەسەی ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا، بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك دەڵێن معاویە ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و دەستەیەك ئاماژە بەیەزیدی کوڕی دەدەن.

کارگوزاری مەدینە لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاس بوو. فەرمانڕەوای بەسرە و کوفە و ڕۆژهەڵات و سیستان و فارس و سیند و هیند، زیاد بوو.

لەم ساڵەدا زیاد، شوێن فەرزدق کەوت کەمناڵەکانی نەشهەل و مناڵەکانی فەقیم، دژی ئەو سکاڵایان کرد. فەرزدق بۆ لای سەعید کوڕی عاس هەڵات کە لەو کاتەدا کارگوزاری مەدینە بوو. داوای پەنای لەسەعید کرد و سەعید کوڕی عاس پەنای پێ بەخشی.

## بەسەرهاتی فەرزدق

لەبیتە کوڕی فەرزدق لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك ئەشهەب کوڕی ڕەفیلە و بوعەیسم هەجو کرد و ڕیسوا بوون، منداڵەکانی نەشهەل و منداڵەکانی فەقیم لای زیاد کوڕی ئەبی سوفیان سکاڵایان لێکردم.

دەستەیەك وتوویانە یەزید کوڕی مەسعودی نەشهەلی سکاڵای کردبوو بەڵام زیاد ئەوی نەناسییەوە تا پێیان وت: ئەو گەنجە سارانشینە کەزیوەکانی تاڵانکرا و جلەکانی خۆی داکەند. زیاد ئەوی ناسییەوە.

فەرزدق دەڵێت: غالیبی باوکم منی لەگەڵ کاروان و کاڵاکانی خۆی ناردبوو تا بیانفرۆشم و ئازوخەی و جلوبەرگ بۆ کەسەکانم بکڕم. ڕۆشتم و کاڵاکانم فرۆشت و پارەکەم لەناو جلەکانمدا هەڵگرت.

دەڵێت: لەو کاتەدا پیاوێك هات وەك بڵێی خودی شەیتان بوو، وتی: زۆر پارێزگاری لەپارەکەت دەکەیت؟

وتی: کێشەی هەیە؟

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەو پیاوەی دەیناسم، لەجیاتی تۆ بووایە، هەڵینەدەگرت.

وتم: ئەو کێیە؟

وتی: غالیب کوڕی سەعسەعە.

دەڵێت: خەڵکانم لەدەوری خۆم کۆکردەوە و هاوارم کرد: هەڵیگرنەوە. پارەکەم بەسەر ئەواندا پرژوبڵاو کردەوە. دەڵێت: یەکێك لەوان وتی: کوڕی غالیب، عاباکەت هەڵدە، منیش عاباکەم هەڵدا.

یەکی دیکە وتی: کراسەکەت و کراسەکەیشم داکەند و پێمدان.

یەکی دیکە وتی: جامانەکەی سەرت، جامانەکەیشم پێدان و تەنیا ژێر شەرواڵێکم لەپێداما.

یەکێك وتی: ژێر شەرواڵەکەت؟

وتم: ئەویش داکەنم و بەڕووتی بگەڕێمەوە؟ شێت نیم.

دەڵێت: زیاد ئاگادار بوویەوە و چەند سوارێکی بۆ ئەویٚ نارد تا من ببەنە لای. یەکێك لەمناڵەکانی هوجەیم بەسواری ئەسپ هات و وتی: ئەوا هاتن، ڕابکە. منی لەدوای خۆیەوە سوار کرد و ڕۆشتین. سوارەکانی زیاد کاتێك گەیشتن کەمن ڕۆشتبووم. زیاد، دوو مامی من یانی زوهەیل و زوحاف، کوڕەکانی سەعسەعەی گرت و زیندانی کردن کە لەدیوان لەپێرستی ئەو کەسانەدا بوون کەدوو هەزاریان وەردەگرت. من کەسم بۆ لای ئەوان نارد و پێم وتن ئەگەر دەخوازن، دێم. کەسیان نارد و وتیان، لەئێمە نزیك مەبەرەوە چوونکە کەس لەمەبەستی زیاد ئاگات. ناتوانێت هیچ لەگەڵ ئێمە بکات چوونکە هیچ گوناح و تاوانێکمان ئەنجام نەداوە.

دەڵێت: دوو مامەکەم چەند ڕۆژێك لەزیندان مانەوە. دواتر سەبارەت بەوان قسەیان بۆ زیاد کرد و وتیان: گویرایەڵ و ملکەچن، گەنجێکی سارانشین ئەو کارەی کردووە، ئەوان هیچ تاوانێکیان نییە. زیاد ئەوانی ئازاد کرد.

پێیان وتم: پێمان بڵێ: باوکت داوای چی و چی کردبوو؟

پێم وتن: هەموویان کڕی و بارم کردن و ڕۆشتمە لای باوکم کە لەبەسەرهاتەکەی من ئاگادار بووبوویەوە. پرسی: چیت کردووە؟ بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.

وتی: باش شارەزای ئەم کارانەیت. دەستی بەسەرمدا هێنا.

بێژەر دەڵێت: فەرزدق تا ئەو کاتە هۆنراوەی نەدەوت و دوای ئەوە دەستی پێکرد. زیاد بەسەرهاتەکەی ئەوی لەبیر مابوو.

دەڵێت: دوای ئەوە ئەحنەف کوڕی قەیس و جاریە کوڕی قودامە لەتایەفەی مناڵەکانی ڕەبیعە کوڕی کەعب و جەون کوڕی قەتادەی عەبشەمی و حەتات کوڕی یەزید باوکی مونازل، یەکێك لەکوڕەکانی حوی کوڕی سوفیان، ڕۆشتنە لای معاویە. معاویە یەکی سەد هەزاری پێبەخشین. بەلاٚم حەفتا هەزاری بەحەتات بەخشی. کاتێك گەڕانەوە، لەیەکتریان پرسی و هەرکام خەلاٚتەکەی خۆی باسکرد و دەرکەوت کەحەتات حەفتا هەزاری وەرگرتووە. حەتات بۆ لای معاویە گەڕایەوە. معاویە پرسی: ئەی باوکی مونازل بۆ گەڕایتەوە؟

وتی: لەناو منداڵەکانی تەمیم پیسوات کردم، مەگەر کەسێکی بڕواپێکراو و خاوەن پێگە نیم؟ مەگەر بەتەمەن نیم؟ مەگەر خەڵکەکەم گوێرایەڵی فەرمانەکانی من نین؟

وتی: بۆنا.

وتی: بۆ لەناو ئەو کەسانە تەنیا منت جیا کردەوە؟

وتی: بەو پارەیە دینی ئەوانم کڕییەوە و تۆم بەدین و باوەڕت بەعوسمان کوڕی عەفان بەجێهێشت. بۆیە ئەو قسەی کرد چوونکە حەتات یەکێك لەشوێنکەوتەکانی عوسمان کوڕی عەفان بوو.

وتی: دینەکەی منیش بکڕە. سکاڵای لەدیارییەکەی خۆی گرت و معاویە زیندانی کرد. فەرزدق لەمبارەوە هۆنراویەکی دووروودرێژی هۆنییەوە و ڕەخنەی لەمعاویە گرت و سی هەزاری بەکەسەکانی حەتات بەخشی. ئەم کارە، بووە هۆی توڕەبوونی زیاد لەفەرزدق.

دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی نەهشەل و فەقیم لای زیاد سکاڵایان لەفەرزدق کرد، توڕەیی ئەو زیاتر بوو و شوێنی کەوت بەڵام فەرزدق هەڵات و پەنای بۆ عیسا کوڕی خەسیلە برد.

فەزڵ کوڕی موسا کوڕی خەسیلە دەڵێت: کاتێك زیاد بەدوای فەرزدقەوە بوو، شەوانە هاتە لای مامی من، عیسا کوڕی خەسیلە و وتی: ئەی باوکی خەسیلە، لەم پیاوە دەترسم و هاورێکانم و هەموو ئەوانەی پشتم پێ دەبەستن، پشتگوێیان خستووم، هاتوومە لای تۆ تا پەنام بدەیت و بمشاریتەوە.

وتی: بەخێربێیت.

دەڵێت: فەرزدق سێ شەو لای ئەو مایەوە، دواتر پێی وت: دەمەوێت بەرەو شام بڕۆم.

وتی: هەرچۆن دەخوازیت، ئەگەر دەتەوێت، لێرە بمێنەرەوە، ماڵی خۆتە. ئەگەر دەتەوێت بڕۆیت، وشترێکی باشت پێ دەدەم.

دەڵێت: شەوی دواتر فەرزدق سوار وشتر بوو، عیسا کەسێکی لەگەڵدا نارد تا لەماڵەکان دوورکەوتەوە. دوو سێ مەنزڵ دوورکەوتنەوە، هۆنراوەیەکی

لەمبارەوە هۆنییەوە.

دەڵێت: زیاد لەڕۆشتنی فەرزدق ئاگادار بوویەوە و عەلی کوڕی زەهدومی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد.

ئەعیەن نەوەی فەرزدق دەڵێت: کوڕی زەهدوم شوێنپێی فەرزدقی لەماڵی ژنێکی مەسیحی بەناوی کچی موورار لەمناڵەکانی قەیس دۆزییەوە. ژن ئەوی لەکونێکی ماڵەکەی خۆیدا شاردەوە و بەم شێوەیە کوڕی زەهدوم نەیتوانی بیگرێت.

مەسمەع کوڕی عەبدولمەلیك دەڵێت: فەرزەدق بەرەو ڕوحا ڕۆشت و لەناو خەڵکانی بەکر کوڕی وایل دابەزی و چەند قەسیدەیەکی بۆ وەسفی ئەوان هۆنییەوە.

دەڵێت: کاتێك زیاد لەبەسرە نیشتەجێ دەبوو، فەرزدق دەڕۆشتە کوفە و کاتێك زیاد لەکوفە نیشتەجێ دەبوو، فەرزدق ڕێگەی بەسرەی دەگرتەبەر چوونکە زیاد شەش مانگ لەبەسرە و شەش مانگ لەکوفە دەمایەوە. کاتێك زیاد لەکارەکەی فەرزدق ئاگادار بوویەوە، فەرمانی بۆ عەبدولڕەحمان کوڕی عوبەید، کارگوزارەکەی خۆی لەکوفە نووسی: فەرزدق نێرێکی وەحشییە و لەساراکاندا دەلەوەڕێت و کاتێك خەڵکان لێی نزیك دەبنەوە، دەترسێت و بەرەو سەرزەمینێکی دیکە دەڕوات، بەدوایدا بگەڕێ و بیگرە.

فەرزدق دەڵێت: بەسەختی بەدوای منەوە بوون بەشێوەیەك هەرکەس پەنای دەدام، لەپێشەوە خۆیان دەردەکرد. جارێك کەعابام لەسەرمەوە پێچابوو و دەڕۆشتم، ئەو کەسەی بەدوامدا دەگەڕا لای منەوە تێپەڕی. کاتێك شەو داهات ڕۆشتمە لای یەکێك لەخاڵەکانم لەتایەفەی مناڵەکانی زەببە. حەفلەیان بوو، برسی بووم. بەخۆم وت دەڕۆمە لای ئەوان و کەمێك نان دەخۆم.

دەڵێت: لەو کاتەی کەدانیشتبووم، بینیم کەسێك ئەسپەکەی ڕادەکێشێت و ڕمێکی بەدەستەوەیە و هاتە ناو ماڵەکە. چەند کەسێك هەستان و دیوارەکەیان لابرد و من دەرباز بووم و دواتر دیوارەکەیان لەشوێنەکەی خۆیدا دانایەوە و وتیان: ئێمە نەمانبینیوە. ماوەیەك گەڕان و کاتێك هیچیان نەدۆزییەوە، ڕۆشتن.

بەرەبەیان هاتنە لای من و وتیان: ڕێگەی حیجاز بگرەبەر چوونکە لەوێ زیاد دەستی بەتۆ ناگات چوونکە ئەگەر دوێشەو تۆی دەگرت، ئێمەیش لەناو دەچووین.

دەڵێت: بەشێوەیەکی نهێنی دوو چوارپێیان بۆ ئامادە کردم و لەگەڵ مەقاعس یەکێك لەخەڵکانی منداڵەکانی تیم الله کەڕێنیشاندەری ڕێگە و لەگەڵ بازرگانەکان سەفەری دەکرد، قسەیان کرد و لەگەڵ ئەو ڕێگەی بانقیامان گرتەبەر. کاتێك گەشتینە یەکێك لەماڵەکانی ئەوێ، دەرگایان بەڕووی ئێمەدا نەکردەوە، بەناچاری بارەکەی خۆمان لەبن دیوارێکدا فرێدا. مانگەشەو بوو، وتم: ئەی مەقعاس، ئەگەر بەرەبەیان زیاد کەسانێك بەرەو عەتیق بنێرێت، دەتوانن ئێمە بگرن؟

وتی: بەڵێ، بۆسەمان بۆ دەنێنەوە.

دەڵێت: هێشتا لەعەتیق گوزەریان نەکردبوو. عەتیق خەندەکێك بوو کەعەجەمەکان هەڵیانکەندبوو.

فەرزدق دەڵێت: پێم وت: عەرەب چی دەڵێت:

دەڵێت: دەڵێن: شەو و ڕۆژێك مۆڵەتمان پێ بدە و دواتر هەڵاتوو بگرە. بەڕێکەوە.

وتم: لەدڕندەکان دەترسم..

وتی: مەترسی دڕندەکان لەمەترسی زیاد کەمترە.

دەڵێت: بەڕێکەوتین، شتێك لەپشت سەرمانەوە بوو. یەکێك بەدوامانەوە بوو کە لێمان دوور نەدەکەوتەوە.

وتم: ئەی مەقاعس، ئەمە کەسە دەبینی کەهەموو شتێك جگە لەو بەجێدەهێڵین و لەسەرەتای شەوەوە بەدوامانەوەیە؟

وتی: ئەمە دڕندەیە؟

دەڵێت: وەك بڵێی تێگەیشت کەهات و لەنێوان ڕێگەکەدا خەوت. کاتێك ئەمەمان بینی، دابەزین، وشترەکانمان خەواند و من کەوانەکەی خۆم هەڵگرت.

مەقاعس وتی: ئەی ڕێوی، دەزانی لەترسی چی بەرەو ئێرە هەڵاتووین؟

لەترسی زیاد.

دەڵێت: دڕندەکە کلکی لەقاند و تۆزەکەی بەئێمە و وشترەکانمان گەیشت.

وتم: تیر بهاوێژم.

مەقاعس وتی: مەیبزوێنە، کاتێك خۆر هەلات، دەڕوات.

دەڵێت: دڕندەکە دەنگی بەرز دەکردەوە و دەینەڕاند و مەقاعس چاودێری دەکرد تا بەیانی بوویەوە و دڕندەکە ڕۆشت.

فەرزدق لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

(( لەبەر ئەو هەموو شتەی لەشەو و ڕۆژەکاندا بینیومە

چیتر خۆم بەترسەنۆك نازانم

شێرێك بوو وەك بڵێ پێپۆشی لەپێدا بێت

بەپەنجەی ئەستور و نینۆکی تیژ

کاتێك دەینەڕاند گیانم دەکەوتە لەرزین

و پرسیاری ڕێگەی هەلاتنم کرد

دڵنەوایی خۆم دایەوە و وتم خۆڕاگر بە

لەو کاتەدا دۆخینەکەم توند کرد

ئەی دڕندە، مەترسی تۆ لەزیاد کەمترە

و ئاسانتر دەتوانم ڕووبەڕووی تۆ ببمەوە.))

سیبس کوڕی ڕیبعی ڕیاحی دەڵێت: ئەم هۆنراوەم بۆ زیاد خوێندەوە، وەك بڵێی بەزەیی پیادا هاتبێتەوە، وتی: ئەگەر دەهاتە لای من ئەمانم پێ دەبەخشی و خەڵاتم دەکرد.

فەرزدق دەڵێت: درێژەمان بەڕێگەدا تا گەشتینە مەدینە کەسەعید کوڕی عاس کارگوزاری ئەو شارە بوو. لەو ڕۆژەدا بەشداری پرسەی کەسێکی دەکرد. بەدوایدا گەڕاین. دۆزیمانەوە، دانیشتبوو و خەڵکان سەرقاڵی بەخاك سپاردنی مردووەکە بوون. لەبەردەمیا وەستام و وتم: کەسێك کەخوێنی نەڕشتووە و سامانی کەسی نەخواردووە، پەنای بۆ تۆ هێناوە.

وتی: ئەگەر خوێنت نەڕشتووە و سامانی کەست نەخواردووە، لەپەنای

مندایت.

وتی: کێیت؟

وتم: هومام کوڕی غالیب کوڕی سەعسەعە

دەڵێت: ماوەیەك لەمەدینە مامەوە و ماوەیەك لەمەککە تا ئەو کاتەی زیاد مرد.

لەم ساڵەدا حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری لەکاتی گەڕانەوە لەجەنگی خەڵکی کوێستانی ئەشەل لەمەرورود مرد.

## جەنگی حەکەم کوڕی عەمرۆ لەکوێستانی ئەشەل و هۆکاری مردنی ئەو

عەبدولڕەحمان کوڕی سوبەیح دەڵێت: لەگەڵ حەکەم کوڕی عەمرۆ لەخوراسان بووم. زیاد نامەی بۆ نووسی کەخەڵکی کوێستانی ئەشەل سیلاحی پێستینیان هەیە و دەفری زێڕین. حەکەم بۆ جەنگی ئەوان ڕۆشت و کاتێك گەیشتە دڵی کوێستان، دۆڵ و ڕێگەکانیان گرت و ناکاوگیریان کرد. حەکەم سەرگەردان مایەوە و موهەلیبی بۆ کاروباری جەنگ ڕاسپارد. موهەلیب بەردەوام بیری لەڕێگەچارە دەکردەوە تا ئەوەی یەکێك لەگەورەکانی گرت و پێی وت: یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرە، یا دەتکوژم یا دەبێت لەم دۆڵە ڕزگارمان بکەیت.

وتی: لەبەردەم یەکێك لەڕێگەکان ئاگر بکەرەوە و فەرمان بدە باروبنە بۆ ئەوێ ببەن و کاتێك ئەوان گومان بکەن ئێوە ڕۆشتوونەتە سەر ڕێگەکە، لەوێ کۆدەبنەوە و ڕێگەکانی دیکە بەجێدەهێڵن. لەم کاتەدا تۆیش ڕێگەیەکی دیکە هەڵبژێرە چوونکە ئەوان پێتان ناگەنەوە.

دەڵێت ئەو کارەی کرد و ڕزگاری بوو. تالآنییەکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنا.

حەکەم کوڕی سوبەیح دەڵێت: زیاد نامەیەکی بۆ حەکەم نووسی و هەڕەشەی لێکرد کەئەگەر زیندوو بمێنمەوە یەکێك لەئەندامەکانی جەستەت دەبڕمەوە لەبەر ئەوەی کاتێك زیاد بیستبووی تالآنی زۆری لەگەڵ خۆی هێناوە، زیاد نامەی بۆ نووسی کەسەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم دەفری زێڕین و زیوین و دیاری گرانبایی بۆ هەڵبژێرم، پێش ئەوەی ئەم شتانە جیا بکەیتەوە، تالآنییەکان

دابەش مەکە.

حەکەم لەوەڵامدا نووسی: نامەکەت بەدەستم گەیشت کەنووسیبووت سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ نووسیویت کەدەفری زێڕین و زیوینی بۆ جیا بکەینەوە و دەست لەهیچ شتێك نەدەم. بەڵام کتێبی خواوەند پێش نامەکەی سەروەری باوەڕدارانە. سوێند بەخوا ئەگەر زەوی و ئاسمانەکان بەڕووی بەندەی لەخواترسدا داخرابێت، خواوەند ڕێگە چارەیەکی بۆ دەدۆزێتەوە.

دەڵێت: ئەوسا بەخەڵکی وت: هەرچی زووتر تالانییەکان دابەش بکەن. پێنج یەکی جیاکردەوە و تالانییەکانی دیکەی دابەش کرد.

دەڵێت: ئەوسا حەکەم وتی: خواوەندا ئەگەر کاری خێرم ئەنجامداوە، گیانم بگرە. لەخوراسان و لەمەروود مرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك وادەی مەرگی حەکەم لەمەرو نزیك بوویەوە، ئەنس کوڕی باوکی ئەناسی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. ئەم ڕووداوە لەساڵی پەنجای کۆچی ڕوویدا.

ساڵی پەنجا و یەك دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و یەکی کۆچ

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە جەنگی زستانەی فەزاڵە کوڕی عوبەید لەسەرزەمینی ڕۆم بوو. جەنگی هاوینەی بوسر کوڕی باوکی ئەرتات و کوژرانی حوجر کوڕی عودەی و هاوەڵانی لەم ساڵەدا ڕوویدا.

## کوژرانی حوجر کوڕی عودەی

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك معاویە کوڕی ئەبو سوفیان لەجومادی ساڵی پەنجا و یەك، موغەیرە کوڕی شەعبەی وەك فەرمانڕەوای دەستنیشان کرد، ئەوی بانگ کرد و پێی وت: دەمویست پێشنیاری زۆر شتت پێ بکەم بەڵام لەبەر باوەڕی خۆم بەوەی دەزانی ڕەزامەندی من لەچیدایە و حکومەتەکەم چی دەوێت و بەرژەوەندی خەڵکان لەچیدایە، چاوپۆشی لەو شتانە دەکەم بەڵام پێشنیاری یەك کارت پێدەکەم کە لەخراپەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و سەرکۆنە کردنی هاوەڵانی ئەو و وەسف کردنی عوسمان کوڕی عەفان و داوای بەخشش بۆ ئەو چاو نەپۆشیت. ڕەخنە لەهاوەڵانی عەلی بگرە و گوێ لەوتەکانیان مەگرە، شوێنکەوتەکانی عوسمان لەخۆت نزیك بکەرەوە و گرنگی بەوتەکانیان بدە.

موغەیرە وتی: کەسێکی خاوەن ئەزمون و تاقیکراوەمەتەوە. پێش تۆ کاروبارەکانی کەسێکی دیکەم ڕاپەڕاندووە و کەس ڕەخنەی لەکارەکانم نەگرتووە. تۆیش تاقیم بکەرەوە، سەرئەنجام یا سەرکۆنەم دەکەیت یا وەسف.

معاویە وتی: پشت بەخوا، وەسفت دەکەین.

شەعبی دەیوت: دوای موغەیرە، فەرمانڕەوایەکی هاوشێوەی ئەومان نەبووە. یەکێك بوو لەکەسە شیاوەکانی ڕۆژگاری خۆی. حەوت ساڵ و چەند مانگ بەنوێنەرایەتی معاویە فەرمانڕەوایەتی کوفەی کرد، هەڵسوکەوتەکانی ئارام و خوازیاری هێمنی و ئاشتی بوو بەڵام لەسەرکۆنە کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ڕەخنە گرتن لەشوێنکەوتەکانی و وەسف کردنی عوسمان کوڕی عەفان و

وەسفکردنی هاوەڵانی چاوپۆشی نەدەکرد.

کاتێک حوجر کوڕی عودەی ئەم وتانەی دەبیست، دەیوت: خوا ئێوە بەنەعلەت بکات. دواتر هەڵدەستا و دەیوت: خواوەند دەفەرمێت: ئێوە کەباوەڕتان هەیە، دادپەروەری بکەنە پیشە و شایەتی بۆ خواوەند بدەن.[٩]

شایەتی دەدەم ئەو کەسەی ڕەخنەی لێدەگرن و عەیبەکانی باس دەکەن، چاکییەکانی لەهەمووتان زیاترە و ئەو کەسەی وەسفی دەکەن، شیاوی ڕەخنە و سەرکۆنە کردنە.

موغەیرە پێی دەوت: ئەی حوجر، شانسی خۆتە کەمن فەرمانڕەوام، ئەی حوجر، هاوار لەتۆ، لەحکومەت بترسە، لەتوڕەیی حکومەت خۆت بەدوور بگرە چوونکە بەدڵنیاییەوە توڕەیی حکومەت کەسانی زۆری وەك تۆ دەکوژێت.

موغەیرە چاوپۆشی لەکارەکانی حوجر دەکرد و بەمشێوە بوو تا ئەوەی لەیەکێك لەدوا ڕۆژەکانی فەرمانڕەوایەتی خۆی لەناو خەڵکان قسەی کرد و سەبارەت بەعوسمان و عەلی وتەکانی هەمیشەی دووبارە کردەوە و وتی خواوەندا بەزەیی و ڕەحمەتی خۆت بەسەر عوسمان کوڕی عەفاندا ببارێنە و لێی خۆش ببە، پاداشتی چاکییەکانی بدەرەوە چوونکە فەرموودەکانی تۆی جێبەجێ کرد و شوێن سوونەتی پێغەمبەرەکەی تۆ کەوت،. ئێمەی یەکخست و خوێنی ئێمەی پاراست و بەستەم کوژرا. خواوەندا هاوەڵان و شوێنکەوتەکان و تۆڵەستێنەکانی بپارێزە. نفرینی بکوژەکانی کرد.

حوجر کوڕی عودەی هەستا و بەدەنگی بەرز موغەیرەی بانگ کرد بەشێوەیەك هەموو کەسانی ناو مزگەوت و ئەوانەی لەدەرەوەی مزگەوت بوون، بیستیان، وتی: لەبەر ئەوەی پیر بوویت، نازانیت سەبارەت بەچ کەسێك درۆ دەکەیت. ئەی پیاو، فەرمان بدە ڕۆژی و مانگانەکانی ئێمە بدەن کەلای خۆت گلت داوەتەوە، کەسانی پێش تۆ ئەو کارەیان نەکردووە. تەنیا سەرقاڵی سەرکۆنە کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و شوێنکەوتەکانی ئەویت.

دەڵێت: دوو لەسەر سێی خەڵکان هەستان و وتیان: وتەکانی حوجر ڕاستە و

---

[٩] - سورەی نسا ئایەی ١٣٤

ڕاستی هێنایە سەرزمان. فەرمان بدە ڕۆژ و مانگانەکانی ئێمە بدەن چوونکە سوود لەوتەکانی تۆ نابەین. بەمشێوەیە زۆریان قسە کرد.

دەڵێت: موغەیرە دابەزی و ڕۆشت. کەسانی دەوروبەری داوای مۆڵەتیان کرد و پێیدان. پێیان وت: بۆ ڕێگە دەدەیت ئەم پیاوە بەم شێوەیە قسە بکات و بوێرانە مەبەستەکانی بێنێتە سەرزمان. ئەم کارەی تۆ دوو دەرئەنجامی هەیە، یەکەم ئەوەی دەسەلاّت و هێزی تۆ لاواز دەبێت، دووەم ئەوەی ئەگەر معاویە ئاگادار ببێتەوە، دەبێتە مەترسییەك بۆ سەر خۆت و دەسەلاّتەکەت.

دەڵێت: ئەوەی زیاتر هەمووان سەبارەت بەحوجر قسەی دەکرد و کار و وتەکانی ئەوی بەگەورە و مەترسیدار لەقەڵەم دەدا، عەبدوللّە کوڕی باوکی عوقەیلی سەقەفی بوو.

دەڵێت: موغەیرە پێی وتن: ئەوم بەکوشتنداوە، دوای من فەرمانڕەوایەك دێت کەحوجر گومان دەکات ئەویش هاوشێوەی منە. حوجر بەو شێوەیە لەگەڵ ئەو قسە دەکات کەئێستا دەیبینین لەگەڵ من دەیکات. فەرمانڕەوای تازە لەهەمان جاری یەکەم دەیگرێت وبەخراپترین شێوە دەیکوژێت. مەرگی من نزیك و لاواز بووم. نامەوێت کوشتن و خوێنڕشتنی چاکەکاران و خەڵکی ئەم شارە لەمنەوە دەستپێبکات چوونکە بەهۆیەوە کەسانی دیکە بەختەوەر دەبن و من بەدبەخت. معاویە لەم دنیا پێگەی بەرز دەبێتەوە و موغەیرە لەو دنیا ڕیسوا دەبێت. بەچاکەی چاکەکارانیان ڕازی دەبم و لەخراپەکارانیان خۆش دەبم، وەسفی بیرمەندەکانیان دەکەم و ئامۆژگاری نەزانەکانیان دەکەم تا مەرگ لەیەك جیامان دەکاتەوە. کاتێك کارگوزاری دوای من دەبینن، بیری من دەکەونەوە.

عوسمان کوڕی عەقەبەی کێندی دەیوت: یەکێك لەپیرەکان کەباسی ئەم حەدیسەی دەکرد دەیوت: سوێند بەخوا ئەوانمان ئەزموون کرد و موغەیرە زیاتر لەهەموان وەسفکەری بێ گوناحان بوو و بەخشندەی خراپەکار و بەپاساوەکان ڕازی دەبوو.

عەوانە دەڵێت: موغەیرە لەساڵی چل و یەك و مانگی جومادی فەرمانڕەوایەتی کوفەی گرتەدەست و لەساڵی پەنجا و یەکی کۆچ مرد. کوفە و

بەسرە کەوتە ژێردەستی زیاد کوڕی ئەبی سوفیان کەهات و ڕۆشتە ناو کۆشکی کوفە. دواتر ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

ئێمەیان تاقیکردۆتەوە و ئێمەیش کەسێکی خاوەن ئەزموونین. ڕێبەرایەتیمان کردووە و ڕێبەرایەتی کراوین و دەزانین باشکردنی ئەم بارودۆخە لەکۆتاییدا بەو شێوە دەبێت کە لەسەرەتاوە بووە. ملکەچی و گوێڕایەڵی کە بەنهێنی و ئاشکرا وەك یەك بێت و خاوەنەکانی لەئامادە بوون و ئامادە نەبوون یەکسان بن و دڵ و زمانیان یەك بێت. دەزانین چاککردنی بارودۆخی ئەم خەڵکە بەنەرمی دەکرێت، بێ نواندنی سستی لەهێز و دەسەڵات و بێ توندوتیژی. لەناو ئێوەدا کارێك دەست پێناکەم بەئەنجامی نەگەیەنم. هیچ درۆیەك قێزەونتر لەدرۆی پێشەوا لەسەر مینبەر نییە.

دەڵێت. دواتر وەسفی عوسمان کوڕی عەفان و شوێنکەوتەکانی کرد و خراپەی بکوژەکانی هێنایە سەرزمان و نفرینی کردن.

دەڵێت: حوجر هەستایە سەر پێ و بەهەمان شێوە قسەی لەگەڵ کرد کەپێشتر لەگەڵ موغەیرە دەیکرد.

دەڵێت: زیاد بۆ بەسرە گەڕایەوە و عەمرۆ کوڕی حورەیسی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد و ئاگادار بوویەوە شیعەکانی عەلی لەدەوری حوجر کۆدەبنەوە و بەئاشکرا بێزاری خۆیان لەمعاویە دەردەبڕن و عەمرۆ کوڕی حورەیسیان زیخباران کردووە. زیاد بۆ کوفە گەڕایەوە، ڕۆشتە ناو کۆشك و دواتر ڕۆشتە سەر مینبەر.

حوجر لەمزگەوت دانیشتبوو. هاوەڵانی لەدەوری کۆبووبوونەوە. زیاد سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

سەرەئەنجامی گومڕایی و سەرکێشی، مەترسیدارە، ئەوان پشتگوێ خراون و گەردنکێشی دەکەن. لەمن پارێزراو بوون و بوێر بوون. سوێند بەخوا ئەگەر پەشیمان نەبنەوە، بەدەرمانی خۆتان چارەسەرتان دەکەم.

هەروەها وتی: هیچ نیم ئەگەر گۆڕەپانی کوفە لەحوجر پاك نەکەمەوە و ئەو نەکەمە وانەیەك بۆ داهاتووان. هاوار لەحوجر و هاوار لەدایکی. چوونکە

ڕووبەڕووی مەترسییەکی گەورە بۆتەوە.

محەممەد کوڕی سیرین سەبارەت بەبەسەرهاتی حوجر دەڵێت: ڕۆژێکی هەینی زیاد قسەی کرد و قسەی زۆری کرد و نوێژ دواکەوت. حوجر کوڕی عودەی پێی وت: نوێژ. بەڵام زیاد لەقسە کردن بەردەوام بوو. دووبارە وتی: نوێژ. زیاد لەقسە کردن بەردەوام بوو و کاتێک حوجر ترسا نوێژەکەیان بفەوتێت، دەستی بۆ مشتێك زیخ برد و بۆ نوێژ هەستا. خەڵکیش هەستان و کاتێك زیاد ئەمەی بینی، هاتەخوار و نوێژی لەگەڵ خەڵکان خوێند. کاتێك کۆتایی بەنوێژەکە هێنا، سەبارەت بەحوجر نامەی بۆ معاویە نووسی و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان.

دەڵێت: معاویە نامەی بۆنووسی: بەندی ئاسنینی لەپێ ببەستە و بۆ لای من ڕەوانەی بکە. کاتێك نامەکەی معاویە گەیشت، کەسانی حوجر ویستیان پشتیوانی لێ بکەن بەڵام حوجر وتی: نا، گوێڕایەڵ بن و ملکەچ.

دەڵێت: بەستیانەوە و بردیانە لای معاویە. کاتێك گەیشت وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سڵاوی خوات لێ بێت.

معاویە وتی: سوێند بەخوا ناتبەخشم.، بیبەن و بیکوژن.

دەڵێت: حوجریان لای معاویە هێنا. حوجر بەو کەسانەی وت کەبۆ کوشتنی ئەو ڕاسپێردرابوون: ڕێگە بدەن دوو ڕەکعەت نوێژ بخوێنم.

وتیان: بیخوێنە.

دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند و نوێژی کورتی خوێند. وتی: ئەگەر جگە لەوەی مەبەستم بوو، گومانی دیکەتان نەدەکرد، حەزم دەکرد نوێژەکەم زیاتر درێژە بکێشێت بەڵام ئەگەر لەنوێژەکانی پێشووم هیچ نەبێت، لەم نوێژەیشدا هیچ نییە. دواتر بەکەسەکانی خۆی وت: زنجیرەکانی من هەڵمەگرن و خوێنەکەم مەشۆنەوە چوونکە بەیانی لەجادە ڕووبەڕووی معاویە دەبمەوە.

دەڵێت: ئەویان هێنایە پێش و سەریان بڕی.

هوشام دەڵێت: کاتێك لەمحەممەد سەبارەت بەغوسلی شەهیدیان دەپرسی، حەدیسی حوجری بۆ ئەوان دەوت.

محەممەد دەڵێت: عایشەی دایکی باوەڕداران چاوی بەمعاویە کەوت...

مەخلەد دەڵێت: گومان دەکەم لەمەککە بوو.

دەڵێت: پێی وت: ئەی معاویە سەبارەت بەحوجر بۆ وەك کەسێکی خۆڕاگر نەبوویت؟

وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، بیرمەندی تۆم نەبوو.

کوڕی سیرین دەڵێت: بیستوومە کاتێك وادەی مەرگی معاویە نزیك کەوتەوە، بەدەنگێك کە لەقوڕگیدا دەمایەوە، دەیوت: ئەی حوجر، ڕۆژێکی درێژم لەگەڵ تۆدا هەیە.

حسەین کوڕی عەبدوڵڵە هەمەدانی دەڵێت: یەکێك بووم لەپاسەوانەکانی زیاد. زیاد وتی: یەکێك بڕوات و حوجر بانگ بکات.

دەڵێت: سەرکردەی پاسەوانەکان شەداد کوڕی هەیسەمی هیلالی پێی وتن: بڕۆ لای حوجر و بانگی بکە.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای حوجر و پێم وت: وەرە بۆ لای ئەمیر.

هاوەڵانی وتیان: نایەت و ڕێزی ئەمیر ناگرێت.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای زیاد و ئاگادارم کردەوە. فەرمانی بەسەرکردەی پاسەوانەکاندا کەسانێك لەگەڵ مندا ڕەوانە بکات.

دەڵێت: چەد کەسێکی لەگەڵ مندا نارد.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای حوجر و پێم وت: وەرە بۆ لای ئەمیر.

دەڵێت: ئێمەیان جوێنباران کرد. بۆ لای زیاد گەڕاینەوە و ئاگادارمان کردەوە.

دەڵێت: زیاد گەورەکانی کوفەی کۆکردەوە و وتی: ئەی خەڵکی کوفە بەدەستێك بریندارم دەکەن و بەدەستێك تیمار. جەستەتان لەگەڵ منە و دڵتان لەگەڵ حوجر، ئێوە لەگەڵ من و برا و منداڵ و عەشیرەکانتان لەگەڵ حوجر، سوێند بەخوا ئەم پیلانە و فێڵبازی ئێوەیە. سوێند بەخوا یا بێ گوناحی خۆتان دەسەلمێنن یا کەسانێك دێنم تا ئێوە بێننە سەر ڕێگەی ڕاست.

کەسانێك هەستان و وتیان: خوا ئاگادارە لێرە جگە لەڕەزامەندی و ملکەچی

فەرمانەکانی تۆ و دژایەتی کردنی حوجر، هیچ مەبەستێکی دیکەمان نییە. سەبارەت بەو فەرمانی خۆت بدە.

وتی: هەرکام لەئێوە پێویستە کەسەکانی خۆتان لەشوێنکەوتنی حوجر پەشیمان بکەنەوە.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد و زۆربەی ئەو کەسانەیان لەحوجر دوورخستەوە. کاتێك زیاد بینی زۆربەی هاوەڵانی حوجر بەجێیان هێشتووە، بەشەداد کوڕی هەیسەمی هیلالی و بەوتەیەك بەهەیسەم کوڕی شەدادی وت: بڕۆ لای حوجر، ئەگەر لەگەڵت هات بیهێنە، جیاواز لەوە فەرمان بەهاوەڵانت بدە ستوونەکانی بازار هەڵکەنن و هێرش بکەنە سەر حوجر و هەرکەس ڕێگری کردن، ڕووبەڕووی ببنەوە.

دەڵێت: هیلالی ڕۆشتە لای حوجر و وتی: وەرە بۆ لای ئەمیر.

هاوەڵانی حوجر وتیان: نایەت.

دەڵێت: هیلالی بەهاوەڵانی خۆی وت: ستوونەکانی بازار هەڵکەنن. هەڵیانکەند و هێنایان. عومەیرە کوڕی یەزیدی کیندی، بەحوجری وت: جگە لەمن کەس لای تۆ نییە کەشمشێری بەدەستەوە بێت و ئەمە بۆ ڕووبەڕووی ئەوان بەس نییە.

وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: لێرە بڕۆ و بگەڕێرەوە بۆ لای کەسەکانت چوونکە ئەوان پشتیوانیت لێدەکەن.

دەڵێت: زیاد کە لەسەر مینبەر بوو، هەستا و سەیری ئەوانی دەکرد کە لەگەڵ ستوونەکان دەگەڕانەوە. یەکێك لەعەجەمەکان بەناوی بەکر کوڕی عوبەید، بەیەکێك لەستوونەکان کێشای بەسەری عەمرۆ کوڕی حەمەق و لەپێی خست. ئەبوسوفیان کوڕی عوەیمر و عەجلان کوڕی ڕەبیعە هاتن و ئەویان هەڵگرت و بردیانە یەکێك لەماڵەکانی ئەزد بەناوی عوبەیداللە کوڕی مالیك و لەوێ شاردیانەوە و بۆ ماوەیەك زۆر لەوێ مایەوە.

عوبەیداللە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەر دەڵێت: کاتێك لەجەنگی باجمیرا

دەگەڕاینەوە (ساڵێك دوای كوژرانی مەسعەب كوڕی زوبەیر) عەجەمێك لەگەڵ مندا بوو. سوێند بەخوا لەو ڕۆژەوەی لەعەمرۆ كوڕی حەمەقیدا بوو، نەمبینیبوو و گومانم نەدەكرد ئەگەر بیبینم دەیناسمەوە. بەڵام كاتێك بینیم دڵنیابووم كەخۆیەتی. ماڵەكانی كوفە دەركەوتبوو و حەزم نەدەكرد لێی بپرسم ئایا تۆ بوویت لەعەمرۆ كوڕی حەمەقتدا؟ چوونكە ئەگەری بوو بەشێوەیەكی توند وەڵامم بداتەوە. پێم وت: لەو ڕۆژەوەی لەمزگەوت بەستوون كێشات بەسەری عەمرۆ كوڕی حەمەقدا، تۆم نەبینیوە بەڵام ئەمڕۆ كاتێك تۆم بینی، ناسیمییەوە.

وتی: خوا چارەكانت بۆ بهێڵێت، كاری شەیتان بوو. بیستبووم كەپیاوێكی خۆپارێزە، لەوەی كەلێمدا پەشیمانم و داوای بەخشین لەخوا دەكەم. پێم وت: ئاگادار نیت، سوێند بەخوا لێت جیانابمەوە تا تۆڵەی عەمرۆت لێ دەكەمەوە، یا من دەمرم یا تۆ دەمری.

وتی: سوێندیدام بەڵام ڕازی نەبووم. كۆیلەكەم بەناوی ڕەشید بانگ كرد (خەڵكی ئیسفەهان بوو) ڕمێكی بەدەستەوە بوو، ڕمەكەم لێوەرگرت تا پەلاماری بدەم. لەچوارپێكەی خۆی دابەزی. كاتێك قاچی خستە سەر زەوی بەڕم كێشام بەسەریدا. كەوت و من بەجێم هێشت و لێی جیابوومەوە. دواجار كەبینیمەوە باش بووبوویەوە. هەموو جارێك پێی دەوتم: خوا لەنێوان من و تۆ داوەری دەكات. منیش پێم دەوت: خوا لەنێوان تۆ و عەمرۆ كوڕی حەمەق داوەری دەكات.

حسەین كوڕی عەبدوللە هەمەدانی دەڵێت: كاتێك عەمرۆ گورزی بەركەوت و ئەو دوو كەسە بردیان، هاوەڵانی حوجر بۆ لای دەروازەكانی كێندە ڕۆشتن. یەكێك لەخەڵكانی جوزام كە لەپاسەوانەكان بوو، بەستون لەكەسێكیدا بەناوی عەبدوڵلە كوڕی خەلیفەی تایی. دەستی عاندا كوڕی حەملەی تەمیمی گورزی بەركەوت و ددانی شكا. ئەویش ستوونی یەكێك لەپاسەوانەكانی هەڵگرت و جەنگی و پشتیوانی لەحوجر و كەسەكانی دەكرد تا ئەوەی لەدەروازەكانی كێندە دووركەوتنەوە. ئێسترەكەی حوجریان لەوێ ڕاگرتبوو. عومەیرە كوڕی یەزیدی كێندی ئێسترەكەی هێنایە پێش و وتی: دوژمنەكەت بێ باوك بێت،

سوێند بەخوا دەکوژرێیت و ئێمەیش لەگەڵ تۆدا دەکوژرێین. حوجر ویستی سوار ئێسترەکە بێت بەڵام نەیتوانی. عومەیرە ئەوی سوار ئێسترەکە کرد و خۆیشی سوار ئەسپەکە بوو. هێشتا نەڕۆشتبوون کەیەزید کوڕی تەریف هات و بەستوونێك کێشای بەڕانی عومەیرەدا. ئەو شمشێری دەرکێشا و کێشای بەسەری یەزیددا. یەزید دواتر باش بوویەوە. ئەمە یەکەم شمشێر بوو بەهۆی جیاوازی خەڵکانم لەکوفە لەکاڵان دەرکێشرا.

دەڵێت: حوجر و عومەیرە ڕۆشتن تا گەیشتنە ماڵی حوجر. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوریان کۆبوونەوە. قەیس کوڕی قەمدانی کێندی سوار لەسەر کەر لەناو کۆڕی خەڵکانی کێندە دەسوڕایەوە و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی خەڵکی حوجر بەرگری بکەن و خۆتان ئامادە بکەن
بۆ ماوەیەك لەبەر براکەتان بجەنگن
کەس لەئێوە لەهاوکاری کردنی حوجر خۆی بەدوور نەگرێت
مەگەر ڕم وەشێن و تیرهاوێژ نین؟
مەگەر سوار و پیادە و قەڵغان بەدەست نین
هیچ شمشێر وەشێنێك دوا نەکەوێت))
بەڵام خەڵکی زۆر کەم لەکێندە لەدەوری حوجر کۆبوونەوە.

دەڵێت: زیاد لەسەر مینبەر دەیوت: خەڵکی هەمەدان و تەمیم و هوازین و کوڕەکانی ئەعسەر و مەزحەج و غەتەفان هەستن و بەرەو گۆڕستانی کێندە بڕۆن و لەوێوە بڕۆنە شوێنی مانەوەی حوجر و بیهێننە لای من.

دواتر لەترسی ئەوەی نەکا تایەفەیەك لەموزێر و تایەفەیەك لەیەمەنییەکان بڕۆن و کێشە لەناویاندا بێتە ئاراوە، وتی: خەڵکی تەمیم و هوازین و مناڵەکانی ئەعسەر و ئەسەد و غەتەفان بمێننەوە و خەڵکی مەزحەج و هەمەدان بڕۆن و حوجر لەگەڵ خۆیان بێنن. خەڵکانی دیکەی یەمەنی بەرەو گۆڕەپانی سایدبین بڕۆن و لەوێوە بڕۆنە لای هاوڕێکەی خۆیان و بیهێننە لای من.

دەڵێت: خەڵکی ئەزد و بوجەیلە و خەسعەم و ئەنسار و خوزاعە و قوزاعە

بەرێکەوتن و ڕوویان لەگۆڕەپانی سایدین کرد. خەڵکی حەزرەمەوت لەگەڵ یەمەنییەکان نەڕۆشتن چوونکە پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ خەڵکانی کێندەدا هەبوو و لەبەر ئەوەی ڕەچەڵەکی هەردووکیان دەگەیشتە یەك کەس، نەیاندەویست لەهێنانی حوجر بەشداری بکەن.

محەممەد کوڕی موخەنیف دەڵێت: من لەگەڵ یەمەنییەکان لەگۆڕەپانی سایدین بووم کەسەرکردەکانی یەمەنی کۆبووبوونەوە و سەبارەت بەحوجر ڕاوێژیان دەکرد. عەبدولڕەحمان کوڕی موخەنیف وتی: پێشنیارێك دەکەم ئەگەر ڕازی بوون، هیوادارم لەگوناح بەدوور بن. بۆچوونی من ئەوەیە ماوەیەك چاوەڕوان بن تا گەنجە ڕووداوخوازەکانی هەمەدان و مەزحەج ئەم کارە لەکۆڵ ئێوە بکەنەوە کەخوازیاری ئەنجامدانی نین.

دەڵێت: لەسەر ئەم کارە ڕێککەوتن.

دەڵێت: سوێند بەخوا زۆری نەخایاند کەسانێك هاتن و وتیان خەڵکانی مەزحەج و هەمەدان ڕۆشتوون و لەگەڕەکی منالەکانی جەبەلە، هەرکەسێکیان بینیبێت، گرتوویانە.

دەڵێت: یەمەنییەکانی دیکە بەناو ماڵەکانی کێندەدا دەگەڕان و سەبارەت بەبێ تاوانی خۆیان دەدوان. ئەم هەواڵە بەزیاد گەیشت و سپاسی خەڵکانی مەزحەج و هەمەدان و سەرکۆنەی یەمەنییەکانی دیکەی کرد.

دەڵێت: کاتێك حوجر گەیشتە ماڵەکەی خۆی و بینی ژمارەیەکی کەمی خەڵکەکەی لەوێ ماونەتەوە و ئاگادار بوویەوە خەڵکانی مەزحەج و هەمەدان لەناو خەڵکی کێندەدا جێگیر بوون و یەمەنییەکانی دیکە لەگۆڕەپانی سایدین کۆبوونەتەوە، بەهاوەڵانی خۆی وت: بڕۆن چوونکە سوێند بەخوا ناتوانن لەبەرابەر ئەو کەسانە خۆڕاگری بکەن کەدژی ئێوە کۆبوونەتەوە و ناخوزام ئێوە لەناو بچن. کاتێك ویستیان بڕۆن، سوارەکانی مەزحەج و هەمەدان دەرکەوتن کەعومەیر کوڕی یەزید و قەیس کوڕی یەزید و عوبەیدە کوڕی عەمرۆی بەدی و عەبدولڕەحمان کوڕی موحریز تومەحی و قەیس کوڕی شیمر ڕووبەڕوویان بوونەوە و جەنگیان دەستپێکرد و چەند ساتێك بەمەبەستی پشتیوانی کردن

لەحوجر جەنگان و بریندار بوون. قەیس کوڕی زەید ئەسیر کرا و ئەوانی دیکە هەڵاتن.

دەڵێت: حوجر بەکەسەکانی خۆی وت: ئەی بێ باوکینە، بڵاوەی لێ بکەن و خۆتان لەجەنگ بەدوور بگرن، من لەیەکێك لەکۆڵانەکانەوە دەڕۆم و خۆم دەگەیێنمە گەڕەکی مناڵەکانی حوت.

دەڵێت: حوجر ڕۆشت تا گەیشتە یەکێك لەماڵەکانی مناڵەکانی حوت بەناوی سەلیم کوڕی یەزید و ڕۆشتە ماڵەکەی. خەڵکەکەی دوای ئەو هاتن و گەیشتنە لای ماڵەکە. سەلیم کوڕی یەزید شمشێرەکەی هەڵگرت و بەڕێکەوت تا بڕواتە لای ئەوان. کچەکانی گریان. حوجر پێی وت: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: سوێند بەخوا پێیان دەڵێم دەست لەتۆ هەڵگرن و ئەگەر ڕازی نەبوون، بەم شمشێرە بەرگری لەتۆ دەکەم.

حوجر وتی: دوژمنەکەت بێ باوك بێت، بەڵایەکی گەورەم پێشکەش بەکچەکانت کرد.

وتی: ڕۆژی و بژێوی ئەوان لەدەستی زیندوویێکدایە کەنەمرێت، من هیچ کات بەنەنگ و ڕیسوایی ڕازی نابم، تۆ لەماڵەکەی مندا بەئەسیری ناڕۆیت.

حوجر وتی: لەماڵەکەی تۆدا دیوارێك نییە من لێوەی بڕۆم یا دەلاقەیەك، ئەگەری هەیە خواوەند بمپارێزێت و تۆیش تەندروست بیت چوونکە ئەگەر پێش تۆ دەستیان بەمن نەگات، زیانت لێ نادەن.

وتی: لێرە دەلاقەیەك هەیە کەتۆ دەباتە ماڵی مناڵەکانی ئەلعەنبەر و کەسانێکی دیکە لەتایەفەکەت.

دەڵێت: حوجر بەڕێکەوت و گەیشتە لای مناڵەکانی زوهەل کەپێیان وت: چەند ساتێك لەمەوبەر دەستەیەك کەبەدوای تۆدا دەگەڕان، لێرەوە گوزەریان کرد.

وتی: منیش لەدەستی ئەوان ڕادەکەم.

دەڵێت: ڕۆشت و چەند گەنجێك لەمناڵەکانی زوهەل لەگەڵیدا ڕۆشتن و ڕێگەیان نیشاندەدا. ئەویان لەناو کۆڵانەکانەوە برد تا گەیشتنە گەڕەکی نەخەع.

لەم کاتەدا حوجر پێی وتن: خواتان لێ ڕازی بێت، بگەڕێنەوە. ئەوان گەڕانەوە.

حوجر بەرەو ماڵی عەبدوڵڵە کوڕی حارس برای ئەشتەر ڕۆشت و چووە ژوور. عەبدوڵڵە فەرشی ڕاخستبوو و سفرەیەکی ڕازاندبوویەوە. خۆشحاڵ و شادومان میوانداری حوجری کرد کەیەکێك هات و وتی: پاسەوانەکان لەگەڕەکی نەخەع بەدوای تۆدا دەگەڕێن. هۆکارەکەی ئەوە بوو کەنیزێکی ڕەش بەناوی ئەدما ئەوانی بینیبوو و پرسی بووی، بەدوای کێدا دەگەڕێن؟

وتبوویان: بەدوای حوجردا دەگەڕێن.

وتی: لێرەیە، من لەگەڕەکی نەخەع بینیم. ئەوانیش بەرەو گەڕەکی نەخەع هاتبوون.

حوجر بەشێوەیەکی نەناسیاو ماڵی عەبدوڵڵەی بەجێهێشت و عەبدوڵڵە لەگەڵ ئەو سوار بوو و لەکاتی شەودا ڕۆشتنە ماڵی ڕەبیعە کوڕی ناجدی ئەزدی لەگەڕەکی ئەزد. حوجر شەو و ڕۆژێك لەوێ مایەوە.

دەڵێت: کاتێك لەگرتنی حوجر ناتەوان بوون، زیاد، محەممەد کوڕی ئەشعەسی بانگکرد و پێی وت: ئەی باوکی مەیسا، سوێند بەخوا یا حوجر دەهێنیتە لای من، یا هەموو دارخورماکانت دەبڕمەوە و ماڵەکانت وێران دەکەم و خۆیشت لەت لەت دەکەم.

وتی: مۆڵەتم پێبدە تا بەدوایدا بگەڕێم.

وتی: سێ ڕۆژ مۆڵەتت پێدەدەم، ئەگەر حوجرت هێنا چ باشتر، جیاواز لەوە خۆت لەناو دەچیت.

دەڵێت: محەممەدیان بەرەو زیندان برد، ڕەنگ بەڕوخسارییەوە نەمابوو، بەدژواری هەنگاوی هەڵدەگرت.

حوجر کوڕی یەزیدی کێندی بەزیادی وت: کەسێك وەك دەستەبەری ئەو دیاریبکە و ڕێگەی بدە بڕوات تا بەدوای هاوڕێکەیدا بگەڕێت چوونکە ئەگەر ئازاد بێت باشتر دەتوانێت بیدۆزێتەوە.

وتی: دەبیتە دەستەبەری.

وتی: بەڵێ.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بڕوات، تۆ لەناو دەبەم، هەرچەند لەئێستادا لای من کەسێکی ڕێزداریت.

وتی: ئەو کارە ناکات.

زیاد ئەوی ئازاد کرد.

دەڵێت: دوای ئەوەی حوجر کوڕی یەزید سەبارەت بەقەیس کوڕی یەزید قسەی لەگەڵ زیاد کرد، وتی: کاری قەیس دژوار نییە، بۆچوونی ئەو سەبارەت بەعوسمان دەزانین چوونکە لەجەنگی سەفین لەسوپای سەروەری باوەڕداراندا بوو.

دەڵێت: دواتر کەسیان نارد و قەیسیان هێنا و پێی وت: دەزانم لەبەر ئەوە هاوکاری حوجرت نەکرد کەهاوبۆچوونی ئەو بیت بەڵکو بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی بووە، لەباوەڕی ڕاستی تۆ و تێکۆشینی تۆ ئاگادارم بەلام ڕزگارت ناکەم تا عومەیری برات دەهێنیت.

وتی: بەخواستی خواوەند دەیهێنم.

وتی: کەسێك بێنە کەدەستەبەری تۆ و ئەو بێت.

وتی: حوجر کوڕی یەزید.

حوجر کوڕی یەزید وتی: ڕازیم بەو مەرجەی سامان و خوێنی ئەو پارێزراو بێت.

وتی: سامان و خوێنی ئەو پارێزراوە.

دەڵێت: ڕۆشتم و عومەیری بریندداریان هێنا. زیاد فەرمانیدا بەئاسن بیبەستنەوە. دواتر کەسانێك ئەویان دەگرت و بەرزیان دەکردەوە و کاتێك تا لای ناوکیان بەرزیان دەکردەوە، بەرەڵایان دەکرد. چەند جارێك ئەم کارەیان دووبارە کردەوە.

حوجر کوڕی یەزید هەستا و وتی: ئەی ئەمیر، خوا تەندروستیت پێ ببەخشێت، مەگەر ئەمانت بەخوێن و سامانی ئەو نەبەخشی.

وتی: بۆنا، بەڵێنی پاراستنی خوێن و سامانی ئەومدا بەلام خوێنی نارێژم و سامانەکەی زەوت ناکەم.

وتی: خوا بتبەخشێت، تا سەرەمەرگ ئازابی دەدەن. ئەمەی وت و لێی نزیک کەوتەوە. یەمەنییەکان کە لەوێ بوون، هەستان و ڕۆشتنە لای زیاد و قسەیان لەگەڵ کرد کەوتی: بەڵێن دەدەن ئەگەر کارێکی نەشیاوی ئەنجامدا بیهێننە لای من.

وتیان: بەڵێ.

وتی: قەرەبووی ئەو زڵلەیە دەکەنەوە کە لەموسولای داوە؟

وتیان: بەڵێ.

زیاد ئازادی کرد.

دەڵێت: حوجر کوڕی عودەی شەو و ڕۆژێک لەماڵی ڕەبیعە کوڕی ناجدی ئەزدی مایەوە. دواتر کۆیلەکەی خۆی بەناوی ڕەشید لەخەڵکانی ئیسفەهان بۆ لای محەممەد کوڕی ئەشعەس نارد و پێی ڕاگەیاند: دەزانم ئەو ستەمکارە چ بەڵایەکی بەسەر تۆدا هێناوە، نیگەران مەبە، من دێمە لای تۆ.

چەند کەسێک لەخەڵکەکەی خۆت هەڵبگرە و بڕۆ لای زیاد و داوای لێبکە ئەمان بەمن بدات و ڕەوانەی دەرباری معاویەم بکات تا لێکۆڵینەوە لەکارەکانی من بکات.

دەڵێت: زیاد ئەو کارەی کرد و نێردراوی حوجریان بۆ لای ئەو نارد و ئاگاداریان کردەوە کەئەمانمان وەرگرتووە با بێت. حوجر ڕۆشتە لای زیاد کەپێی وت: باوکی عەبدوڵڵە، دەستخۆش، جەنگ لەڕۆژگاری جەنگ و جەنگ لەکاتی ئاشتی؟

کردەوەی نەشیاوی کەسێک دەبێتە هۆی لەناو چوونی کەسەکانی.

وتی: سەرپێچی فەرمانەکانم نەکردووە و لەخەڵکان جیانەبوومەتەوە و ڕێزم لەبەیعەتەکەی خۆم گرتووە.

وتی: ئەی حوجر، هەرگیز، بەدەستێک بریندار دەکەیت و بەدەستێک تیمار و دەتەوێت کاتێک خواوەند تۆی تەسلیم بەئێمە کرد، هەمووان ببەخشین، هەرگیز!

وتی: مەگەر ئەمانت پێنەبەخشیوم کەرەوانەی لای معاویەم بکەیت تا ئەو لێکۆڵینەوە لەکارەکانی من بکات؟

وتی: بەڵێ، ئەمانمان پێداویت، بیبەن بۆ زیندان.

دەڵێت: کاتێك ئەویان لای زیاد برد، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر ئەمان بەخشینەکە نەدەبوو، زیندوو ئێرەی بەجێنەدەهێشت.

عەوانە دەڵێت: زیاد وتی: سوێند بەخوا ئارەزوومەندم شانەمارەکەی ببڕن.

شەعبی دەڵێت: کاتێك حوجریان لای زیاد برد، هاواری کرد: خواوەندا لەسەر بەیعەتەکەی خۆم ماوم و نامەوێت بیشکێنم و نامەوێت بیشکێنن، خوا و خەڵك دەبیستن. کڵاوێکی درێژی لەسەردابوو، بەرەبەیانێکی سارد بوو. دە ڕۆژ لەزیندان مایەوە. لەم دەڕۆژەدا زیاد بەدوای شوێنکەوتەکانی حوجردا دەگەڕا.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەمەق و ڕەفاعە کوڕی شەداد ڕۆشتن تا گەیشتنە مەداین و لەوێوە ڕێگەی سەرزەمینی موسڵیان گرتەبەر و لەچیایەك خۆیان شاردەوە. کارگوزاری گوندەکە ئاگادار بوویەوە کەدوو کەس لەچیاکەدا خۆیان حەشارداوە. ئەو لەخەڵکانی هەمەدان بوو بەناوی عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی بەلتەعە. لەکارەکەی ئەوان سەریسوڕما و لەگەڵ چەند سوارێك بەرەو چیاکە ڕۆشت. خەڵکی گوندەکەیشی لەگەڵدا بوو. کاتێك نزیك بوونەوە، هەردووکیان هاتن. عەمرۆ کوڕی حەمەق نەخۆش بوو، سکی ئاوی هەڵێنابوو و توانای خۆڕاگری کردنی لەخۆیدا نەدەبینی. بەڵام ڕەفاعە کەگەنجێکی بەهێز و بوێر بوو، سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و بەعەمرۆی وت: بۆ بەرگری کردن لەتۆ دەجەنگم.

وتی: جەنگی تۆ هیچ سوودێك بەمن ناگەیەنێت، ئەگەر دەتوانی خۆت ڕزگار بکە.

ڕەفاعە هێرشی کردە سەریان کەڕێگەیان بۆ کردەوە و ڕۆشت. ئەسپەکەی ئەوی برد و سوارەکان شوێنی کەوتن. ئەو تیرهاوێژێکی شارەزا بوو. هەر سوارێك لێی نزیك دەبویەوە، تیری بۆ دەهاویشت کەبریندار ددبوو یا دەکوژرا و لەشوێنکەوتنی ئەو پەشیمان دەبوویەوە. عەمرۆ کوڕی حەمەقیان گرت و لێیان پرسی: تۆ کێیت؟

وتی: کەسێك کەئەگەر ئازادی بکەن بۆ ئێوە باشترە و ئەگەر بیکوژن، زیانتان پێ دەگات.

دەڵێت: دووباره لێیان پرسی بەڵام هیچی نەوت. کوڕی باوکی بەلتەعە ئەوی بۆی لای کارگوزاری موسڵ نارد کەعەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵەی سەقەفی بوو. عەبدولڕەحمان کاتێک ئەوی بینی، ناسییەوە و معاویەی لەبەسەرهاتی ئەو ئاگادار کردەوە.

معاویە نووسی: عەمرۆ وتوویەتی بەتیرەکانی خۆی، نۆ جار لەعوسمان کوڕی عەفانیداوە، ئێمە نامانەوێت دەستدرێژی بکەینەسەر، نۆجار بەتیر لێی بدە بەهەمان ئەندازە کە لەعوسمان کوڕی عەفانی داوە.

دەڵێت: عەمرۆیان هێنا و نۆ جار لێیاندا. لەجاری یەکەم یا دووەمدا مرد.

کوری ئیسحاق دەڵێت: زیاد دەستەیەکی بۆ گرتنی شوێنکەوتەکانی حوجر ڕەوانە کرد. ژمارەیەکیان هەڵاتن وئەوانی دیکە گیران. سەرکردەی پاسەوانەکان، شەداد کوڕی هەیسەمی بۆ لای قەبیسە کوڕی زوبەیعە نارد. قەبیسە لەناو خەڵکەکەی خۆی جارِیدا و شمشێری هەڵگرت. ڕەبعی کوڕی خەڕاش و دەستەیەك لەخەڵکەکەی هاتن. ژمارەیان زۆر نەبوو. دەیویست بجەنگێت. سەرکردەی پاسەوانەکان پێی وت: گیان و سامانی تۆ پارێزراوە، بۆ خۆت بەکوشتن دەدەیت؟

هاوەڵانی وتیان: کاتێك ئەمانت پێ بەخشراوە، بۆخۆت و ئێمە بەکوشتن دەدەیت؟

وتی: سوێند بەخوا ئەم بێ باوکە، خراپەکارە. سوێند بەخوا ئەگەر بمگرێت، ڕزگارم نابێت و دەمکوژێت.

وتیان: هەرگیز. خۆی تەسلیم بەوان کرد و بردیانە لای زیاد کەوتی: خەڵکی عەبەس سەبارەت بەکاروباری دین ڕووبەڕووی من بوونەوە. سوێند بەخوا بەشێوەیەك گرفتاری خۆتت دەکەم کە لەئاژاوەنانەوە و شۆڕش دژی فەرمانڕەواکان چاوپۆشی بکەیت.

وتی: من ئەمانم پێ بەخشراوە و هاتوومەتە لای تۆ.

وتی: زیندانی بکەن.

دەڵێت: قەیس کوڕی عیبادی شەیبانی هاتە لای زیاد و وتی: یەکێك لەئێمە

لەتیرەی منداڵەکانی هومام بەناوی سەیفی کوڕی فەیسەڵ لەشوێنکەوتەکانی حوجرە و بۆ دژایەتی کردنی تۆ لەهەمووان پێداگرترە.

زیاد کەسی نارد و ئەویان هێنا و پێی وت: ئەی دوژمنی خوا سەبارەت بەباوکی توراب چی دەڵێیت؟

وتی: باوکی توراب ناناسم.

وتی: باش دەیناسیت.

وتی: نایناسم.

وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناناسیت؟

وتی: بۆنا.

وتی: باوکی توراب ئەوە.

وتی: نە، ئەو باوکی حەسەن و حسەینە.

سەرکردەی پاسەوانەکان وتی: ئەمیر دەڵێت ئەو باوکی تورابە و تۆ دەڵێی نا.

وتی: ئەگەر ئەمیر درۆ بکات، دەخوازیت منیش درۆ بکەم و وەك ئەو شایەتی ناڕەوا بدەم.

زیاد وتی: لەگەڵ ئەوەی گوناحکاریت، بەو شێوەیە قسە دەکەیت! داردەستەکەم بێنن.

کاتێك داردەستیان هێنا، وتی: چی دەڵێیت؟

وتی: باشترین وتەیەك کەسەبارەت بەیەکێك لەبەندەکانی خوا دەیڵێم.

وتی: بەدار لەپشتی بدەن تا دەکەوێتە سەر زەوی.

دەڵێت: لێیاندا تا کەوتە سەرزەوی.

دواتر وتی: دەستی لێ هەڵگرن، سەبارەت بەعەلی چی دەڵێیت؟

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بەکێرد و شمشێر لەت لەتم بکەیت، جگە لەوەی بیستووتە، هیچی دیکە ناڵێم.

وتی: دەبێت نفرینی بکەیت جیاواز لەوە دەتکوژم.

وتی: کەواتە دەبێت بمکوژیت چوونکە ئەگەر لەسەر کوشتنی من پێداگر بیت، بەکارەکانی خواوەند ڕازیم و تۆ بەدبەخت دەبیت.

زیاد وتی: سەری بڕن. دواتر وتی: بەزنجیر بیبەستنەوە و زیندانی بکەن.

دەڵێت: دوای کەسی بەدوای عەبدوڵڵە کوڕی خەلیفەی تایی نارد کەهاوڕێی حوجر و بۆ پشتیوانی کردنی ئەو جەنگابوو. بوکەیر کوڕی حیمرانی ئەحمەری کەیاریدەدەری کارگوزارەکان بوو، بۆ لای ئەو نارد و چەند کەسێك لەهاوەڵانی خۆی کردە هاوڕێی. بەدوای عەبدوڵڵەدا ڕۆشتن و ئەویان لەمزگەوتی عودەی کوڕی حاتەم دۆزییەوە و هێنایانەدەر. ئەو کەپیاوێکی بوێر بوو، ڕووبەڕوویان بوویەوە و خۆڕاگری کرد و سەرئەنجام بریندار بوو. بەڕادەیەك بەردیان پیاکێشا کە لەپێ کەوت. مەیسای خوشکی هاواری کرد: ئەی خەڵکانی تەی، کوڕی خەلیفە تەسلیم دەکەن کەزمان و ڕمی ئێوەیە.

کاتێك ئەحمەری هاواری مەیسای بیست، ترسا خەڵکی تەی دژی ئەو کۆببنەوە و بکوژرێت. هەڵات و دەستەیەك لەژنانی تەی هاتن و کوڕی خەلیفەیان بردەوە بۆ ماڵ. ئەحمەری گەڕایەوە بۆ لای زیاد و وتی: خەڵکی تەی دژی من کۆبوونەوە و نەمتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکەم و گەڕاعەوە.

دەڵێت: زیاد کەسی نارد و عودەیان لەمزگەوتەکەدا گرت و هێنایان. ئەوی زیندانی کرد و وتی: کوڕی خەلیفە بێنە.

وتی: چۆن کەسێك بێنم کەکوشتوویان؟

وتی: بیهێنە با بزانم کوژراوە.

بەڵام عودەی خۆی لەڕاستییەکان دەشاردەوە و وتی: نازانم لەکوێیە و چی کردووە.

زیاد ئەوی لەزینداندا هێشتەوە. لەشارەکە لەخەڵکانی یەمەن و ڕەبیعە و موزێر کەس نەمایەوە لەکارەکانی عودەی پەرێشان نەبێت. ڕۆشتنە لای زیاد و سەبارەت بەو قسەیان کرد.

عەبدوڵڵە کوڕی خەلیفەیان نەبرد و ماوەیەك بەنهێنی ژیانی بەسەر دەبرد. دواتر کەسی بۆ لای عودەی نارد و پێی وت ئەگەر دەخوازیت دێم و دەست دەخەمە ناو دەستی تۆ.

عودەی پەیامی بۆ ناردەوە کەسوێند بەخوا ئەگەر لەژێر قاچی مندا دەبوویت،

قاچم هەڵنەدەگرت. دواتر زیاد، عودەی بانگکرد و وتی: ئازادت دەکەم بەو مەرجەی بەڵێن بدەیت عەبدوڵڵە لەکوفە دوور بخەیتەوەو بەرەو دوو چیای بنێریت.

وتی: ئەو کارە دەکەم. کاتێك گەڕایەوە کەسی بۆ لای عەبدوڵڵە نارد تا بڕوات و وتی: هەرکات زیاد هێور بوویەوە، سەبارەت بەتۆ قسەی لەگەڵ دەکەم تا بگەڕێیتەوە. عەبدوڵڵە ڕۆشت.

دەڵێت: کەریم کوڕی عەفیفی خەسعەمییان بردە لای زیاد کەپێی وت: ناوت چییە؟

وتی: کەریم کوڕی عەفیف.

وتی: هاوار لەتۆ، ناوی خۆت و ناوی باوکت جوانە، بەلاّم باوەڕ و بۆچوونەکەت خراپ.

وتی: سوێند بەخوا تازە لەبۆچوونی من ئاگادار بوویتەوە.

دەڵێت: زیاد کەسانێکی بۆ گرتنی هاوەڵانی حوجر کوڕی عودەی نارد و دوانزەکەس لەوانی لەزیندان کۆکردەوە. دواتر سەرکردەی چوار ناوچەی بانگکرد و وتی: سەبارەت بەکارەکانی حوجر شایەتی بدەن.

دەڵێت: لەو کاتەدا سەرکردەی چوارناوچەکە ئەم کەسانە بوون:

عەمرۆ کوڕی حورەیس سەرکردەی خەڵکانی ناوشار.

خالید کوڕی عەرەفتە سەرکردەی خەڵکانی تەمیم و هەمەدان.

قەیس کوڕی وەلید کوڕی عەبدشەمس سەرکردەی خەڵکانی ڕەبیعە و کێندە.

ئەبو بەردە کوڕی ئەبوموسا سەرکردەی خەڵکانی مەزحەج و ئەسەد.

دەڵێت: ئەم چوارەکەسە شایەتییاندا کەحوجر خەڵکانی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە و بەئاشکرا ئیهانەی خەلیفەی کردووە و بۆ جەنگی سەروەری باوەڕداران هانی داون و گومان دەکات خەلافەت ماف ڕەوای بنەماڵەی ئەبوتالیبە. لەشارەکەدا ئاژاوەی ناوەتەوە و کارگوزاری سەروەری باوەڕدارانی دەرکردوە و باوکی توراب بەڕاست دەزانێت و سلاّوات و ڕەحمەت بۆ ئەو دەنێرێت و بێزاری خۆی لەدوژمنەکانی دەردەبڕێت. ئەم کەسانەی ئێستا لەزیندانەدان،

شوێنکەوتەکانی ئەون و بۆچوونیان هاوشێوەی بۆچوونی ئەوە.

دواتر زیاد فەرمانیدا حوجر و شوێنکەوتەکانی ببەن. قەیس کوڕی وەلید هاتە پێش و وتی: بیستوومە ئەگەر ئەمانە ببەن، کەسانێك ڕێگەتان لێدەگرن. زیاد کەسی بۆ بازار نارد و وشتری تیژپێی کڕی و سەرەتای ڕۆژ ئەوانی لەگۆڕەپانی (رەحبە) کۆکردەوە و سواری کردن و کاتێك شەو داهات، وتی: هەرکەس دەخوازێت، ڕێگری بکات، بەڵام کەس ورتەی نەکرد.

دەڵێت: زیاد شایەتی شایەتحاڵەکانی بینی و وتی: ئەم شایەتییە بەبەسەندە نازانم، دەمەوێت شایەتحاڵەکان زیاتر لەچوارکەس بن.

باوکی ئەلکنود دەڵێت: شایەتییەك بەمشێوە بوو:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

ئەم شایەتییەکە کە ئەبو بەردە، لەپێشگای خواوەند، پەروەردگاری جیهانیان دەیدات: شایەتی حوجر کوڕی عودەی سەرپێچی دەکات و لەخەڵکان جیابۆتەوە و نفرینی خەلیفەی کردووە و بانگەشەی ئاژاوە و فیتنە دەکات، خەڵکان لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و بۆ شکانی بەیعەت و لەسەر کار لابردنی سەروەری باوەڕداران هانیان دەدات))

زیاد وتی: بەمشێوەیە شایەتی بدەن. سوێند بەخوا هەوڵ دەدەم شادەماری ئەم نەزانە بەمزوانە ببڕدرێت.

دەڵێت: سەرکردەی ناوچەکان کەچوار کەس بوون، هاوشێوەی ئەبوبەردە شایەتییاندا. دواتر زیاد کەسانێکی بانگکرد و وتی: هاوشێوەی ئەو چوار سەرکردە شایەتی بدەن. نامەکەیان بۆ ئەوان خوێندەوە. یەکەم کەس کەهەستا، عوناق کوڕی شورەحبیلی تەمیمی بوو کەوتی: ناوی من بنووسن.

زیاد وتی: لەناوی قورەیشییەکانەوە دەست پێبکەن. دواتر ناوی عوناق لەپێرسی شایەتحاڵەکاندا بنووسن کەخۆڕاگری و چاکەخوزای ئەو دەزانین و سەروەری باوەڕدارانیش لێی ئاگادارە.

دەڵێت: ئیسحاق کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە و مونزەر کوڕی زوبەیر و عەمارە کوڕی عەقبە کوڕی باوکی موعیت و عەبدولڕەحمان کوڕی هوناد و

عومەر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عامیر کوڕی مەسعود کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف و موحریز کوڕی جاریە کوڕی ڕەبیعە کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی عەبدشەمس و عوبەیداللە کوڕی موسلیم کوڕی شەعبەی حەزەرمی و عوناق کوڕی شورەحبیل و وائیل کوڕی حوجری حەزەرمی و کەسیر کوڕی شەهاب کوڕی حەسینی حارسی و قوتب کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسین شایەتییاندا.

شایەتی سەری کوڕی وەقاسی حارسیشیان نووسی بەڵام خۆی لەوێ نەبوو. سایب کوڕی ئەقرەعی سەقەفی و شەبیب کوڕی ڕیبعی و عەبدوللە کوڕی باوکی عەقیلی سەقەفی و مەسقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی و شەعقاع کوڕی شَوری زوهەلیش شایەتییاندا.

شەداد کوڕی مونزەری زوهەلیش شایەتیدا کە بەکوڕی بوزەیعە ناویان دەبرد.

زیاد وتی: ئەمە باوکی نییە، ناوی لەپێرستی شایەتحاڵەکان بسڕنەوە.

وتیان: ئەو برای حەسینە و کوڕی مونزەر.

وتی: کەواتە ناوی باوکی بنوسن.

دەڵێت: شەداد ئەمەی بیست و وتی: هاوار لەو دایك خراپە، مەگەر باوکی لەدایکی ناسراوتر نییە، سوێند بەخوا ڕەچەڵەکی ئەو بۆ سومەییەی دایکی دەگەڕێتەوە.

دەڵێت: حەجار کوڕی ئەبجەری عیجلیش شایەتیدا.

دەڵێت: خەڵکانی ڕەبیعە لەو کەسانە توڕە بوون کە لەتایەفەی ڕەبیعە شایەتییاندا و وتیان: بۆ دژی هاوڕێیان و هاوپەیمانەکانی ئێمە شایەتیتاندا.

وتیان: ئێمەش وەك ئەم خەڵکەین. کەسانێکی زۆر دژی خەڵکەکەی خۆیان شایەتییانداوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی و لوبەید کوڕی عەتارد و محەممەد کوڕی عومەیر کوڕی عەتارد و سوەید کوڕی عەبدولڕەحمان، هەرسێکیان تەمیمی، و ئەسما کوڕی خاریجەی فەزاریش شایەتییاندا.

ئەسما لەکارەکەی پەشیمان بوویەوە.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەنی عامری و شەداد و مەروان کوڕەکانی

هەیسەم، هەردووکیانی هیلالی، و موحسن کوڕی سەعلەبە لەپەنابەرانی قوڕەیش و هەیسەم کوڕی ئەسوەدی نەخەعی (پەشیمان بووبوویەوە) و عەبدولڕەحمان کوڕی قەیسی ئەسەدی و حارس و شەداد، کوڕەکانی ئەزمەع کەهەردووکیان هەمەدانی وادعی بوون و کورەیب کوڕی سەلمە و عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی سیر و زەحر کوڕی قەیس هەرسێکیان جوعەفی و قودامە کوڕی عیجلانی ئەزدی و عەزرەت کوڕی عەزرەی ئەحمەسیش شایەتییاندا.

دەڵێت: داوای لەموختار کوڕی باوکی عوبەیدە و عوروە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبە کرد شایەتی بدەن بەڵام بەفێڵ خۆیان لەم کارە بەدوور گرت.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی قەیس زوولەحییە و هانی کوڕی ئەبی حەییە، هەردووکیان وادعی، شایەتییاندا. نزیکەی حەفتاکەس شایەتییاندا. زیاد وتبووی: ئەو کەسانەی ناوبانگییان نییە یا وەك کەسیکی چاکەکاری و خۆپارێز نەناسراون، لەپێرستەکەدا مەنووسن. کەسانێکیان لەپێرستەکەدا سڕییەوە و ئەم ژمارەیە ماوەتەوە. شایەتی عەبدوڵلە کوڕی حەجاجی تەغلەبییان سڕییەوە.

دەڵێت: شایەتی ئەم کەسانەیان لەلاپەڕەیەکدا نووسی و زیاد تەسلیمی وائیل کوڕی حوجری حەزەرمی و کەسیر کوڕی شەهابی حارسی کرد و ئەوانی لەگەڵ زیندانییەکان نارد.

دەڵێت: لەناو شایەتحاڵەکان، شوریەحی قازی، کوڕی حارس و شورەیح کوڕی هانییان نووسی. شورەیحی قازی دەیوت: سەبارەت بەحوجر لەمنی پرسی و وتم کەسێکە بەڕۆژوو دەبێت و شەوانە ناخەوێت. شورەیح کوڕی هانی دەیوت: من شایەتیم نەداوە بەڵام بیستوومە شایەتی منیان نووسیوە کەحاشام لێکرد و سەرکۆنەی زیادم کرد.

دەڵێت: وائیل کوڕی حوجر و کەسیر کوڕی شەهاب هاتن و شەوانە ئەوانیان برد. سەرکردەی پاسەوانەکانیش لەگەڵیان ڕۆشت تا لەکوفە دووری خستنەوە. کاتێك گەیشتنە گۆڕەپانی عەزرەم، سەیریماڵی قەبیزە کوڕی زەبیعەی عەبەسی کرد و کچەکانی خۆی بینی کەهاتبوونە سەر بانەکە، بەوائیل و کەسیری وت: ڕێگەم بدەن وەسیەت بۆ بنەماڵەکەم بکەم. کاتێك لەوان نزیکە کەوتەوە، دەگریان،

ماوەیەك بێدەنگ بوو، دواتر وتی: بێدەنگ بن، بێدەنگ بوون. وتی: لەخوا بترسن و خۆڕاگر بن چوونکە لەم ڕێگەدا، لەخواوەندا چاوەڕوانی دوو شتم: یا شەهادەت کەبەختەوەرییە یا گەڕانەوە بۆ لای ئێوە بەتەندروستی. بەڵام ئەو کەسەی ڕۆژی بەئێوە دەدا و خەرجی ئێوەی لەئەستۆدا بوو، خواوەندە کەزیندووی نەمرە و هیوادارم پشتگوێتان نەخات و ڕێزی من لای ئێوە بپارێزێت.

دەڵێت: بەڕێکەوت و لای خەڵکەکەی گوزەری کرد. دۆعایان بۆ کرد و وتی: بەبۆچوونی من بەفیڕۆچوونی باوەڕی خەڵکەکەم گرنگتر لەحاڵی ئێستای منە.

دەیوت: هاوکاری منیان نەکرد چوونکە چاوەڕوانبوو، ڕزگاری بکەن.

عوبەیدالله کوڕی حەرجوعفی دەڵێت: من لەبەردەم ماڵی کوڕی ئەبی وەقاسدا وەستابووم کەحوجر و هاوەڵەکانیان هێنا. وتم: دەکەس نییە بەهاوکاری ئەوان ڕزگاریان بکەم، پێنج کەس نییە؟

عوبەیدالله بەداخەوە دەیوت: کەس وەڵامی منی نەدایەوە.

دەڵێت: ئەوانیان برد تا گەشتنە غەرییین. شورەیح کوڕی هانی پێیان گەیشتەوە کەنامەیەکی پێبوو، بەکەسیری وت: ئەم نامەیە بۆ سەروەری باوەڕدارانە.

وتی: چی تیا نوسراوە.

وتی: مەپرسە، نیازی من لەو نامەدایە.

بەڵام کەسیر ڕازی نەبوو و وتی: نامەوێت نامەیەك تەسلیم بەسەروەری باوەڕداران بکەم کەنازانم چی تیا نووسراوە و ئەگەری هەیە لەگەڵ بۆچوونەکانی من یەکنەگرێتەوە.

دەڵێت: نامەکەی بۆ لای وائیل کوڕی حوجر برد و ئەو، بەڵێنی پێدا نامەکەی بگەیەنێت.

دەڵێت: ڕۆشتن و گەیشتنە مەرجی عوزرا. لەوێوە تا دیمەشق دوانزە میل ڕێگە بوو.

## ناوی ئەو کەسانەی زیاد بۆلای معاویەی نارد

حوجر کوڕی عودەی کوڕی جەبەلە و ئەرقەم کوڕی عەبدوڵڵە هەردووکیان کێندی لەمناڵەکانی ئەرقەم.

شەریك کوڕی شەدادی حەزەرمی، سەیفی کوڕی فوسەیل، قەبیسە کوڕی زەبیعە کوڕی حەرەملەی عەبەسی، کەریم کوڕی عەفیفی خەسعەمی لەمناڵەکانی عامر کوڕی شەهران لەتیرەی قەحافە.

عاسم کوڕی عەوف و وەرقا کوڕی سەمی هەردووکیان بیجلی.

کەدام کوڕی حەییان وعەبدولڕەحمان کوڕی حەسان، هەردووکیان عەنزی لەمناڵەکانی هومەیم.

موحریز کوڕی شەهابی تەمیمی لەمناڵەکانی مەنقەر.

عەبدوڵلە کوڕی حەویەی سەعدی لەمناڵەکانی تەمیم.

ئەمانەیان لەمەرج عوزرا هێشتەوە.

زیاد، عەتبە کوڕی ئەخنەسی سەعدی هوازینی و سەعد کوڕی غەزانی هەمەدانی ناعتی لەگەڵ عامر کوڕی ئەسوەد عیجلی بەدوای ئەو دەستەیەدا نارد کەهەموویان بوونە چواردەکەس.

دواتر معاویە کەسی بۆ لای وائیل کوڕی حوجر و کەسیر کوڕی شەهاب نارد و ئەوانی بانگکرد. نامەکەی ئەوانی کردەوە و بۆ خەڵکی شامی خوێندەوە کەنووسرابوو:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بۆ بەندەی خوا معاویە، سەروەری باوەڕداران، لەزیاد کوڕی ئەبی سوفیان. خواوەند ئەزمونێکی شیاوی خستە بەردەم سەروەری باوەڕداران کەدژی دوژمنەکەی ڕێگەچارەی دۆزییەوە و ئەرکی یاخییەکانی لەسەر شانی هەڵگرت. یاخییەکان لەشوێنکەوتەکانی باوکی توراب و سەبائییەکان کەسەرکردەکەیان حوجر کوڕی عودەی بوو و دژایەتی سەروەری باوەڕدارانیان دەکرد و لەموسوڵمانان جیابوونەوە و جەنگیان دژی ئێمە دەستپێکرد. خواوەند

سەرکەوتنی بەئێمە بەخشی و بەسەر ئەواندا زاڵبووین. داوامان لەچاکەکاران و خۆپارێزانی شارەکەمان کرد کەشایەتی کردەوەکانی ئەوان بدەن. ئەوانمان بۆ لای سەرووەری باوەڕداران ڕەوانە کرد. شایەتی چاکەکاران و کەسە بەناوبانگەکانی کوفەمان لەخوارەوەی نامەکەدا نووسیوە)).

کاتێک نامە و شایەتی شایەتحاڵەکان خوێنرایەوە، وتی: سەبارەت بەم کەسانە کەخەڵکەکەیان دژی ئەوان شایەتییانداوە، بۆچوونتان چییە؟

یەزید کوڕی ئەسەدی بیجلی وتی: بۆچوونی من ئەوەیە لەگوندەکانی شامدا بڵاویان بکەیتەوە تا سەرکێشەکان و یاخییەکان لەناویان ببەن.

وائیل کوڕی حوجر نامەکەی شورەیح کوڕی هانی تەسلیم بەمعاویە کرد کەخوێندییەوە. نووسرابوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بۆ بەندەی خوا معاویە، سەرووەری باوەڕداران لەشورەیح کوڕی هانی. بیستوومە کەزیاد شایەتی منی دژی حوجر بۆ تۆ نووسیوە. من شایەتی دەدەم کەنوێژ دەخوێنێت و زەکات دەدات و بەردەوام بۆ حەج و عەمرە دەچێت و فەرمان بەچاکە دەدات و ڕێگری لەخراپە دەکات و خوێن و سامانی ئەو حەرامە. ئەگەر دەخوازیت بیکوژە و ئەگەر دەخوازیت ئازادی بکە)).

معاویە نامەکەی شورەیحی بۆ وائیل کوڕی حوجر و کەسیر خوێندەوە و وتی: ئەم کەسە حاشا لەشایەتییەکەی دەکات.

دەستەیەکیان لەمەرج عوزرا بەجێهێشتبوو، معاویە بۆ زیادی نووسی:

(( ئەوەی سەبارەت بەحوجر و هاوەڵان و شایەتی کەسەکان دژی ئەو نووسیوتە، خوێندمەوە و لێکۆڵینەوەم لەم کارە کرد. هەندێکات گومان دەکەم کوشتنیان لەئازاد کردنیان باشترە و هەندێ کات گومان دەکەم بەخشینیان لەکوشتنیان باشترە)).

زیاد نامەیەکی نووسی و بەیەزید کوڕی حەجییە کوڕی بەیعەی تەمیمی بۆ معاویەی نارد:

نامەکەم خوێندەوە و لەبۆچوونی تۆ سەبارەت بەحوجر و هاوەڵانی ئاگادار

بوومەوە و سەرمسوڕماوە لەوەی کارەکانی ئەوان لای تۆ ئاشکرا نییە. لەکاتێکدا کەسانێك کەئەوان باشتر دەناسن دژی ئەو، شایەتییان داوە؟ ئەگەر پێویستت بەم شارەیە، حوجر و هاوەڵانی بۆ لای من مەگەڕێنەوە.

یەزید کوڕی حەجیە هات و لەعەزرا لای ئەو دەستەیە تێپەڕی و وتی: سوێند بەخوا گومانی ئازادی ئێوە ناکرێت. نامەیەکەم پێیە کەناوەرۆکەکەی سەربڕینی ئێوەی تیایە، هەرچی دەخوازن و گومان دەکەن ئەگەری هەیە سوودی هەبێت، بیڵێن با ئەنجامی بدەم.

حوجر وتی: بەمعاویە بڵێ، ئێمە لەسەر بەیعەتەکەی خۆمان سوورین و هەڵیناوەشێنینەوە و نامانەوێت هەڵیوەشێننەوە. دوژمنانی ئێمە و خەڵکی گوماندار، دژی ئێمە شایەتییانداوە.

یەزید نامەکەی بردە لای معاویە کەخوێندییەوە و لەوتەکانی حوجریش ئاگاداری کردەوە.

معاویە وتی: لای من زیاد لەحوجر ڕاستگۆترە.

عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەمی سەقەفی و بەوتەیەك عوسمان کوڕی عومەیری سەقەفی وتی: بیبە، بیبە.

معاویە وتی: پێویست بەزەحمەت ناکات.

خەڵکی شام ڕۆشتنەدەر و نەیانزانی معاویە و عەبدولڕەحمان چییان وت، ڕۆشتنە لای نەعمان کوڕی بەشیر و لەوتەکەی کوڕی دایکی حەکەم ئاگاداریان کردەوە کەوتی: کوژران.

عامر کوڕی ئەسوەدی عیجلی هاتە عوزرا کەدەیویست سەردانی معاویە بکات تا لەهەواڵی ئەو دووپیاوە ئاگاداری بکاتەوە کەزیاد ئاگاداری بکاتەوە. کاتێك دەڕۆشت، حوجر کوڕی عودەی بەشەلەشەل، ڕۆشتە لای و وتی: ئەی عامر گوێ بگرە، بەمعاویە بڵێ خوێنی ئێمە بۆ ئەو حەرامە. پێی بڵێ ئەمانیان پێ بەخشیوین، لەخوا بترسێت و لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی ئێمە بکات. حوجر بەردەوام وتەکانی دووبارە دەکردەوە و سەرئەنجام عامر وتی: باشە تێگەیشتم، بۆ ئەوەندە قسە دەکەیت.

حوجر وتی: قسەی ناڕەوام نەکردووە، بۆ سەرکۆنەم دەکەیت، تۆ شتێك دەبینی و پاداشت وەردەگریت، حوجر دەبەن و دەیکوژن، گازندە ناکەم لەوەی لەوتەکانم بێزار بوویت. بڕۆ.

دەڵێت: عامر شەرم دایگرت و وتی: سوێند بەخوا بەو شێوە نییە. هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم. وەك دەڵێن زۆر داوای بەخشینی ئەوانی کردووە بەڵام معاویە ڕازی نەبووە.

عامر ڕۆشتە لای معاویە و لەبەسەرهاتی ئەو دوو پیاوە ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: یەزید کوڕی ئەسەدی بیجلی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوو ئامۆزاکەی من بەمن ببەخشە.

جەریر کوڕی عەبدوڵڵە سەبارەت بەوان نووسیبووی کەکەسێکی گوماناوی لای زیاد سەبارەت بەدوو کەس لەخەڵکەکەی من کەشوێنکەوتەی سەروەری باوەڕدارانن، قسەی کردووە و ئەوانیان لەگەڵ خەڵکانی کوفە بۆ لای سەروەری باوەڕداران ڕەوانە کردووە بەڵام ئەوان کەسانێك هیچ پێشهاتێکی تازەیان لەئیسلاندا نەهێناوەتە ئاراوە، دژی خەلیفە یاخی نەبوون.

کاتێك یەزید داوای بەخشینی ئەوانی کرد، معاویە نامەکەی جەریری بیرکەوتەوە و وتی: کوڕە مامەکەت جەریر سەبارەت بەوان نووسیبووی و چاکەی ئەوانی باس دەکرد. کەسێکی وەك جەریر شیاوی ئەوەیە وتەکانی بەڕاست لەقەڵەم بدرێت و گوێ لەئامۆژگارییەکانی بگیرێت. تۆیش داوای بەخشینی دوو کوڕە مامەکەت دەکەیت، هەردووکیان بەتۆ دەبەخشم.

وائیل کوڕی حوجر داوای بەخشینی ئەرقەمی کرد و معاویە بەخشی.

باوکی ئەعوەری سولەمی داوای بەخشینی عەتەبە کوڕی ئەخنەسی کرد و بەخشرا.

حەمزە کوڕی مالیکی هەمەدانی داوای بەخشینی سەعد کوڕی نەمرانی هەمەدانی کرد و بەخشرا.

حەبیب کوڕی مەسلمە داوای ئازادی کوڕی جویەی کرد و ئازاد کرا.

مالیك کوڕی هوبەیرەی سەکونی هەستا و بەمعاویەی وت: ئەی سەروەری

باوەڕداران، ئامۆزاکەم، حوجر بەمن بسپێرە.

وتی: ئامۆزاکەی تۆ حوجر، سەرکردەی نەیارەکانە و دەترسم ئەگەر ئازادی بکەم، ئاژاوە لەشارەکەدا بنێتەوە و بەیانی ناچار بین تۆ و هاوەڵانت بۆ جەنگی ئەوان لەعێراق ڕەوانە بکەین.

وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ مندا کەسێکی دادپەروەر نەبوویت، شان بەشانی تۆ و ئامۆزاکەت جەنگیم و ڕۆژگارم هاوشێوەی ڕۆژگاری سەفین بوو تا ئەوەی کاروبارەکان بۆ تۆ سەقامگیر بوو و لەبەلاَکان دووربوویتەوە. ئێستا_داوای گیانی ئامۆزاکەم دەکەم کەتوندوتیژیت نواند و ئەو قسانەی کەهیچ سوودێك بەمن ناگەیەنێت.

دواتر ڕۆشتە و لەماڵەکەی خۆیدا دانیشت.

معاویە، هودبە کوڕی فەیازی قوزاعی لەمناڵەکانی سەلامان کوڕی سەعدی لەگەڵ حەسین کوڕی عەبدوللە کەلابی و باوکی شەریف بودی ڕەوانە کرد کەشەوانە ڕۆشتنە لای حوجر و هاوەڵانی. خەسعەمی کاتێك یەکچاوی بینی، وتی: نیوەی ئێمە دەکوژرێت و نیوەمان ڕزگاری دەبێت.

سەعد کوڕی نەمران وتی: خواوەندا هیوادارم من لەو کەسانە بم کەڕزگاریان دەبێت و تۆ لێم ڕازی بیت.

عەبدولڕەحمان کوڕی حەبیانی عەنزی وتی: خواوەندا کارێك بکە لەڕیسوایی نەیارەکان پێگەی من بەرز بێتەوە و لەمن ڕازی بیت، چەندین جار ڕووبەڕووی مەرگ بوومەتەوە بەلاَم خواوەند نەیویست.

نێردراوی معاویە هەواڵی هێنا کەشەش کەس ئازاد دەکرێن و هەشت کەس دەکوژرێن.

نێردراوی معاویە وتی: فەرمانم پێدراوە پێتان بڵێم بێزاری خۆتان لەعەلی دەربڕن و نفرینی بکەن. ئەگەر ئەو کارە بکەن، ئازادتان دەکەم و ئەگەر نەتانکرد، دەتانکوژم.

سەروەری باوەڕداران گومان دەکات بەهۆی شایەتی خەڵکان دژی ئێوە، خوێنتان حەلاَڵە بەلاَم بەمە ڕازی دەبێت. بێزاری خۆتان لەو پیاوە دەربڕن تا

ئازادتان بکەن.

وتیان: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەین.

وتیان گۆڕەکانیان بۆ هەڵکەنن، کفنەکانیان هێنا. ئەوان نوێژی شەویان کرد و کاتێك بەیانی بوویەوە، هاوەڵانی معاویە وتیان: ئەی خەڵکینە، دوێشەو بینیمان نوێژتان درێژ کردەوە، پێمان بڵێن بۆچوونی ئێوە سەبارەت بەعوسمان کوڕی عەفان چییە؟

وتیان: یەکەم کەس بوو فەرمانی ستەمکارانەی دەرکرد و کردەوەی ناڕەوای ئەنجامدا.

هاوەڵانی معاویە وتیان: سەروەری باوەڕداران ئێوەی باشتر دەناسی. دواتر لێیان نزیك بوونەوە و وتیان: بێزاری خۆتان لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەردەبڕن؟

وتیان: نا، ئێمە شوێنکەوتەی ئەوین و لەو کەسە بێزارین کەبێزاری لەو دەردەبڕێت.

هەرکامیان یەکیانی گرت بۆ ئەوەی بیکوژێت. قەبیسە کوڕی زەبیعە کەوتە دەستی باوکی شەریفی بودی، قەبیسە پێی وت: لەنێوان خەڵکی من و خەڵکی تۆ دوژمنایەتی نییە، با کەسێکی دیکە بمکوژێت.

وتی: خزمی خۆت چاکەت لەگەڵ بکات.

حەزەرمی ئەوی گرت و کوشتی و قەبیسە بەدەستی قوزاعی کوژرا.

دەڵێت: حوجر پێی وتن: ڕێگە بدەن دەستنوێژ بگرم.

وتیان: بیکە.؟

کاتێك دەستنوێژی گرت، وتی: ڕێگە بدەن دوو ڕەکعەت نوێژ بخوێنم.

وتیان: ڕێگە بدەن با نوێژ بخوێنێت.

نوێژی خوێند و ئاوڕی دایەوە و وتی: سوێند بەخوا هیچ کات نوێژێکی لەمە کورتترم نەخوێندووە. ئەگەر گومانی ئەوەتان نەدەکرد کە لەمردن دەترسم، دەمویست نوێژەکەم درێژ بکەمەوە.

وتی: خواوەندا دادی ئێمە لەم خراپەکارانە وەربگرە، خەڵکی کوفە دژی ئێمە

شایەتییاندا، خەڵکی شام دەمانکوژن. سوێند بەخوا ئەگەر لێرەدا بمانکوژن یەکەم سواری موسوڵمانانم لەم سەرزەمینەدا دەکوژرێم و یەکەم پیاوی موسوڵمانانم لێرەدا سەگەکان لەدەوری کۆدەبنەوە.

دەڵێت: یەکچاو، هودبە کوڕی فەیاز، شمشێر بەدەست بەرەو ڕووی ڕۆشت و هەموو گیانی دەلەرزی.

وتی: گومان دەکەیت لەمردن ناترسیت، ئازادت دەکەم ئەگەر بێزاری لەعەلی دەربیڕیت.

وتی: چۆن لەمەرگ ناترسم لەکاتێکدا گۆڕی هەڵکەنراو و کفنی ئامادەکراو و شمشێری دەرکێشراو دەبینم، سوێند بەخوا ئەگەر لەمەرگیش بترسم شتێك ناڵێم توڕەیی خواوەندی بەدواوە بێت.

دەڵێت: ئەوی کوشت. کەسانی دیکەیش ئەوانیان یەك لەدوای یەك کوشت تا ئەوەی شەش کەس مایەوە.

عەبدولرەحمان کوڕی حەسانی عەنزی و کەریم کوڕی عەفیفی خەسعەمی وتیان: ئێمە بۆ لای سەروەری باوەڕداران ببەن چوونکە هاوشێوەی ئەم پیاوە قسە دەکەین.

دەڵێت: کەسیان بۆ لای معاویە نارد و لەوتەکانی ئەوان ئاگاداریان کردەوە. کەسی نارد و وتی ئەوان بێننە لای من. کاتێك گەیشتنە لای معاویە، خەسعەمی وتی: ئەی معاویە، خواوەندا، خواوەندا چوونکە دەڕۆیتە ئەو دنیا و سەبارەت بەکوشتنی ئێمە پرسیارت لێدەکەن کەبۆ خوێنی ئێمەت ڕشت؟

وتی: سەبارەت بەعەلی بۆچوونت چییە؟

وتی: ئەوە دەڵێم کەتۆ دەیڵێیت.

وتی: لەدینی عەلی بێزارم.

خەسعەمی بێدەنگ بوو و معاویە نەیویست هیچ بڵێت.

دەڵێت: شیمر کوڕی عەبدوڵڵە لەمناڵەکانی قوحافە هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کوڕە مامەکەم بەمن ببەخشە.

وتی: بەخشیم بەتۆ بەڵام یەك مانگ زیندانی دەکەم.

معاویە هەموو دوو ڕۆژ جارێك بانگی دەکرد و قسەی لەگەڵ دەکرد و دەیوت: حەیفە کەسێکی وەك تۆ لەناو خەڵکی عێراقدا بێت.

دواتر شیمر جارێکی دیکە لەگەڵ معاویە قسەی کرد کەوتی: تۆ دەکەمە شایەتی ئازادکردنی ئامۆزاکەت. ئەوی بانگ کرد و ئازادی کرد بەو مەرجەی تا معاویە زیندوو بێت، نەڕواتە کوفە.

وتی: هەرکام لەسەرزەمینەکانی عەرەبت پێخۆشە هەڵیبژێرە تا ڕەوانەی ئەو سەرزەمینەت بکەم.

ئەو موسڵی هەڵبژارد. بەردەوام دەیوت: ئەگەر معاویە بمرێت، بۆ شارەکەم دەگەڕێمەوە، بەڵام مانگێك پێش معاویە مرد.

دەڵێت: معاویە دوای خەسعەمی ڕووی کردە عەبدولڕەحمانی عەنزی و وتی: ئەی برای ڕەبیعی بۆچوونت سەبارەت بەعەلی چییە؟

وتی: واز لەمن بێنە و لێم مەپرسە چوونکە بۆ تۆ باشترە.

وتی: سوێند بەخوا دەبێت پێم بڵێیت.

وتی: شایەتی دەدەم بەردەوام لەبیری خواوەندا بوو، فەرمانی چاکەی بەکەسەکان دەدا، دادپەروەری دەکرد و خەڵکانی دەبەخشی.

وتی: سەبارەت بەعوسمان؟

وتی: یەکەم کەس بوو دەروازەکانی ستەمی کردەوە و دەروازەکانی ڕاستی لەرزاند.

وتی: خوێنی خۆتت حەڵاڵ کرد.

وتی: خوێنی تۆم حەڵاڵ کرد کاتێك کەس پشتیوانی لەتۆ نەکات.

دەڵێت: معاویە ئەوی بۆ لای زیاد نارد و بۆی نووسی: ئەم کەسە خراپتر لەهەموو ئەو کەسانە بوو کەڕەوانەت کرد. سزایەکی شیاوی پێبدە و بەخراپترین شێوە بیکوژە.

دەڵێت: کاتێك ئەویان بردە لای زیاد، زیاد ئەوی بۆ قەس ئەنلناتف نارد و لەوێ زیندە بەگۆڕیان کرد.

دەڵێت: کاتێك عەنزی و خەسعەمییان بۆ لای معاویە دەبرد، عەنزی

بەحوجری وت: ئەی حوجر، خوا بتپارێزێت، موسوڵمانێکی خۆپارێز بوویت.

خەسعەمی وتی: پارێزراو بیت و زیندوو چوونکە فەرمانی چاکەت دەدا و ڕێگەت لەخراپە دەگرت.

دەڵێت: کاتێك ئەوانیان برد، حوجر بەدوای ئەواندا گریا و وتی: مەرگ، پەیوەندی دۆستایەتی دەپچڕێنێت.

دەڵێت: چەند ڕۆژ دوای کوژرانی حوجر، عەتەبە کوڕی ئەخنەس و سەعد کوڕی نەمرانیان بردە لای معاویە و ئازادی کردن.

## ناوی هاوەڵانی حوجر کەکوژران

حوجر کوڕی عودەی، شەریك کوڕی شەدادی حەزەرمی، سەیفی کوڕی فوسەلی شەیبانی، قەبیسە کوڕی زەبیعەی عەبەسی، موحریز کوڕی شەهابی سەعدی مینقەری، کودام کوڕی حەییانی عەنزی، عەبدولڕەحمان کوڕی حەسانی عەنزی.

عەبدولڕەحمانی بۆ لای زیاد نارد و لەقەس ئەلناتیف زیندە بەگۆڕ کرا.

حەوت کەس بوون کەکوژران، کفنیان کردن و نوێژی مردوویان لەسەر خوێندن.

دەڵێت: کاتێك حەسەن کوڕی عەلی لەکوژرانی حوجر و هاوەڵانی ئاگادار بوویەوە، وتی: نوێژیان لەسەر خوێندن، کفنیان کردن و دفنیان کردن و ڕوەو قیبلە دایاننان؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: سوێندتان دەدەم بەپەروەردگاری کەعبە، زیارەتیان بکەن.

## ناوی هاوەڵانی حوجر کەڕزگاریان بوو

کەریم کوڕی عەفیفی خەسعەمی، عەبدوڵڵە کوڕی حەویەی تەمیمی، عاسم کوڕی عەوف و وەرقا کوڕی سەمی (هەردوکیان بیجلی)، ئەرقەم کوڕی عەبدوڵڵە کیندی، عەتەبە کوڕی ئەخنەس لەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر، سەعد کوڕی نەمرانی هەمەدانی کەهەموویان حەوت کەس بوون.

دەڵێت: کاتێك معاویە لەبەخشینی حوجر بەمالیك کوڕی هوبەیرەی سەکونی خۆی بەدوور گرت، لەکۆڕی خەڵکانی کیندە و سەکون و ژمارەیەکی زۆر لەیەمەنییەکان کە لەدەوری کۆبووبوونەوە، وتی: سوێند بەخوا معاویە زیاتر لەوەی ئێمە نیازمان پێیەتی، نیازی بەئێمەیە، ئێمە لەناو خەڵکەکەی ئەو دەتوانین کەسێك لەجیاتی ئەو بدۆزینەوە بەلاّم ئەو لەناو خەڵکەکەی ئێمە، ناتوانێت کەسێکی وەك ئێمە بدۆزێتەوە. با بڕۆین و ئەم پیاوە لەدەستی ئەو ئازاد بکەین.

خەڵکان بەڕێکەوتن و دڵنیابوون لەوەی ئەوان لەعوزران و نەکوژراون. بکوژەکان کەعوزرایان بەجێهێشتبوو، ئەوانیان بینی و کاتێ مالیکیان لەناو ئەواندا بینی، زانیان بەمەبەستی ڕزگار کردنی حوجر هاتوون.

مالیك لێی پرسین: چ هەواڵێکتان پێیە؟

وتیان: ئەو دەستەیە تۆبەیان کرد و دەڕۆین معاویەی لێ ئاگادار بکەینەوە.

مالیك بێدەنگ بوو و بەرەو عوزرا ڕۆشت و کەسێك کەلەوێوە دەهات ئاگاداری کردەوە کەحوجر و هاوەڵانی کوژراون.

مالیك وتی: بکوژەکان بگرن.

سوارەکان شوێنیان کەوتن و بکوژەکان پێشکەوتنەوە و گەیشتنە لای معاویە و لەمەبەستی مالیك کوڕی هوبەیرە و هاوەڵانی ئاگاداریان کردەوە.

معاویە وتی: ئارام بن، گرژییەك لەخۆیدا دەبینێت وەك بڵێی کوژابێتەوە.

دەڵێت: مالیك گەڕایەوە و لەماڵەکەی خۆی نەهاتەدەر و نەڕۆشتە لای معاویە. معاویە کەسی بەدوایدا نارد بەلاّم ڕازی نەبوو. کاتێك شەو داهات، سەد هەزار

درهەمی بۆ نارد و پەیامیدا: ئەگەر سەروەری باوەڕداران بەداواکەی تۆ بۆ بەخشینی ئامۆزاکەت ڕازی نەبوو لەبەر ئەوەبوو دەترسا جەنگێکی دیکە دەستپێبکەن. ئەگەر حوجر کوڕی عودەی زیندوو دەمایەوە، دەترسام لەوەی تۆ و هاوەڵانت ناچارین بۆ جەنگی ئەو بڕۆن و موسوڵمانان گرفتاری بەڵایەکی گەورەتر لەبەڵای کوژرانی عودەی ببن.

دەڵێت: مالیك پارەکەی وەرگرت و دڵخۆش بوو. ڕۆژی دواتر لەگەڵ کەسەکانی ڕۆشتە لای معاویە.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: عایشەی دایکی باوەڕداران، عەبدولڕەحمان کوڕی حارسی سەبارەت بەبەسەرهاتی حوجر و هاوەڵانی بۆ لای معاویە نارد و کاتێك گەیشت کەکوژرا بوون.

عەبدولڕەحمان بەمعاویە وتی: چۆن خۆڕاگری ئەبوسوفیانت لەبیر نەمابوو؟

معاویە وتی: کەسێکی خۆڕاگری وەك تۆ لای من نەبوو، کوڕی سومەییە ئەمەی بەسەردا سەپاندم و ڕازی بووم.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: عایشە دەیوت: ئەگەر بەو شێوە نەدەبوو کەڕێگریمان لەهەرچی کرد، پێشهاتێکی خراپتری بەدواداهات، ڕێگریمان لەکوژرانی حوجر دەکرد. سوێند بەخوا دەزانم موسوڵمانێك بوو کەحەج و عەمرەی ئەنجام دەدا.

باوکی سەعیدی مەقبەری دەڵێت: کاتێك معاویە دەڕۆشتە حەج، ڕۆشتە بەردەم ماڵی دایکی باوەڕداران و داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کرد. مۆڵەتی پێدرا و کاتێك لەبەردەم ئەودا دانیشت، پێی وت: معاویە ناترسیت کەسێکم حەشاردابێت بۆ ئەوەی تۆ بکوژێت؟

وتی: هاتووەمەتە ناو ماڵێکی ئەمن.

وتی: سەبارەت بەکوشتنی حوجر و هاوەڵانی لەخوا نەترسایت؟

وتی: من ئەوانم نەکوشت، کەسانێك ئەوانیان کوشت کەدژی ئەوان شایەتییاندا.

باوکی ئیسحاق دەڵێت: بینیم کەخەڵکان دەیانوت: یەکەم ڕیسوایی ناو کوفە

مەرگی حسەین کوڕی عەلی و کوژرانی حوجر کوڕی عودی و هاتنی زیاد بوو.

باوکی موخەنەف دەڵێت: بیستم معاویە لەسەرەمەرگدا وتوویەتی: لەگەڵ کوڕی ئەدبەر ڕۆژێکی دوورودرێژم هەیە. سێ جار ئەم وتەی دووبارە کردبوویەوە. مەبەستی لەحوجر بوو.

حەسەن کوڕی عەلی وتبووی: معاویە چوار کاری کرد کەئەگەر یەکیانی زیاتر نەکردبوو، دەبووەی هۆی لەناوچوونی ئەو: ئەوەی نەزانەکانی کردە فەرمانڕەوای خەڵك و ئەوەی خەلافەتی بێ ڕاوێژ کردن بەپاشماوەی ئەسحابەکان و چاکەکاران ڕفاند و کوڕە شەرابخۆرەکەی کردە خەلیفە و ئەوەی ڕەچەڵەکی زیادی بۆ خۆی گەڕاندەوە لەکاتێکدا پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: منالی هی ناو جێگەیە و بەرد هی زیناکار. و ئەوەی کەحوجری کوشت، هاواری ئەو لەحوجر و شوێنکەوتەکانی حوجر. ئەم وتەی دووجار دووبارە کردەوە.

هیند کچی زەید کوڕی مەخرەمەی ئەنساری کەشیعە بوو، لەپرسەی حوجردا هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئەی مانگەشەوی ڕووناك، بڕۆسەر و باش بڕوانە
ئایا دەبینی حوجر بەرێگەدا دەڕوات؟
بەرەو لای معاویە کوڕی حەرب دەڕوات
تا بەهەمان شێوە کەئەمیر ویستی بیکوژێت
لەدوای حوجر، ستەمکاران، ستەمکارییان کردە پیشە
هەمووشتێك بەدڵی ئەوان بوو
زەوی بایر مایەوە
وەك بڵێی بارانی لێ نەباری
ئەی حوجر، حوجری کوڕی عودەی
تەندروستی ورەزامەندی بۆ تۆ بێت
لەوەی عودەی بەکوشتندا
و پیرێك کە لەدیمەشق شانازی بەخۆیەوە دەکات
لەتۆ دەترسم

پیری دیمەشق کەکوشتنی چاکەکاران
بەماق خۆی بزانێت
هاوپەیمانێکی هەیە
کە لەخراپترینی خەڵکانە
خۆزگە حوجر بەمەرگی ئاسایی دەمرد
و هاوشێوەی وشتر سەریان نەدەبڕی
ئەگەر ئەو کوژرا
هەموو پێشەوای خەڵکەکان
دەکوژرێن))

قەیس کوڕی عیباد کەداوای بەخششی بۆ سەیفی کوڕی فوسەیل کرد، زیندوو مایەوە تا ئەوەی لەگەڵ محەممەد کوڕی ئەشعەس بۆ جەنگ ڕۆشت و لەهەموو جەنگەکانی ئەو بەشداری کرد. لەڕۆژگاری حەجاج، حوشەب کەیەکێك لەمناڵەکانی هۆزەکەی قەیس بوو، پێی وت: یەکێك لەئێمەیە کەکاری ئاژاوەنانەوەیە و شۆڕش دژی حکومەت، لەعێراق ئاژاوەیەك ڕوویندەداوە بەشداری تیا نەکردبێت، تورابییە و نفرینی عوسمان دەکات، لەگەڵ ئەشعەس ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و لەهەموو جەنگەکانی ئەو بەشداری کردووە و کاتێك خواوەند ئەوانی لەناو برد، پەنای بۆ سووچی ماڵەکەی بردووە.

حەجاج کەسی نارد و ئەویان هێنا و سەریان بڕی.

کەسانی قەیس بەبنەماڵەی حوشەبیان وت: بۆ سکاڵا و تۆمەتتان بۆ ئێمە هەڵبەست؟

وەڵامیان دانەوە: ئێوەش ئەو کارەتان سەبارەت بەهاوڕێکەی ئێمە ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا زیاد، ڕەبیع کوڕی زیادی حارسی وەك کارگوزاری خوراسان ڕەوانە کرد. ئەمە دوای مەرگی حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری بوو. حەکەم، ئەنس کوڕی باوکی ئەناسی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبوو. ئەو بوو کەنوێژی لەسەر حەکەم خوێند و لەماڵی خالید کوڕی عەبدوڵڵە برای خولەید کوڕی عەبدوڵڵە بەخاکیان سپارد. حەکەم ئەمەی بۆ زیاد نووسی و زیاد، ئەنسی لابرد

و خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی لەجێگەی ئەودانا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێک زیاد ئەنسی لابرد و خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی لەجێگەی ئەو دانا، ئەنس هۆنراوەیەکی وت بەم ناوەرۆکە:

((کێیە پەیامێك لەمن
بۆ زیاد ببات
پەیکێکی خێرا بیبات؟
من لادەبەیت و ولایەتی دەکەیتە پارووی خولەید؟
بەڕاستی کەخەڵکی حەنیفە
ئەوەی دەیانویست بەدەستیان هێنا
بڕۆن و لەیەمانە زەوی بکێڵن
چوونکە یەکەم و دووا کەستان کۆیلەن))

خولەیەد یەك مانگ کارگوزار بوو، دواتر زیاد ئەوی لابرد و لەسەرەتای ساڵی پەنجا و یەکی کۆچی، رەبیع کوڕی زیادی وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان کرد و خەڵکان، بنەماڵەی خۆیان بۆ خوراسان برد و لەوێ نیشتەجێ بوون. دواتر زیاد، رەبیعیشی لابرد.

عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبانی قورەشی دەڵێت: رەبیع هاتە خوراسان و بەئاشتی دەستی بەسەر بەڵخدا گرت کەدوای ئاشتی ئەحنەف، دەروازەکانیان بەستبوو. هەروەها بەجەنگ دەستی بەسەر قەهستاندا گرت.

دەستەیەك لەتورکەکان لەوێ بوون، ئەوانی کوشت و شکستیدان. یەکێك لەپاشماوەکانی ئەوان نەیزەك تەرخان بوو کەقوتەیبە کوڕی موسلیم لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خۆی ئەوی کوشت.

عەلی دەڵێت: رەبیع بۆ جەنگ ڕۆشت و لەڕووبار پەڕییەوە. کۆیلەکەی فروخ و کەنیزەکەی شەریفە، هاوڕێیەتیان دەکرد. تەندروست و لەگەڵ تالانییەکان گەڕایەوە. فروخی ئازاد کرد. پێشتر حەکەم کوڕی عەمرۆ لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خۆی لەڕووبار پەڕیبوویەوە بەلام نەیتوانیبوو دەست بەسەر هیچ ناوچەیەکدا بگرێت.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: یەکەم کەس لەموسوڵمانان کە لەئاوی ڕووباری خواردەوە، کۆیلەکەی حەکەم بوو کە بەقەڵغانەکەی خۆی ئاوی هەڵگرت و خواردییەوە و دواتر دەرخواردی حەکەمیدا کەخواردی و دەستنوێژی لێگرت و لەو بەری ڕووبار دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند. یەکەم کەس بوو ئەو کارەی کرد و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. باوکی مەعشەر و واقیدی ئاماژەیان بەمە داوە.

لەم ساڵەدا کارگوزاری معاویە لەمەدینە، سەعید کوڕی عاس بوو، کارگوزاری کوفە و بەسرە و هەموو ڕۆژهەڵات زیاد بوو. کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیحدا بوو و کاروباری دادی بەسرە لەئەستۆی عومەیرە کوڕی یەسربی.

## ساڵی پەنجا و دووەمی کۆچی دەستپێکرد

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا، سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی بەمەبەستی جەنگ ڕوویکردە سەرزەمینی ڕۆم و زستانی لەوێ بەسەر برد و لەوێ مرد و عەبدوڵڵە کوڕی مەسعەدەی فەزاری کردە جێنشینی خۆی. بەڵام بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە، ئەو کەسەی لەم ساڵەدا جەنگی زستانەی لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدا، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات بوو-کەسوفیان کوڕی عەوف ئەزدی هاوڕێیەتی دەکرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوڵڵەی سەقەفی جەنگی هاوینەی لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا بەوتەی باوکی مەعشەر و واقدی، سەعید کوڕی عاس ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

کارگوزاری ویلایەتەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ساڵی پەنجا و سێیەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و سێ

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە جەنگی زستانەی عەبدولڕەحمانی کوڕی دایکی حەکەمی سەقەفی بوو لەسەرزەمینی ڕۆم.

لەم ساڵەدا ڕۆدس دەستی بەسەردا گیرا، جونادە کوڕی باوکی ئومەییەی یەزدی دەستی بەسەردا گرت و موسوڵمانان لەو شارە نیشتەجێ بوون و کشتوکاڵیان دەستپێکرد. موسوڵمانان مەڕومالاّتیان بووو کە لەدەوروبەری دوورگەکە دەیانلەوەڕاند و شەوان دەیانبردنەوە بۆ قەلاّکە. پاسەوانیان دیاریکردبوو تا چاودێری دەریا بکات بۆ ئەوەی ئەگەر ڕووبەڕووی مەترسی بنەوە، ئاگاداریان بکاتەوە. بەردەوام لەگەڵ ڕۆمییەکان دەجەنگان، لەدەریا هێرشیان دەکردە سەریان و کەشتییەکانیان تالاّن دەکرد. معاویە ڕۆژی و مانگانەی پێدەدان و دوژمن لێیان دەترسا. کاتێك معاویە مرد، یەزید کوڕی معاویە ئەوانی گەڕاندەوە.

زیاد کوڕی سومەییە لەم ساڵەدا مرد.

فیل کۆیلەی زیاد دەڵێت: زیاد بۆ ماوەی پێنج ساڵ فەرمانڕەوایەتی عێراقی کرد و دوای ئەوە لەساڵی پەنجا و سێی کۆچ مرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك زیاد هاتە عێراق، تا ساڵی پەنجا و سێی کۆچی مایەوە و دواتر لەمانگی ڕەمەزان و لەکوفە کۆچی دوایی کرد. جێگری ئەو لەبەسرە سەمورە کوڕی جوندەب بوو.

## هۆکاری مردنی زیاد کوڕی سومەییە

کەسیر کوڕی زیاد دەڵێت: زیاد نامەی بۆ معاویە نووسی: بەدەستی چەپم کاروباری عێراقم ڕێکخستووە بەڵام دەستی ڕاستیم بەتاڵە.

دەڵێت: معاویە، عروز، یانی یەمامە و سەرزەمینەکانی دەورووبەری بەزیاد سپارد.

دەڵێت: کوڕی عومەر نەحلەتی زیادی کرد کەتاعوونی گرت و مرد. کاتێك هەواڵی مردنەکەی بەکوڕی عومەر گەیشت، وتی: ((کوڕی سومەییە ڕێگەی خۆت بگرەبەر، چوونکە نە ئەم دنیات بۆ مایەوە، نەئەو دنیا)).

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: زیاد نامەی بۆ معاویە نووسی و وتی: بەدەستی چەپم کاروباری عێراقم بۆ ڕێکخستیت و دەستی ڕاستم بەتاڵە. معاویە کاروباری حیجازی پێسپارد و فەرمانەکەی بەهەیسەم کوڕی ئەسوەد نەخەعی ڕەوانە کرد و کاتێك خەڵکی حیجاز ئاگادار بوونەوە، چەند کەسێك لەوان ڕۆشتنە لای عەبدوڵڵە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و لەم پێشهاتە ئاگاداریان کردەوە. کوڕی عومەر وتی: بەنەحلەتی بکەن تا خواوەند ئەو لەسەر ڕێگەتان لاببات.

دەڵێت: عەبدوڵڵە ڕوویکردە قیبلە، ئەوانیش ڕوویان کردە قیبلە، ئەو نەحلەتی کرد، ئەوانیش نەحلەتیان کرد و تاعوون لەپەنجەی زیادیدا. کەسی بۆ لای شورەیح نارد کەدادوەری ئەو بوو و وتی: بەڵایەکەم بەسەردا هاتووە کەئاگاداری لێی، فەرمانمداوە، پەنجەم ببڕنەوە، بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: دەترسم برینەکە تەشەنە بکاتە ناو دەستت و دڵت لێوانلێو بێت لەڕەنج و ئەجەل نزیك بێت و بەدەستی بڕاو بڕۆیتە پێشگای خواوەند، لەکاتێکدا تامەزرۆی دیداری خواوەند نیت بۆیە دەستی خۆت دەبڕیت، یا ئەوەی ئەجەلەکەت دوور بێت و دەستی خۆت بڕیتەوە و بێ دەست ببیت و ببیتە هۆی شەرمەزاری بۆ منداڵەکانت.

دەڵێت: زیاد ئەو کارەی نەکرد. شورەیح هاتەدەر. لێیان پرسی. بەسەرهاتەکەی لەگەڵ زیاد بەتەواوی بۆ گێڕانەوە. سەرکۆنەیان کرد و پێیان

وت: بۆ ڕێگەت نەدا پەنجەی ببڕێتەوە.

دەڵێت: پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ئەوەی ڕاوێژی پێدەکرێت، دەبێت ئەمانەتدار بێت.

عەبدوڵڵە دەڵێت: لەکەسێکی دیکەم بیستووە کەزیاد شورەیحی بانگ کرد و سەبارەت بەبڕینی دەستی خۆی ڕاوێژی لەگەڵ کرد کەوتی: ئەو کارە مەکە چوونکە ئەگەر زیندوو بمێنێت، بەدەستی بڕاو دەبێت ژیان بەسەر ببەیت و ئەگەر بمریت، تاوانت بەرابەر بەخۆت ئەنجامداوە.

وتی: سوێندت دەدەم بەخوا چۆن دەتوانم لەگەڵ ئەم تاعوونە لەژێر یەك بەتانیدا بخەوم؟

دەڵێت: بڕیاریدا دەستی خۆی ببڕێت و کاتێك ئاگر و شیشە سوورەکانی بینی، ترسا و چاوپۆشی لەمکارە کرد.

کوڕی باوکی زیاد دەڵێت: کاتێك وادەی مەرگی زیاد هات، کوڕەکەی پێی وت: باوکە شەست پارچەم ئامادە کردووە تا بیکەم بەکفنی تۆ.

وتی: کوڕم، ئەگەری هەیە باوکت پۆششێکی لەمە باشتری بێت یا ئەوەی بێ پۆشش بمێنێتەوە.

دەڵێت: زیاد مرد و لەسوبە لەنزیك کوفە بەخاکیان سپارد. دواتر یەزید وەك فەرمانڕەوای حیجاز بەرەو ئەو سەرزەمینە بەڕێکەوت.

مسکین کوڕی عامری دارمی سەبارەت بەمەرگی ئەو هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((کاتێك زیاد لێمان جیابوویەوە

بەئاشکرا بینیم لاوازی ئیسلام دەستی پێکرد)).

فەرزدق لەوەڵامی مسکین هۆنراوەیەکی هۆنییەوە. فەرزدق تا ئەو کاتەی زیاد زیندوو بوو، هەجوی ئەوی نەکردبوو. ئەمە ناوەرۆکی هۆنراوەکەیە:

((ئەی مسکین! خوا چاوانت پڕ بکات لەفرمێسك

چوونکە فرمێسك بەناڕەوا لەچاوت هاتەخوار

بۆ کەسێك لەبنەماڵەی میسان دەگریت

کەخۆی کافرێك بوو

هاوشێوەی قەیسەر و کەسرا)).

جورەیر کوڕی یەزید دەڵێت: زیادم بینی، سورباو بوو، چاوی ڕاستی کەمێك خێل بوو، ڕیشی سپی و کراسێکی پینەداری لەبەردابوو، سوار لەسەر ئێسترێك و هەوساری بەدەستەوە بوو.

لەم ساڵەدا رەبیع کوڕی زیادی حارسی کە لەلایەن زیاد وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکرابوو، مرد.

## هۆکاری مردنی رەبیع کوڕی زیاد

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: رەبیع کوڕی زیاد دوو ساڵ و چەند مانگێك فەرمانڕەوای خوراسان بوو و لەهەمان ساڵی مردنی زیاد، ئەویش مرد. پێش مردنی، عەبدوڵڵەی کوڕی وەك جێگری خۆی دانا و ئەویش دوای دوو مانگ فەرمانڕەوایەتی مرد.

دەڵێت: کاتێك فەرمانی فەرمانڕەوایەتی عەبدوڵڵەیان لای زیادەوە هێنا، ئەویان دەخستە ناو گۆڕ.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی رەبیع، خولەید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

محەممەد کوڕی فەزڵ لەباوکی دەگێڕێتەوە: بیستم ڕۆژێك رەبیع کوڕی زیاد لەخوراسان باسی حوجری کوڕی عودەی کرد و وتی: بەردەوام عەرەبەکان بەدەستی بەستراو دەکوژن. ئەگەر لەکاتی کوژرانی ئەو شۆڕشیان دەکرد، کەس لەوان بەدەست بەستراوی نەدەکوژرا بەڵام خۆیان بەدەستەوەدا و ڕیسوا بوون.

دەڵێت: دوای ئەم وتەیە هەینییەك ژیا. دواتر ڕۆژی هەینی بەجلوبەرگی سپی هات و وتی: ئەی خەڵکینە، من لەژیان بێزاربووم، دۆعایەك ددکەم بڵێن، ئامین.

دواتر دەستی لەنوێژ هەڵگرت و وتی: خواوەندا ئەگەر خێرێك چاوەڕوانی من دەکات، زووتر من بۆ لای خۆت ببەرەوە. خەڵکان وتیان ئامین.

دەڵێت: ڕۆشت و هێشتا لەچاوی خەڵك دوورنەکەوتبوویەوە کەکەوت. ئەویان

بردەوە بۆ ماڵەکەی. عەبدوڵڵەی کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و هەمانڕۆژ مرد.

دەڵێت: دوای ئەوە کوڕەکەی مرد و خولەیدی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك زیاد کوڕی سومەییە مرد، عەبدوڵڵە کوڕی خالید کوڕی ئەسیدی وەك جێگری خۆی لەکوفە دانا و سەمورە کوڕی جوندەبی وەك فەرمانڕەوای بەسرە-دەستنیشان کرد کەبۆ ماوەی هەژدە مانگ فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی لەدەستا بوو.

جەعفەر کوڕی سلێمانی زەعبی دەڵێت: دوای زیاد، معاویە بۆ ماوەی شەش مانگ سەموری کردە فەرمانڕەوای بەسرە و دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد.

دەڵێت: سەمورە وتی: خواوەند، معاویە بەنەحلەت بکات، سوێند بەخوا ئەگەر بەو شێوەی گوێڕایەڵی معاویە بووم، گوێڕایەڵی خواوەند دەبووم، هەرگیز ڕووبەڕووی ئازاب نەدەبوومەوە.

موسلیمی عەجەلی دەڵێت: ڕۆشتمە مزگەوت، کەسێك هاتە لای سەمورە و زەکاتی سامانەکەی خۆیدا. دواتر ڕۆشتە ناو مزگەوت و نوێژی خوێند، کەسێك هات و بەشمشێر لەگەردنیدا، سەری کەوتە ناو مزگەوتەکە و جەستەی لەشوێنێکی دیکەدا بوو، ئەبوبەکرە لەوێوە تێپەڕی و وتی: خواوەند دەفەرمێت: (( قد افلح من تزکی و ذکر اسم ربه فصلی))

واتاکەی: هەرکەس پاکبوویەوە و ناوی پەروەردگاری هێنایە سەرزمان و نوێژی خوێند، بەڕزگاری دەگات.

دەڵێت ئەمەم بینی و سەمورە نەمرد تا نەخۆشییەکی کوشندەی گرت و بەخراپترین شێوە مرد.

دەڵێت: ئامادەبووم کەکەسانێکی زۆریان هێنایە لای ئەو، کەسانێکیش دەوریان گرتبوو، لەکەسێکی دەپرسی: لەسەر چ دینێکیت؟

دەیوت: شایەتی دەدەم کەهیچ خوایەك جگە لەخواوەندی تاقانە نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و لەحرورییەکان بێزارم. بەڵام ئەویان دەبرد و

سەریان دەبڕی و بەمشێوەیە تا بیست و چەند کەس کوژران.

بەوتـەی بـاوکی مەعـشەر و واقـدی، لـەم سـاڵەدا سـەعید کـوڕی عـاس، فەرمانڕەوای مەدینە، ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

ساڵی پەنجا و چوارەم دەستپێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و چوارەم

جەنگی زستانەی محەممەد کوڕی مالیك و جەنگی هاوینەی مەعن کوڕی یەزیدی سولەمی لەسەرزەمینی ڕۆم لەم ساڵەدا ئەنجامدرا.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا جونادە کوڕی باوکی ئومەییە لەدەریا و لەنزیك قوستەنتەنییە دەستی بەسەر دوورگەیەکدا گرت بەناوی ئەرواد.

دەڵێت: تەبیع کوڕی زەن کەعب دەیوت: کاتێك ئەم پلیکانەی دەیبینن، هەڵبکەندرێت، کاتی ڕۆشتنی ئێمەیە.

دەڵێت: بایەکی توند هەڵیکرد و پلیکانەکەی هەڵکەند و هەواڵی مەرگی معاویە و نامەی یەزیدمان بەدەست گەیشت کەفەرمانی گەڕانەوەی دەدا. گەڕاینەوە، ئەو شوێنە بەوێرانی مایەوە و ڕۆمییەکان ئاسوودە بوون.

لەم ساڵەدا معاویە، سەعید کوڕی عاسی لەفەرمانڕەوایەتی مەدینە لابرد و مەروان کوڕی حەکەمی وەك فەرمانڕەوای ئەو شارە دەستنیشان کرد.

## هۆکاری لابردنی سەعید کوڕی عاس و دانانی مەروانی کوڕی حەکەم

جوێرییە کوڕی ئەسما دەڵێت: معاویە، مەروان و سەعید کوڕی عاسی دژی یەك هاندەدا. نامەی بۆ سەعید کوڕی عاس نووسی (لەو کاتەدا کارگوزاری مەدینە بوو) و فەرمانی پێداماڵی مەروان وێران بکات بەڵام ئەو کارەی نەکرد. جارێکی دیکە نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بەڵام ئەو کارەی نەکرد.

دەڵێت: معاویە ئەوی لابرد و مەروانی وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشان کرد.

بەڵام بەوتەی محەممەد کوڕی عومەر، معاویە نامەی بۆ سەعید کوڕی عاس نووسی و فەرمانی پێدا دەست بەسەر سامانەکانی مەرواندا بگرێت و هەروەها فەدەکیش لەمەروان وەربگرێتەوە کەپێشتر پێی بەخشیبوو.

دەڵێت: سەعید لەمبارەوە نامەی بۆ معاویە نووسی و وتی: ئەو خزمی نزیکە. معاویە جارێکی دیکە نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا دەست بەسەر هەموو سامانەکانی مەرواندا بگرێت. سەعید هەردوو نامەکەی هەڵگرت و بەکەنیزێکی سپارد.

دەڵێت: کاتێك سەعید لەکاروباری مەدینە دوورخرایەوە، معاویە نامەی بۆ مەروان نووسی و فەرمانی پێدا دەست بەسەر ماڵ و سامانی سەعید لەحیجازدا بگرێت. نامەکەی بەعەبدولمەلیکی کوڕی بۆ سەعید نارد و وتی: ئەگەر شتێك جگە لەنامەکەی سەروەری باوەڕداران دەبوو، گرنگیم پێنەدەدا.

سەعید ئەو دوو نامەی پێشتر معاویە سەبارەت بەدەست بەسەردا گرتنی سامانی مەروان بۆی ناردبوو، هەڵیگرت و بردییە لای مەروان. مەروان وتی: ئەو زیاتر لەوەی ئێمە دەیکەین، ڕێزی ئێمەی گرتووە. لەگرتنی سامانەکانی سەعید چاوپۆشی کرد.

دواتر سەعید ئەم نامەی بۆ معاویە نووسی:

((کرداری سەروەری باوەڕداران جێگەی سەرسوڕمانە کەئێمەی خزم دژ بەیەك هان دەدات، سەروەری باوەڕداران بەو هەموو خۆڕاگریی و پشوو درێژییەوە، ئەو

کارەمـــان لەگـــەڵ دەکـــات کـــە لای بێگانـــەکانیش ناڕەوایـــە و دووبـــەرەکی و دوژمنایەتی لەنێوان ئێمەدا دەنێتەوە و ئەم ڕق و کینە وەك میرات بۆ منداڵەکانمان دەمێنێتـەوە. سـوێند بـەخوا ئەگـەر منـاڵی یـەك بـاوك نـەدەبووین و هاوخـەمی بـۆ هاوکـاری خەلیفـەی سـتەملێکراو نـەدەبوو، دەبـوا ڕێـز لەمـەیش بگـرین، بـەڵام خزمایەتی باشترە)).

معاویـە نامـەی بـۆ نووسـی و داوای بەخششی کـرد و وتـی چیتر کردارەکـانی باشتر دەبێت.

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ حەدیسەکەی جویرییە کوڕی ئەسما.

دەڵێـت: کاتێـك مـەروان وەك کـارگوزار دەستنیـشانکرا، معاویـە نامـەی بـۆ نووسی کە: ماڵی سەعید وێران بکە و ئەو کەسێکی نارد تا ماڵەکە وێران بکات.

سەعید پێی وت: ئەی باوکی عەبدولمەلیك ماڵی من وێران دەکەیت؟

وتـی: بـەڵێ، سـەروەری بـاوەڕداران فـەرمانی پێـداوم، ئەگـەر فـەرمانی وێرانکردنی ماڵەکەی خۆمی دەدا، بەئەنجامم دەگەیاند.

وتی: بەڵام من ئەو کارەم نەدەکرد.

وتی: ئەگەر ئەو فەرمانەی بۆ تۆ دەنووسی، تۆیش جێبەجێت دەکرد.

وتی: هەرگیز ئەی باوکی عەبدولمەلیك.

دەڵێت: ئەوسا بەکۆیلەکەی خۆی وت: برۆ و نامەکانی معاویە بێنە.

دەڵێـت: نامەکـەی معاویـەی هێنـا کەفـەرمانی وێرانکردنـی ماڵەکـەی مـەروانی تێدا نووسرابوو.

مـەروان وتـی: ئـەی بـاوکی عوسمـان، فـەرمانی وێرانکردنـی ماڵەکـەی مـنی پێدابوویت بەڵام نەتکرد و بەمنت نەوت؟

وتـی: هـەرگیز مـاڵی تـۆم وێـران نـەکرد و منـەتم نەخـستە سـەرت. معاویـە دەیویست دووبەرەکی و دژومنایەتی لەنێوان ئێمەدا دروست بکات.

مـەروان وتـی: دایـك و بـاوکم قوربانـت بـن، سـوێند بـەخوا پێگـە و ڕێـزی تـۆ لەهەمووومان زیاتر و بەرزترە.

دەڵێت: مەروان گەڕایەوە و ماڵی سەعیدی وێران نەکرد.

باوکی محەممەد کوڕی زەکوانی قورەشی دەڵێت: سەعید کوڕی عاس هاتە لای معاویە کەپێی وت: ئەی باوکی عوسمان، باوکی عەبدولمەلیك چۆن بوو؟

وتی: کاروباری ویلایەتەکەی تۆی ڕێکخستووە و فەرمانەکانی تۆ جێبەجێ دەکات.

وتی: هاوشێوەی خاوەن نانێکە کەنانیان بۆ کردووە و ئەو دەیخوات.

وتی: هەرگیز ئەی سەروەری باوەڕداران، لەگەڵ کەسانێکدایە کەناکرێت قامچییان بۆ هەڵبگریت و شمشێر کێشان بۆ ئەوان ڕەوا نییە، هاوشێوەی تیر پەیوەستی یەکترن، تیرێك لەقازانجی تۆدایە و تیرێك لەزیانی تۆ.

وتی: چ شتێك ئێوەی لەیەك دوور کردۆتەوە؟

وتی: لەمن بۆ سەر پێگەی خۆی دەترسێت، منیش بەهەمانشێوە.

وتی: هەڵسوکەوتی تۆ لەگەڵ ئەو چۆنە؟

وتی: لەئامادەنەبوونی خۆی، ڕەزامەندی ئەو بەدەست دێنم و بەئامادەبوونی خۆیشی هەروەها.

وتی: ئەی باوکی عوسمان، لەم گرفتارییانە ئێمەت پشتگوێ خست؟

وتی: بەڵێ ئەی سەروەری باوەڕداران، قورسایی ئەم بارە گرانەم خستۆتە سەرشانی خۆم تا پێویستم بەدوورئەندێشی نەبێت، نزیکم لێتان، ئەگەر بانگێشت بکرێم، ڕازی دەبم، ئەگەر بڕۆی، دەڕۆم.

لەم ساڵەدا معاویە، سەمورە کوڕی جوندەبی لەکارگوزاری بەسرە دوورخستەوە و عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی غەیلانی وەك کارگوزاری نوێ دیاریکرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی غەیلان شەش مانگ کارگوزاری بەسرە بوو و عەبدوڵڵە کوڕی حەسینی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دەستنیشان کردبوو.

لەم ساڵەدا معاویە، عوبەیداڵڵە کوڕی زیادی وەك کارگوزاری خوراسان دەستنیشان کرد.

## چۆنیەتی و هۆکاری دەستنیشانکردنی عوبەیدالله کوڕی زیاد وەك کارگوزاری خوراسان

محەممەد کوڕی ئەبانی قورەشی دەڵێت: کاتێك زیاد مرد، عوبەیدڵڵە ڕۆشتە لای معاویە. معاویە لێی پرسی: براکەم کێی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد؟

وتی: عەبدوڵڵە کوڕی خالید کوڕی ئەسید

وتی: کێی وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرد؟

وتی: سەمورە کوڕی جوندەبی فەزاری.

معاویە وتی: ئەگەر باوکت کاروبارەکانی بەتۆ دەسپارد، کاروبارەکانم بەتۆ دەسپارد.

عوبەیدڵڵە پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا کارێك بکە کەدوای خۆت کەس بەمن نەڵێت ئەگەر باوکت و مامت کاروبارەکانیان بەتۆ دەسپارد، کاروبارەکانم پێدەسپاردی.

دەڵێت: بەوشێوە بوو کاتێك معاویە دەیویست کاروبارەکان بەیەکێك لەمناڵەکانی حەرب بسپێرێت و ئەوی وەك کارگوزاری تایف دەستنیشان دەکرد، ئەگەر کارەکانی پەسەند بکردایە، کاروباری مەککەیشی پێدەسپارد و ئەگەر لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکان بەتوانا بوایە، کاروباری مەدینەیشی پێدەسپارد.

دەڵێت: کاتێك معاویە کەسێکی وەك کارگوزاری تاییف دەستیشان دەکرد، دەیانوت: ئەو ئەبجەد (ئەبی جاد) دەخوێنێت و کاتێك ئەوی وەك کارگوزاری مەککەیش دەستنیشان دەکرد، دەیانوت: قورئان دەخوێنێت و کاتێك وەك کاروباری مەدینەیشی پێدەسپێردرا، دەیانوت: شارەزایی و توانایی پێویستی بەدەستهێنا.

دەڵێت: کاتێك عوبەیدڵڵە ئەو قسەی کرد، معاویە ئەوی وەك کارگوزاری خوراسان دیاریکرد و پێی وت: ئەو فەرمانەی بەتۆمداوە، هاوشێوەی ئەو فەرمانەیە کە بەکارگوزارەکانی دیکەی دەدەم، بەڵام پێشنیارێکی تایبەتی

خزمایەتیش بەتۆ دەکەم چوونکە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی منیت، زۆر بەکەم مەفرۆشە، ئاگات لەخۆت بێت، لەدوژمن تەنیا بەوە بەسەندە بکە کەئەرکەکانی خۆی ئەنجام بدات و نەبێتە ئەرك بۆتۆ و تۆیش نەبیتە ئەرك بۆ ئێمە. دەرگات بەرووی خەڵکاندا ئاوەڵا بێت تا بتوانن یەکتر بناسن. کاتێك بڕیاری ئەنجامدانی کارێکتدا، خەڵکانی لیٚ ئاگادار بکەرەوە چوونکە کەس بیر لەگۆڕینی بڕیارەکەت ناکاتەوە و پێشنیاری گۆڕینت پێنادات. کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بوویتەوە و لەسەر زەوی بەسەرتۆدا زاڵبوون، نابێت ژێر زەوی لەدەستی تۆ دەربێنن. کاتێك هاوەڵانت پێویستیان بەهاوکاری تۆ بوو، هاوکاری خۆتیان لیٚ درێغ مەکە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عوبەیدللە کوڕی زیادی وەك کارگوزار دەستنیشان کرد و پێی وت:

((لەخواوەند بترسە و هیچ شتێك مەخە پێش ترس لەخواوەند چوونکە ترس لەخواوەند پاداشتی چاکەی بەدواوە دێت. ئابڕووی خۆت بپارێزە. کاتێك بەڵێنتدا، بیبەسەر، زۆر بەکەم مەفرۆشە، هیچ کارێك ئاشکرا نەکە تا ئەو کاتەی بڕیار دەدەیت و کاتێك ئاشکرات کرد، مەیگۆڕە. کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بوویتەوە، زیاتر لەهەمووان تێبکۆشە و بەپێی فەرموودەکانی کتێبی خواوەند کارەکانت ئەنجام بدە. کەس بۆ شتێك هیوادار مەکە کەشیاو نییە بۆی و کەس لەماف خۆی بێبەش مەکە)).

دواتر ماڵئاوایی لێکرد.

موسلیمە دەڵێت: عوبەیدللە لەکۆتاییەکانی ساڵی پەنجا و سێی کۆچی شامی بەجێهێشت و لەمەکاتەدا ساڵەکانی تەمەنی بیست و پێنج بوو. ئەسلەم کوڕی زەرعەی کەلابی لەپێشەوە بۆ خوراسان نارد و ئەو ڕۆشت. جوعد کوڕی قەیسی نەموری لەگەڵ ئەو شامی بەجێهێشت کە لەپێش ئەو هۆنراوەی بۆ مەرگی زیاد دەخوێندەوە. عوبەیدللە ئەو ڕۆژە ئەوەندە گریا کەدەستارەکەی سەری کەوتەخوار.

دەڵێت: عوبەیدللە گەیشتە خوراسان. دواتر لەڕووبار پەڕییەوە و سوار لەسەر وشتر ڕوویکردە کوێستانەکانی بوخارا. ئەو یەکەم کەس بوو لەگەڵ سوپاکەی

لەکوێستانەکانی بوخارا گوزەری کردبوو. دەستی بەسەر وەرامین و نیوەی بیکەندا گرت و دەستەی بوخارییەی لەوێ کۆکردەوە.

دەڵێت: عوبەیدللە لەبوخارا ڕووبەڕووی تورکەکان بوویەوە. قەبەج خاتوون ژنی شای شاکان لەگەڵ ئەودا بوو. کاتێك لەسەر دەستی خواوەند شکستیان خوارد، دەرفەتی ئەوەی دەست نەکەوت هەردوو پاپووچەکەی لەپێی بکات، یەکیانی لەپێ کرد و ئەوی دیکەی بەجێما و کەوتە دەستی موسوڵمانان. دووسەد هەزار درهەمیان لەسەر گۆرەوییەکانی دانا.

عوباد کوڕی حوسن دەڵێت: کەسم بوێرتر لەعوبەیدللە کوڕی زیاد نەبینیوە. کاتێك دەستەیەك لەتورکەکان لەخوراسان هێرشیان کردە سەرمان، بینیم دەجەنگا و هەڵمەتی دەبرد و شمشێری دەوەشاند و لەچاوان ون دەبوو. دواتر ئالاکەی بەرز دەکردەوە کەخوێنی لێدەچۆڕا.

مەسلەمە دەڵێت: دەستەی بوخارییە کە عوبەیدللە ئەوانی هێنایە بەسرە، دوو هەزار کەس و هەموویان لەتیرهاویشتندا بەتوانا بوون.

دەڵێت: هێرشی تورکەکان لەڕۆژگاری زیاد لەبوخارا ڕوویدەدا و لەهێرشە گرنگەکانی خوراسان بوو.

هوزەلی دەڵێت: هێرشەکانی خوراسان پێنج دانە بوو: ئەحنەف کوڕی قەیس ڕووبەڕووی چوار هێرش بوویەوە: یەکیان لەنێوان قەهێستان و ئەبەرشەهر بوو و سێ هێرشەکەی دیکە لەمورغاب. هێرشی پێنجەم، هێرشی قارن بوو کە عەبدوللە کوڕی خازم تێکیشکاند.

مەسلەمە دەڵێت: عوبەیدللە کوڕی زیاد دوو ساڵ لەخوراسان مایەوە.

بەوتەی واقدی و باوکی مەعشەر لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا کەکارگوزاری مەدینە بوو. کارگوزاری کوفە عەبدوللە کوڕی خالید و بەوتەیەك زوحاك کوڕی قەیس بوو. کارگوزاری بەسرە عەبدوللە کوڕی عەمرۆ کوڕی غەیلان بوو.

ساڵی پەنجا و پێنج دەستی پێکرد.